


# گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

47
گۆڤارێكی ئەكادیمی و زانستیی وەرزییە
٢٧٢١ كوردی ٢٠٢١ زایینی

**باس و توێژینەوە بڵاوکراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی**
**دەربڕی بیر و بۆچوونی توێژەرانن نەک دەستەی نووسەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەساز: عیسام موحسین نادر.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، ئیمان نەجات، شیلان جەلال
- ڕێکخەری کاروباری گۆڤار: شیلان جەلال
موبایل: ٠٧٥٠٤٩٠٢٠٧٥
- ئیمێل:govary.ak@gmail.com

**لەم ژمارەیەدا**

**بەشی کوردی**



**بەشی عەرەبی - القسم العربي**

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، گۆڤارێکی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کورد و کوردستان بڵاو دەکاتەوە، بەمەرجێك لە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییە، ئەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشانی باسەکەی، ناو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لە هەڵبژاردنی ناونیشان و نووسینەوەی توێژینەوەکاندا، پێویستە ڕەچاوی بنەماکانی میتودی زانستی بکرێت. لەمەسەلەکانی پەیوەست بە ڕێکخستنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویستە نووسینی باس و بابەتەکان بە زمانێکی زانستی شیاو بێت، بە پێچەوانەوە هەر توێژینەوەیەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویستە توێژەر پوختەی توێژینەوەکەی بە دوو زمانی دیکە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەکەی لە کۆتایی توێژینەوەکەیدا بنووسێت، بەمەرجێك لە یەك لاپەڕەی A4 زیاتر نەبێت و تیایدا گرینگی باسەکە و ئەنجامە سەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هەر باس و بابەتێك لەبارەی ساغکردنەوەی (پەیدۆزی، تحقیق) ی دەستنووسەکانەوە بێت. پێویستە پەیدۆزییەکە بە گوێرەی بنەما زانستییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیەکی کۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبێ باس و بابەتەکان بەجۆری فۆنتی یونیکورد بنووسرێن. لەمەسەلەی بەکارهێنان و ڕێکخستنی سەرچاوەکان پێڕەوی لە شێوازی هارفارد بکرێت. ناونیشانی باس و توێژینەوەکان بە فۆنتی قەبارە (١٥) بێت، ناوی توێژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دایبڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بڵاوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بڵاوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# لادان لە بنەمای هاریکاری
# (کتێبی ڕشتەی مرواری بە نموونە)

**م. ی. ئاگرین شەوکەت هادی**
بەشی کارگێڕیی یاسا
پەیمانگەی تەکنیکی کارگێڕیی
زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر

**م. ی . کەلسووم خالید ئەحمەد**
کۆلیژی تەکنیکی تەندروستی
زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر

**پ. ی. د. نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو**
بەشی زمانی کوردی
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی
زانکۆی سەلاحەددین

## پێشەکی

### ١ـ ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە بریتییە لە (لادان لە بنەمای هاریکاری "کتێبی ڕشتەی مرواری بە نموونە"). لێکۆڵینەوەیەکی پراگماتیکییە، نموونەکانی ئەو دەقانەن، کە لە کتێبی ڕشتەی مرواریدا باسکراون، بەپێی تیۆری بنەماکانی هاریکاری شیکراونەتەوە و هەوڵدراوە گونجاوترین نموونە هەڵبژێردرێت، کە لەگەڵ ناوەرۆکی باسەکەدا بگونجێت، کە ئەمەش هەوڵێکە بۆ دەرخستنی بنەما وردەکانی بنەمای هاریکاری لە دەقە نووسراوەکاندا.

### ٢ـ سنوور و ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە

لێکۆڵینەوەکە لە ئاستی پراگماتیکدایە و شیکردنەوەی نموونەکان بەپێی تیۆری بنەماکانی هاریکاری گرایس لێکدراوەتەوە و سنوورەکەی دەستنیشان کراوە بەوەی تەنیا ئەو نموونانە وەرگیراون، کە لە کتێبی ڕشتەی مرواریدا باسکراون، ئەم لێکۆڵینەوەیەش لە چوارچێوەی ڕێبازی (وەسفی شیکاری) باسی لێوە دەکرێت.

### ٣ـ هۆی هەڵبژاردنی لێکۆڵینەوەکە

خاڵی گرنگ لە هەڵبژاردنی لێکۆڵینەوەکە، کاریگەریی ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان قسەکەر و گوێگردا هەیە، بەتایبەتی لە بنەماکانی هاریکاریدا، کە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر سەرکەوتنی پڕۆسەی پەیوەندیکردن، بە

پیادەکردنی بنەماکان لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵدا، بەوەی زمان چالاکییەکی کۆمەڵایەتییە بە مەبەستی هاریکاریکردنی نێوان بەشداربووانی ئاخاوتن بەکاردەهێنرێت.

**٤ـ کێشەی لێکۆڵینەوەکە**

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ شیکارکردنی پراگماتیکییانەی چەند دەقێکی نێو کتێبی ڕشتەی مرواری بەپێی بنەماکانی هاریکاری، کێشەی ئەم دەقانە لەوەدابوو کە هەر دەقێک زیاتر لە بنەمایەکی تێدا پێشێل کرابوو، بە ئەستەم نموونەیەکمان دەستدەکەوت و دەبینییەوە تەنیا لە یەک بنەمادا لادان تیایدا ڕوویدا بێت.

**٥ـ ناوەرۆکی لێکۆڵینەوە**

ناوەرۆکی ئەم لێکۆڵینەوەیە جگە لە پێشەکی و ئەنجام، لە سێ بەش پێکهاتووە:

بەشی یەکەم؛ بەشێکی تیۆرییە و تیایدا باس لە بنەمای هاریکاری لەلایەن پۆل گرایس کراوە، لەگەڵ باسکردنی هەریەکە لە بنەماکانی هاریکاری (بنەمای چەندێتی، بنەمای چۆنیەتی، بنەمای پەیوەندی و بنەمای شێواز)، لەگەڵ هێنانەوەی نموونە بۆ هەر بنەمایەک.

بەشی دووەم؛ ئەم بەشەش بەشێکی تیۆرییە و باس لە لادان لە بنەماکانی هاریکاری گرایس دەکات و هێنانەوەی نموونە بۆ هەر یەکێک لەم بنەمایانە، بنەمای چەندێتی، بنەمای چۆنیەتی، کە ئەمیش چەند جۆرێکی لادانی لێدەکەوێتەوە، وەک (توانج و گاڵتەپێکردن، خواستن، ئاماژەپێکردن، زێدەڕۆیی و کەمکردنەوە)، هەروەها بنەمای پەیوەندی و شێواز، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێویست سەبارەت بەم بنەمایانە.

بەشی سێیەم، بەشی پراکتیکی لێکۆڵینەوەکەیە، کە باس لەو لادانانە دەکات، کە لە بنەمای هاریکاریدا هاتۆتە کایەوە، بە پشتبەستن بە نموونەکانی نێو کتێبی ڕشتەی مرواری و شیکارکردنی نموونەکان.

لە کۆتاییدا، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە و لیستی سەرچاوەکان، لەگەڵ پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی پێشکەش کراون.

# بەشی یەکەم
# بنەمای هاریکاری

### ١ـ بنەمای هاریکاری

پرۆسەی ئاخاوتن لە زمانی مرۆڤدا چالاکییەکی کۆمەڵایەتییە لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵدا و پرۆسەیەکە بە پلانی تەواوەوە ئەنجام دەدرێت. بۆیە بۆ پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونی، پێویستی بە پرەنسیپێکە، کە لەسەر کۆمەڵێک یاسا و بنەما بەڕێوە بچێت. هەر بەهۆی ئەم پرەنسیپانە بوو بنەمای هاریکاری هاتە کایەوە، کە یەکێک لەو بنەمایانەی سوودێکی زۆری هەیە بۆ نێرەر و وەرگر لەکاتی گفتوگۆ، یان لە نووسیندا، ئەم بنەمایە بە (گرایس) ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام مێژوویەکی کۆنتری هەیە. بۆیە گرایس "بۆچوونی هاریکاری خستەڕوو سوودی لە زانیاری و بۆچوونەکانی پێش خۆی وەرگرت و وەک تەواوکردنێک و گەشەسەندنێک بۆ کارەکانی بەر لە خۆی ئەنجامدرابوون، ئەم کارەی جێبەجێ کرد" (هێرش چەتۆ، ٢٠١٦، ل٣٧). ئەوە گرایس لەڕێگەی وانەکانی، کە لە زانکۆی هارڤارد ساڵی **١٩٦٧** پێشکەشی کردوون، خاڵی دەستپێک لای گرایس ئەوەبوو دیاری بکات، کە بەشداربووانی ئاخاوتن لە گفتوگۆکانیاندا مەبەستی زیاتریان هەیە لەوەی دەیڵێن، یان هەمان مەبەستیان هەبێت. جگە لەوە دەشێ مەبەستەکانیان پێچەوانەی دەربڕینەکانیان بێت (علی محمود، ٢٠١٠، ل ٩). واتە مرۆڤەکان لە پەیوەندیکردنیان و دەربڕینەکانیاندا زیاتر لە واتایەک دەگەیەنن لەو شتانەی دەڵێن، بە سوود وەرگرتن لە جۆرەکانی پەیوەندیکردن. گرایس باسی لەم بابەتە کرد و ڕوونی کردۆتەوە لەژێر ناونیشانی لێکەوتەی گفتوگۆ (پەروەر عبدالرحمن، ٢٠١٣، ل ٧٢). لێکەوتە هەموو ئەو واتایانە دەگرێتەوە، کە بە وشە دەرنەبڕاون، بەڵام لە گوتنێک هەڵدەهێنجرێن، پشتبەستوو بە بنەماکانی هاریکاری، کە بە بۆچوونی گرایس بنەمایەکی هاریکاری هەیە لەنێوان قسەکەر و گوێگر، کە ئاخاوتنەکە هەڵدەسووڕێنێ، قسەکەران هەوڵدەدەن ڕاست بڵێن و زانیارییەکی وا بدەن تاڕادەیەک ڕوون و گونجاو بێت و پێداویستییەکانی گوێگر بێنێتەدی (عبدالواحید مشیر دزەیی، ٢٠١٤، ل ١٠١). گرایس لە ئەنجامی تیۆرەکەی (واتای نەسروشتی)دا گەیشتە چەند بنەمایەک و دەستنیشانی کردوون، کە وەک

ڕێنمایی و یاسا پێناسەیانی کردوون، بۆ ئەوەی بەشداربووانی ئاخاوتن سەرکەوتووانە پرۆسەکە ئەنجام بدەن و لە پەیوەندیدابن (سروە فیصل، ٢٠١٠، ل٣٥). بە باوەڕی گرایس گەیشتن بە واتای هاوبەش لە ئاخاوتندا لەڕێگای بنەمای هاریکارییەوە دەبێت، کە هەموو قسەکەرێک بێ جیاوازیی ڕۆشنبیری و کلتووری لە هەموو کۆمەڵێکدا پەیڕەوی بکات (محمد معروف فتاح، ٢٠١٠، ل٤٢٤). بنەمای هاریکاری چەند بنەمایەکن، کە چۆنیەتی بەڕێوەچوون و ئامانجی ئاخاوتن پێیانەوە بەندە و جێبەجێکردن و نەکردنی ئەم بنەمایانە ئامانج و ئاراستەی هەر ئاخاوتنێک دیاری دەکەن.

بە بۆچوونی گرایس ئاخاوتن چالاکییەکی هۆشەکییە، کە بە هاریکاری بەشداربووانی ئاخاوتن دێتە ئەنجام (محمد معروف فتاح، ٢٠١١، ل٢١٣). گرنگییەکی دیاری بنەماکانی هاریکاری لەوەدایە، هۆکارێکە بۆ ئەوەی بەشداربووانی ئاخاوتن لە مەبەستی یەکتر بگەن، گرایس دەقی بنەماکانی هاریکاری بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو: "با گوتنەکەت هێندە بێت و لەو کات و شوێنەدا بێت و بەو جۆرە بێت، کە پێویستی تێگەیشتن دەیەوێت" (جۆرج یول، ٢٠٠٠، ل٣٧). هاوبەشی ئاخاوتن باوەڕی بەوە هەیە، کە دەیەوێت هاریکاری بکات. مەبەست ئەوەیە لە شێوەی داخوازیدا (با هێندە بێت: کەمییە، لەو کات و شوێنە: بەو جۆرە بێت، کە ئاخاوتنەکە پێویستییەتی (محمد معروف فتاح، ٢٠١١، ل٢١٣). بەپێی ئەو بنەمایە، ئاخاوتن شێوەیەکی ڕێکوپێک وەردەگرێت و گونجاو دەبێت، واتە نە کەم دەبێت و نە زیاد، بێ بەڵگەش ئاخاوتن ناکرێت. جۆر و چۆنیەتی و بڕی زانیاری هەر دەربڕینێک لە گفتوگۆدا، دەبێ بەپێی پێویستی گوتنەکە بێت. کەواتە دەتوانین بڵێین ئاخاوتن لەسەر بنەمایەکی هاریکاریی نێوان نێرەر و وەرگر بەڕێوەدەچێت، کە پەیڕەوکردنی ئەم بنەمایانەش نەخشەکێشانێکە بۆ ئەوەی ئاخاوتن شێوەی نموونەیی وەربگرێت (عبدالواحيد مشير دزەيى، ٢٠١٤، ل ١٠١)، بەڵام مەرج نییە هەموو کەسێک لە هەموو ئاخاوتنێکدا جێبەجێی بکات "ئەمە زۆر ئەستەمە و لە ئاخاوتندا نایەتەدی، چونکە ئاخاوتن تێکەڵ بە هەندێ ڕەهەندی دیکەی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبێ، ئاخێوەر سوودیان لێوەردەگرێ، یان کاریگەری لەسەر ئاخاوتندا دروست دەکات" (بەدرخان سلێمان، ٢٠١٥، ل٦٤).

بە پیادەکردنی بنەمای هاریکاری گرایس قسەکەر و گوێگر لە پەیوەندیکردندا سەرکەوتووتر دەبن، چونکە لێڵی و لەیەکنەگەیشتن لەنێوان بەشداربووانی ئاخاوتندا کەمتر دەکاتەوە، کە ئەمەش لە پرۆسەی پەیوەندیکردندا گرنگە (Finch, 2000, P159). بنەمای هاریکاری بە شێوەیەکی واتادار بەشداری دەکات لە ئامانجی پەسەندکراوی ئاراستەی قسەکەر، کە مەبەستی سەرەکی لێی پەسەندکردنی بنەمایەکە، ئەمەش نەبەزاندنی بەندە بە گونجانی وشەکان لە سنووری ڕستەدا لەگەڵ یەکتر و دەبێت پێویستییەکانی کارەکە (بکەر، بەرکار) لەگەڵ کارەکە بگونجێت. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتنی ئاخاوتن هەموو جارێک پەیوەست نییە بە نەبەزاندنی بنەماکان، چونکە هەموو کات هاوبەشەکانی ئاخاوتن ناچار نابن بە پەیڕەوکردنی ئەو بنەمایانە، بە تایبەتی لەو ئاخاوتنانەی لە ڕیزبەندییەکی بەرزتر ڕوودەدەن، یان لەپێناو شاردنەوەی ئاخاوتنەکان ئەنجامی دەدەن (حاتم وليا و ژيان عبدالله، ٢٠١٥، ل٥٧).

هەر کاتێک یەکێ لە بنەمایەکان لە ئاخاوتن بەکارنەهات، ئەوە بنەمای هاریکاری لەنێوان لایەنەکانی دەکەوێتە بەر تیشکەوە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێ بە هاوڕێکەی بڵێ (دێیت ئەمشەو بچین بۆ پارک)، هاوڕێکەی لە وەڵامدا بڵێ (بەیانی تاقیکردنەوەم هەیە)، پەیوەندییەکە کورتی هێناوە لەسەر بنەمای هاریکاری، چونکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکە دراوەتەوە و گوێگر تێدەگات، کە هاوڕێکەی نایەوێت لەگەڵی بڕوات (نگار مؤمنی، ١٣٨٩، ل٧٧).

بەم پێیە گرایس چەمکی بنەمای هاریکاری لەنێوان قسەکەر و گوێگر داناوە و دابەشی سەر چوار جۆری کردوون (بنەمای چەندێتی، بنەمای چۆنیەتی، بنەمای پەیوەندی، بنەمای شێواز).

**١ـ١: بنەمای چەندێتی**

ئەم بنەمایە پەیوەستە بە ڕادە و چەندێتی ئەو زانیارییانەی، پێویستە قسەکەر لە کاتی گفتوگۆدا بیبەخشێ، واتە بە کەمترین کات و داڕشتنێکی کەم، واتایەکی گونجاو و تەواو بێتە دەست. ئەم بنەمایە سوودی بۆ هەردوو بەشداربووەکەی پەیوەندیکردن هەیە (گوێگر و قسەکەر)، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و

بەگوێرەی پێویست گفتوگۆکە بەڕێوەبچێت و ئەو زانیارییانەی مەبەستیانە بیگەیەنن و زانیارییەکان ئاڵوگۆڕ بکەن. بەپێی بۆچوونی گرایس ئەم بنەمایە بەهۆی دوو بنەمای ترەوە جێبەجێدەکرێت:

- گوتنەکەت هێندە زانیاری بەخش بێت، کە پێویستە.
- گوتنەکەت زانیاریی زیاتر نەبەخشێ لەوەی، کە پێویستە (Grice, H.P, 1987, P46).

**نم١ / أ-ئازاد لە کام کۆلێژ دەخوێنێ؟**

**ب - لە کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی.**

لەم نموونەیەدا قسەکەر بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پرسیارەکەی کردووە، لە بەرانبەردا گوێگر هاریکارە و وەڵامی پرسیارەکە بەگوێرەی پێویست دەداتەوە و زانیاری دەبەخشێت، واتە ڕەچاوی بنەمای چەندێتی کردووە و زانیارییەکە نە زیادە و نە کەم.

**١-٢: بنەمای چۆنیەتی**

لەم بنەمایەدا پێویستە بەشداربوونی قسەکەران ڕاست بێت، پێویستە ئاخاوتن بەڵگەدار بێت و لە گومان دوور بێت (شێرزاد سەبری و عبدالسلام نجم الدین، ٢٠١١، ل٢٣١)، واتە با گوتنەکەت دروست بێت، شتی نادروست و بێ بەڵگە مەڵێ، ئەمەش بەم دوو یاسایە جێبەجێدەکرێت:

- شتێک مەڵێ، کە گومانت لە ڕاستییەکەی هەبێت.
- شتێک مەڵێ، کە بەڵگەی دیارت لەسەر نەبێت (Grice, H.P, 1987, P46).

**نم ٢ / أ-لە پێشانگاکە چەند کتێبت کڕی؟**

**ب - دوو کتێبم کڕی.**

لەم نموونەیەدا قسەکەری دووەم پابەندی بنەماکە بووە، بەوەی وەڵامێکی ڕاستی داوەتەوە و بە بەڵگەوە قسەی کردووە، کە ئەویش کڕینی دوو کتێبە.

**١ـ٣: بنەمای پەیوەندی/ گونجان**

بەپێی بنەمای پەیوەندی، گوتنەکانی قسەکەر پێویستە پەیوەنداربێت بە بابەتی ئاخاوتنەوە، واتە پێویستە وتنەکان لەبار و شیاو بن، بۆ ئەو شوێنەی ئاخاوتنەکەی تێدا بەکاردێت (عادل الفاخوری، ١٩٨٩، ل١٤٧). ئامانجیش لێی نەهێڵانی ئاخافتنکەرییە، کە بۆ مەبەستی تر بچێت، یان جیا بێت لەو گوتنەی هەیە (شێرزاد سەبری، ٢٠١٤، ل١٥٨). ئەم بنەمایە پەیوەندی بە چەند لایەنێکی ئاخاوتنەوە هەیە، کە پێویستە قسەکەر ڕەچاویان بکات، وەک:

- چۆنیەتی دەستپێکردنی ئاخاوتن.
- چۆنیەتی بەشداریکردن بە شێوازی لەبار و شیاو.
- چۆنیەتی گۆڕینی بابەتی ئاخاوتن.
- چۆنیەتی کۆتاییهێنان بە ئاخاوتن (دارا حەمید، ٢٠١٢، ل١٢٣).

بەم جۆرە ڕەچاوکردنی ئەم بنەمایە لە ئاخاوتندا، دەبێتە مایەی سەرکەوتنی تێگەیشتنی بەشداربووانی ئاخاوتن. واتە کاتێک قسە دەکەین، دەبێت لەگەڵ قسەکانی تر گونجان هەبێت. ئەم بنەمایەش کار لەسەر دوو یاسا دەکات:

- با قسەکەت پەیوەندار بێت بە بابەت و ڕووداوی ئاخاوتنەوە.
- با قسەکەت پەیوەندار بێت بە کات و شوێنەوە (Grice, H.P, 1991, P39)

**نم ٣/ أ ـ ئەمشەو بچینە دەرەوە.**

**ب ـ ناتوانم میوانمان دێت.**

لەم نموونەیەدا ڕەچاوی بنەمای پەیوەندی کراوە و تا ڕادەیەک پەیوەندییەک هەیە لەنێوان داوای قسەکەر و وەڵامی گوێگر، بەوەی ڕاستەوخۆ وەڵامی دەداتەوە، کە ناتوانێ لەگەڵیدا بچێتە دەرەوە، بەڵام هەندێکجار وا ڕێکدەکەوێت وەرگر بۆ ئەوەی وەڵامی قسەکەر نەداتەوە، پابەندی بنەماکە نابێت و خۆی لە وەڵام دەدزێتەوە، وەک ئەم نموونەیە:

**نم ٤ / أ ـ دەتوانی بڕێک پارەم بە قەرز پێ بدەی.**

**ب ـ خانووەکەمان کۆن بووە، پێویستە نۆژەنی بکەمەوە.**

بنەمای پەیوەندی لە گفتوگۆکردندا لە هەموو بنەماکانی تر زیاتر ڕێگە بە کورتبڕی و دوورکەوتنەوە دەدات لە باسکردنی شتێک، کە بێ سوود بێ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئاسانکردنی تێگەیشتن.

**١ـ٤: بنەمای شێواز**

ئەم بنەمایە پەیوەستە بە شێوازی دەربڕینی ئاخاوتنەوە، بەڵام بنەماکانی تری هاریکاری پەیوەستن بە ناوەڕۆکی گوتنەوە. ئەم بنەمایە دەڵێت ڕوون بدوێن، کە ئەم چوار یاسایە لەخۆ دەگرێت:

- "خۆ بپارێزن لە دەربڕینی تەمومژاوی و لێڵ.
- خۆ بپارێزن لە لێڵی.
- پوخت بدوێ (خۆ بپارێزە لە زیادە گوتنی ناپێویست).
- گوتنەکەت تۆکمە بێت/ ڕیزبەندی گوتنەکانت ڕەچاو بکە" (ڕەحیم سورخی، ٢٠١٦، ل٧٠).

جێبەجێکردنی کردەی ئاخاوتن و پابەندبوونی بە بنەمای شێواز، لێک تێگەیشتن لەنێوان بەشداربووانی ئاخاوتن ئاسانتر و خێراتر دەکات، چونکە بنەمای شێواز پەیوەندی بە جۆر و شێوازی گوتنەکەوە هەیە. بەپێی ئەم بنەمایە ئاخێوەر لە ئاخاوتنی ئاساییدا دەبێت لە هەموو لایەنەکانی گوتن بکۆڵێتەوە، بێگومان لە هەموو زمانێکدا دیاردەی فرەواتایی و لێڵی هەیە، لە هەر ئاستێکدا بێت کاریگەریی خۆی دەکاتە سەر تێگەیشتنی گوێگر بۆ گوتنەکە. بۆیە دەبێت قسەکەر خۆی بە دوور بگرێ لە هەموو جۆرە دەربڕینێکی لێڵی واتایی، کە لای گوێگر مەبەستێکی تر بگەیەنێ و سەرلێشێوان دروست بکات، هەندێکجار بەهۆی دەوروبەرەوە، ڕەنگە ئەم دیاردانە نەمێنن، بەڵام لە هەموو کاتێکیشدا ئەمە نابێ.

**نم ٥ / أ‌ـ لە پەیوەندییەکە گوتم ببە بە پیاو.**

**ب ـ سەبارەت بە پەیوەندییەکانی تر نازانم چییان پێ گوتووە.**

لادانێک لەم دەربڕینەی سەرەوەدا هەیە، کە هەست دەکرێت لێڵییەک لە گوتنەکەدا هەیە، ئەویش جۆری پەیوەندییەکەیە، کە نازانرێت، گوێگریش تووشی سەرلێشێوان دەبێت و لە مەبەستی قسەکەر تێناگات.

**نم ٦ / أ ـ له تاقیکردنەوە چۆن بوویت؟**

**ب ـ لەبەرئەوەی نەخۆش بووم، نەمزانی پرسیارەکان چۆن بوون، باشم جواب نەداوە.**

لەم نموونەیەدا درێژدادڕی لە وەڵامدانەوەی پرسیاری قسەکەر کراوە، لێرەدا گوێگر دەیتوانی بە وەڵامێکی کورت و پوخت وەڵام بداتەوە. کە ئایا لە تاقیکردنەوەکەدا باش بووە، یان خراپ. بۆیە پابەندی بنەمای شێواز نەبووە و پوخت نەدواوە.

بە گشتی ئەم بنەمایانە (چەندێتی، چۆنیەتی، پەیوەندی، شێواز) گریمانەن، لە توانای قسەکردندا هەن، تەنانەت ئەگەر ئاخێوەر بەپێی ئەم بنەمایانەش نەڕوات، ئەوە گریمانە دەکرێت ئاخێوەر پەیڕەویان بکات، ئەگەر لە هەر ئاستێکدا بێت.

## بەشی دووەم
## لادان لە بنەمای هاریکاری

### ٢ـ لادان لە بنەمای هاریکاری

دەبێت ئەوە بزانین، کە لە توانای هیچ قسەکەرێکدا نییە لە کاتی قسەکردندا هەموو بنەماکان بەکار بێنێ و پەیڕەویان بکات، ئینجا لەبەر هەر ئەگەرێک بێت. ئەم لادانەش نابێتە ئەگەری ئەوەی هاوبەشەکانی ئاخاوتن لەیەکتر تێنەگەن، بەڵکو ئەو لادانە هەندێجار شێوازێکی کارتێکەر و سەرنجڕاکێش دەهێنێتە ئاراوە. "گرنگی بنەماکانی هاریکاری لە پڕۆسەی ئاخاوتندا لەوەدا نییە، کە پێمان بڵێ چۆن پڕۆسەی گفتوگۆ لەنێوان قسەکەر و گوێگر ڕوودەدات. بایەخی دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی ئەو بنەمایانە لەلایەن گرایس زیاتر بۆ پیادەنەکردنی ئەو بنەمایانە دەگەڕێتەوە، زۆرجار ئاخێوەر مەبەست و ئامانجی دیکە لەپاڵ گوتنەکانیەوە جێبەجێدەکات، وەک (گاڵتەپێکردن و بێزارکردن، داواکردن، ...)، واتە لە کاتی گفتوگۆدا تەنیا گرنگی بە مەبەستی خۆی دەدات، نەک ئامانجی گشتی گفتوگۆکە" (سروە فیصل، ٢٠١٠، ل٥٤).

مەبەستیش لە لادان و پابەندنەبوون بە بنەماکانی هاریکاری ئەوەیە، کە هاوبەشەکانی ئاخاوتن زانیاریی کەم، یان زیاتر دەبەخشن، یان وەڵامێک لەلایەن گوێگر دەدرێتەوە، کە پەیوەندی بە بابەتی پرسیاری قسەکەرەوە نییە، ئەمەش بۆ خۆدزینەوەیە لە بابەتەکە، یان سەرلێشێواندنی بەشداربووانە. هەروەها دەبێت ئەوەش بزانین، کە ئەم "بنەمایانە لە پرۆسەی ئاخاوتندا وەک بنەما کلتووری و ئاینی و کۆمەڵایەتییەکان نین، کە لادان لێیان ببێتە هۆی سزا و کەشێکی نالەبار دروست بکات. تەنانەت لادان لەم بنەمایانە وەک یاسا و ڕێسا ڕێزمانییەکانیش نین، کە ببنە هۆی بەرهەمهێنانی ڕستەی ناڕێزمانی و نادروست، کە لەلای هاوبەشانی ئاخاوتن جێگەی ڕەزامەندی و قبوڵ نەبن و ببنە هۆی تێنەگەیشتن، بەڵکو زۆرجار لادان لەم بنەمایانە بەپێچەوانەوە لەبری ئەوەی پرۆسەی ئاخاوتن بەرەو تێکدان و تەمومژی ببات، دەبێتە هۆی داهێنان و جوانکاری، ئەمەش پێچەوانەی هەموو بنەمایەکی ترە، کە دەبێت مرۆڤ هەمیشە پێیانەوە پابەند بێت" (سروە فیصل، ٢٠١٠، ل٥٤).

**٢ـ١: لادان لە بنەمای چەندێتی**

ناوەرۆکی سەرەکی ئەم بنەمایە لەوەدایە، کە ئاخێوەر دەبێت بەپێی پێویست زانیاری ببەخشێت، ئەم بنەمایەش بە بۆچوونی گرایس لەسەر دوو بنەمای تر بەندە، بەڵام زۆرجار ئاخێوەر پابەندی ئەم بنەمایە نابێ، کەمتر یان زیاتر لەو زانیارییە دەبەخشێ، کە پێویستە "ئەگەر بەشداریی گوێگر بە گوێرەی پێویست نەبیت، ئەوە ئەم لادانە لە نەزانینەوە نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە نایەوێ هەستی خۆی ڕاستەوخۆ بۆ بەرامبەرەکەی دەرببڕێ" (عبدالواحد مشیر دزەیی، ٢٠١٤، ل١٠٤).

**نم ٧ / قوتابی: مامۆستا لە تاقیکردنەوەکان دەرچووم ؟**

**مامۆستا: لەوانەیە لە کوردی دەرچوویت.**

لەم نموونەیەدا قسەکەری دووەم لە بنەمای یەکەمی چەندێتی لایداوە، بەوەی زانیاریی کەمتری بەخشیوە لەوەی کە پێویستە، چونکە قسەکەری یەکەم چاوەڕێی وەڵامێکی گونجاوە لەوەی، کە ئایا دەرچووە، بەڵام وەڵامێکی کەمتری دەستکەوتووە لەوەی پێویستە، ئینجا ئەمەش لەبەر نەزانین و ئاگادارنەبوونی گوێگرە، کە زانیاری لەسەر ئەنجامی تاقیکردنەوەکان نییە، یان ئەوەیە کە ئەو مامۆستای وانەی کوردییە و تەنیا زانیاری لەسەر بابەتی خۆی هەیە، یان ئەوەیە لەبەر ئەوەی قوتابییەکە لە هەموو وانەکان کەوتووە و نایەوێ لەبەردەم ئامادەبووان شەرمەزاری بکات، بە هەر جۆرێک بێت، ئەمە لادانە لە بنەمای چەندێتی و زانیارییەکی کەمتر دەربڕاوە لەوەی کە پێویستە.

**نم ٨ / أـ بەیانی لە کوێ بتبینم؟**

**ب ـ بەیانی لە چایخانەی مەچکۆ لای قەڵا بەرانبەر بازاڕی گەورە.**

لەم نموونەیەدا وەڵامی گوێگر پێویستی بەم هەموو زانیارییە نییە، تەنیا دەیتوانی بڵێ (چایخانەی مەچکۆ)، چونکە شوێنێکی دیارە و ئەوەی خەڵکی ئەم شارە بێت، دەزانێت دەکەوێتە کوێ، بەڵام گوێگر درێژدادڕی لە وەڵامدا کردووە، ئینجا لەبەر هەر هۆکارێک بێت و زانیاریی زیاتری بەخشییە لەوەی کە پێویستە، بەمەش دەبێتە لادان لە بنەمای دووەمی چەندێتی، کە دەڵێت (گوتنەکەت زانیاریی زیاتر نەبەخشێ لەوەی، کە پێویستە).

**٢ـ٢: لادان لە بنەمای چۆنیەتی:**

لادان لە بنەمای چۆنیەتی ڕوودەدات لەو کاتەی گومان لە ئاخاوتندا هەبێت و قسەکەر شتێک بڵێت، کە ڕاست نەبێت، یان گومان لە ڕاستیبوونیدا هەبێت و بەڵگەدار نەبێت (عادل الفاخوری، ١٩٨٩، ل١٥٤).

زۆربەی جار لادان لەم بنەمایە بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لەوانەیە بەئاسانی ئەم لادانە هەست پێنەکرێت، یان ماوەیەک بەسەر بچێ، ئینجا هەستی پێ بکرێت، چونکە ئەم بنەمایە پەیوەندی بە دروستی و نادروستی ئەو زانیارییانەوە هەیە، کە بەشداربووی ئاخاوتن دەریدەبڕێ، بۆیە ماوەیەکی دەوێ تا گوێگر ڕاستی و دروستی زانیارییەکانی بۆ دەردەکەوێ، ئەگەر قسەکەر بە ئەنقەست زانیاریی هەڵەی دا، ئەوە لادانە لەم بنەمایە (سروە فیصل، ٢٠١٥، ل٥٨). لادان لە بنەمای چۆنیەتیش بە چەند شێوەیەک دەردەکەوێت، وەک (توانج و گاڵتەپێکردن، خواستن، ئاماژەپێکردن، زیادەڕۆیی و کەمکردنەوە).

**١ـ گاڵتەپێکردن و توانج:** توانج دیاردەیەکە ئاخێوەر بەکاریدەهێنێت، بۆ ئەوەی مەبەستی خۆی بەرانبەر کێشەیەک، بابەتێ، کەسێک یان هەر شتێک ... دەربڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا گاڵتەپێکردن پلەی هەیە، واتە هەندێکجار توانجەکە توندە و کاتێک ئاڕاستەی گوێگر دەکرێت، پێی تووڕە دەبێت، هەندێکجاریش توانجەکە سووکە و کەسی بەرانبەر پێی تووڕە نابێت و قسەکەر بەئاسانی ئاخاوتنی خۆی دەردەبڕێت.

**نم ٩ / کچی من زیرەکە، بە یەکەم دەرچووە.**

ئەگەر دایکێک لەناو ئامادەبووان ئەمە بە کچەکەی بڵێ، کە ئەوانیش ئاگادار بن لەوەی ئەم قوتابییە زیرەک نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دایکەکە دەزانێ کچەکەی زیرەک نییە و لە تاقیکردنەوەکان کەوتووە، لێرەدا ئەمە دەبێتە لادان و بە مەبەستی توانج و گاڵتەپێکردن بەکاری دەهێنێت.

**٢ـ خواستن:** لادانە لە واتای بنەڕەتی، مەبەست لێی ئەوەیە وشەیەک جگە لە واتا دروستەکەی (واتای فەرهەنگی) بەکاردێت، ئەوە واتایەکی خواستراویش

دەبەخشێت، وشەیەک یان دەستەواژەیەک بۆ واتایەکی دوور لە واتا ڕاستەقینەکەی بخوازرێت، کە هەمان واتای نەبێت (عمر محمود، ٢٠٠٩،ل١٣). بۆ نموونە ئەگەر بڵێین:

**نم ١٠ / ئازاد شێرە.**

وشەی (شێر) لەم نموونەیەدا بە مەبەستی گیانلەبەر نایەت، بەڵکو وەسفی ئازادی پێدەکرێت، کە ئازایەتی و بەهێزی و چاونەترسی لەم گیانلەبەرە دەچێت، ئەم سیفەتانە لەم مرۆڤەدا کۆبوونەتەوە، لێرەدا وشەی (شێر) خواستراوە، بۆ ئەوەی وەسفی مرۆڤێکی لە ئازایەتیدا پێ بکرێت.

**٣ـ ئاماژەکردن:** دەبێتە ئەگەری ئەوەی لادان لە بنەمای چۆنیەتی ڕووبدات، ئەویش بەوەی کاتێک قسەکەر گوێبیستی پرسیارێکی هەڵە دەبێت، ئەوە بە گوتنێکی هەڵە وەڵامی دەداتەوە، بۆ ئەوەی ئاماژە بە هەڵەی گوێگر بکات، ئەمەش لەبەر ئەوە ڕوودەدات، کە ناتوانێ وەڵامێکی ڕاستی ئەو هەڵە گەورەیە بداتەوە، کە بیستیتی و هەڵەکەی ڕاست بکاتەوە، بۆیە بە گوتنێکی هەڵە وەڵامدەداتەوە.

**نم ١١ / أـ دوێنێ لای سەرۆک بووم.**

**ب ـ بەڵێ ئێوەم لە کۆبوونەوەکە بینی.**

**٤ـ کەمکردنەوە:** ئەوەیە کەسێک کارەکی گەورە و خراپ بکات و بچووکی بکاتەوە و داپۆشێت. بۆ نموونە کەسێک جگەرە زۆر بکێشێ و بڵێ دکتۆر تاکە تاکە دەکێشم (عبدالواحید مشیر دزەیی، ٢٠١٤،ل١٠٦).

**٥ـ زیادەڕۆیی:** ئەم جۆرەشیان گەورەکردنی شتە، کە لەگەڵ واقع ناگونجێ و پێچەوانەی کەمکردنەوەیە، واتە باسکردنی شتێکە، کە زۆر لە قەبارەی خۆی گەورەترە.

**نم ١٢ / بەژنی هێندە درێژە دەڵێی دار ئەسپیندارە.**

**مردم هێندەی چاوەڕێت بم.**

**٢ـ٣: لادان لە بنەمای پەیوەندی**

لادان لەم بنەمایەدا پەیدا دەبێت، کاتێک وەڵامی گوێگر گونجاو نەبێت و پەیوەندی بە بابەتی داواکراوەوە نەبێت، کە هەندێکجار بە مەبەست لەم بنەمایە

لادەدات و وەڵامێک دەداتەوە، کە پەیوەندی بە بابەتەوە نەبێت، "لادان لەم بنەمایەدا لە ئاخاوتنی ئاساییدا کەمتر بەرچاو دەکەوێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەم بنەمایە لە گفتوگۆکردندا زۆر گرنگە و لادان لێی گرفتی گەورە لە پەیوەندیکردندا دەنێتەوە، کە وەڵامی وەرگر لەگەڵ داوای نێرەر ناگونجێ و بەئاسانی هەست بە پێشێلکردنی ئەم بنەمایە لەلایەن ئاخێوەرەوە بکرێت" (سروه فیصل، ٢٠١٠، ل٦٠).

**نم ١٣/ أ- ئەرکیماڵەوەت جێبەجێکردووە؟**

**ب - ئەوە کێیە لە دەرگا دەدات؟**

لەم نموونەیەدا گوێگر هیچ وەڵامێکی نەداوەتەوە، زانیاری نەداوەتە دەست بەرانبەر داوای قسەکەر، بۆیە بەئاسانی هەست دەکرێت، کە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان پرسیار و وەڵامەکەدا نییە.

**٢-٤: لادان لە بنەمای شێواز**

لادان لەم بنەمایە کاتێک ڕوودەدات، کە قسەکەر لە یەکێک لە بنەما وردەکانی ئەم بنەمایە لابدات، کە هەندێکجار قسەکەر بە مەبەستێکی تایبەتی خۆی لە یەکێک لەم بنەمایانەی شێواز، یان زیاتر لە بنەمایەک لادەدات، بەمەش بەشداربووانی ئاخاوتن لە تێگەیشتن تووشی زەحمەتی دەبن، تەمومژی واتاییش بە خاڵێکی گرنگ دادەنرێت، کە لادان لەم بنەمایە دەهێنێتە کایەوە، واتە دەبێت قسەکەر گوتنێک دەرببڕێت، کە لێڵی و تەمومژی واتایی دروست نەکات. هەروەها دەبێت لە دەربڕینی فرەواتا دوور بکەوێتەوە، ئەمەش کاتێک ڕوودەدات، کە قسەکەر وشەیەک بەکاردێنێ، زیاتر لە واتایەکی هەیە، بەمەش گوێگر تووشی سەرلێشێوان دەبێت و پەیوەندییەکە سەرکەوتوو نابێت، لە کاتی پەیوەندیکردندا هاوبەشەکانی ئاخاوتن پێویستە بە شێوەیەکی ڕێک و پوخت وتەکانیان دەربڕن، ئەگەر وا نەبێت، ئەوە لادان لەم بنەمایە دروست دەبێت.

**نم ١٤ / أ- لە تاقیکردنەوەکە دەرچووی؟**

**ب - پرسیارەکان زۆر گران بوون، بەگشتی قوتابییەکان خراپ بوون، باش نەبووم.**

## بەشی سێیەم
## لادان لە بنەمای هاریکاری (کتێبی ڕشتەی مرواری بە نموونە)

### ٣ـ لادان لە بنەمای هاریکاری لە(کتێبی ڕشتەی مرواری)

نموونەی لێکۆڵینەوەکەمان بریتییە لە دەقەکانی نێو کتێبی (ڕشتەی مرواری)، کە ئەم کتێبە لە هەشت بەرگ پێکهاتووە، لەلایەن مامۆستا عەلائەددین سەجادی بە شێوەیەکی پوخت و بێ کەموکوڕی نووسراوەتەوە، کتێبەکە باس لەو بەسەرهات و سەربوردانە دەکات، کە لە کۆمەڵگەی کوردی ڕوویانداوە و ڕەنگدانەوەی ئەو بارە کۆمەڵایەتییەیە، کە میللەتی کورد پێیدا تێپەڕیوە، هەڵبژاردنی نموونەکانیش لە کۆی هەر هەشت بەرگەکەدا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی بووە.

هەروەک لە سەرەتای بەشی یەکەم باسمان لەوە کرد، کە زمان چالاکییەکی کۆمەڵایەتییە و بۆ بە ئەنجامگەیاندن و سەرکەوتنی ئەم چالاکییە پێویستمان بە پلان و پرەنسیپێکی تەواو هەیە، بۆ ئەوەی پرۆسەی پەیوەندیکردن سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، هەر بۆ ئەم مەبەستەش بوو، کە بنەمای هاریکاری هاتە کایەوە، کە لەسەر چەند بنەما و یاسا و ڕێسایەک بەڕێوەدەچێت. هەندێکجاریش نێرەر و وەرگر بە مەبەست لەم بنەمایانە لادەدەن و ئاراستەی گفتوگۆکە بەرەو شوێنێکی تر دەبەن، ئینجا لەبەر هەر هۆکارێک بێت، لادانیش لەم بنەمایانە بە چەند شێوەیەکە، کە لە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەدا ئاماژەی پێکراوە، بەم شێوەیە:

- **لادان لە بنەمای چەندێتی:** زانیاری بەپێی پێویست ببەخشرێ، نە زیاتر و نە کەمتر.
- **لادان لە بنەمای چۆنیەتی:** نابێت گومان لە ئاخاوتندا هەبێت و شتی بێ بەڵگە باس بکرێت، کە ئەویش بە چەند شێوەیەک دەردەکەوێت (توانج، خواستن، ئاماژەپێکردن، کەمکردنەوە و زێدەڕۆیی).
- **لادان لە بنەمای پەیوەندی:** وەڵامی گوێگر گونجاو نەبێت و پەیوەندی نەبێت بە بابەتی گفتوگۆ.
- **لادان لە بنەمای شێواز:** لەکاتی قسەکردن تەمومژی واتایی و دەستەواژەی فرەواتا و ناڕوونی لە ئاخاوتندا هەبێت، ئەمەش لادان لەم بنەمایەی لێدەکەوێتەوە.

بۆ هەر یەکێک لەم بنەمایانە چەند نموونەیەک دەخەینەڕوو، کە لەگەڵ جۆری لادانەکە و تێبینی و ڕوونکردنەوەی پێویست لەسەر بنەمایەکەیە.

**٣ـ١: لادان لە بنەمای چەندێتی لە (کتێبی ڕشتەی مرواری)**

**نم١/ کابرایەکی کورد ڕۆژێکی ڕەمەزان نەیتوانی بەڕۆژوو بێت، هەستا چوو لە سووچێکی تاریکی ماڵەکەی خۆیاندا دەستی کرد بە نان خواردن. کوڕێکی هەبوو بەسەریا چوو گوێی لە ملچەملچێک بوو، وتی ئەمە کێیە؟ وتی "ڕۆڵە باوکی سەگبابتە نانی خۆی ئەخوا لە خەڵک ئەترسێ".**

لەم نموونەیەدا بۆ تێگەیشتن زانیاری زیاد لە پێویست بە گوێگر دراوە، کە ئەمەش پێویستی بەم زیادە گوتنە نەبوو، بەڵکو دەیتوانی تەنیا بڵێ "**ڕۆڵە باوکتە**" دەربڕینەکانی تر هەمووی زیاد دەربڕاوە، ئەمەش بە مەبەستی ئەوەی ڕەنگە نەیەوێ گوێگر پرسیاری زیاتر بکات، لەبارەی ئەوەی بۆچی بەڕۆژوو نەبووە.

**نم٢/ کابرایەکی مەرگەیی لە مەلایەک ئەپرسێ و ئەڵێ: "توخوا مامۆستا هەر دەڵێن پردی سیراتی هەیە، ئەوە چۆنە؟" مەلایش ئەڵێ: "مام هۆمەر کتێبان دەفەرموێ پردی سیرات لە مەشرەقان هەتا مەغریبان درێژە، لە موو باریکتر و لە شیر تیژترە، بە قەد سەد کێوی لەسەر یەک دانێی هێندە بەرزە، جەحەنەمیش لەژێریدایە، یەعنی پردەکە بەسەر جەحەنەمیدا ڕاکێشراوە".**

بڕی ئەو زانیارییانەی لەم نموونەیەدا وەڵامدراوەتەوە، زۆر زیاترن لەوەی لە پرسیارەکەدا داواکراوە، کە بەم هۆیەش وا دەکات لادان لە بنەمای چەندێتی بێتە کایەوە، زانیارییە زیادەکانیش لەوەدایە، کە گوێگر زۆر بە دووردرێژی باس لە پردی سیرات دەکات، کە زانیاری زۆر زیاتری بەخشیوە لەوەی پێویستە، ئەویش بە مەبەستی زیاتر ترساندنی قسەکەر بێت، یان هەر هۆکارێکی تر، بەم شێوەیە زیادەڕۆیی لە قسەکردندا کردووە.

**نم٣/ کابرایەکی کورد هەبوو (نەزەر)ی ناو بوو، پیاوی (مەحموو پاشا) بوو، نەزەر لەناکاو ون ئەبێ و زۆری پێ ناچێ پەیدا ئەبێتەوە، پاشا ئەپرسێ: ها نەزەر ئەوە**

**لەکوێ بووی؟ ئەڵێ: "بە خوا پاشا چووم بۆ ماڵی شێخ، ڕۆحم وەقوربانی سەگی بەر قاپیەکەی وێ".**

ئەگەر سەیری ئەم نموونەیە بکەین، دەبینین گوێگر زیاتر زانیاری بەخشیوە لەوەی لە پرسیارەکەدا داواکراوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەبەر خۆشەویستی بۆ شێخ ئەم زیادە گوتنەی دەربڕیوە، بەوەی دەڵێ: (**ڕۆحم وەقوربانی سەگی بەر قاپیەکەی وێ**)، کە وەڵامی پرسیارەکە پێویستی بەم زیادە گوتنە نەبوو.

**نم٤/ جارێک موفتی زەهاوی لە بەغدا لەلای والی دائەنیشێ و لە تەنیشتییەوە ئەبێ و سەرینێک لە بەینیانا ئەبێ، لەو وەختەدا یەکێک لە کوردە فەیلییەکان ئەبەنە لای والی و والی زۆر تووڕە ئەبێ و ئەڵێ "بریا ئەمزانی بەینی کورد و کەر چەندە" خێرا موفتی زەهاوی هەڵئەداتێ و ئەڵێ: "تەنها سەرینێک" والی کە لا ئەکاتەوە زۆر شەرمەزار ئەبێ و داوای لێبووردنی لێ ئەکا.**

لەم نموونەیەدا ئەگەر سەیر بکەین، دەبینین لە وەڵامدا بڕی زانیاریی داواکراو کەمترە لەوەی پرسیارەکە پێویستی پێیەتی، کە ئەمەش بۆتە هۆی لادان لەم بنەمایە، چونکە پرسیارەکە زیاتر لەم وەڵامەی دراوەتەوە لەخۆ دەگرێت، گوێگر لە وەڵامی پرسیاری قسەکەر تەنیا دەڵێت (**سەرینێک**)، کە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی تری نەداوە، بەمەش وەڵامەکە کورتی هێناوە و لەگەڵ ئەوەشدا لادان لە بنەمای شێوازیشی لێکەوتۆتەوە، بەوەی وەڵامەکە تەمومژی واتایی لێ دروست بووە.

**نم٥/ کابرایەکی وسیۆجانی کە ئەچێ بۆ کوێستان، لەو بناری بانەیە گایەک بارئەکا لە جەوت و ئەیباتەوە، لە ڕێگادا کابرایەکی تووش ئەبێ، ئەڵێ بارەکەت چییە؟ ئەویش ئەڵێ: برا جەوتە!! جەوتە، ئازا جەوتە، تاڵە جەوتە، جەوتی کوننە، جەوتی مەشکە، جەوتی گاوس، قەسقەوانە، هەزار خێری خواس.**

لەم نموونەیەشدا زانیاریی زیاد لە پێویست خراوەتە ڕوو لەوەی پێویستە و داواکراوە، کە گوێگر لە وەڵامی پرسیارەکەدا دەیتوانی تەنیا جارێک بڵێ باری جەوتە. نەوەک ئەوەندە وەڵامەکە درێژ بکاتەوە و زانیاریی زۆرتر بدات، کە پێویست نین.

لە کۆی ئەم نموونانەی دەربارەی لادان لە بنەمای چەندێتی و چەندین نموونەی تر خستمانە ڕوو، کە لە کتێبی (ڕشتەی مرواری) بەرچاو دەکەون، زۆرترینی نموونەکان بەپێی بنەما وردەکانی بنەمای چەندێتی، کە باس لەوە دەکات نابێ زانیاریی زیاد و کەم بێت، دەبێت بەپێی پێویست بێت، زانیاریی زیاتر و کەمتر نەبەخشێت لەوەی لە پرسیارەکە داواکراوە.

**٣ـ٢: لادان لە بنەمای چۆنیەتی لە (کتێبی ڕشتەی مرواری)**

**نم١/ ساڵێک بوومەلەرزەیەک لە پێنجوێندا کەوت، کابرایەکی ترسنۆک بە پیاوێکی گەورەی وت "ڕەنگە لە بوومەلەرزەکە زۆر ترسا بێتی و لەرزیبێتی". کابرا وتی "بەڵێ، بەڵام زەوییەکە لە منیش و لە تۆیش زیاتر ترسا و لەرزا".**

ئەگەر سەیری ئەم نموونەیە بکەین، دەبینین زەوی لەرزین و بوومەلەرزە دیاردەیەکی سروشتییە و ڕوودانی کارێکی ئاساییە و پەیوەندی بە ترس نییە، بەڵام لێرەدا لەبەر ئەوەی قسەکەر کەسێکی ترسنۆکە و بۆ ئەوەی هاوەڵ بۆ خۆی پەیدا بکات و ترسەکەی بشارێتەوە، پرسیار لە گوێگر دەکات، بەوەی ئەویش ترساوە لەم زەمین لەرزینە، بەڵام گوێگر بە شێوەی توانج و گاڵتەپێکردنەوە وەڵامی پرسیاری قسەکەر دەداتەوە، بەوەی زەوییەکە لەوان زیاتر ترساوە.

**نم٢/ کابرایەک هەبوو گۆزەیەکی دانابوو، هەر کەسێک کە ئەمرد، بەردێکی ئەخستە گۆزەکەوە، لە ئاخری ساڵا ئەیبژارد، بزانێ ئەو ساڵە چەن کەس مردووە. دۆستێکی هەبوو ڕۆژێک هات بۆ لای، سەیری کرد کابرا دیار نییە، لە دراوسێی دووکانەکەی پرسی: ئەرێ فڵان کەس چی لێهات؟ ئەویش وتی: "چووە گۆزەکەوە".**

لەم نموونەیەدا لادان لە بنەمای چۆنیەتی دروست بووە، بەوەی دەستەواژەی (**چووە گۆزەکەوە**) بەکارهاتووە و خوازراوە، لەبری ئەوەی بڵێ کابرا کۆچی دوایی کردووە.

**نم٣/ کامل چادرچی لە بەغدا بۆی گێڕامەوە وتی لە ساڵی ١٩٤٩دا بوومەلەرزەیەک لە بەغدا پەیدابوو. دنیا شەو بوو، من نوستبووم ئاگام لێ نەبوو. بەیانی کە هەستام پێیان وتم لە هەر کەسم ئەپرسی هەر یەکە قسەیەکی ئەکرد، یەکێ**

**ئەیوت تەنیا دوو دەقیقە بوو، یەکێک ئەیوت پێنج دەقیقە بوو، قسەیەکی ساغم دەست نەکەوت. وتی پیاوێکی کوردمان لابوو لەوم پرسی. وتی تۆزێ سەری داخست و لەپاشا سەری بەرز کردەوە و وتی: "جگەرەیەک هەڵگرە نەفەسێکی لێدە و نەفەسەکە بدەوە دواوە، هەر ئەوەندە بوو". کامل وتی لە قسەی ئەو کابرایە پوختەتر نەمبیستبوو.**

ئەگەر لەم نموونەیە ورد بینەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە زیاتر لە لادانێکی وردی بنەمای چۆنیەتی تێدا بەدی دەکرێت، بەوەی هەریەک لە ئامادەبووانی ڕووداوەکە بە جۆرێک باسی لێوە دەکات و بەڵگەیەکی ڕاست و دروستیان لەبەردەستدا نییە، کە پشتڕاستی قسەکانیان بکاتەوە، هەندێک زێدەڕۆیی لە گوتنەکەی دەکات و دەڵێت کاتی ڕوودانەکە پێنج دەقەی خایاندووە، هەندێک ڕووداوەکە بە کەم دادەنێت و بچووکی دەکاتەوە، کە بە هێندەی نەفەسێکی جگەرە کێشان دەیخەملێنێت. لە لایەکی تر لادانێکی تر بەرچاو دەکەوێت، وەک خواستنی ئەم وتەیە "**جگەرەیەک هەڵگرە نەفەسێکی لێدە و نەفەسەکە بدەوە دواوە هەر ئەوەندە بوو**". لەبری دیاریکردنی کاتی ڕوودانی ڕووداوەکە.

**نم٤/ عەزیزی مەسرەفی لە دیوەخانی شای ئێران نەسرەدین شادا ئەبێت. شا ئەپرسێ: ئاغا زووتر ئەسپی چاکت هەبوون چییان لێهات؟ ئەویش دەڵێ: شاهم، خاوەنی خۆیان سواریان بوون و ڕپیشتن، شا ئەم وەڵامەی پێخۆش ئەبێ.**

خواستنی وشەی (**ئەسپ**) لەم نموونەیەدا لادانی لە بنەمای چۆنیەتیدا دروست کردووە، کە بەرانبەر وشەی (**کچ**) بەکاری هێناوە، مەبەستیش لە خاوەنی خۆیان سواریان بوون و ڕۆیشتن، واتە چوونەتە ڕێگای خۆیان و شوویان کردووە و چاوەڕێیان مەکە.

**نم٥/ کابرایەکی دەوڵەمەندی ترزلی بێ چاووڕوو تووشی مەلایەکی خێل ئەبێ، ئەڵێ مامۆستا ڕاستە ئەڵێن پیاوی خێل یەک بە دوو ئەبینێ؟ مەلا ئەڵێ: بەڵێ وایە: کابرا ئەپرسێ چۆن؟ ئەڵێ: "ئەوەتە ئەڵێن تۆ دوو پێت هەیە، کەچی من بە چوار ئەیبینم!".**

یەکێک لە لێکدانەوەکانی لادان لە بنەمای چۆنیەتی، گاڵتەپێکردن و توانج لێدانە، بەم پێیەش لە ئاراستەکردنی پرسیار و وەڵامەکانی ئەم نموونەیەدا وشە و دەستەواژەی بەکارهاتوو لە وەڵامەکاندا بە مەبەستی توانج و گاڵتەپێکردنە، وەک گاڵتەکردن بە مامۆستایەکی ئایینی، کە خێلە لەڕێگەی پرسیارکردنێکی لەم شێوەیە، "مامۆستا ڕاستە ئەڵێن پیاوی خێل یەک بە دوو ئەبینێ؟"، مامۆستاکەش بە شێوازی گاڵتەپێکردن و توانجەوە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "**ئەوەتە ئەڵێن تۆ دوو پێت هەیە، کەچی من بە چوار ئەیبینم!**". لێرەدا مامۆستاکە کەسی قسەکەر بە چوارپێ ئەچوێنێت و توانجی لێدەدات.

**نم٦/ کابرایەکی کوێر ژنێکی هەبوو، ژنەکەی زۆری خۆش ئەویست و هەمووجار پێی ئەوت پیاوەکە خۆزگە چاوت ئەبوو سەیرت ئەکردم، کە من چەندە جوان و نازدارم، لەگەڵ ئەوەش من چەند تۆم خۆش ئەوێ. کوێرەکەش وتی: "ڕاست ئەکەی ئەگەر ئەوەندە جوان بوویتایە، وەکو خۆت ئەیڵێی بەر من نەئەکەوتی".**

لێرەدا پیاوە نابیناکە توانج لە هاوسەرەکەی دەگرێت بەوەی دەڵێت: "**جوان بوویتایە بەر من نەئەکەوتی**"، ئەمەش ئەوە دەخاتەڕوو، کە پیاوەکە گومانی لە جوانیی ئافرەتەکەی هەیە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێی دەڵێت، کە جوان نی، بەمەش لادان لە بنەمای چۆنیەتی لێکەوتۆتەوە.

**نم٧/ سواڵکەرێک چووە لای کابرایەک وتی: پوولێکم بەرێ بۆ خوا. وتی چی چی؟ وتی پوولێکم بەرێ بۆ خوا. وتی: "کەواتە تۆ بڕۆ من خۆم چاوم پێ ئەکەوێ!".**

لە ڕوونکردنەوەی ئەم نموونەیە سێ لادان لە بنەمای چۆنیەتی بەدی دەکرێت، گاڵتەپێکردن و توانج لێدان، لەگەڵ ئاماژەپێکردن؛ کابرای سواڵکەر دەیەوێ لە ڕێگەی ئاماژەکردن بۆ خوا پارە پەیدا بکات، کە ئەمەش دوورە لە ڕاستی، خوا پێویستی بە هیچ شتێک و کەسێك نییە، لە بەرانبەردا گوێگر بە هەمان شێوازی ئەم بە شتێک وەڵامدەداتەوە، کە دوورە لە ڕاستی، واتە قسەکەر و گوێگر بە ئاماژەکردنێکی نادروست لە پەیوەندیدا بوون. لە هەمان کاتیشدا گوێگر بە گاڵتەپێکردنەوە وەڵامی سواڵکەر دەداتەوە و سووکایەتی پێدەکات، بۆ ئەوەی پارەکەی پێنەدات.

لە ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی نموونەکاندا لادان لە هەموو بنەما وردەکانی بنەمای چۆنیەتی خراوەتەڕوو، وەک (توانج، خواستن، ئاماژەپێکردن، زیادەڕۆیی و کەمکردنەوە)، کە بوونەتە هۆی ئەوەی ئاراستەی گفتوگۆکە بەرەو لایەکی تر ببەن و کردەی تێگەیشتن زەحمەتتر بکەن و بەشداربووانی ئاخاوتن کاتی زیاتریان پێویست بێت بۆ تێگەیشتنی مەبەستی گفتوگۆکە.

**٣ـ٣: لادان لە بنەمای پەیوەندی لە(کتێبی ڕشتەی مرواری)**

**نم١/ کابرایەک بوو بە میوانی ماڵە کوردێک. نانیان دانا، چێشتەکە زۆر گەرم بوو، کابرای میوان هەموو دەم و ددانی سووتا! لە تاوا سەری بەرزکردەوە و سەیرێکی دارەڕای خانووەکەی کرد، بۆ ئەوەی خاوەن ماڵەکە هەستی پێ نەکا، پێی وت: "ئەرێ برا ئەم خانووەت بە چەندی دروست کردووە؟" کابرای خاوەنماڵیش وتی: "بە دوو فوو و سەبرێک".**

ئەگەر سەرنج لە وەڵامی خاوەن ماڵ بدەین، دەبینین هیچ پەیوەندییەک نییە لەنێوان پرسیاری قسەکەر و وەڵامەکەدا، بەڵکو بگرە بە شێوەی توانج لێدانیش وەڵامی پرسیارەکە دراوەتەوە لەوەی دەڵێ: "**بە دوو فوو و سەبرێک**". واتە ئەگەر سەبرت گرتبا، دەمت نەدەسووتا، بەڵام لێرەدا پرسیارەکە دەربارەی خانوو دروستکردن بوو، کەچی وەڵامەکە شتێکی تر بوو، بەمەش لادان لە بنەمای پەیوەندی هاتۆتە کایەوە.

**نم٢/ جارێک سەید ئەحمەدی خانەقا لە مەلا ساڵحی کۆزەپانکە ئەپرسێ و ئەڵێ: "ئەرێ مەلا! تۆی مەلا ساڵحی گۆزەپانکەی؟" مەلا ساڵحیش بە سەید ئەڵێ: "ئەرێ سەید جەنابتی سەید ئەحمەدی عەلی عەیری".**

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا قسەکەری دووەم لە بنەمای پەیوەندی لایداوە، بەوەی وەڵامی پرسیاری بە پرسیار داوەتەوە، کە هیچ گونجان و پەیوەندییەک لەنێوان پرسیار و وەڵامەکەدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا لادان لە بنەمای چۆنیەتیشی لێکەوتۆتەوە، بەوەی بۆ گاڵتەپیکردن و توانج لێدان لە یەکتر بەم شێوە دواون.

**نم٣/ کابرایەک ئەبێ بە میوانی ماڵە کوردێک، بەرخێک ئەکەن بە بریانی و دایئەنێن، کابرای میوان زۆری برسی ئەبێ، پارووی سەیر سەیر و بەپەلەی لێ دائەگرێ، میوانێکی تریش لەوێ ئەبێ پێی ئەڵێ: "برا بۆ چ ئەوەندە لێی بە داخی، خۆ باوکی شەڕە قۆچی لەگەڵ نەکردووی!". ئەمیش ئەڵێ: "برا تۆ بۆ چ ئەوەندە دڵت پێ ئەسووتێ، خۆ دایکی شیری پێ نەداوی!".**

له بنەمای پەیوەندیدا پێویستە وەڵامی گوێگر پەیوەندی بە پرسیاری قسەکەرەوە هەبێت، بەڵام ئەوەی لەم نموونەیەدا تێبینی دەکرێت، پێچەوانەی بنەمایەکەیە لەوەی وەڵامەکە لەگەڵ پرسیاری قسەکەر ناگونجێ و پەیوەندی بە بابەتی پرسیارەکەوە نییە، کە بە شێوازی پرسیار وەڵامی قسەکەری داوەتەوە.

**نم٤/ کابرایەکی کورد منداڵێکی هەبوو، شەوێک لەسەر پشت ڕاکشابوو، تەماشای ئاسمانی ئەکرد، لە باوکی پرسی: باوە ئەو خەتە سپیە چییە بە ئاسمانەوە؟ باوکیشی وتی: ڕۆڵە! ئەوە ڕێی کاکێشانە. کوتوپڕ کوڕە لە پڕ ڕاست بۆوە وتی: "ئای بە خوا بابە! پووشێک لە کایەکەی ئاسمان کەوتە خوارەوە چووە چاومەوە" و دەستی کرد بە گریان.**

ئەگەر سەیری ئەم نموونەیە بکەین دەبینین، کە پرسیاری قسەکەر و وەڵامی گوێگر گونجان و پەیوەندییەک لەنێوانیاندا هەیە، بەڵام دوای وەڵامدانەوەی پرسیارەکە، کاردانەوەی کەسی یەکەم، کە پرسیارەکەی خستبووە ڕوو، هیچ پەیوەندییەک و گونجانێک لەنێوانیاندا نییە، بەوەی دەڵێ (**پووشێک لە کایەکەی ئاسمان کەوتە چاومەوە**)، چونکە ئەمە دوورە لە ڕاستی و بێ بەڵگەیە، بەمەش لادان لە بنەمایەکی تری هاریکاری لێکەوتۆتەوە، ئەویش لادان لە بنەمای چۆنیەتییە.

**نم٥/ کابرایەکی کورد جارێک چێشتی برنج ئەخوا. چێشتەکە زۆر گەرم ئەبێ، هەموو دەم و ددانی ئەسووتێنێ و ئیتر جارێکی تر ناوێری توخنی برنج بکەوێ. ڕۆژێک تووشی کابرایەک ئەبێ گوێدرێژێکی بە بارەوە لە پێشەوەیە، لێی ئەپرسێ: برا باری گوێدرێژەکەت چییە؟ ئەڵێ برنجە. ئەڵێ: "ئای بە قوربانت! لێی بکەوە ئەگینا هەر ئێستە پشتی کەرەکە ئەسووتێنێ".**

بنەمای پەیوەندی کاتێک جێبەجێ دەبێت و پرۆسەی پەیوەندیکردنەکە سەرکەوتوو دەبێت، کە گوتنەکە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبێت و پرسیار و وەڵام لەگەڵ یەکتر گونجاو و پەیوەنددار بن، بەڵام ئەوەی لەم نموونەیەدا بەرچاو دەکەوێت لادانە لە بنەمای پەیوەندی، چونکە باری برنج و سووتانی پشتی گوێدرێژەکە، هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نییە، کاتێک پرسیار دەکات و دەڵێ: **باری گوێدرێژەکەت چییە**، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: **برنج** و پابەندی بنەماکە بووە، بەڵام لێرەدا لادانەکە سەری هەڵداوە، کە دوای بیستنی وەڵامەکە، قسەکەری یەکەم بە شێوازێک قسەی کردووە، کە دەربڕینەکانی لەگەڵ وەڵامی گوێگر ناگونجێ، بەوەی دەڵێ: "**ئای بە قوربانت! لێی بکەوە ئەگینا هەر ئێستە پشتی کەرەکە ئەسووتێنێ**". چونکە وەک دەزانین برنج بەرهەمێکی فێنک و ساردە، تا ئەوەی بکرێتە چێشت، ئینجا گەرم دەبێت.

ئەوەی لەم بنەمایەدا بۆمان ڕوون بۆوە ئەوەیە، کە دەبێ بۆ پابەندبوون بە بنەمای گونجان و پەیوەندی پرسیار و وەڵامی بەشداربووانی ئاخاوتن پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت و پابەندی بنەماکە بن، بەڵام لەم نموونانەی خستمانەڕوو، هیچ گونجانێک لەنێوان ئاخێوەران نەبوو، هەر ئەمەش وایکردووە لادان لە بنەمای پەیوەندیی گونجان بێتە کایەوە، ئینجا ئەویش لەبەر هەر هۆکارێک بێت.

**٣ـ٤: لادان لە بنەمای شێواز لە(کتێبی ڕشتەی مرواری)**

**نم١/ جارێک مەولەوی لە شاری سنە لە کۆڕێکا دائەنیشێ. لێی ئەپرسن ئەڵێن: تۆ هەر ئەڵێی هۆزەکەم خۆشیان ئەوێم، بە گەورەم دائەنێن، بەچیيا پیشانی ئەدەی کە ڕاست ئەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: خۆ ئەگەر هیچ نەگێڕمەوە ئەوە بۆ من بەسە کە هەورامییەک بارێکی ئێجگار گران لە کەرەکەی ئەنێ و ئەیەوێ بەسەر کێوی (ئارێزدا) سەری خا و کەرە مان ئەکا و ناڕوا. پێی ئەڵێ: "هەچە دەی هەچە! بە خوا ئەگەر مەولەویش بیت هەر سەرت ئەخەم".**

ئەگەر سەرنج لە دەقی نموونەکە بدەین، دەبینین لادان لە بنەمای شێوازی بەئاسانی تێدا دەرکەوتووە، کە لە دوو لایەنەوە بەرچاو دەکەوێت، یەکێکیان

پەیوەندی بە درێژدادڕییەوە هەیە، کە زۆر بەدرێژی وەڵامی قسەکەری یەکەمی داوەتەوە، یەکێکیش لە بنەما وردەکانی شێواز ئەوەیە، کە بە پوخت و کورتی گوتەکان دەرببڕدرێن، بەڵام لێرەدا لادان لەم بنەمایە هاتۆتە کایەوە. لەلایەکی تر لادانەکە پەیوەندی بە لێڵییەوە هەیە، کە بە شێوەیەکی لێڵ و تەمومژاوی قسەی کردووە، بۆ تێگەیشتن ئاسان نییە، بەوەی دەڵێ (**خۆ ئەگەر هیچ نەگێڕمەوە، ئەوە بۆ من بەسە، کە هەورامییەک بارێکی ئێجگار گران لە کەرەکەی ئەنێ و ئەیەوێ بەسەر کێوی (ئارێزدا) سەری خا و کەرە مان ئەکا و ناڕوا. پێی ئەڵێ: "هەچە دەی هەچە! بە خوا ئەگەر مەولەویش بیت هەر سەرت ئەخەم**)، کە هەم بە شێوەیەکی لێڵ و هەم درێژدادڕی لە وەڵامەکەدا کردووە.

**نم٢/ کابرایەک لە سنە هەبوو (مەولوو)ی ناو بوو. کابرایەکی قسە قوت و گاڵتەچی بوو ماڵ کاولە ئەوەندە زل و ناکوڵۆکاریش بوو ئەتوت تاوێرە، کەچی کوڕێکی هەبوو ئەوەندە بچووک بوو، هەروەخت کە لەگەڵیا ئەڕۆیشت ئەتوت هێلکەیە بە شوێنیەوە. لێیان ئەپرسی: (مەولوو) ئەمە کوڕی خۆتە؟ ئەیوت: "من نازانم دایکی ئەزانێ".**

لەم نموونەیەدا لادان لە بنەمای شێواز دروست بووە، چونکە پرسیاری لەم جۆرە بە بەڵێ یان نەخێر وەڵام دەدرێتەوە، بەڵام ئەوەی لەم دەقەدا بەدی دەکرێت، بەتایبەتی کاتێک وەڵامی پرسیارەکە بەم شێوەیە دەداتەوە (**من نازانم دایکی ئەزانێ**). ڕستەیەکی لێڵە و وەڵامی پرسیارەکەی تێدا بە دروستی نەدراوەتەوە، کە چەند واتایەکی تر لەخۆ دەگرێت، بەمەش بۆتە لادان لەم بنەمایە.

**نم٣/ ژنێکی هەورامی هەبوو ئاتەی ناو بوو، هاتە سەر و کاری مردن و گیانەڵا، کوڕێکی مەلای هەبوو چووە سەری و دەستی کرد بە ئامۆژگاریکردنی و پێی وت دایە ئاگات لە خوا بێ. دایکەش پێی وت: ڕۆڵە! من حەدم چێشەن ئاگام جەوی بۆ، پاسە ئای ئاگاش جە من بۆ!.**

لەم نموونەیەدا دەستەواژەی (**ئاگات لە خوا بێ**) فرەواتایی دروستکردووە، چونکە واتای جیاواز لەخۆ دەگرێت، لەوانە خوات لەبیر بێت، یان ئەوەتە مەبەستی

ئەوە بێت ئاگادار بوون لە خوا، هەر لەبەر ئەمەیە، کە بۆتە هۆی لادان لە بنەمای شێواز و بە شێوەیەکی پوخت و بێ تەمومژی گوتنەکەی دەرنەبڕیوە.

**نم٤/ بەکراغای مەنگوڕ هەبوو، چەتیوێک لەماڵیان ئەبێ، مارەی ئەکا و لەم چەتیوە کوڕێکی ئەبێ. ڕۆژێک لە کوڕەکە تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: بەچکە کارەکەر. کوڕەکەش پێی ئەڵێ: "بابە! دایکم خانزادەتر بووە، بە ئاغە نەبێ ڕازی نەبووە!".**

لادان لە بنەمای شێواز ڕوویداوە، چونکە یەکێ لە بەشداربووانی ئاخاوتن بە شێوەیەکی ناڕوون و لێڵ قسەی کردووە، ئەویش کاردانەوە و وەڵامدانەوەی کوڕەکەیە بۆ باوکی و بەرگریکردنە لە دایکی، کە بەم شێوە ناڕوونە دەڵێت: (**بابە! دایکم خانزادەتر بووە، بە ئاغە نەبێ ڕازی نەبووە!**). ڕەنگە لێرەدا مەبەستی کوڕەکە لەوەدا بێت، کە دایکی هێندە شایستە و لەبار بووە، کە جگە لە کوڕە ئاغا شایەن بە کەسی تر نەبووە، بەڵام ڕۆژگار بەم ڕۆژەی گەیاند بێ و بووبێتە کارەکەری ماڵی ئاغا.

**نم٥/ کابرایەکی کورد برایەکی هەبوو، براکەی مرد. خەڵک و خوا کۆبوونەوە چوون ناشتیان، ئەو لەو وەختەدا خۆی دزییەوە، نەچوو بۆ ناشتنەکەی، پاشان پێیان وت، بۆ چ نەچوویت تەرمی براکەت بنێژی؟ وتی: "برا بۆ چ من شێت بووم بچم؟ برا جوانەمەرگەکەم لەگەڵ تەرمەکەی خلەی ئامۆزاما چوو بۆ گۆڕستان ناشتی، ئیزرائیل چاوی پێکەوت، کەوتەوە بیری. هات گیانی ئەویشی کێشا. ئێستە منیش بچم بخەمەوە بیری، ئیزرائیل بێت گیانی منیش بکێشێ؟ با هەر تۆی وە دەوەوە بتلێتەوە منی بەرچاو نەکەوێ!".**

یەکێ لە یاسا و بنەما وردەکانی بنەمای شێواز، کورتی و پوختییە لە پەیوەندیکردندا، بەڵام ئەوەی لەم نموونەیەدا دێتە بەرچاو، پێچەوانەی ئەم بنەمایەیە، کە چەندین ڕستە بەدوای یەکدا ڕیزکراون و زانیاریی زیادەن و لە وەڵامدانەوەی گوێگر بەرانبەر بە پرسیارەکە درێژدادڕی تێدا کراوە، کە تێگەیشتن لە وەڵامەکە و جەختکردنە سەر وەڵامەکە، تێڕامانێکی وردی پێویستە، تا لە مەبەستی قسەکەری دووەم دەگەی، کە ئەمەش بۆتە هۆی لادان لە بنەمای شێواز.

لەم نموونانەی لەسەر بنەمای شێواز خستمانە ڕوو، بەگشتی لادان لە بنەما وردەکانی شێوازی بەئاسانی تێدا بەدی دەکرێ، لە ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی نموونەکان بۆمان دەرکەوت، کە لە کام بنەمایە لادراوە و پابەند نەبوون بە بنەماکە دەرکەوتووە، کە یاساکانی ئەم بنەمایە کورتی و پوختی لە دەربڕینە، ئەمەش لە نموونەکان بەدی نەدەکرا، یان لێڵی و تەمومژی لە دەربڕیندایە، ئەم بنەمایەش لە یەک دوو نموونەدا بەرچاوکەوت، لەم نموونانەی ئێمە هەڵمانبژاردوون بۆ لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ دەیان نموونەی تر لە کتێبەکەدا لادان لەم بنەمایانەیان تێدا بەرچاو دەکەوێت.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

١.لادان لە بنەمای هاریکاری هەموو کات نابێتە هۆی پچڕان و لاوازی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا، بەڵکو زۆرجار شێوازێکی کارتێکەر و سەرنج ڕاکێش دەهێنێتە ئاراوە.

٢.ئامانجی ئاخاوتن بە بنەمای هاریکارییەوە بەندە، جێبەجێکردن و نەکردنی ئەم بنەمایانە ئامانج و ئاڕاستەی ئاخاوتنەکان دیاری دەکەن، بۆیە پابەندبوون و پێشێلنەکردنی بنەماکان پرۆسەی ئاخاوتنەکە سەرکەوتووتر دەکات ئامانجەکەی دەدات بەدەستەوە، چونکە لە ئاخاوتنی رۆژانەدا لادان لە بنەمای هاریکاری زۆر ڕێی پێ نادرێت و کاریگەری دەبێت لەسەر پەیوەندییەکە.

٣.زۆرترین ژمارەی لادان لە بنەماکاندا، لە بنەمای چۆنیەتی و شێوازدا بوو، هەر لەبەرئەوەی نموونەکانی نێو پەرتوکەکە چیرۆک و بەسەرهاتەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکە، بۆیە بەمەبەستی جۆراوجۆر لە بنەماکانی هاریکاری لایانداوە.

## سەرچاوەکان

### یەکەم: بە زمانی کوردی

١ـ بەدرخان سلێمان عەلی (٢٠١٥)، لێکەوتەی ئاخاوتەیی لە ڕۆمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی، فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتییەکان.

٢ـ پەروەر عبدالرحمن صالح (٢٠١٣)، هەندێ لایەنی کۆمەڵایەتی پراگماتیک (زمانی بواری پزیشکی بە نموونە)، نامەی ماستەر، زانکۆی سەڵاحەددین، کۆلێژی زمان.

٣ـ جۆرج یوڵ (٢٠١٦)، مەبەستناسی (پراگماتیک)، و: ڕەحیم سورخی، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم، سلێمانی.

٤ـ حاتم ولیام محمد ـ ژیان عبدالله محمد (٢٠١٥)، پێکهێنانی زانیاری و کردە قسەییەکان، گۆڤاری زانکۆ، بەرگی ١٩، ژمارە (٤).

٥ـ دارا حمید محمد (٢٠١٢)، شیکاری ڕستەی ئاڵۆز لە ڕوانگەی پراگماتیکەوە، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی، فاکەڵتی پەروەردە.

٦ـ سروە فیصل عزیز (٢٠١٠)، بنەمای هاریکاری لە چوارچێوەی نواندنی کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی پەروەردە، هەولێر.

٧ـ شێرزاد سەبری عەلی (٢٠١٤)، پراگماتیک، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.

٨ـ عبدالسلام نجم الدین ـ شێرزاد سەبری عەلی (٢٠١١)، زمانڤانیا تیۆری، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی یەکەم، هەولێر.

٩ـ عبدالواحید مشیر دزەیی (٢٠١٤)، زانستی پراگماتیک، ناوەندی ئاوێر، چاپی دووەم، هەولێر.

١٠ـ عومەر مەحمود کەریم (٢٠٠٩)، سیمای پراگماتیک و سیمانتیکی گریمانە پێشەکییەکان، نامەی دکتۆرا، زانکۆی کۆیە، کۆلێژی زمان.

١١ـ محمد معروف فتاح (٢٠١٠)، لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، کۆکردنەوەی: شێروان حسێن خۆشناو ـ شێروان میرزا قادر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، هەولێر.

١٢ـ ـــــــــــــــ (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی سێیەم، هەولێر.

١٣ـ هێرش چەتۆ حسێن (٢٠١٦)، شیکردنەوەی نوکتەی کوردی بەپێی بنەمای هاریکاری، نامەی ماستەر، زانکۆی سۆران، فاکەڵتی ئاداب.

دووەم: بە زمانی عەرەبی

١٤ـ عادل الفاخوري (١٩٨٩)، الأقتضاء في التداول اللساني، عالم الفكر، مجلة العشرون، العدد الثالث.

١٥ـ على محمود حجي الصراف (٢٠١٠)، في البراجماتية: الافعال الانجازية في العربية المعاصرة، الطبعة الاولى، مكتبة الاداب، القاهرة.

**سێیەم: بە زمانی فارسی**

١٦ـ نگار مؤمنی دانشجوی بهار (١٣٨٩)، زبان شناسی قانونی: بردس شهادت در دادگاه با توجه به ویژگی های زبانی، کانگاه، دور دوم، سال سوم، شماره ١٠، pdf.

**چوارەم: بە زمانی ئینگلیزی**

17- Geoffrey Finch (2000), Linguistic Terms and Concepts.

18- George Yule (2000), Pragmatics, Oxford University Press.

19- Grice, H.P (1987), Studies in the way of words, Harvard University Press, Cambridge Massachuse H, London.

20- Grice H.P (1991), Logic and Conversation, in Bavis S. Pragmatics A reader, Oxford University Press.

## ملخص البحث

## الانزياح عن مبدأ التعاون كتاب " ڕشتەی مرواری" أنموذجا

١ـ عنوان البحث:

الانزياح عن مبدأ التعاون " كتاب ڕشتەی مرواری أنموذجا"، دراسة دلالية يأخذ نماذجها من نصوص كتاب " ڕشتەی مرواری " و تحللها وفق نظرية مبدأ التعاون كما تحاول اختيار أحسن مثال منسجم مع محتوى الموضوع، و إظهار المبادىء الدقيقة في النصوص المكتوبة .

٢ـ حدود البحث ومنهجه

يحلل هذا البحث النماذج المقتبسة من الكتاب المذكور على المستوى الدلالي وفق مبدأ التعاون لدى (غرايس). وقد حدد الباحثون إطار عملهم عن طريق التركيز على نماذج من كتاب "ڕشتەی مرواری" والاعتماد على (المنهج الوصفي التحليلي).

٣ـ سبب اختيار الموضوع

الدافع الرئيس لاختيار هذا الموضوع تأثير العلاقة المتبادلة بين المتكلم والمتلقي، ولاسيما في مبدأ التعاون الذي له وقع كبير على نجاح عملية التواصل عند مراعاة المبادىء بين أفراد المجتمع، لأن اللغة نشاط اجتماعي يهدف إلى إقامة علاقة تعاون بين المشاركين في الخطاب .

٤ـ مشكلة البحث

تتمثل مشكلة البحث في أن مؤلف الكتاب خرق أكثر من مبدأ في كل نص من نصوص كتابه، فقد كان من الصعوبة بمكان الحصول على مثال حدث فيه الانزياح عن مبدأ واحد.

٥ـ محتوى البحث

يتكون محتوى هذا البحث من مقدمة و ثلاثة مباحث وخاتمة.

خصص المبحث الأول للجانب النظري، وتم الحديث فيه عن مبادىء التعاون عند (بول غرايس) مثل: (مبدأ الكمية، مبدأ الكيفية، مبدأ التواصل و مبدأ الأسلوب) مع الاستشهاد بالأمثلة لكل مبدأ . أما المبحث الثاني، فهو يتناول الانزياح عن مبادئ التعاون عند (غرايس) مع ذكر نماذج لكل واحد من (مبدأ الكمية) و (مبدأ الكيفية) اللذين تتولد عنهما انزياحات أخرى مثل: (التورية و السخرية، الاستعارة، الإشارة، الغلو والاختصار). كما يتناول (مبدأ التواصل) و(مبدأ الأسلوب)، مع توضيحات ضرورية عنهما. و أما المبحث الثالث، فهو يتكون من الجانب التطبيقي للدراسة، ويتحدث عن الانزياحات التي حدثت عن مبدأ التعاون، و ذلك بالاعتماد على النماذج المأخوذة من كتاب "ڕشتەی مرواری" وتحليلها .

وتم تخصيص الخاتمة للنتائج التي توصل إليها الباحثون، مع ثبت المصادر و المراجع وملخص الدراسة باللغتين العربية والانجليزية.

## Abstract

### Violation of the Principle of Cooperation
### "The Book of Rishaty Mrwari as an Example"

1-The Title of the Paper

The paper is entitle Violation of the Principle of Cooperation in the "The Book of Rishaty Mirwari as an Example". It is a pragmatic study, which focuses on the best texts of this book to illustrate them based on the principles of cooperation. This study is an attempt to show the basic principles of cooperation in the written texts.

2-The Scope and Hypothesis of the Study

The research is conducted according to the pragmatic level. The examples are illustrates based on the Grice's principles of cooperation. The scope of the study is limited to only of the examples taken from this book ( Rishaty Mirwari). The research paper is conducted within descriptive analysis method.

3-The Purpose of the Study

One reason of choosing this topic for the study is the effect of the relation exists between speaker and listener, particularly within the principles of cooperation as through practicing these principles among individuals of community, it is very powerful in the success of this relation. So language is a social activity for the sake of cooperation among individuals, communication takes place.

4- The Problem of the Study

The paper is an attempt to a pragmatic analysis of some written texts in the book of Rishatay Mirwari according to the principles of cooperation. The problem was in the violations of the principles of cooperation in that each written text was violated by more than one principle; it is very difficult to find an example where there is only one violation of the principles.

5- The Content of the Study

The content of the study besides of the introduction and conclusions is comprised of three sections:

The first section is devoted to theoretical part, focuses on the Paul Grice's cooperative principles. It also mentions the main principles of cooperation such as maxims of quantity; maxims of quality, maxims of manner, and maxims of relevance with examples are provided for each of them.

The second section is also a theoretical part pays attention to the violations of Grice's cooperative principles with the illustrations of examples in maxims of quantity and quality. This includes some violations like (mocking, satire, pointing, exaggeration, over briefing) as well as the maxims of manner and relevance with necessary explanations about each of them.

The third section deals with the practical issues of the study. This part is about the violations of cooperative principles based on analyzing examples taken from the book of Rishtay Mirwari.

Finally, the conclusions, list of references, and the abstract are introduced in English and Arabic.

# زمانێ کوردی و
# هەبوونا زار و دەڤۆکێن جودا جودا
## (دەڤۆکێن دەڤەرا ئاکرێ وەکو نموونە)

**م. هـ. ئاشتی حەجی حەسن** **م. هـ. بەدرەدین عەبدولکەریم قادر**
پشکا زمانێ کوردیا/ کۆلێژا پەروەردە/ئاکرێ
زانکۆی دهۆك

**پێشەکی:**
ئەڤ ڤەکۆلینە ل ژێر ناڤێ (زمانێ کوردی و دەڤۆکێن جودا جودا – دەڤۆکێن دەڤەرا ئاکرێ وەکو نموونە- ) دویڤ رێبازا (وەسفی - شیکاری) هاتیە ئەنجامدان و ئارمانج ژێ دانەنیاسین و دیارکرنا لایەنێن جیاواز و تایبەتمەندیێن ئەڤان دەڤۆکایە، شێوەیەکێ گشتی ڤەکۆلینا مە ژ بلی ئەنجام و لیستا ژێدەران ل دوو پشکان پێکهاتییە، ل پشکا ئێکێدا، باس ل زمان و دیالێکت و دیالێکتێن کوردی ب گشتی و کرمانجییا ژووری و شێوەزارێ بادینی نەخاسمە دەڤۆکا ئاکرێ هاتییەکرن و پشکا دووێ ژی هاتییە تەرخانکرن بۆ دانەنیاسین و باسکرنا دەڤۆکێن دەڤەرا ئاکرێ، کو ژ دەڤۆکێن (ئاکرەیی، زێباری، سوورچی و هەرکی) پێکهاتینە و هەول هاتییەدان ب کۆرتی و پۆختی چەند نموونەیەك د ئاستێن جیاوازێن زمانیدا ل ئەڤان دەڤۆکان بهێنە وەرگرتن و نیشاندان. پەیڤێن سەرەکی (دەڤۆک، ئاستێن زمانی، زار)

# پشکا ئێکێ

**زمان:**

زمان گرنگترین ئامرازە بۆ بڕێڤەبرنا ژیانا مروڤان، هەروەسان هۆکارە بۆ پتر خورتکرنا پەیوەندییان د ناڤبەرا گەلاندا، ڕێکەکا ئاساییکرنێیە بۆ ژیارا مروڤان، " زمان ڕۆلێکی گرنگ لەژیانی مروڤ دەگێڕێ بەردی بناغەی کومەڵە" (دزەیی، ٢٠١١: ١٥). هەروەسا "زمان داینەمۆیەکە خاوەن ڕووداو و سەلماندنە، واتاکانی سەرکەوتووە، شێوەی پەیوەندی بەڕادەی وشەکانی و ڕەگ و ڕیشەی وەستاوە و قەوارە و بوونی میللەتان دەگۆڕێت.... زمان ئاوێنەیەکە نەریت و خووڕەوشت و ڕەفتار و کرداری گەلەکەی تێدا دەرئەکەوێ" (زەند، ١٩٧٥: ٤،٦).

و "یەکەم ناوە بۆ ئەو پارچە گۆشتەی کە لەناو دەمدایە و دەستێکی باڵای هەیە لەدروستکردنی دەربڕین و ئەو ترپانەی (النبرة) پیتەکان دروشمی ئەون. دووەم: ناوە بۆ ئەو ئاخاوتنەوەی کە لە نەتەوەیەکدا باوە و ئەو نەتەوەیە بەهۆی ئەو ئاخاوتنەوە کەلە یەك تێدەگەن" (خەیات، ٢٠١١: ١١).

زمان ل دیف ئەوێ قوناغا ژیانا مروڤایەتیێ تێدا دەربازبوویە، گوهۆڕین ب سەر زمانیدا هاتینە و هێدی هێدی بەرەڤ پێش چوویە و پەیڤێن نوی ژ دایکبووینە، ژبەر زێدەبوونا هژمارا مروڤان و بەلاڤبوونا وان ل سەر روویێ ئەردی. هەر ل دەسپێکا پەیدابوونا ژیانا مروڤایەتیێ زمان ئالاڤەکێ گرنگ بوو، کو بهێتە هەبوونێ، هەروەکی گەلەك زانا زمانی ب دیارییا خودایێ مەزن بۆ مروڤایەتییێ د هژمێرن.

چەند پێناسەیەك دەربارەی زمانی ژلایێ زانایێن زمانیڤە:

- (ابن جنی) و (ابن فاس) دبێژن: "زمان دەنگە، هەر جڤاکەك ب ڕێکا خۆ ئەوان دەنگان دەربڕینێ ژ ئارەزوویێن خۆ دکەت" (سالح، ٢٠١١: ١٠).

- (مارتنێت دبێژیت: " زمان هۆیەکە بۆ لەیەکتر گەیشتن، لە چەند دانەیێکی بچووك پەیدادەبێ ئەو دانانەش خاوەنی واتای خۆیانن" (ناوخۆش، خۆشناو،٢٠١٠ :١٤٣).

زمانێ کوردی ئێك ژ زمانێن هند و ئەورووپی، سەر ب کومەلا خێزانا زمانێن ئیرانییە، ئەڤ زمانە ژ چەندین دیالێکتێن سەرەکی پێکهاتیە و هەر دیالێکتەك ژی دابەشی سەر چەندین شێوە دیالێکتان دبیت و هەر شێوە دیالێکتەك ژی دابەشی سەر

چەندین دەڤوکان دبیت و دیسان دەڤوك ژی چەند هۆز یان تیرە و گوند و دەڤەران بخوڤە دگریت. ئەگەر ل سەر دەڤوکەکێ راوەستین و لێکۆلینێ ل سەر بکەین دێ بینین، کو چەندین جوداهی د هۆزەکێ بۆ هۆزەکێ یان گوندەکێ بۆ گوندەکێ یان تیرەکێ بۆ تیرەکێ دهێنە دیتن، ئەڤەژی دبیتە ئەگەرێ هندێ کو زمان دیاردەکا زۆرا ئالوز بیت، و دیسان بەردەوام دهێتە گوهۆڕین، ئەڤەژی ژبەر ئەگەرێن: سرۆشتی، جڤاکی، سیاسی، بازرگانی...هتد.

ل گەل بەلاڤبوونا زمانی ل ناوچە و دەڤەرێن جوداجودادا و ب هەبوونا هندەك هۆکارێن تایبەت زمان دهێتەگوهۆڕین و دبیتە ئەگەرێ هندێ، کو هندەك شێوێن جودا جودا ژ زمانی پەیدابین و دبێژنە ئەوان شێوان دیالێکت ( Dialect) مەرەم ژ دیالێکتێ ئەوە، کو " هندەك سیماییێن زمانییێن تایبەتن ب ژینگەهەکا تایبەتڤە و خەلکێ ئەوێ ژینگەهێ د ئەوان سیمایاندا هەڤبەش دبن" (انیس،٢٢: ١٦).

ب شێوەیەکێ گشتی دێ شێین دابەشبوونا زمانی وەکو ئەڤی هەرەمێ ل خوارێ دیاربکەین:

ئەڤجا دێ هێین و ئەڤ دابەشبوونا د ئەڤی هەرەمیدا هاتییە دیارکرن، د ئێك ئێکە ل سەر ڕاوەستین:

زمان: بۆ نموونە زمانێ نەتەوەیی، کو ئەو زمانە هەمی خەلك ل ئێك وەلاتدا بکاردهینن و سنوورێ جوگرافیێ ئەوی وەلاتی هەمیێ بخۆڤە دگریت.

زمانێ کوردی: " کورد سەر بە گوتیەکانن، لە کۆنترین شوێنیشدا ناویان هاتبێ، لە چیای زاگرۆسدایە لە ٣٨٠٠ پ. ز بۆیە پێش ئەوەی شەپۆلە سەرەتاییەکانی یەکانی ئاری بگەنە کوردستان و چیای زاگرۆس، بەزمانی تایبەتی خۆیان دەدوان ... بەرەبەرە کەوتوتە بەر کارتێکردنی وشە و ناوی ئاری، واتە لەگەڵ دەرکەوتنی پێشرەوانی ڕەوی ئارییەکان بۆ چیای زاگرۆس( کوردستانی ئێستا) کارتێکردنی زمانی ئاری لەم زمانەدا بەردەوام بوو هەتا هاتنی میدییەکان کە تێکەڵی گوتییەکان بوون زمان و نەریت و ڕۆشنبیری خۆیانی بەسەریانا سەپاند" (خورشید،١٩٨٣ : ٧٣- ٧٤).

زمانێ کوردی ئێکە ژ زمانێن دێرینێن زیندی و هەتا نووکە زمان و کەلتوور و داب و نەریتێن خۆ پاراستینە، زمانێ کوردی زمانەکێ هندو ئارییە، ئانکو هندو

ئەوروپییە " ئەگەر بێین و تەماشەیەکی نەخشەی زمانە هیند و ئەوروپییەکان و دابەشبوونی جوگرافیای هاوچەرخ بکەین، دەبینین هیند و ئەوروپیی کۆن چەند کومەڵە زمانێکی سەرەکی لێ دروست بووە لێ جیابوونەوە یەکێك لەو کۆمەڵە زمانانە (هیند و ئێرانییە)، کە دەبێتە سێ بەشی گەورە و سەرەکی (دەردی، هیندی، ئێرانی) ئێرانی شەش لقە زمانی دیکەی لێدەبێتەوە کە یەکێکیان زمانی (کوردی)یە، کەواتە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە" (خەیات،٢٠١١ : ١٩- ٢١). هەروەسا جهێ جوگرافیێ زمانێ کوردی ل ناڤ کیشوەرێن دونیایێ "دەکەوێتە ناو کۆمەڵەی زمانە هیندو ئارییەکانەوە، لە بەشی خێزانە زمانی ئێرانیدایە و بەپێی شوێنی جوگرافی قسەکردنی زمانەکانیش لە کیشوەرەکانی دونیادا دەکەوێتە بەشی زمانەکانی کیشوەری ئاسیاوە و لە ناو کۆمەڵەی هیند و ئاریدا لە خێزانی زمانە ئێرانییەکان لە باشووری رۆژئاوای کیشوەری ئاسیادایە" (شوانی، ٢٠٠٨ : ٨٣).

مینۆرسکی دەربارەی زمانێ کوردی دبێژیت: " زمانی کوردی لە زمانە ئێرانییەکانە و لە فارسییەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو زمانێکی سەربەخۆیە و یاسای فۆنەتیکی و سینتاکسی تایبەتی خۆی هەیە، پێوەندی ئەم زمانەش وەك پێوەندیی زمانی ئەدەبی سویسراییە شاخاوییەکان وایە، بەزمانی ئیتالییەوە" (کوردستانی، ١٩٩١ :٨٦) .

**دیالێکتێن زمانێ کوردی:**

دیالێکت ب پشکەك ژ زمانەکێ بۆ نموونە زمانێ نەتەوەیی دهێتە هژمارتن، واتە د چارچۆڤێ زمانەکیدا دیالێکت دروست دبن و زانا و شارەزایێن زمانی، دیالێکت یان زاران ژ چەندین لایانڤە پێناسە دکەن:

- "شێوەی لێدوان و قسەکردنی کۆمەڵە خەڵکێکە لە نەتەوەیەکدا کە ئەم شێوە و لێدوان و قسەکردنەش هەرچەندە تایبەتییەکی دەنگسازی و وشەسازی و رستەسازیی خۆی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا بەشێکە لە زمانی نەتەوەیی ئەو خەڵکە و پەیدابوونیشی دیاردەیەکی سروشتییە" (البصیر، ١٩٨٤: ١٥).

- " دیالێکت شێوەیەکی دیار و جیاکراوەی قسەکردن و ئاخاوتنە، لە چوارچێوەی یەك زماندا، کە قسەکەرانی ناوچەیەك جیادەکاتەوە... زۆر سیما و خاسێتی جیاکەرەوەی لە چینەکانی دی هەیە". (میراودەلی، ٢٠٠٧: ٤٥).

-"بریتییە لە شێوەیەکی زمانی و بە ناویەکدا چوو و لە زمانی ستاندارد جیاوازە و سیستەمی فۆنۆلوجی و وشەیی و فەرهەنگی و یاسایی و سینتاکسیی تایبەت بە خۆی هەیە " (ئەحمەد، ٢٠١١: ٢٣ – ٢٤).

کەواتە زانایان دیالێکت دبوارێن جودا جودادا و ل دویڤ سروشتێ دروستبوونا دیالێکتان دایە نیاسین .

دیارکرنا دیالێکت و بەشە دیالێکتێن زمانێ کوردی کارەکێ ئاسان نابیت، هەرچەندە زۆر ڤەکولین دەربارەی ئەڤی بابەتی هاتینە ئەنجامدان، لێ زوربەیا ئەوان زانستی نەبووینە، "لێکۆڵینەوەی زۆر و هەمەجۆر لەبارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی ئەنجام دراوە، روژهەلاتناس و زمانەوانە خۆماڵییەکان گرنگیی زۆریان بە دیالێکتی زمانی کوردی داوە" ( هەمان ژێدەر، ٢٠١١: ٦٨).

بەلێ ئەڤە ئەوێ چەندێ ناگەهینیت، کو دیالێکت و بەشە دیالێکتێن زمانێ کوردی ب تەمامی هاتینە دیارکرن، ژبەرکو ئەو دابەشکرنێن بۆ هاتینە ئەنجامدان زۆر کەموکوری د ناڤدا هەنە " لێکۆڵەران بۆ هەر دیالێکتێك زیاتر لەناوێکیان بەکار هێناوە، یان بەشە دیالێکتێکی لەسەر کۆمەڵە دیالێکتێك داناوە.... بەزۆری لە دەستنیشانکردنی سنووری جوگرافی بڵاوبوونەوەی دیالێکتەکان سەرکەوتوو نەبوونە، تەنیا ئەو دیالێکتانە نەبێت کە خودی لێکۆڵەر بەکارهێنەری بووە، هەروەها پشتیان بە داتا و داردە و کەرەستەی زمانی و سیمای جیاکەرەوەی زمانی نێوان دیالێکتەکان نەبەستووە" ( هەمان ژێدەر ، ٢٠١١: ٧٢- ٧٣).

دابەشکرنا دیالێکت و بەشە دیالێکتێن کوردی:

**ئێك: فوئاد حەمە خورشید:**

١- کرمانجی باکوور: ( بایەزیدی، هەکاری، بۆتانی، شەمدینانی، بادینانی، دیالێکتی ڕۆژئاوا).

٢-کرمانجی ناوەڕاست: ( موکری، سۆرانی، ئەردەڵانی، سلێمانی، گەرمیانی ).
٣- کرمانجی باشوور: ( لوڕی ڕەسەن، بەختیاری، مامەسەنی، کۆهگلۆ، لەك، کەلهوڕ).
٤-گۆران: ( گۆرانی ڕەسەن، هەورامانی، باجەڵانی، زازا. (خورشید، ٢٠٠٨: ٤١).

**دوو: جەمال نەبەز:**

**أ- دوو شێوە بنچینەییەکە:**

١-کرمانجی ژووروو: ( بۆتانی ، جزیرەیی، هەکاری، بادینانی، ئاشیتەیی، بایەزیدی).

٢-کرمانجی نێوەڕاست: ( سلێمانی، سنەیی، ئەردەڵانی، گەرمیانی، هەولێر، کەرکووکی، سۆرانی، موکری، شارباژێڕی، پشدەری).

**ب- دوو شێوە لاتەنیشتەکە:**

١-کرمانجی خواروو: (ژێروو): ( فەیلی، کرماشانی، لەکی، کەلهوڕی، خانەقینی، لوڕی).

٢-کۆمەڵە شێوەی گۆرانی – زازایی ( گۆران، زازایی، هەورامانی). ( نەبەز، ١٩٧٦: ٢٢-٢٣).

**سێ: عەبدولمەناف رەمەزان ئەحمەد:**

**یەکەم/ گرووپی دیالێکتی کوردی باکور:**

**ئەم بەشە دیالێکتانە لە خۆ دەگرێت:**

**أ- بەشە دیالێکتەکانی کوردی باکوری رۆژهەڵات، کە بریتین لە:**

١-ناوچەکانی: ( خوراسان، ئورمیە، سەلماس، خوێی، ناوچەی نیشتەجێبوونی شکاك و هەرکییەکان).

٢-ناوچە کوردنشینەکانی: ئەرمینیا، جۆرجیا، قیرغزستان، کازاخستان، ئازەربێجان، ئەفغانستان و چیچان.

**ب- بەشە دیالێکتەکانی کوردی باکوری ناوەڕاست :**

بریتین لە: بۆتانی، بادینی، هەکاری، بایەزیدی، شەمزینی.

ج- بەشە دیالێکتەکانی کوردی باکوری رۆژئاوایی:

بریتین لە: حەلەب، عەفرین، قامیشلو، کوردەکانی نیشتەجێی لوبنان (دورزییەکان) و ناوچەکانی باکوری رۆژئاوایی مووسڵ یان ( رۆژئاوای رووباری دیجلە)، وەکو شەنگال و زمار و تەلەعفەر.

**دووەم/ گرووپی دیالێکتی کوردی ناوەڕاست:**

ئەم بەشە دیالێکتانە لە خۆ دەگرێت:

أ- بەشە دیالێکتەکانی کوردی ناوەڕاستی رۆژهەڵاتی، بریتین لە: سنە، موکریانی، ئەردەڵان و مەهاباد.

ب- بەشە دیالێکتەکانی کوردی ناوەڕاستی رۆژئاوایی، بریتین لە: هەولێر، رەواندوز، کەرکوك و سلێمانی.

**سێیەم/ گرووپی دیالێکتی کوردی باشوور :**

ئەم بەشە دیالێکتانە لە خۆ دەگرێت :

أ- بەشە دیالێکتەکانی کوردی باشووری رۆژهەڵاتی، بریتین لە: لوڕستانی بچووك، لوڕستانی گەورە، بەختیاری، لەکی، کوڵیایی، کەلهوڕی، کرمانشان و ئیلام.

ب- بەشە دیالێکتەکانی کوردی باشووری رۆژئاوایی، بریتین لە: هەورامی، فەیلی، باجەڵانی و شەبەك، زەنگنە، شوانی کیشك و ناوکوڕی.

**چوارەم/ گرووپی دیالێکتی کوردی زازایی :**

دابەشی سەر سێ ناوچەی جیاواز دەبن، بریتین لە: ناوچەکانی دێرسم و ئەلازیز و بینگول (ئەحمەد، ٢٠١١: ٧٦- ٧٨).

**دیالێکتا کرمانجییا ژووری:**

ئەڤ دیالێکتە ژ هەمی دیالێکتێن کوردییێن دی بەرفرەهتر و زۆرترە و ل چەند وەڵاتان دابەشبووینە، "ئەم زارە کوردەکانی ژووروە واتە هەموو کوردەکانی سوریە و

له توركيا و بادينان و كوردەكانی یەكێتی سۆڤێت و هێندێ له كوردەكانی عيراق و ئێران قسەی پێ دەكەن و ئەم بەشانە دەگرێتەوە: بۆتانی و جەزیرەیی، هەكاری و بادينانی و ئاشێتەیی بایەزیدی" (البصير ،١٩٨٧: ٥).

پرانیا ئەڤێ دیالێکتێ ل وەلاتێ تورکیا ئانکو باکورێ کوردستانێ د نیشتەجێنە، (چونکی کوردێن تورکیا ژ (٢١) پارێزگەهان پێکدهێت: (بایەزید، وان، هەکاریا، سێرت، مووش، ماردین، دیاربەکر، ئەدیامان، مەلاتیە، تونجەلی، ئیلازیغ، بینگول، ئاگری، باتمان، بەدلیس، ئورفە، شەرنەخ، روژهەلاتێ مەرعەش و سێواس و بەشێن باشوورێ پارێزگەهێن ئەرزەروم و قارس) هەمی ب ڤێ دیالێکتێ دئاخڤن. هەروەسا کوردێن باشوورێ روژئاڤایێ ئەرمەنستانێ و باکورێ سوریێ، پشکەك ل کوردێن رۆژهەلات و هەروەسا ئاکنجیێن پارێزگەها دهوکێ و قەزاییێن ئاکرێ و مێرگەسۆرێ و شێخان و شنگالێ ب ڤێ دیالێکتێ دئاخڤن.

ژبەر بەرفرەهیا ئەڤێ دیالێکتێ و ئەگەرێن جوگرافی و سیاسی بوویە ئەگەرێ هندێ کو ئاخفتنکەرێن ئەڤێ دیالێکتێ چەند ناڤەکێن ژێك جودا دەڤەرا خۆ ب ناڤبکەن و ئاماژێ ب چەند بەشە دیالێکتێن کرمانجییا باکور بکەن لێ ئەو ژی نە ل سەر بنەمایەکێ زانستی و ئەو جیاوازیێن هەین ژی ب شێوەیەکێ کێم د ناڤبەرا ئەواندا دیاردبن، کو ئەم دشێین هەر ئێك ژوان بەشە دیالێکتان ل دویڤ مەلبەندێ وێ دیاربکەین، وەکی ل خوارێ دیارکری :

- بایەزیدی: ژ باکور و باکورێ روژهەلاتێ وانێ.

- هەکاری: ژ باشوور و باشوورێ روژئاڤایا دەریاچا وانێ.

- بۆتانی: ل دەوروبەرێ دولا بۆتان ل باشوورێ دەریاچا وانێ، و شارێ سێرتێ و ئەرتووش و جزیرە و دیاربەکر (ئامەد).

- شەمدینانی: باشوورێ روژهەلاتا تورکیا و روژئاڤایا دەریاچا ئورمیێ، و ناوچەیێن نزیك ب ئەوێ ژی کو دکەڤنە د ناڤ سنوورێ ئیرانێدا.

-بادینانی: ل پارێزگەها دهوکێ قەزاییێن ئاکرێ و ئامێدیێ و شێخان و شنگال.

- دیالێکتا روژئاڤا: خەربوت (ئەلئەزیز) ئورفە و عەفرین ب خوڤە دگریت (خورشید، ٢٠٠٨: ٥٣).

ژ لایەکێ دیڤە محەمەدی مەحویی د (مەنامە)یا خودا ب ئەڤی شێوەی دیالێکتا ژووری ددەتە نیاسین: " (أ) کرمانجی سەروو، لە سەرووی کوردستان (لە تورکیا) لە رۆژاوای کوردستان (لە رۆژهەلاتی سوریا) و هەندێك بەشی رۆژهەلاتی کوردستان (ئێران) و قەفقاز قسەی پێدەکرێت، (ب) بادینی لە خوارووی کوردستان (سەرووی عێراق)، لە دەوروبەری زاخۆ، دهۆك، ئامێدی و هەندێك ناوچەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران قسەکەری هەیە" (مەحویی، ٢٠١٦: ٤٠).

**شێوە دیالێکتا بادینی :**

شێوە دیالێکت یان بن زار واتە دیالێکتەکێ د ناڤ خۆدا چەند شێوەیەکێن دی هەبن، د سنوورێ ئێك دیالێکتدا شێوە زار و دەڤۆك ژی هەبن، شێوە دیالێکت " ئەو زمانەیە، کە شێوەزارێکی تایبەتی پێ دەناسرێت، لە رێگەی قسەپێکەرانییەوە پێ دەناسرێت، یان ئەوەیە زمانی کەسێك دەلالەت دەکاتە سەر شێوەزارە جوگرافیەکەی و ئاستە رۆشنبیرییەکەی"(سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو،٢٠١١: ١٠٧).

شێوە دیالێکتا بادینی بەشەکە ژ دیالێکتا کرمانجییا ژووری، کو ب شێوەیەکێ گشتی پارێزگەها دهوکێ ل باشوورێ کوردستانێ دگریتەڤە ئانکو دەڤەرا بادینان، ژ لایێ جوگرافیڤە دکەڤیتە باکورێ روژئاڤایێ عێراقێ، واتە ئاکنجیێن سنوورێ ناڤەندا باژێری و دەوروبەرێن پارێزگەها دهوکێ ژی ب ئەڤی شێوە دیالێکتێ دئاخڤن.

**دەڤوکا دەڤەرا ئاکرێ :**

ژلایێ مێژوویێڤە "ئاکرێ شارەکێ گەلەگ کەڤنارە ژلایێ فەرماندارەکێ زەرەدەشتی هاتیە دروست کرن، کو بناڤێ (زەند) بووە ل سەدێ حەفتێ بەری زایینی، ناڤێ ئاکرێ ب رامانا (ئاگرێ ) یان (ئاگر ) دهێت" (بەرزنجی، ٢٠٠٤: ٨) هەروەسا ژ لایێ جوگرافیڤە "دکەڤیتە باشوورێ کوردستانێ و دهێتە ناسکرن ب دەرگەهێ بادینان، دکەڤیتە ناڤبەرا پارێزگەهێن (هەولێر و دهوك)ێدا. ل روویێ ئیداریڤە قەزایە، کو رووبەرەکێ بەرفرەهـ و پان و بەرین هەیە، سێ ناحیان بخوڤە دگریت ( بجیل، گردەسێن و دینارتە).

هەروەسا ژلایێ پێکهاتەیانڤە گەلەك پێکهاتە لێ دژین، کۆ پتری سەدان سالە لێ دژین. پێکهاتێن سەرەکیێن جڤاکا کوردی ل دەڤەرا ئاکرێ ئەڤەنە: ( ئاکرەیی، زێباری، سوورچی و هەرکی ) و زێدەباری گەلەك تیرە و بنەمالێن دیژی.

دەڤۆکا دەڤەرا ئاکرێ ئێکە ژ دەڤۆکێن سەر ب شێوەزارێ بادینیێ کرمانجیا ژووری یا زمانێ کوردی، ژبەرکو دەڤەرا ئاکرێ جهەکێ ستراتیژیە کۆ دبیتە دەرگەهەك بۆ گرێدانا پارێزگەها هەولێر و دهوك، هەر ژ بەر ئەڤێ چەندێ زۆربەیا خەلکێ وێ یێ بەهرەمەندە ب هەردوو دیالێکتێن سۆرانی و کرمانجی و شارەزاییەکا باش د هەردوو دیالێکتاندا هەیە. ئەو زمانێ خەلکێ ئاکرێ پێ دئاخڤن (زمانێ کوردی )یە ب هەردوو دیالێکتێن (سۆرانی و بەهدینی) دئاخڤن. (بەرزنجی ، ٢٠٠٤: ٢٧).

هۆکارێ سەرەکییێ پەیدابوونا دەڤۆکێن دەڤەرا ئاکرێ، هۆکارێ کۆمەلایەتی ئانکۆ جڤاکییە، چونکی ئەڤ دەڤەرە دابەشی سەر چەندین هۆزێن مەزنێن کوردی بوویە و هەر هۆزەکێ ژی جه و وار و ڕەوشت و تیتالێن تایبەت ب خۆ هەنە، لەوا ئەڤە پتر دابەشبوونا جڤاکییە ل سەر چەند هۆز و تیرە و بنەمالەکاندا، هەروەسان (ئەڤ هوکارە ئانکو جڤاکی، تایبەتە ب جوداهیێن خەلکێ جهەکیڤە ژ لایێ داب و نەریت و رەوشت و روشەنبیری و هزرێڤە) (وافی، ١٥٩:١٩٦٢)، دیارە کو روشنبیری و داب و نەریتان ڕەنگڤەدانەکا بەرچاڤ د زمانیدا هەیە، ژبەر هەبوونا هندەك رەوشت و داب و نەریتێن تایبەت، زاراڤێن تایبەت دهێنە د زمانیدا، بۆ نموونە د زمانێ خەلکێ گوند و باژێراندا ئەڤ چەندە دیاردبیت، "باهرا پتر خەلکێ گوندان پێگیریێ ب هندەك داب و نەریتان دکەن نەوەك خەلکێ باژێران، هەروەسا رەوشەنبیری د ناڤ باژێراندا ب ڕادەیەکیە، کو زمانێ ئەوان ژ زمانێ خەلکێ گوندان جودا دکەت" (نەسرین عەبدوڵلا محەمەد تاهر ،٢٠٠٩: ٥).

## پشكا دووێ:

**پێكهاتەیێن جڤاكی یێن دەڤۆكا ئاكرێ :**

دەڤەرا ئاكرێ وەك سنوورێ كارگێری ژ سەنتەرێ قەزایا ئاكرێ و هەرسێ ناحیێن (گردەسێن، دینارتە، بجیل) پێكهاتییە، كۆ د سنوورێ ئەڤان ناحیانژیدا چەندین گوند و كۆمەلگەهـ هەنە، دشیاندایە بێژین دگەل تێكەلبوونا خێزانی و جڤاكی، لێ هەتا رادەیەكێ زۆر پێكهاتێن جڤاكیێن دەڤۆكا ئاكرێ ژی هەر وەكو دابەشبوونا سنوورێ خۆ یێ كارگێری دابەشبووینە سەر چەندین هۆزێن كوردی، ئەو ژی: ( ئاكرەیی ل سەنتەرێ قەزایێ و زێباری ل ناحیا دینارتە و گوندێن دەوروبەرێن وێ و هەركی ل ناحیا گردەسێن و گوندێن دەوروبەرێن وێ و سۆرچی ل ناحیا بجیل و گوندێن دەوروبەرێن ئەوێ ئاكنجیبووینە. ئەڤە سەرەرای پشتی مەزنبوون و بەرفرەهبوونا باژێرێ ئاكرێ ، وەكو سەنتەر د نووكەدا هەمی ئەڤ پێكهاتەیێن جڤاكی ل سەنتەری ژی هەبوونا خۆ هەیە.

ب شێوەكێ گشتی ل سنوورێ دەڤەرا ئاكرێ، چار پێكهاتەیێن سەرەكی یێن جڤاكێ كوردی هەنە، ئەوژی: (ئاكرەیی، زێباری، سۆرچی و هەركی) كۆ د ئەڤێ ڤەكۆلینێدا پتر ل سەر ئەڤان راوەستیاینە و رووناهیا ڤەكۆلینێ ئێخستییە سەر، لێ جهێ ئاماژە پێدانێ‌یە كۆ ژبلی ئەڤان هەرچار هۆزێن مەزن و سەرەكیێن ئاكرێ، هندەك تیرە و لق و هۆزێن دیێن كوردی ژی لێ هەنە، لێ ب رێژەیەكا گەلەك كێمترە، كۆ دبیتن ل سنوورێ گوندەك یان دوو گوندان یا ن سێ گوندان هـەبن، یان ب تێكەلی دگەل هۆزێن دیێن دەڤەرێ دژین وەكو تیرێن (خێل، نەقەبی، كاوانی، مەسیحی ..هتد).

هەرچار پێكهاتەیێن جڤاكیێن دەڤۆكا ئاكرێ واتە: (ئاكرەیی، زێباری، سۆرچی و هەركی) هەرچەندە هەر ئێك ژ ئەڤان ژلایێ دەڤۆكێڤە تایبەتمەندیێن تایبەت ب خۆژی هەنە و ب ئاشكەرا جیاوازیێن زەق د هەمی ئاستێن زمانیدا د ناڤبەرا ئەواندا هەنە، لێ دگەل هندێ ژی گەلەك لایەنێن هەڤپشك و پێكڤەگرێدای ژی هەنە و ب ئەڤان سیماییێن هەڤپشك ژی ژ دەڤەرێن دی دهێنە جوداكرن و ب دەڤۆكێن دەڤەرا ئاكرێ دهێنە نیاسین.

ب شێوەیەكێ گشتی دشێین بێژین، دەڤۆكێن دەڤەرا ئاكرێ ئەڤ تایبەتمەندییە هەنە:

- ئەڤان دەڤۆكان گەلەك تایبەتمەندین تایبەت ب خۆ هەنە.
- د هەمی ئاستێن زمانیدا، تایبەتمەندییا خۆ هەنە.
- هەمیان پەیڤێن تایبەت ب تشت و دەم و جهێن تایبەتڤە هەنە.
- سەرەرای بكارنەئینانا پشكەكا زور یا ئەڤان پەیڤێن تایبەت و ڕەسەن، هەتا نووكەژی پشكەكا زۆر ماینە و دهێنە بكارئینان.
- ئەڤ دەڤۆكە هەر ب ئاوازا دەنگێ ئەوانڤە دهێنە نیاسین.

ل خوارێ دێ هەولدەین هەر ئێك ژ دەڤۆكێن پێكهێنێن دەڤۆكا دەڤەرا ئاكرێ ب جودا بدەینە نیاسین :

**١- ئاكرەیی:**

ئاكرەیی وەك پێكهاتەكا جڤاكییا ڕەسەنا ئاكرێ دهێنە هژمارتن، ژبەركو ئاكنجیبوونا ئەوان یا كەڤنارە ل سەنتەرێ قەزایا ئاكرێ و پتر ب باژێری دهێنە نیاسین، نەكو هۆز یان عەشیرەت و ل چەندین بنەماڵ و بابكان پێكهاتینە.

**- تایبەتمەندیێن دەڤۆكا ئاكرەییان:**

**أ- ئاستێ دەنگی:**

- گوهۆڕینا دەنگەكی ب ئێكێ دی، وەكو:

(ح) بۆ (هـ) : هەفتێ ، هەفت.

(ێ) بۆ (ه) : باژەر

ئامرازێ (ژ) بۆ (ل): ژ ئاكرێ : ل ئاكرێ .

- لادان یان تێبرنا هندەك دەنگان، وەكو:

(ه): جەهـ : جە ، بەرفرەهـ : بەرفرە ، مێهڤان : مێڤان.

-زێدەكرنا دەنگەكی، وەكو:

دەنگێ (ه): ئەڤی مللەتی : ئەڤی مللەتەی. ، ئەڤی كورەی .

**ب- ئاستێ پەیڤێ :** د ئەڤی ئاستیدا، چەندین پەیڤێن تایبەت ب ئەڤێ دەڤۆکێ دبینین، وەکو:

- سوبەترا: سوبە نە دووسبە یان سیزبە
- خن: جوان
- سلال - سلا : بانی
- هیزار: جلکین بویکا
- تەروتەلیش: شل و تەربوون
- مقێمێ: جهە
- طوش : توژی

**ج- ئاستێ رستێ :**

هەلەکا دییش وەرە. (جارەکا دی ژی وەرە)

وێش فرێبدە ناڤ سەلکێدا. (ئەوێ ژی پاڤێژە دناڤ سەلکێدا)

تە ئاگا لێ ئاگا لێیە چ دبێت. (تە ئاگەهـژێ هەیە)

ئەوان بن عنتکر. (ئەوان بەرزەکر)

**د- ئاستێ واتایێ:** سەبارەت ئاستێ واتایێ بێگۆمان دەمێ گوهۆڕین دکەڤنە ئاستێن دیێن پێکهاتا کەرەستێن زمانی، ئێکسەر کاریگەرییا خۆ ل ئاستێ واتایێ ژی دکەن و چەندین گوهۆڕین ڕویددەن بۆ نموونە دبیت دەربڕینەکا زمانی ل دەڤۆکەکێدا واتایەك هەبیت و ل دەڤۆکەکا دیدا هەمان دەربڕین یان پەیڤ و کەرەستێ زمانی، واتایەکا دی بدەت و ئەڤ دیاردەیە د هەمی دەڤۆکێن دەڤەرا ئاکرێدا دهێتە دیتن.

**٢-زێباری:**

ئێك ژ هۆزێن مەزن و بەرنیاسێن کوردە و جهێ ئاکنجیبوونا ئەوان ل دەڤەرا ئاکرێ ب شێوەیەکێ سەرەکی دکەڤیتە سنوورێ ناحیا دینارتێ و گوندێن ئەوی سنووری، زێدەباری سەنتەرێ قەزایا ئاکرێ و چەندین گوندێن دیێن بەربەلاڤ ل سنوورێن دی .

**- تایبەتمەندیێن دەڤۆکا زێبارییان:**

**ا- ئاستێ دەنگی:**

- بکارهینانا بزروکەیا (i) ل جهێ (ی) : ئەحمەدی ئەحمەد(i)

عەمـەری عەمەر(i)

- گوهۆڕینا دەنگەکی ب ئێکێ دی، وەکو:

(ل) بۆ (ڵ): بلا : بڵا

(ە) بۆ (ێ): جی : جێ

نیشانا (ژی) بۆ (یش): ئەزژی : ئەزیش

- زێدەکرنا دەنگەکی، وەکو:

دەنگێ (ڵ) : هێڵك

**ب- ئاستێ پەیڤێ:**

- هاڤلدان - ئانکو دەمێ دەست پاڤیە تشتەکی (دەست دان).

- تێن دێ - ئانکو سەحکێ (بەرێ خو بدێ).

- خو ڤەرساندن - ئانکو وەختی مروڤ خۆ ل جهەکی بەردەتەڤە (خۆ بەردان).

- هەکو - ئانکو (وەکو= وەکی).

- هاستن - ئانکو ب واتایا (هاتن) دهێت.

- نهانك یان بەراك - ئانکو (شکەفتێن بچیك).

- جێن - ئانکو (ری).

- رش - ئانکو (روژ).

- نە پێوەستم - واتا (نەشێم) دهێت.

- پێستم - واتا (دشێم).

- قەلەندەرێ /ی - ژارێ /ژارو.

- چالك - ئانکو (سایلو).

- هشیك - ئانکو (هێزوك، هێزك) ئەو هێزوکا زاروك دچنە سەر.

- چاپەست - کەرستێ لێنانگەهێیە تایبەتە ب دروستکرنا چایێ (چاپەست).

- سێلیڤانك - ئانكو (هێلینا مریشكا یان كولیتكێ مریشكێ).
- دڤ - واتا (دەڤ).
- نێنك - ئانكو (خودیك) قودی.
- كاسول - ئانكو (كوپ) چایێ پێڤە دخون.

**ج- ئاستێ رستێ :**

توش مروڤ نی : تو مرۆڤ نینی.

نك تەرا خۆ فرەدا: دەڤ تەرا خۆ هاڤێت.

ئەمیش دێ سەرا وا دەین: ئەم ژی دێ سەرا وان دەین.

ئەز پێناستم بێم: ئەز نەشێم بهێم.

د- ئاستێ واتایێ: بیگومان ئەڤ گوهۆڕین تایبەتمەندیێن د ئاستێن دیدا ڕیددەن، ئێكسەر كاریگەرییا خۆ ل سەر واتایێ ژی دكەن و بۆ نموونە پەیڤەكا ئەڤێ دەڤۆكێ بۆ ئاخڤتنكەرێ دەڤۆكەكا دی تێگەهشتنا ئەوێ دی گران بیت.

**٣- سۆرچی:**

هۆزەكا مەزن و بەرنیاسا كوردینە ل هەردوو دەڤەرێن سوران و بادینان ئاكنجیبووینە، لێ ل دەڤەرا ئاكرێ، ناحیا بجیل و گوندێن سنووری وی ناحیێ ب دەڤەرا ئاكنجیبوونا سۆرچیان دهێتە نیاسین و زێدەباری چەندین گوندێن دیتر و دیسان ل سەنتەرێ قەزایێ و هندەك دەڤەرێن دیژی هەنە.

**تایبەتمەندیێن دەڤۆكا سۆرچیان:**

**ا- ئاستێ دەنگی:**

- گوهۆڕینا دەنگێ (ك) بۆ (چ) : كێلێ = چێلێ
- گوهۆڕینا دەنگێ (ع) بۆ (ح) : عبدالله = حەولا
- گوهۆڕینا دەنگێ (إ) بۆ (ح) : إنسان = حینسان
- گوهۆڕینا دەنگێ (ب) بۆ (پ) : ب من = پ من

**ب- ئاستێ پەیڤێ :**

لەمەس: ل دەڤ

زاڤێجا: ئەڤجا

دێنکێ: بنێرە

چروو: چلی

واز: هەست و هوش و هزر

**ج- ئاستێ رستێ :**

زاڤێجا دێ دێنکەمێ : ئەڤجا دێ سەحکەمێ.

وازا خۆ نەدێ: بهێلە یانژی گوە نەدێ.

کمکە: کێم بکە.

**د- ئاستێ واتایێ:** دەڤۆکان سۆرچییان ژبەر ئاواز و ب لێڤکرنا تایبەتا ئەوان کاریگەرییا خۆ ل سەر ئاستێ واتایێ ژی کرییە و ل دەمێ ئەو ب دەڤۆکا خۆ د پەیڤن، ئاخڤتنکەرێن دەڤۆکێن دی ب تایبەتی د هندەک دەربڕین و رستەیاندا ب زەحمەت تێدگەهن.

**٤- هەرکی:**

هۆزا هەرکییان ژی ب ئێك ژ هۆزێن مەزن و بەربەلاڤێن کورد دهێتە نیاسین، ئەڤێ هۆزێ ژبلی دابەشبوونا ئەوێ ل چەندین دەڤەر و پارچەیێن دیێن کوردستانێ، پشکەکا زۆرژی لێ ل سنوورێ دەڤەرا ئاکرێ و ب تایبەتی ل ناحیا گردەسێن و دەوروبەرێن ئەوێ ئاکنجیبووینە و تەنانەت ل چەندین گەرەکێن سەنتەرێ باژێری ژی هەنە.

**تایبەتمەندییێن دەڤۆکا هەرکییان:**

**ا- ئاستێ دەنگی:**

- گوهۆڕینا هندەك دەنگان ب هندەکێن دی، وەکو:

دەنگێ (ڤ) بۆ (و) : ئاڤ = ئاو ، یان چاڤ = چاو

دەنگێ (ا) بۆ (ە) : یا جوانە = یە جوانە

دەنگێ (هـ) بۆ (ح): بهەشت = بـحەشت
- لادانا هندەك دەنگان ب مەرەما سڤککرنێ، وەکو:
دەنگێ (ن) : نك من : ن من
نیشانا (ی) یا نڤشێ نێر: ئەوی کوری : ئەو کور
دەنگێ (هـ)، دەرگەهـ : دەرگە

**ب- ئاستێ پەیڤێ :**

لال(i) : ل دەڤ
وەرد(i): وێرێ
کەرد(i): کیڤە
لێوەستێ: تەماشە بکە
چتو : چەوا
کرتەك: گەلەك
کەژ: سپی
سوکر: ستو
کومەشێلك : کوم، زۆر
قالورە : قیڤار
بەزا : بلەز
تاو : تەڤی
حەلاتن : ڕەڤین
شەپکین: ماندیبوون

**ج - ئاستێ رستێ :**

تو کەردرا لێوەستای؟ تە ل کیڤەرا سەحکرێ
تو چتو گە ئاخوتی؟ تو چەوا دگەل ئاخڤتی
ئاوێ وەخوە : ئاڤێ ڤەخۆڤە

**د- ئاستێ واتایێ:** ئێک ژ سیماییێن جوداکەر یێن ئاخڤتن و دەڤۆکا هەرکییان ئەڤەیە، کو ئاخڤتنێ زۆر ب لەز و کورتکری دبێژن و گەلەک سڤککرن و لێڤەکرنا دەنگ و پەیڤان تێدا ڕوپددەت، لەوا ئەڤەژی تایبەتمەندییەکا واتایی پێ دبەخشیت و ژلایێ واتایێڤە بۆ ئاخڤتنکەرێن دەڤۆکێن دی سانەهی نینە زوی ب زوی د مەبەستا هندەک پەیڤ و رستەیان بگەهن.

شێوەیێن جودایێن ئاخفتنێ د چارچۆڤێ دەڤەرەکێ دبیتە ئەگەرێ دەولەمەندییا کەلتوورێ وێ دەڤەرێ و تایبەتمەندییێن جودا دێ هەبن دگەل دەڤەرێن دیتر، دەڤەرا ئاکرێ ئێکە ژ وان دەڤەرێن ستراتیجی و گرنگ ژلایێ کەلتووری و شارستانیڤە، دشیاندایە بێژین، کو دەڤۆکا دەڤەرا ئاکرێ، سەرەرای هندێ، کو سیما و تایبەتمەندییێن تایبەت بخۆ هەنە و هەمی ئەڤ پێکهاتێن دەڤۆکا ئاکرێ د گەلەك لایەن و ئاستێن زمانیدا هەڤپشك و پێکڤە گرێداینە، لێ دگەل هندێژی جیاوازی و تایبەتمەندییێن تایبەت بخۆژی هەنە.

**ئەنجام**

١-سەرەرای هەبوونا چەندین زار و شێوەزاران دناڤ زمانێ کوردیدا، دیسان دناڤ خۆژیدا ئەڤ زار و شێوەزارە دابەشی سەر چەندین دەڤۆکێن دی دبنەوە.

٢-شێوەزارێ بادینیێ کرمانجییا ژووری، سەرەرای هەبوونا چەندین دەڤۆکان وەکو دەڤۆکێن ئاکرێ، ئامێدی و زاخۆ د ناڤدا، د هەمان دەدا ئەڤ دەڤۆکەژی دابەشی سەر چەندین دەڤۆکێن دی دبنەڤە، هەروەکی چەوا پێکهاتێن دەڤۆکا ئاکرێ ئەڤەنە (ئاکرەیی، زێباری، سوورچی و هەرکی).

٣-دەڤۆکێن دەڤەرا ئاکرێ سەرەرای هەبوونا چەندین سیمایێن هەڤپشک و نێزیکی ئێک لێ د هەمان دەمژیدا، هەر دەڤۆکەکا دەڤەرا ئاکرێ چەندین تایبەتمەندی و جیاوازی دگەل دەڤۆکێن دیدا هەنە، کو دشیاندایە بێژین ئەڤەژی د هەمی ئاستێن زمانیدا دهێتە تێبینیکرن.

## پۆختە

زار یان دیالێکت کۆمەکا سیماییێن زمانینە، کو گرێدای ژینگەهەکا تایبەتن، ئاسایی و سانەهییە بۆ جڤاکێن خودان ئێک زمان لێ زارێن جودا جودا هەبن، کو پەیوەندیێ ب ئێکودووڤە بکەن و ل ئاخڤتنا ئێکودوو بگەهن، ئەڤەژی ب ڕێکا ئەوێ پێکڤەگرێدانا دناڤبەرا ئەوان زاراندا هەی. جیاوازییا دناڤبەرا زاراندا ب ڕێکا ب لێڤکرنا هندەک پەیڤێن دیارکرییە، کو تایبەتن ب کۆمەکا کەسانڤە و ب ئەڤێ چەندێ ژ جڤاک و کۆمێن دی دهێنە جوداکرنەڤە.

دەڤۆکا ئاکرێ ئێکە ژ دەڤۆکێن کوردی د چارچۆڤێ دەڤۆکا بەهدینان ئانکۆ کرمانجییا ژووری یا زمانێ کوردیدا، کو ب مەزنترین و بەرفرەهترین دیالێکتا زمانێ کوردی دهێتە هژمارتن، هندەک وەسا دبینن، کو دەڤۆکا ئاکرێ وەکو ئێک و ئێک دەڤۆکە، لێ د کەتواریدا جیاوازە و ئەڤەژی ل دویڤ پێکهاتێن دەڤەرێیە، خەلکێ دەڤەرا ناڤهاتی دشێن جیاوازیێ دناڤبەرێدا بکەن و ژ ئێک جودا بکەنەڤە، وەکی دەڤۆکێن ئاکرەیی، زێباری، سوورچی و هەرکییان، ئەڤە و ژبلی هەبوونا گەلەک جوداهییان د هەمی لایەن و ئاستێن زمانیدا هەر ژ دەنگان هەتا واتایێ.

**لیستا ژێدەران**

**ب زمانێ کوردی:**

١- ئاری عوسمان خەیات، ٢٠١١، لەبارەی زمان و زمانی کوردیەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی نارین.
٢- ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی،٢٠٠٤، سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، چاپی یەکەم، هەولێر.
٣- جەمال نەبەز، ١٩٧٦، زمانی یەکگرتووی کوردی، یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا بڵاویکردووتەوە، بامبێرگ، ئەلمانیا.
٤- دەلال ئەحمەد سالح، ٢٠١١، کاریگەرییا هوکارێن جوگرافی ل سەر دابەشبوونا زاران بۆ سەر گوڤەران ( دەڤەرا بەهدینان وەك نموونە)، ناما ماستەرێ ، سکولا ئاداب، فەکولتیا زانستێن مروڤایەتی، زانکویا دهوك، دهوك.
٥- ڕەفیق شوانی، ٢٠٠١، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

٦- ڕەفیق شوانی، ٢٠٠٨، زمانی کوردی و شوێنی لەناو زمانەکانی جیهاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی (دهوك).
٧- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو،٢٠١٠، زمانەوانی، بەرگی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، چاپخانەی منارە، هەولێر.
٨- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو،٢٠١١، زمانەوانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
٩- عەبدولمەناف ڕەمەزان ئەحمەد، ٢٠١١، ئەتڵەسی زمانی هەرێمی کوردستانی عێراق وەك نموونە، چاپا ئێکێ، چاپخانەیا خانی/ دهوك.
١٠- عەبدولواحید موشیر دزەیی، ٢٠١١ ، زارە کوردییەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی پاك/ هەولێر.
١١- فوئاد حەمە خورشید، ٢٠٠٨، زمانی کوردی و دیالێکتەکانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.
١٢- کامیل حەسەن البصیر ، کوردستان موکریانی، سادق بەهائەددین ئامێدی، حەمە ئەمین هەورامی، ١٩٨٧، زارە کوردییەکان، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین.
١٣- کامیل حسن البصیر، ١٩٨٤، زمانی نەتەوایەتی کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغداد.
١٤- کەریم زەند، ١٩٧٧، زمانی کوردی و هونەری وەرگێڕان، سلێمانی.
١٥- کەمال میراودەلی،٢٠٠٧، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی .
١٦- محەمەدی مەحویی، ٢٠١٦، مەنامە بەستانداردکردنی زمانی کوردیی دروستنووسیین.
١٧- محەمەد مەردۆخی کوردستانی، ١٩٩١، مێژووی کورد و کوردستان، بەغدا.
١٨- نەسرین عەبدوڵلا محەمەد تاهر، ٢٠٠٩، هندەك جیاوازیێن زمانی دناڤبەرا دەڤوکا دهوك و ئاکرێدا، ناما ماستەرێ، کولیژا ئادابێ، زانکویا دهوك، دهوك.

**ب زمانێ عەرەبی:**

١- ابرهيم انيس، ١٩٦٥، في اللهجات العربية، الطبعة الثالثة، ملتزم الطبع والنشر مكتبة الانجلو المصرية.
٢- علي عبدالواحد وافي، (١٩٦٢)، اللغة و المجتمع، دار نهضة مصر للطبع والنشر، الفجالة- القاهرة.

## الملخص

## اللغة الكردية ووجود لهجات مختلفة

### (اللهجات في منطقة آكري كدراسة حالة)

تعد اللهجة مجموعة من الصفات اللغوية التي تنتمي إلى بيئة خاصة، إذ تسهل للمجموعات التي تتحدث لهجات مختلفة ولغة واحدة التواصل مع بعضهم البعض، وفهم ما يدور بينهم من حديث بقدر الرابطة التي تربط تلك اللهجات، وتختلف اللهجات بطريقة لفظ كلمات معينة. تخص مجموعة من الاشخاص وتميزهم عن المجموعات الاخرى.

من ذلك لهجة عقرة (ئاكرى) ..فهي واحدة من اللهجات الكوردية التي تنتمي لعائلة اللهجة البهدينانية أو الكرمانجية الشمالية الكوردية والتي تعد أكبر وأوسع اللهجات الكوردية الاساسية . وقد يبدو للبعض أن لهجة منطقه عقرة واحدة ، بيد أنها – وفي الواقع- تحمل في طياتها العديد من الاختلافات اللهجية التي يستطيع أهل المنطقه والمختصون باللغة الكوردية رصدها والتعرف عليها . من ذلك اللهجة العقراوية اللهجة الزيبارية والسورجية والهركية .. إذ تكمن الاختلافات في هذه اللهجات على مستوى الصوت والدلالة.

## Abstract

## Kurdish language and the Wxistence of Different Dialects (Dialects in Akre Region as a case study)

Dialect is a set of linguistic qualities that belong to a particular environment, as it makes it easier for groups that speak different dialects and one language to communicate with each other, to understand the conversation between them as much as the bond that binds those dialects, and dialects vary in the manner of the pronunciation of certain words. it belongs to a group of people and distinguishes them from other groups.

Akre dialect is one of the Kurdish dialects that belong to the Family of the Bahadinian dialects or the North Karmanji dialect, which is considered the largest and widest of the Kurdish dialects. it seems to certain people that Akre dialects are all the same, but in reality it contains many accent differences that people from the Kurdish linguists scholars can recognize them. Examples of these dialects are the Akreyi, the Zebari, the Sorchi, and the Harke. The differences in these dialects lie in the level of sound and meaning.

# ڕۆڵی خستنەسەر لە زاراوەسازیدا

**میدیا مراد محەمەدئەمین**

مامۆستای یاریدەدەر

بەشی کوردی / کۆلێژی زمان / زانکۆی سەلاحەددین

**پوخته**

لێکۆڵینەوەکە بە ناونیشانی (ڕۆڵی خستنەسەر لە زاراوەسازیدا)یە، کە باس لە زاراوەسازی دەکات، بەتایبەتیش ئەو ڕۆڵەی کە ڕێگای خستنەسەر دەیبینێ لە دروستکردنی زاراوە بۆ زمانی کوردی. ڕێگای خستنەسەر جۆرێکە لەجۆرەکانی دروستکردنی گرێی ناوی، ئەم ڕێگایە توانراوە سوودی لێوەربگیرێ لە بواری زاراوەسازیدا، چونکە زاراوەش خۆی ناوە.

ئەو زاراوانەی بەڕێگای خستنەسەر دروست دەکرێن، وەک هەر وشەیەک یا ناوێکی لێکدراو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، لەکاتی بەکارهێنان و لەناو فەرهەنگیشدا؛ بەڵام جیاوازیی زاراوەی خستنەسەر و وشەی لێکدراو لەگەڵ یەکتریدا لە پێکهاتەیاندایە، بە تایبەتیش زیاتر لە بوار و ئامرازدا خۆی دەنوێنێ.

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە وەسفی شیکارییە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەش زاری کوردیی ناوەڕاستە و نموونەکانیش بە گشتی لە کتێب و فەرهەنگ و فەرهەنگۆکە زاراوەسازییەکانی ئەم زارە وەرگیراون.

لێکۆڵینەوەکەم بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو تەوەر پێکهاتووە. تەوەری یەکەم: بەناونیشانی (زاراوەسازی)یە کە لەم تەوەرەیەدا باس لە زاراوەسازی و پێناسەی و ڕێبازەکانی وەرگرتنی زاراوە و ڕێگاکانی دروستکردنی زاراوە دەکەم.

تەوەری دووەم: بەناونیشانی (ڕۆڵی خستنەسەر لە زاراوەسازیدا): لەم تەوەرەیەدا باس لە چەمک و پێناسەی گرێ دەکەین، پێکهاتەی گرێی خستنەسەری، هەروەها جۆرەکانی خستنەسەر لە ڕووی واتاوە لەناو زاراوەسازیی زمانی کوردیدا. جگە لەمانە ڕووی لێکچوون و جیاوازیی گرێی ناوی خستنەسەری و زاراوەی خستنەسەری، لەگەڵ زاراوەی خستنەسەری و وشەی لێکدراو خراوەتەڕوو، لە کۆتاییشدا ئەنجامەکانم لە چەند خاڵێکدا پێشکەش کردووە.

**وشە گرنگەکان:** زاراوەسازی، زاراوە، خستنەسەر، گرێی ناوی، وشەی لێکدراو

**پێشەکی:**

**ناونیشان و بواری لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکە بە ناونیشانی (ڕۆڵی خستنەسەر لە زاراوەسازیدا)یە، کە تیایدا خستنەسەر وەک ڕێگایەک لە ڕێگاکانی زاراوە دروستکردن ڕووندەکەینەوە، هەروەها ئەو ڕۆڵەی کە بینیویەتی و دەیبینێ لە زاراوەسازی لەچوارچێوەی زاراوە دانراو و ڕۆیشتووەکانی زمانی کوردیدا دەخەینەڕوو.

**هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە:**

کاتێک سەرنجی زاراوەکانی کۆڕی زانیاریم دەدا لەگەڵ زاراوەکانی ناو فەرهەنگۆکە زاراوەییەکان و دوای ئەمانەش تێبینیی ئەوەم کرد، چەندین لە زاراوانەی کە ڕۆژانە دەیابینین و گوێبیستیان دەبین بە زۆری لە قالبێکی دوو وشەیی یا سێ وشەیی... سازکراون، کەچی لەهەمان کاتدا وشەی لێکدراویش نین؛ لەگەڵ ئەوەشدا وەک وشەی لێکدراو، یا هەر وشەیەکی تری ناو فەرهەنگ، ئەمانە ڕۆڵیان هەیە لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگ و ئاخاوتنی زمانی کوردیدا.

هەر چەندە ڕێگای خستنەسەر یەکێکە لە ڕێگا چالاکەکانی زاراوەسازی؛ بەڵام بەسەربەخۆیی باسی لێنەکراوە و ئەو زاراوانەی کە بەم ڕێگایەش سازکراون، ئەگەر باسیش کرابن، خراونەتە پاڵ ڕێباز و ڕێگاکانی تری زاراوەسازی، بۆیە بە پێویستمان زانی لە لێکولێنەوەیەکی سەربەخۆدا بناغە و ڕۆڵی بەرهەمداری ئەم ڕێگایە لە زانستی زاراوەسازیدا بخەینەڕوو.

**ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:**

ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە وەسفی شیکارییە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەش زاری کوردیی ناوەڕاستە و نموونەکانیش زاراوەی زیندوو و بەکارهاتوون کە بە گشتی لە کتێب و فەرهەنگۆکە زاراوەسازییەکانی ئەم زارە وەرگیراون.

**ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکە بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو تەوەر پێکهاتووە:

تەوەری یەکەم: تێدا بە شێوەیەکی گشتی باس لە زاراوەسازی و ئەو ڕێبازانەی کە هەیەتی و ڕێگاکانی دروستکردنی زاراوە خراوەتەڕوو. ئەم بابەتانە لەخۆوە دەگرێ (پێناسەی زاراوەسازی ڕێبازەکانی زاراوە وەرگرتن: خواستن و کورداندن و وەرگێڕانی پیتی ، وەرگێڕانی چەمکی و ڕێبازی پێوانەیی و خوازە، ڕێگەکانی زاراوەسازیش، وەک: لێکدان و دارشتن و داتاشین و خستنەسەر.

لە تەوەری دووەمدا: باس لە چەمک و پێناسەی گرێ دەکەین، پێکهاتەی گرێی خستنەسەری لەگەڵ جۆرەکانی خستنەسەر لە ڕووی واتاوە لەناو زاراوەسازیی زمانی کوردیدا. هەروەها ڕووی لێکچوون و جیاوازیی گرێی ناوی خستنەسەری و زاراوەی خستنەسەری، هەروەها زاراوەی خستنەسەری و وشەی لێکدراو دەخەینەڕوو.

خستنەسەر یەکێکە لەڕێگە باو و بڵاوەکانی زاراوەسازی، لەو سەردەمەدا ئەو زاراوانەی لەلایەن لێژنەکان ، کۆڕی زانیاری و ئەو فەرهەنگە زاراوایانەی کە زاراوە بەرهەم دێنن یا تۆماری دەکەن ، ئەگەر سەرنجی زۆربەیان بدەین ئەوە تێبینی دەکرێ، بەشێکی زۆر لەو زاراوانە بەڕێگەی خستنەسەر سازکراون. لەناو قالبی دوو وشەیی یان سێ وشەیی داڕێژراون.

بۆیە لەم ڕووەوە زۆر لە وشەی لێکدراو دەچن؛ بەڵام لەبەرئەوەی ڕێگەی دروستکردنیان جیاوازە بۆیە نابێ ئەم پێکهاتانە بڕژێنرێنە یەکتریەوە، یاخود لە بۆتەی ڕۆنان و شیکردنەوەیاندا لەپاڵ وشەی لێکدراودا باسیان لێوەبکرێ، یا لەپاڵ ڕێبازێکی تر شوێنیان بۆ بکرێتەوە.

هەر لەبەرئەمەش بە پێویستمان زانی بەسەربەخۆیی باس لە پێکهاتە و ڕۆڵی ڕێگەی خستنەسەر بکەین، کە ڕێگایەکی چاڵاکە لە زاراوەسازیدا و لە سەردەمی ئێستادا ئەگەر لە ڕێگەی لێکدان برەوی زیاتر نەبێ کەمتر نییە. ڕێگایەکی خێراتر و باوترە لەناو خەڵک لەبەرامبەر ڕێگای لێکدان لە کاتی دروستکردنی زاراوەدا، هەروەها لەڕووی بڵاوبوونەوەش و بەکارهێنانی هەمان برەوی هەیە. بەئاسانی بەسەر زاری قسەکەراندا دێت و خێرا بڵاو دەبێتەوە بەناویاندا.

## تەوەری یەکەم:

### زاراوەسازی:

یەکێکە لە زانستەکانی زمانەوانی کارەکی کە بایەخ بەدانان و دروستکردنی زاراوە دەدات، بە گشتی دەتوانرێ لە ڕوانگەی هەموو ئاستەکانی زمان لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم زانستە بکرێ. زاراوەسازی: ئەو زانستەیە کە لە پەیوەندیی نێوان چەمکە زانستییەکان و زاراوەکانی زمان دەکۆڵێتەوە و گوزارشتیان لێ دەکات و ناویان بۆ دادەنێت (شەهاب شێخ تەیب:٢٠١٢، ١٠٤-١٠٥) زاراوەسازان و ئەوانەی لە مەترسی مردنی پلەبەپلەی زمان ئاگادارن ڕووبەڕووی لێشاوی زاراوەکان دەبنەوە هەوڵ دەدەن ئەو زاراوانە بکوردێنن، یاخود دایبڕێژنەوە لەبۆتەی ڕێزمانی کوردیدا. لە بنەڕەتدا ((زانستی زاراوە واتا دۆزینەوە و هەڵبژاردن و وەرگێڕان و دانانی زاراوە، ئەم زانستە لە سەدەی ڕابردووەوە پەرەی سەندووە. ڕێوشوێنی بۆ دانراوە تا ساڵانی (٦٠)ەکان ئەم کارە بەشێوەیەکی سست و سادەو ساکار بووە)) (محمد وەسمان،٢٠٠٤،١٠) لە ناو کورددا؛ بەڵام دوای ئەوەی خوێندن لە ١٤ ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ ەوە، لە زۆربەی قوتابخانەکانی کوردستان کرایە کوردی، بۆیە پێویستیی زاراوە زیاتر برەوی سەند (ڕۆژان نوری عبدالله، ٢٠٠٧،١٥). لە دوای ئەو کاتەوە چەندین لێژنە یا دەستە لە ڕۆشنبیران زاراوەیان داناوە ، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵی تاکە کەسی هەر هەیە و دەبینرێ، نەک تەنیا کەسانی زمانەوان و زاراوەسازان، بەڵکو خەڵکانی تر لەناو چین و توێژە جیاجیاکانی ناو کۆمەڵگای کوردیش لێرەو لەوێ زاراوە ڕێکدەخەن و بەکاریش دەهێنرێ.

لە ڕاستیدا ئەو زاراوانەی کە دروست دەکرێن هەر چییەک بێ و لەلایەن هەر کەسێکەوە سەرچاوە بگرێ، لە ئەنجامدا دەبنە هۆی دەوڵەمەندکردن و زیندوومانەوەی زمانی کوردی. بەگشتی ئەو وشە و زاراوانەی کە بەرهەمی نووسەر و وەرگێڕ و زاراوەساز و لێژنەکانن تۆمارکراون و ئەگەر ڕۆیشتبن لەسەر زاری قسەپێکەرانی زمانی کوردی دەتوانرێ بخرێنە ناو فەرهەنگی گشتی زمانەکەمانەوە؛ بەڵام ئەم بەشەی تر کە بەرهەمی خەڵکی ئاسایین و سەر زارەکین دەتوانرێ هەوڵ بدرێ سەرەتا کۆبکرێنەوە و لە فەرهەنگی زاراوەییدا تۆماربکرێن، دواتر تاوتوێ بکرێن، لە قۆناغێکی تردا ئەگەر بینرا شیاو و گونجاوە بۆ بەکارهێنان لە لایەن گشت

چین و توێژەکانی تری ناو کۆمەڵگای زمانەکەمان، ئەو کاتە بخرێنە ناو فەرهەنگی گشتی زمانەکەمانەوە.

زۆر جار پرسیارێک بەخەیاڵمان گوزەر دەکات. ئایا هۆی سەرکەوتنی زاراوەیەک بۆچی دەگەڕێتەوە؟ ئایا مەرجە ئەو زاراوانەی زاراوەسازێک یا زمانەوانێک سازی دەکات بڕوات لەناو خەڵکدا؟ لەوەڵامدا: بێگومان نەخێر، ئەمە لەهەموو کاتێکدا مەرج نییە، چونکە زاراوەسازێک یا زماناسێک لەبەر ئەوەی لە ڕێزمانی زمانەکەی خۆی زۆر شارەزایە، هەموو هەوڵی بۆ ئەوەیە کە ئەو زاراوانەی سازدەکرێن بەپێی یاسا و ڕێساکانی زمانەکە بێت و دوورنەکەوێتەوە لە قالب و پێکهاتەی زمانەکەی خۆی، لەوانەیە بەشێک لە زاراوەکانی هەرچەندە بەو هەوڵ و بەو وردییە داڕشتووە، کەچی سەری نەگرتووە هەرچەندە لەڕووی پێکهاتە و ڕۆنانەوە هیچ کەموکورییەکی نییە. لە هەمان کاتدا زاراوە هەیە هیچ زاراوەسازێکی ئەکادیمی سازی نەکردووە کەچی لە زاری خەڵکدا جێگەی خۆی کردووەتەوە، ئەم خاڵەش زۆر سەرنجی ڕاکێشام بۆچی زاراوەی یەکەم دوای ئەو هەوڵ و ماندوو بوون و بیرکردنەوە قووڵە، کەچی لە ئەنجامدا سەرنەگرێ؛ بەڵام زاراوەیەکی تر کە لەوانەیە کەسێکی زۆر سادەوساکاری ناو کۆمەڵگا بەسەر زارییەوە داهاتبێت، کەچی زاراوەکەی بڵاو بووەتەوە و سەری گرتووە.

زاراوەساز سەرەڕای ئەوەی قسەپێکەری زمانەکەیە و شارەزاییەکی باشی لە وردەکاریی زمانەکەی خۆی و زمانێک یا چەند زمانێکی تریش هەیە. هەوڵ دەدات لە یاساو ڕێساکانی زمان لانەدات و بە پێوانەی ڕۆنانی وشە ڕەسەنەکانی تری زمانەکەی خۆی زاراوەکان دابڕێژێ؛ بەڵام ئەوەی دووەم کەسێکی ئاساییە و بەسەلیقەی خۆی و بەشێوەیەکی ڕەمەکی بەبێ بیرکردنەوە لە یاسا و ڕێساکانی، یا کێشە و گرفتەکانی، دوو وشە، یا زیاتر بەشێوەیەکی سروشتی و بەبێ گرێ دەردەبڕێ و خەڵکیش دەمودەست بەبێ لێپرسینەوە لەوەی پابەندی چییە و چ نییە لە ڕووی ڕێزمانییەوە، بۆچی وا دەڵێ و بۆچی وانالێ. لێی وەردەگرن و لەمەوە بۆ ئەم، بەرەبەرە دەگوازرێتەوە لە کۆتاییدا دەبێتە زاراوەیەکی بەربڵاو و جێگیر لەناو خەڵکدا.

کەواتە تەنیا کارکردنی زانستییانە بۆ زاراوەسازی بەس نییە، چونکە زمان شتێکە هەڵقوڵاوی سروشتی مرۆڤەکانە زمانەوانەکان هەوڵ دەدەن یاساوڕێساکانی ئەو شتە سروشتییە بدۆزنەوە. جا هەر زمانە و سروشتێکی تایبەتی خۆی هەیە.

بۆ نموونە: لە زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی سروشتی لە بەشێک پێکهاتەکانی وشە لێکدراوەکانی وەک: (ناو+ ئاوەڵناو) بەدوایەکدا دێن، کەچی لە بەشێک لە پێکهاتەکانی تری وشەی لێکدراودا (ئاوەڵناو+ ناو) بەدوا یەکتریدا دێن. واتە بە هەر دوو شێوەکە دادەڕێژرێ. وەك:

**ناو + ئاوەڵناو** ← (ڕووسوور، چاوسوور، سەرسوور، مێرگەسوور،....)

**ئاوەڵناو+ ناو** ← (سوورەگوڵ، سوورەماسی، سوورەقوڵینگ،....)

(عەبدولوەهاب شێخانی)

بۆچی هەموو وشە لێکدراوەکانی زمانی کوردی هەمان یاسای دروستبوونیان نەبووە؟ ئایا بەکام شێوەی دروست بکەین باو و بەربڵاو دەبێ؟ ئەگەر بێ ئامراز بێ؟ یاخود ئامرازی (ە،بە،لە...) بەکاربێنین باشتر و گونجاوترە؟ ئەو کەسە ئاساییانە هیچ بیر لەمانە ناکەنەوە. ناو و ئاوەڵناوەکان دەدەن بەدەم یەکتریدا و بەسەلیقەی خۆیان وشە یا زاراوەیەکی نوێ دادەڕێژن. لەوانەیە هەرگیز بیریان لە ڕۆنانی زاراوە نەکردبێتەوە یاخود پلانێکی پێشوەختەیان دانەنابێ، تەنیا یەک جار لە دەرفەتێکدا ئەمە زۆر بە سفت و سۆڵیش لە زاریانەوە دەرچووبێ.

بە پێویستمان زانی پێناسەی **زاراوە** بهێنینەوە بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی چەمکەکەی:

- **زاراوە:** ناوێکی ڕەسەنە لە فەرهەنگی نەتەوەیی کوردییەوە بەپێی ڕێبازێکی وشەسازیی کوردی بۆ مەبەستێکی دیاریکراو لە کۆڕی پسپۆڕێتیدا سازکراوە (شەهاب شێخ تەیب،٢٠١٢ ،١٥٩)

کەواتە **زاراوە:** ناوە نەک بەشە ئاخاوتنێکی تر. پێکهاتەکانی لە ناو فەرهەنگی کوردیدا وەرگیراوە. بە یاسایەکی وشەسازی، واتە: بەپێی یاساکانی زمانی کوردی دانراوە. لەلایەن کەسێک یا دەستەیەک لە شارەزایان .

**پۆلینکردنی زاراوەسازی:**

گومان لەوەدا نییە ئەوانەی وشیارن لە مەترسی مردنی پلە بە پلەی زمان بەرهەڵستی لەهاتنە ناوەوەی لێشاوی زاراوە دەکەن، کە ئەم دیاردە زمانەوانییە مردنی پلەبەپلەی زمان لە ئەنجامی ئەوەوە سەرهەڵدەدات، کە قسەپێکەرانی زمانێک دەستدەکەن بە بەکارهێنانی وشە و زاراوە نوێیەکانی زمانانی تر، یاخود واز لە وشەی ڕەسەنی زمانەکەی خۆیان دەهێنن و چەندین وشەی زمانێکی تر یا زمانانی تر لە شوێنی وشەکانی زمانی خۆیان بەکاردەهێنن. بەم شێوەیە نەوە لە دوای نەوە دەستبەرداری کۆمەڵ بە کۆمەڵی وشەکان دەبنەوە لە ئەنجامدا ئەو وشە ڕەسەنانە لەبیر دەچنەوە. ئەم دیاردەیە ئەگەر چەند نەوەیەک یا زیاتر بەردەوام بێ بەشێوەیەکی پلە بە پلە زمانەکە دەتوێتەوە و نامێنێ، بۆیە بەو دیاردەیە دەوترێ **مردنی زمان** (محمد داود،٢٠١٧ ).

زمانەوان و زاراوەسازان بۆ ئەو مەبەستە چەندین ڕێباز و شێوازیان دەستنیشان کردووە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ چەمک و زاراوەی نوێ کاتێ دێتە ناو زمانی کوردی بۆ ئەوەی بتوانرێ بە شێوەیەک لە شێوەکان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

ئەوەی تێبینی دەکرێ لەم خشتەیەدا تا ڕادەیەک هاوبەشی و جیاوازی هەیە هەم لە ناونان و هەم لە پۆلینکردنیان؛ بەڵام بەشێک لە خاڵەکان پەیوەندی بە ڕێبازەکانی زاراوەسازییەوە هەیە، بەشێکی تریشی پەیوەندی بە ڕێگاکانی وشەسازییەوە هەیە.

لێرەدا بەپێویستمان زانی بەشێوەیەکی پوخت و چڕکراوە کۆمەڵێ لەو نووسەرانەی ئاماژەیان بە پۆلینکردنی زاراوەسازی کردووە لە خشتەیەکدا بیانخەینەڕوو:

| ناوی نووسەر | کامل بصیر | کامل حسن البصیر | محمد وەسمان | ڕۆژان نوری | جەمال عەبدول | ڕەفیق شوانی | شەهاب شێخ تەیب | کەمال جەلال غەریب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ساڵ | ١٩٧٤ | ١٩٧٩ | ٢٠٠٤ | ٢٠٠٧ | ٢٠٠٨ | چ١/٢٠١١ | ٢٠١٢ | ٢٠١٢ |
| لەژێر ناوی: | ڕێبازی زاراوەدانان | ڕێبازی دانانی زاراوە | شێوازەکانی گوازتنەوەی زاراوە | شێوازی گواستنەوەی زاراوە | هۆکاری واژەیی و وشەسازی و واتایی | ڕێگای پێکهاتنی زاراوە | ڕێگاکانی دروستکردنی زاراوە | دانان و پێکهێنانی زاراوە |
| ١. | مەجاز | ئاوەڵواتا | واتای نوێ- فراوانکردنی واتا- | واتای نوێ | خواستن (المجاز) | خواستن و ئاوەڵواتا | خوازە (میتافۆر) | ئاوەڵواتا (مەجاز) |
| ٢. | داڕشتن | داڕشتن | دانان: داڕشتن، لێکدان... | دانان: داڕشتن، لێکدان... | داڕشتن | داڕشتن | داڕشتن | داڕشتن |
| ٣. | لێکدان | لێکدان | | | لێکدان | لێکدان | لێکدان | لێکدان |
| ٤. | داتاشین | داتاشین | داتاشین | داتاشین | داتاشین | داتاشین | داتاشین | داتاشین |
| ٥. | | وەرگرتن | وەرگرتن (خواستنەوە) | وەرگرتن (خواستن) | خۆماڵیکردن | وەرگرتن | وەرگرتن | وەرگرتن (کورداندن) |
| ٦. | | وەرگێران | وەرگێران | وەرگێران | وەرگێران | وەرگێران | وەرگێران | وەرگێران |
| ٧. | | زرەڕێژ | | | | پێوان | پێوانە | زرەڕێژ |
| ٨. | | | | | | ڕێگای دووبارەکردنەوە | | |
| ٩. | | | | | | ڕێگای سەرە | | |
| ١٠. | | | | | | دەستە وشە (وێنە، ڕێژەی ڕەوانبێژی) | | |

| ١١. | | | | | | ڕێگای چوونە ناویەک | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٢. | | | | | | ڕێگای ئەکرۆنۆمی | | |
| لاپەرە | ٧٥٣ | ٤٦ | ٥٠ | ٢٢٧ | ٤٣-٤٢ | ٢٢٢-٢٠٩ | ٢٣١ | ٢٥ |

**ڕێبازەکانی زاراوە وەرگرتن:**

زاراوەسازان و زمانەوانان و وەرگێڕان دەتوانن سوود لە ڕێبازەکانی زاراوەسازی وەربگرن بەیەکێک لەو دەروازانەوە پێشوازی لە چەمکی نوێ یا زاراوە بیانییەکان بکەن؛ چونکە کاتێک کۆمەڵگەی زمانی ڕووبەڕووی زاراوەی نوێ دەبێتەوە یا زاراوەکە وەک خۆی وەردەگرن هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا ناهێنن، یا ئەوەتە زاراوەکە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دەربڕینی کۆمەڵگاکە و خەڵکەکە زاراوەکە دەگونجێنن لەگەڵ درکاندنیان، یا ئەوەتە زاراوەسازان و خەمخۆرانی زمان چەمکی زاراوەکە وەردەگرن و بەجۆرێک لە جۆرەکان جارێکی تر، زاراوەکە لە بۆتەی زمانی کوردیدا دادەڕێژنەوە.

بۆیە لێرەدا پێناسەی دیارترین ڕێبازەکانی وەرگرتن و دابینکردنی زاراوە بۆ زمانی کوردی دەخەینەڕوو :

١- **خواستن:** «گوازتنەوەی زاراوەکە بە بێژەوی خۆیەوە (بێژەوی بیانی) بۆ زمانی کوردی» (محەمەد وەسمان،٢٠٠٤،٥٠). نووسەر مەبەستی لەو پێناسەیە ئەوەیە کە زاراوەکە وەک خۆی کە چۆن دەبێژرێ، یاخود دەردەبڕێ لە زمانە بیانییەکەدا، هەر بەم شێوەیە وەردەگیرێ و دەگوازرێتەوە بۆ ناو زمانی کوردی.

ئەم دیاردەیە دەمێکە باوە و نووسەران و خەڵکێکی زۆر زاراوەکان دەقاودەق وەک خۆی چۆنە لە ڕووی درکاندنەوە لە زمانە بنچینەکە بەو شێوە وەردەگیرێ و بەکاردەهێنرێ؛ هەر ئەوەندەیە بە ڕێنووسی کوردی دەنووسرێتەوە، کە ئەم دیاردەیە لەکاتی وەرگرتنی زاراوە جیهانییەکان زۆر بەدی دەکرێ؛ بەڵام ئەگەر خەڵک و

زمانەوانان ئەم شێوازەی وەرگرتن- خواستن- یان بە ڕێژەیەکی زۆر بەکارهێنا، مەترسی هەیە بۆ لەناوچونی زمانی کوردی. نموونەی زاراوەی خوازراو وەک :

**(( تەلیسکۆپ، ڕادار، پرۆتین، سینەما، حەج، زەکات...))**

**٢- کورداندن:** بێژەی زمانێکی تر... بەگۆڕینێکی تایبەتیی ئەوتۆ، کە لەگەڵ دەستووری دەنگی (صوتی)... زمانی کوردیدا بگونجێت، بگوێزرێتەوە سەر زمانی کوردی. (کەمال جەلال غەریب،٢٨،٢٠١٢) لەم بارەدا زاراوەکە وەک خۆی وەردەگیرێ؛ بەڵام بۆ ئەوەی لەگەڵ دەربڕینی زمانی کوردیدا بگونجێندرێ هەندێ گۆڕانی دەنگسازی بەسەردا دەهێنرێ، وەک:

**((مەکینە، پاتری، پلایس، کۆمپیتەر، جوملاستیک، عەروز، کەوسەر ...))**

**٣- وەرگێڕانی چەمکی:** ((لەم وەرگێڕانەدا وەرگێڕ واتاکە لە دەقە بنەڕەتییەکەوە وەرئەگێڕێ بێ ئەوەی پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانە بنەڕەتییەکە وەربگێڕێ، ئەم واتایەش بەپێی یاسا و دەستوور و پێکهاتنی زمانی دووەم دائەڕێژرێ.))(غازی فتاح وەیس،١٩٨٤،٥٤) ئەم جۆرە بریتییە لە تێگەیشتن لە چەمک و پێناسەی زاراوەکە لەزمانە بیانییەکەوە داڕشتنەوە لە زمانی کوردیدا، ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی زۆر زانستییانەتر و سەرکەوتووترە زاراوەسازان زۆر بەلایانەوە پەسەندترە لە ڕێگاکانی تر. وەرگرتنی چەمک : چەمکی زاراوەکە هەڵدەهێنجرێ و دواتر لە زمانی کوردیدا دادەڕێژرێتەوە؛ بەڵام ئەگەر زاراوەساز لەم هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو، یا گونجاو نەبوو پەنا دەباتە بەر ڕێبازەکانی تر.

**البلاغة: ڕەوانبێژی**

**airman: فڕۆکەوان**

**Octagon: مثمن: هەشت پاڵوو**

**٤- وەرگێڕانی پیتی (وشە بە وشە):** ((لەم وەرگێڕانەدا وەرگێڕ واتا و پێکهاتنی ڕێزمانی لە زمانە بنەڕەتییەکەوە وەرئەگێڕێتە سەر زمانی دووەم. لێرەدا وشەیەک ئەگۆڕێتەوە بە وشەیەکی دیکە)) (غازی فتاح وەیس،١٩٨٤،٥٣-٥٤) ئەو وشەیە یا چەند وشەیەی زاراوەکە وەردەگێڕێتە سەر زمانەکە؛ بەڵام لە یەکێک لە بۆتەکانی ڕێزمانی

کوردیدا دایدەڕێژێتەوە. ئەو زاراوانەی لە وشەیەک یا زیاتر دروست بوون هەندێ جار دەگونجێ و شیاوە کە وەرگێڕانی پیتی بۆ ئەنجام بدرێ واتە بەرامبەر بە هەر وشەیەک لە زمانەکەی تر وشەیەکی زمانی کوردی بەرامبەری دەوەستێ؛ بەڵام ئەم شێوەیە سەرکەوتوو نییە، بۆ وەرگێڕانی هەموو زاراوەیەک، بەڵکو تەنیا بۆ بەشێک لە زاراوەکان دەتوانرێ ئەم ڕێبازە پەیڕەو بکرێ.

**blind spot: کوێرە پەڵە**

**cosmic rays: تیشکی گەردونی**

**seismology: بوومەلەرزەزانی**

جاری واش دەبێ زاراوەیەک دوو زاراوەی بەرامبەر دەوەستێ بەهۆی جیاوازی لە بیرکردنەوەی زاراوەسازان لە کاتی وەرگێڕاندا وەک ئەم نموونانە تێبینی دەکرێ:

**العصر الحجري القديم: چاخی بەردینی کۆن ، چەرخی کۆنی بەردین**

**علم الاجتماع : کۆمەڵناسی، کۆمەڵزانی**

**زوایا ربعیة: گۆشەی چوارەکی، چارەکە گۆشە، چواریەکە گۆشە**

٥- **ڕێبازی پێوانەیی:** بناغەیەکە...لەبەر ڕۆشنایی ئەودا، هەموو دەستوورەکانی زمان و داڕێژراوەکانی وشە و واتاکانی واژە بنیات دەنرێ، هەروەها بناغەیەکە وەکو پێوانە و تەرازوو وایە بەدەست زمانەوانەوە (کەمال جەلال غەریب،٢٠١٢،٦٦). زاراوەساز هەندێ جار بە ڕێبازی وەرگێڕانی چەمکیش دڵی ئاو ناخواتەوە، هەرچەندە لە چەمکی زاراوەکەش بەتەواوی هوشیارە، کەچی ڕوودەکاتە بۆتەی وشە ڕەسەنەکانی کوردییەوە و لەسەر بنەمای یاساکانی ئەوانەوە زاراوەکە سازدەکەن.

**خوێدان، شەکردان، ئاگردان : هێلکەدان، منداڵدان**

**چاپخانە : کتێبخانە، چاپخانە، دەرمانخانە**

**سێگۆشە (triangle) : چوارگۆشە (square)**

٦- خوازە: بریتییە لە بەکارهێنانی وشەیەک بۆ گەیاندنی واتایەک جگە لەواتا بنەڕەتییەکەی (محمد علي الخولي،١٩٨٢، ١٦٨). ئەمە نە وەرگێڕانی چەمکییە و نە وەرگێڕانی پیتی. بەڵکو زمانەوان و زاراوەسازان بەدوای خواستنی وشەیەکی ڕەسەن و

بەکارهاتووی ناو زمانەکەی خۆیاندا دەگەڕێن بۆ مەبەستێکی تر و بەواتایەکی نزیک لە واتا بنەڕەتییەکە جارێکی تر بەکاری دەهێننەوە. خوازە: واتە وشەیەکی کوردی دەخوازن بەرامبەر بەو زاراوە نوێیە تاوەکو بەکاربێت؛ بەڵام ئەم ڕێبازە ناچالاکترین ڕێبازی زاراوەسازییە لەناو زمانی کوردیدا، لە چەند نموونەیەکدا بەرچاو دەکەوێ، وەک:

**الدائرة: (بازنە)** بەرامبەری لە کوردیدا بەکاردێ کە لە بازنی دەستەوە کە خڕە وەرگیراوە بۆ واتا و مەبەستێکی تری نوێی زانیاریی ئەندازەیی.

یا لە **Telegraph : برووسکە**

یاخود لە **جهاز: apparatus: دەزگا**

کەواتە ڕێبازەکانی **زاراوە وەرگرتن: بریتییە لە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ چەمک و زاراوە نوێیەکان**؛ بەڵام دواتر هەر یەکەو لەو ڕێبازانە دەڕژێنەوە ناو ئاستێک لە ئاستەکانی زمان ، واتە هەر ڕێبازێکیان پەیوەندییان بە ئاستێک لە ئاستەکانی زمانەوە هەیە. بۆ نموونە: کورداندن دەڕژێتە ناو ئاستی دەنگسازی یا بەشێکی زۆر لە ڕێبازەکانی تری زاراوەسازی دەڕژێنەوە ناو ئاستی وشەسازی لەوێشدا لەو چەند ڕێگایەی کە بۆ سازکردنی زاراوە لەبارە، بە یەکێک لە ڕێگاکان زاراوەکە ڕۆدەنرێ.

بۆ نموونە: زاراوەیەکی وەک : **((الجامعة))**: زاراوەکە بە ڕێبازی وەرگێڕانی چەمکییەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردییەوە کە زاراوەی **((زانستگا، گەلەکۆلێج، زانکۆ))**ی لە بەرامبەریدا بەکارهێنراوە، کە هی یەکەمیان بە ڕێگەی داڕشتن، هی دووەمیان بە ڕێگەی لێکدان و هی سێیەمیان بە ڕێگەی داتاشینەوە سازکراوە.

یاخود زاراوەیەکی وەک : **((right angle))**: زاراوەکە ڕێبازی وەرگێڕانی پیتی (وشە بە وشە)وە هاتووەتە ناو زمانی کوردییەوە کە زاراوەی **((گۆشەی ڕاست، گۆشەی وەستاو))** لەگەڵ **((ڕاستەگۆشە ، گۆشەوەستاو))** ی لە بەرامبەریدا بەکارهێنراوە، کە زاراوەکانی جووتە کەوانەی یەکەمیان بە ڕێگەی خستنەسەر و هی دووەمیان بە ڕێگەی لێکدان سازکراوە.

**ڕێگاکانی زاراوە دروستکردن:**

زمانەوانان و زاراوەسازان چەند ڕێگایەک دەگرنەبەر بۆ دروستکردنی زاراوە کە لەلایەن چەندین نووسەرەوە باسیان لێکراوە؛ بەڵام لە دانان و داڕشتنیاندا دەبێ پابەندی سروشتی زمان و ڕێزمانی کوردی بن.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم ڕێگایانە لە یاساوڕێسا ڕەسەن و هەڵێنجراوەکانی زمانی کوردییەوە سەرچاوە دەگرن، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێ لای نووسەران زیاتر جەخت لە دوو ڕێگەی چالاک و بەرهەمداری وشەسازی کراوە و دەکرێ کە ئەوانیش (ڕێگەی داڕشتن و ڕێگەی لێکدان)ن، ڕێگاکانی تری زاراوە دروستکردن کەم بەرهەمترن. هەر چۆنێک بێت لێرەدا دیارترین ئەو ڕێگایانەی کە دەستنیشان کراوە بۆ دروستکردنی زاراوە لە ناو کۆمەڵگەی کوردی لێرەدا دەیخەینەڕوو، بۆیە دەتوانرێ ئەم چەند رێگەیە باوەی داڕشتنی زاراوە لە زمانی کوردیدا دەستنیشان بکرێ. بۆ تێگەیشتن لە ڕێگاکانی دروستکردنی زاراوە لە خوارەوە ڕێگاکان و پێناسەیان و نموونە بۆ هەریەکێکیان دەخەینە ڕوو:

**١. ڕێگەی لێکدان:**

بریتییە لە یەکگرتنی دوو وشە یان زیاتر بۆ گەیاندنی واتایەک یا چەمکێک جا هەندێ جار بەیارمەتی ئامراز و هەندێ جاریش بەبێ یارمەتی ئامراز، لە ئەنجامدا زاراوەی لێکدراو بەرهەم دێ، ((زاراوەش کە چەشنێکە لە وشە بەهۆی ئەم ڕێبازەوە بەگوێرەی پێویست بەدرێژایی تەمەنی زمانی کوردی لەسەر چەند شێوەیەک لە لێکدان هاتۆتە ناو زمانی کوردیدا لەدایک بوو...)) (کامل حسن البصیر،١٩٧٩،٦٢). لێرەدا چەند نموونەیەک لە زاراوەی دروستکراو دەخەینەڕوو لەم ڕێگەیەوە، وەک:

**((ڕەشنووس، ئێسکەپەیکەر، دەنگەژێ، پەنجەمۆر، دەستنووس، تەنزئامێز، ڕەگەزپەرستی، کارنامە، دژەمووشەک، نیمچەکانزا، ڕۆشنەپێکهاتن، ئەستێرەناسی، خەوڕەوی، کانەخەڵووز...هتد))**

**٢. ڕێگەی داڕشتن:**

((لەناوێکی سادەی واتادار و زیادییەک لەدایک بووە جا ئەم زیادییەش پێشگر یا پاشگر یا هەردوو (پێشگر و پاشگر) پێکەوەدەبن)) (کامل حسن البصیر،

١٩٧٩،٧٠). ڕێگایەکە کە وشەیەکی سادە - وەک: ڕاناو، ئاوەڵناو، ڕەگ یا قەدی فرمان- لەگەڵ پێشگر یا پاشگرێکی وشەداڕێژ بەیەکەوە دێنێ و دەگونجێنێ، دواتر وشەیەکی داڕێژراویان لێ بەرهەم دێنێت. وەک:

**((پێنووس، کارگە، گەردیلە، لولەک، پاکانە، فڕۆکە، هەڕەمەکی، داینگە، گیرەک، نووسەک، بینەر، بێتەل، چاویلکە، شەکرە، تەنۆچکە ... هتد ))**

**٣. ڕێگەی داتاشین:**

((ڕێبازێکە بۆ سازکردنی زاراوەی نوێباو لە دوو وشەی سادە پاش قرتاندن و فڕێدانی دەنگێک یان زیاترلە یەکێک لە وشە سادەکان یان لە هەردووکیان ئەمجا بە دەم یەکتردانیان و سازکردنی زاراوەیەکی نوێ لە هەردووکیان)) (کامل حسن البصیر ١٩٧٩،٦٩) بەڵام ئەم ڕێگەیە کەمتر باوە بەراورد بە ((ڕێگەی لێکدان یا داڕشتن **خستنەسەر**)) لەناو زمانی کوردیدا بۆ نموونە:

**((کۆڕەو، زانکۆ، کارۆموگناتیسی، کارۆئاوی، وشکاوی، زەرداو، کۆئەندام، کاژێر...هتد))**

**٤. ڕێگەی خستنەسەر:** بریتییە لە خستنەسەریەکی دوو وشە یا زیاتر بە یارمەتی ئامرازی ((ی/ ە)) بەمەبەستی دروستکردنی زاراوەیەکی نوێ بۆ فەرهەنگی زمانەکەمان –لە تەوەری دووەمدا زیاتر تیشکی دەخەینەسەر-.

## تەوەری دووەم:

**ڕێگەی خستنەسەر:**

ڕێگەی خستنەسەر بریتییە لە ڕێگەیەک لە ڕێگەکانی دروستکردنی گرێ لە زمانی کوردیدا ئەم ڕێگەیە ڕێگەیەکی تازە نییە لە ئێستادا، بەڵکو لە کۆنیشدا هەر هەبووە و وشە و زاراوەی پێدروستکراوە، وەک:

**(( کانی ماسی، شێخی ڕەش، ئاسکی کەڵەک، تەختی سلێمان، چەمی چەتۆ...))**

هەروەها ئەم ڕێگەیە لە چەندین ئیدیەمی کوردیدا دەبینرێ، وەک:

**((مەڕی پێغەمبەر، پیرێژنی جادووکەر، خدری زیندە ، ئەسپێی چەنگی گول، خوێنی سیاوەش، قەزای لابەلا...))**

هەر یەک لەم پێکهاتانە لە چەند کەرەستەیەک یا بڵێین دوو وشە یا زیاتر پێکهاتوون هەریەک لەم وشانە چەمکی خۆیان هەیە، وەک:

**خدری زیندە**

**خدر**: ئاماژەیە بۆ حەزرەتی خدر

**ی**: ئامرازی خستنەسەر

**زیندە**: واتا زیندوو

جگە لەوەی کەرتەکان چەمکی خۆیان پاراستووە لە کاتی هاتنیان بەیەکەوە ؛ بەڵام لەپاڵ واتاکانیشیان چەمکێکی نوێی تریان بۆ دروست بووە کە ئەویش بۆ کەسێکی فریادڕەس و فریادگوزارە ئەم زاراوەیە بەکاردێت.

بەم شێوەیە بە خستنەسەریەکی ئەم وشانە ئیدیەم یا زاراوەیەکی نوێ بۆ فەرهەنگی زمانی کوردی دروست بووە. هەرچەندە کەرەستەکان بەجیاش کاتێ دێن لەناو فەرهەنگدا هەر چەمک و واتای خۆیان لەدەست نەداوە؛ بەڵام کە بەیەکەوەش دێن بەواتا و چەمکێکی نوێی تر بەکاردێن لە زمانەکەدا.

دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین هیچ یەک لە زمانناسان کاتێ ئاماژە بۆ ئەو ئامرازنەی کە بۆ لێکدانی وشەی لێکدراو بەکاردێ، دەکەن، ئامرازی (ی) ناگرێتەوە، ئامرازی (ی) تەنیا لە ناو گرێ بۆ دروستکردنی گرێ لە زمانی کوردیدا ڕۆڵی هەیە.

نابێ پێمان نەنگی بێت کە بڵێین ئەمانە پێکهاتەیەکی گرێین نەک وشەی لێکدراو، یا لە ژێر ناوی تردا باس بکرێن، چونکە ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەمە جۆرێک لە جۆرەکانی گرێیە، لەهەمان کاتدا ڕێگایەکی ئاسان و خێرایە بۆ بەرهەمهێنانی زاراوە لە زمانی کوردیدا، زاراوەسازان ئەم ڕێگایەیان بەکارهێناوە، بێ ئەوەی ئەمە ڕوونبکەنەوە کە لە کوێوە بناغەی ئەم زاراوانە لە فەرهەنگ و فەرهەنگۆکەکانی زاراوەسازی سەریان هەڵداوە، کە ئەم ڕێگایە لە یەکێک لە جۆرەکانی گرێوە سەرچاوە دەگرێ کە ئەویش گرێی ناوی خستنەسەرییە چەندین زاراوەی پێ دروستکراوە بۆ زمانی کوردی. بووەتە یەکێک لە ڕێگە چالاکەکانی زاراوە دروستکردن، کە تا ئێستا سەدان زاراوەی پێدروستکراوە، جگە لە دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی کوردی چووەتە ناو پەڕتووکە بڕیاردراوەکانی خوێندن و لە هەموو قۆناغەکاندا بەرچاو دەکەون، لەوانە:

**(( بواری موگناتیسی، شەپۆلی ڕادیۆ، کارەبای نیشتیمانی، خۆراکی بەسەرچوو، چەکی ئەتۆمی، دڵنیایی جۆری...هتد.))**

**چەمکی گرێ**

وشەی گرێ بەپێی بەکارهێنانی لەناو ڕستە چەند چەمکێک دەدات، بۆ نموونە:

- ئەم کارە بەتۆوە گرێدراوە: پەیوەندیی بەتۆوە هەیە.
- ئەم فەردانە گرێ بدە: دابخە.
- ئەگەر دوو گوریس گرێ بدەی: واتە تێکبخرێ و ببەسترێتەوە.
- ئەم گرێی کوێرە ناکرێتەوە : کاتێک چەندین شت تێک ئاڵا بێت و چووبن بەناو یەکتریدا.

کەواتە وشەی گرێ چەند چەمکێک دەبەخشێ لەوانە: **پەیوەندی، داخراوی، بەستانەوە، چوون بەناو یەکتری.**

**پێناسەی گرێ**

هەرچەندە چەندین پێناسە بۆ گرێ کراوە؛ بەڵام تەنیا ئەو پێناسانەی گرێمان هێناوە تاوەکو وەک پاڵپشتێک بۆ باسەکەمان سوودی لێوەربگرین، لەوانە:

- **فرێز:** لە مۆرفیمێکی سەربەخۆ یان زیاتر پێکدێت، بەمەرجێک پەیوەندییەکی سینتاکسیی بەهێز لەنێواندا هەبێت وەک **پێکهێنەرێکی گەیەنەر دەکەوێتە نێوان وشە و ڕستە** (دیار عەلی کەمال،٤٢،٢٠٠٢).

کەواتە مەبەست لەم پێناسەیە ئەوەیە گرێ لە وشەیەکی واتادار یا زیاتر پێکدێ، بەمەرجێک پەیوەندییەکی ڕێزمانیی بەهێز لە نێوانیاندا هەبێت. گرێ وەک یەکەیەکی نێوەندگیرە دەکەوێتە نێوان وشە و ڕستە یا قۆناغێکی ناوەندییە لەنێوان ئاستی وشە و ئاستی ڕستەسازیدا.

- **گرێ:** یەکەیەکی سینتاکسییە کە لە کە ڕەسەیەک یان کەرەسەیەکی سەرەکی و هەموو ئەو کەرەسانەی کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پێوەی بەندن یان لەژێر دەسەڵاتیەتی پێکدێ (ساجیدە عەبدوڵلا،١٠،٢٠١٣).

ئەم پێناسەیە: گرێ بە یەکەیەکی ڕستەسازی دادەنێ، واتە جۆرە پێکهاتەیەکی زمانییە لە ناو ڕستەدا دروست دەبێ، بەتایبەتیش ئەو بەشەی پێناسەکە زۆر گرنگە بەلامانەوە کە باس لە ناوەڕۆکی پێکهاتەی گرێ دەکات، دەڵێ: کەرستەکان (دوو وشە یا زیاتر)بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ (بە بێ ئامراز) یاخود بەشێوەی ناڕاستەوخۆ (بە ئامراز) وابەستەی یەکترین، یاخود لەژێر کاریگەریی یەکتریدان.

کەواتە لەم پێناسانەدا دەگەین بەوەی: ئەگەر گرێ پێکهاتەیەکی ناو ڕستەبێ و ڕستەش پێکهاتەیەکی ناو زمان بێ، کەواتە گرێش پێکهاتەیەکی ناو زمانە.

گرێ دەکەوێتە نێوان وشە و ڕستەوە: چونکە گرێ لە وشە پێکدێ، هەروەها ڕستەش لە گرێ پێکدێ .

لەو توێژینەوەدا گرنگی بەو گرێیانە دراوە کە لە دوو بەش یا زیاتر پێکهاتوون، هەر دوو بەشەکە دوو مۆرفیمی سەربەخۆ- وشەی فەرهەنگی- ن یا زیاتر ، کە بەبێ ئامراز، یاخود بە هۆی ئامرازەوە بەیەکەوە بەندن.

ئەم جۆرە گرێیانە نزیک دەبنەوە لە وشەی لێکدراو بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەوە؛ بەڵام لە هەمان کاتدا ناچنە خانەی وشەی لێکدراو لەبەر ئەوەی خاوەنی کۆمەڵێ تایبەتمەندیی ترن، کە جیایان دەکاتەوە لە وشەی لێکدراو .

لای زمانەوانان چەند جۆرێک لە گرێ باسیان لێوەکراوە، کە لە سەر بنەمای بەشەئاخاوتنی سەرە جیاکراونەتەوە، لەوانە: ((ناوی، ئاوەڵناوی، کاری، بەند، ئاوەڵکاری))، دەبێ ئەوە بزانرێ گرێی ناوی جیاواز لە جۆرەکانی تری گرێ، چەندین شێوەی ڕۆنانی هەیە، بەڵام لەم لێکۆڵینەوەیەدا تەنیا تیشک دەخەینەسەر ئەو گرێ ناوییانەی کە لەشێوەی خستنەسەرن بەیارمەتی ئامرازی خستنەسەری ((**ی ، ە**))، کە ئەو دوو ئامرازە تەنیا تایبەتن بە دروستکردنی گرێی ناوی خستنەسەر نەک جۆرەکانی تری گرێ، ئەو جۆرە پێکهاتانەی بەهۆی ئەو ئامرازانەوە دروستدەکرێن، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە لە زاراوەسازی و دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زمانی کوردیدا.

**خستنەسەر لە ڕووی پێکهاتەوە:**

لە خستنەسەردا بەشێوەیەکی گشتی کەرەسەکانی بریتییە لە ((**سەرە و ئامرازی خستنەسەر و دیارخەر**)) ، کە لە ڕووی ئامرازەوە: بەگشتی ئامرازی خستنەسەر ((**ی / ە**)) بەکاردێ، خستنەسەر بە لایەنی کەم لە دوو کەرەسە (سەرە و دیارخەر) ێکەوە دەست پێدەکات، بۆ زیاتر. بەشێوەیەکی تیۆری دەتوانرێ بێ پایان لەڕێگەی ئەو ئامرازانەی خستنەسەرەوە و زیادکردنی دیارخەرەکانەوە گرێیەکان درێژ بکرێنەوە؛ بەڵام بەشێوەیەکی کارەکی خەڵک گرێیەکان زۆر درێژ ناکەنەوە، وەک:

- **دار ی دەرگاکە جۆرەکەی باشە.**

سەرە ئامراز دیارخەر

- **دار ی دەرگا ی ژوورەکەت جۆرەکەی باشە.**

سەرە ئامراز دیارخەر ئامراز دیارخەر

- **دار ی دەرگا ی ژوور ی میوانەکەمان جۆرەکەی باشە.**

سەرە ئامراز دیارخەر ئامراز دیارخەر ئامراز دیارخەر

- **دار ە سەوزەکە لقەکانی شۆڕبووەتەوە.**

سەرە ئامراز دیارخەر

- **دار ە سەوزە ە بەرزەکە لقەکانی شۆڕبووەتەوە.**

سەرە ئامراز دیارخەر ئامراز دیارخەر

سەرە (دیارخراو) دەبێ ناو یا ناو ئاسابێ، کە ناو ئاسا: (( ناو / جێناو / چاوگ)) دەگرێتەوە. دیارخەرەکەش دەشێ: ((ناو / جێناو / چاوگ / ئاوەڵناو / ژمارە / ئاوەڵکار)، وەک:

- **کوڕ ی گەڕەک بەهانایەوە چوون.**

سەرە(ناو) دیارخەر(ناو)

- **ئێمە ی کورد دەبێ بێهیوا نەبین.**

سەرە(جێناو) دیارخەر(ناو)

- **نووسین ی وتار ەکە لە کاتت ناگرێ؟**

سەرە (چاوگ) دیارخەر(ناو)

- **خەمی ی تۆ خەمی منیشە!**

سەرە(ناو) دیارخەر(جێناو)

- **شوێن ی وەستان ی پاس ەکە زۆر دوور نییە.**

سەرە(ناو) دیارخەر(چاوگ) دیارخەر(ناو)

- **مرۆڤ ی باش لە هەموو شوێنێکدا هەن.**

سەرە(ناو) دیارخەر(ئاوەڵناو)

- **نهۆم ی دووەم زۆر دڵگیرە.**

سەرە(ناو) دیارخەر(ژمارە)

- **ژیان ی زوو زۆر سادە و ساکار بوو.**

سەرە (چاوگ) (دیارخەر)

سەرەڕای بوونی یەکێک لەم دیارخەرانەش بۆی هەیە، مۆرفیمی بەندی ڕێزمانیش ((ێک/ ەکە/ ان)) وەربگرن، کە ئەو مۆرفیمانەش هەر ڕۆڵی دیارخەریان هەیە، کە ئەو مۆرفیمانە دەشێ لە نێو گرێیەکە یا لە کۆتایی گرێیەکە دەربکەون، وەک:

- **گوڵی سپی بۆ دەبەم.**
- **گوڵێکی سپی بۆ دەبەم.**
- **گوڵە سپییەکەی بۆ دەبەم.**
- **گوڵە سپییەکانی بۆ دەبەم.**
- **جلێکی ئەو زۆر جوان بوو.**
- **جلەکەی ئەو زۆر جوان بوو.**
- **جلەکانی ئەو زۆر جوان بوو.**
- **پێچکێکی مێزەکەی چاکردەوە.**
- **پێچکەکانی مێزەکەی چاکردەوە.**

**خستنەسەر لە ڕووی واتاوە:**

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە زاراوەی خستنەسەری لە ڕووی پێکهاتەوە لە گرێی ناوی خستنەسەریەوە هەڵێنجراوە، هەروەها جۆرەکانی گرێی ناوی خستنەسەری لەڕووی واتاوە جیا کراونەتەوە، بەپێی ئەو پەیوەندییەی کەرتەکانی بەیەکتریەوە هەیانە، چەند جۆرێکی لێ دەستنیشان کراوە (ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی،٢٠١٤،٣١)، لەم ڕوانگەیەوە، ئەگەر سەیرێکی بکەین، دەبینین ئەو جۆرانەی خستنەسەری ڕۆڵێکی کارایان هەیە لە زاراوەی خستنەسەریدا، بۆیە بەپێی چالاکترین و بەرهەمدارترینیان لە زاراوەسازیی زمانی کوردیدا، لە خوارەوە ڕیزبەندی کراون:

١. **خستنەسەری ڕەگەزی (بەیانی):** لەم جۆرەیاندا دیارخەر ڕەگەز یان جۆری دیارخراو دەستنیشان یان بەیان دەکات (نووری عەلی ئەمین،١٩٥٦،٧٢)، بوار و سنووری سەرەکە بەیارمەتی دیارخەرەکە دەستنیشان دەکرێت. کە بە دوو شێوە دەبینرێن:

أ. **خستنەسەری دیارخەری:** کە سەرە و دیارخەر دوو ناوی گشتین. وەک:

**((خەباتی شاخ، ئەسپی دەریا، مانگی دەستکرد، بۆشایی ئاسمان، خانووی پلاستیکی، فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان، خەتی مێخی، بارانی وەرزی، نەخۆشی دەروونی ...))**

ب. **خستنەسەری بکەری یا بەرکاری:** کە سەرە و دیارخەر بریتین لە چاوگێک و ناوێکی گشتی، وەک:

**((بووژانەوەی دڵ، چاندنی گورچیلە، داخورانی خاک، خەواندنی موگناتیسی، پیسبوونی ژینگە، پاڵاوتنی نەوت، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی، پەستانی خوێن، هەڵگێڕانەوەی خاک، پێکدادانی شارستانییەکان...))**

٢. **خستنەسەری تایبەتێتی (بەش لە گشت):** جۆرێکە لە پەیوەندیی نێوان دوو وشە لە ڕووی واتاییەوە کە یەکێکیان ئاماژە بۆ بەشێک دەکات لەوەکەی تر کە ئاماژەی بۆ دەکات (یوسف شەریف سەعید،٢٠١١،١٥٥) وەک ئەم زاراوانە کە سەرەکان بەشێکن لە دیارخەرەکان:

**((پەردەی دڵ، چێوەی بازنە، تیشکی گەردوونی، گلێنەی چاو، پەینی ئاژەڵ...))**

٣. **خستنەسەری وەسفی:** لەم جۆرەیاندا پێکهاتەی خستنەسەر لە دیارخراو و دیارخەر (صفە و موصوف) پێکهاتووە ، کە دیارخەر لەم جۆرەیاندا دەبێ ئاوەڵناو بێت (ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی،٢٠١٤،٣٣)، واتە سەرە ناوە و دیارخەرەکە ئاوەڵناوە، وەک:

**((جەنگی سارد، خڕۆکەی سپی، جیهانی سێیەم، منداڵی ناکام، مرۆڤی هۆشمەند، خاکی فشەڵ، ئاسنی خاو، گۆشەی وەستاو، بۆمبی هێشوویی، تەوژمی بەرز، گوڵەوەرزییەکان...))**

٤. **خستنەسەری خاوەنێتی:** ((پەیوەندیی خاوەن و خاوەندارێتی لەنێوان دیارخراو و دیارخەر هەیە، واتە دەبێ دیارخەر توانای خاوەندارێتی هەبێ، هەروەها

سەرە (دیارخراو)یش دەتوانێ خاوەندارێتی بکات، ئەوەی باوە لەم جۆرەیاندا (دیارخەر) بە شێوەیەکی گشتی ناوی مرۆڤە)) (ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی،٢٠١٤،٣١) کۆمەڵێ زاراوە بەرچاو دەکەوێ، کە بەڕێگەی خستنەسەر سازکراون و ئەم پەیوەندییە لە نێوان سەرە و دیارخەرەکەیدا هەیە، وەک:

**((یاسای باسکاڵ، تیۆری نیوتن، ڕێبازی مارکسی ،...))**

**٥. خستنەسەری ڕوونکردنەوە:** لەم جۆرە خستنەسەرەدا بەشێوەیەکی گشتی دیارخراو ناوی گشتییە و دیارخەر ناوی تایبەتییە (رشید یاسمی و دیگران،١٣٨٠، ٥١). کە لەم نموونانەدا سەرە ناوی گشتییە و دیارخەرەکەش ناوی شوێنە، وەک:

**((جەنگی کەنداو، مرۆڤی نیاندەرتاڵ، شەڕی چاڵدێران، مافووری کاشان، گوێزی هیندی، خانووی کۆری...))**

**٤. خستنەسەری هاوڕێیەتی:** هاوڕێیەتی واتە پەیوەندیی ئاسایی وشەیەک بە هەندێ وشەی دەستنیشانکراوی تر، چەمکی هاوڕێیەتی دەگەڕێتەوە بۆ گونجانی واتەی وشەکان لەگەڵ یەکتردا لە ڕووی پێکەوەهاتنیاندا (حسن انوری و یوسف عالی،١٣٨٩، ٤٤).

**((ساڵی زاینی، چەکی کیمیاوی، مۆرکی نەتەوایەتی، موولوولەی خوێن، بۆتەی ئەدەبی...))**

٥. خستنەسەری لێکچوون (تەشبیهی): لێکچوون بە واتای چوواندنی شتێکە بە شتێکی تر، واتە لە نێوان دیارخراو و دیارخەر پەیوەندیی لێکچوون هەیە (حسن انوری و یوسف عالی،١٣٨٩،٤٤).

خستنەسەری چوواندن (مشبە) بە بەو چوێندراو(مشبە بە): لەم جۆرەیاندا دەبێ (بەو چوێندراو) ئاشکراتر و ڕوونتر لە (چوواندن) بێت، واتە (چوواندن)مان بۆ ڕوون نییە، بە (بەو چوێندراو) دەچوێنین تا بۆمان ڕوون بێتەوە، بۆ ئەوەی لە مەبەستی قسەکەر بگەین، وەک:

**((دەسەڵاتی چوارەم، شۆڕشی سەوز، یاسای دارستان، خەباتی ژێرزەمینی...))**

**٦. خستنەسەری خواستن (میتافۆر):** خواستن جۆرێکە لە خوازەی زمانی و بریتییە لە بەکارهێنانی وشەیەک بۆ دەربڕینی واتەیەکی تر بێجگە لە واتای دروستی

وشەکە، پەیوەندیی نێوان واتای دروست و واتای خوازەیی وشەکە هەمیشە لێکچوونە؛ بەڵام یەکێک لە هەردوو بناغەکەی فڕێ دراوە، دەبێ نیشانەیەکیش هەبێ کە ئێمە مەبەستمان بەم وشەیە واتا خواستراوەکەیە نەک واتا دروستەکە بڕوانە: (کامل حەسەن عەزیز، ١٩٨١،٩٧) (بەکر عومەر عەلی مەعرووف،٢٠،٢٠٠٠)

**((دەستی کار، تیشکی سەوز، هێڵی هەژاری ، کارتی سوور، خەڵاتی نۆبڵ...))**

**گرێی ناوی خستنەسەری و زاراوەی خستنەسەری**

پەیوەندی و هاوبەشی زاراوەی خستنەسەری بە گرێی ناوی خستنەسەریەوە ئەوەیە کە زاراوەی خستنەسەری بەشێکە لە گرێی ناوی خستنەسەری، چونکە زاراوەی خستنەسەری بە هەمان ئەو یاسا و ڕێسایانەی گرێی خستنەسەری دروستدەکرێ- کە لە بابەتی پێشوو خستوومانەتەڕوو - چونکە گرێی ناوی خستنەسەری و زاراوەی خستنەسەری هەردووکیان کەرەسەکانیان بریتییە لە ((سەرە و دیارخەر))، هەروەها بەشە ئاخاوتنەکانی ((سەرە و دیارخەر))ەکانی زاراوەی خستنەسەری هەر لە هەمان جۆری گرێی ناوی خستنەسەرن، لە هەمان کاتدا هەر ئامرازی خستنەسەری ((ی / ە)) لە پێکهاتەیاندا بەکاردەهێنرێ، وەک:

- **<u>گوڵە سوورەکانی</u> کەمە.**

**گوڵ + ە + سوور + ەکە + ان = گرێی خستنەسەری**

سەرە ئامراز دیارخەر دیارخەر دیارخەر

- **<u>خڕۆکە سوورەکانی</u> کەمە.**

**خڕۆکە + ە + سوور + ەکە + ان = *زاراوەی خستنەسەری***

سەرە ئامراز دیارخەر دیارخەر دیارخەر

- **توێژینەوە لەسەر <u>منداڵی ساوا</u> دەکات.**

**منداڵ + ی + ساوا = گرێی خستنەسەری**

سەرە ئامراز دیارخەر

- **توێژینەوە لەسەر <u>منداڵی بلووری</u> دەکات.**

**منداڵ + ی + بلووری = *زاراوەی خستنەسەری***

سەرە ئامراز دیارخەر

• بەڵام ئەوەی زاراوەی خستنەسەری جیادەکاتەوە لە گرێی خستنەسەری ئەوەیە: زاراوەیەکی خستنەسەری لە چەند کەرەستە پێکهاتبێ هەر هەموویان هەمان بەها و نرخیان هەیە، لەمەدا لە وشەی لێکدراو دەچێت نەک گرێ، هەرچی لە گرێدا «هەموو کەرتەکان بەها و نرخی ڕێزمانییان (وەکو یەک) نابێت، بەڵکو کەرەسەیەک تێیاندا دەبێ بە(سەرە)» (ساجیدە عەبدوڵڵا،٢٠١٣،١١). بۆیە لە گرێی خستنەسەر دەتوانرێ دیارخەرەکان لابرێن، تەنیا سەرە (دیارخراو)ەکە بمێنێتەوە؛ بەڵام لە زاراوەی خستنەسەردا ناتوانرێ دیارخەرەکان لابرێن، چونکە هەموو کەرتەکان هەمان بەها و نرخیان هەیە، بەیەکەوە زاراوەیەکیان دروستکردووە، بۆیە بەلادانی هەر کەرتێکی زاراوەکە و چەمکەکەشی تیادەچێ.

• ئەو زاراوانەی لای زاراوەسازان بەڕێگەی خستنەسەر دروستکراون، چەسپاون و چوونەتە ناو فەرهەنگەوە؛ بەڵام هەموو جۆرەکانی گرێی بە خستنەسەریشەوە لای خەڵک بە کاتی دروستدەکرێن و دەتوانرێ بەردەوام گۆڕانکارییان تیا بکرێ.

• جیاوازییەکی تر کە لە نێوان زاراوەی خستنەسەری و گرێی خستنەسەری لەوەدایە. کاتێ گرێیەکی خستنەسەری دەبێت بە زاراوە ئەوکاتە بە بەشەکانی گرێیەکە لەمەولا بەسەریەکەوە بۆ چەمکێکی دیارکراو بەکاردێن وەک هەر وشەیەکی لێکدراو یا داڕژاو ...هتد. کە بۆ مەبەستێک ڕۆنراون. بەسەریەکەوە دەچنە ناو فەرهەنگەوە لەناو ڕستەشدا نابێ لێک هەڵوەشێنرێتەوە، یا هیچ مۆڕفیمێکی ڕێزمانی بکەوێتە نێوانیان، وەک:

- **من چووم بۆ <u>خاچی سوور</u>.** **خاچی سوور** : (زاراوەی خستنەسەری)
- **من چووم بۆ <u>خاچێکی سوور</u>.** **خاچێکی سوور** : (گرێی خستنەسەری)

**زاراوەی خستنەسەر و وشەی لێکدراو**

ئەگەر بوترێ ڕێگەی لێکدان ڕێگایەکی چالاکی وشەسازی و زاراوەسازییە، ئەوا ڕێگەی خستنەسەر ئەگەر لەم بڕەوی زیاتر نەبێت کەمتر نییە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو زاراوانەی کە لە فەرهەنگە زاراوەسازییەکان و تەنانەت لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەبینرێ و دەبیسترێ، بەشێکی زۆری لە جۆری خستنەسەرە.

لە بنەڕەتدا زاراوەی خستنەسەر لە ڕووی پێکهاتەوە سەرچاوەکەی لە گرێوە هاتووە؛ بەڵام لە سنووری گرێوە دەرچووە و چووەتە ئاستی زاراوە و وشەی فەرهەنگییەوە و لەناو ڕستە و فەرهەنگی کوردیدا ئەم پێکهاتەیە مامەڵەی وەک هەر وشەیەکی داڕێژراو یا لێکدراو لەگەڵدا دەکرێ جارێکی تر بەچاوی گرێوە سەیر ناکرێ.

دەتوانرێ لە چەند خاڵێکدا هاوبەشیی نێوان زاراوەی خستنەسەر و وشەی لێکدراو دەستنیشان بکرێ، لەوانە:

١.زاراوەی خستنەسەر: بریتییە لەو جۆرە گرێیانەی لە دوو وشە یان زیاتر پێکدێن، کە وشەکان خراونەتە پاڵ یەکتری بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەر (ی یا ە) هەرچی وشەی لێکدراوە: بریتییە لە دوو یان چەن شێوەیەکی (مۆرف) سەربەخۆ واتادار یا بێ واتا. لە دوو وشە یا وشە و ڕەگ و قەد بەهۆی ئامرازەوە یا ئامراز پێکدێن، وەک: دڵشاد، گوڵەگەنم، دار بادەم....هتد (رفیق شوانی، ٢٠١٤،١٨٩) بە یارمەتی ئامرازی ((ە، و، بە، لە... ))

٢.ئەمەی وایکردووە کە هەندێ جار جیاوازی نەکرێ لەنێوان وشەی لێکدراو و گرێ ئەو تایبەتمەندیەی گرێیە کە وەک ((یەکەیەکی سەربەخۆیە لە رەفتاردا دەگوازرێتەوە بۆ پێشەوە یان دواوە ڕستەکە تێک ناچێت ، واتە کەرتەکانی گرێ هەموویان پێکەوە دەجوولێن نەک یەکێک لە کەرەستەکانی بگوازرێنەوە و لە ڕستەشدا پاش و پێشیان پێ بکرێ)) (ساجیدە عەبدوڵلا ، ٢٠١٣،١١) کە لەمەدا گرێی خستنەسەر یاخود زاراوەی خستنەسەر لەم تایبەتمەندییە لە وشەی لێکدراو دەچێ، کە کەرتەکان وابەستەی یەکترین. لەڕستەدا بەیەکەوە دەجوولێنەوە، نابێ لێک جیا بکرێنەوە.

٣.کەرتەکانی وشەی لێکدراو جۆرە پەیوەندییەکی واتایی لە نێوانیاندا هەیە لە جۆری دیارخەر و دیارخراوی یا بکەر و کار یا بەرکار و کار هتد. هەروەها زاراوەی خستنەسەریش چەندین جۆر لەم پەیوەندییە واتاییانە لە نێوانیاندایە.

٤.هەروەک چۆن کەرتەکانی وشەی لێکدراو بەگشتی لە دوو کەرت پێکهاتوون، وەک: **(( کارنامە، گوڵبەدەم، دوورەدەست، تیروپشک...))**. ڕێژەی ئەوانەی کە لە دوو کەرت زیاترە واتە ئەوانەی لە سێ کەرت پێکدێن زۆر کەمە بۆ

نموونە: **((پاشەکشەکردن، سەرئاوکەوتن، لەهۆشخۆچوون، دەستنیشانکردن، لەخۆدەرچوون...))**، هەروەها ئەوانەی کە لە چوار کەرت پێکدێن ڕێژەیان یەکجار کەمتر دەبێتەوە بۆ باری دەگمەن، هەروەها ژمارەی کەرتەکانی زاراوەی خستنەسەر بەهەمان شێوەیە. زاراوەی خستنەسەر بە شێوەی :

دوو کەرت: **((مرۆڤی سەرەتایی، جەمسەری باکوور، مانگی دەسکرد، یارییەئاگرینەکان، تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان...))**

سێ کەرت: **(( درەختە هەمیشە سەوزەکان، شەڕی یەکەمی جیهانی، پشتێنەی جەمسەری باشوور، مافی چارەی خۆنووسی...))**

بەم جۆرە لە کاتی کارکردن بەم ڕێگەیە ڕەچاوکردنی ئەم ڕێژانە سەرکەوتنی زاراوەکە بە ڕێگەی خستنەسەر دەستەبەر دەکات.

٥.زاراوەی خستنەسەر لە وشەی لێکدراو دەچێ لەو ڕووەوەی هەموو کەرتە پێکهێنەرەکانی هەمان بەها و نرخیان هەیە، بەیەکەوە چەمکێکیان دروستکردووە لەبەر ئەمە ناتوانرێ هیچ کەرتێکیان لاببرێن، وەک:

- **لەماڵەوە پەنجەی خانمی دروستکرد.** **پەنجەی خانم:** زاراوەی خستنەسەر
- **لە دادگادا پەنجەمۆری کرد.** **پەنجەمۆر:** وشەی لێکدراو

٦.وشەی لێکدراو بەوە ناسراوە کە مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی، وەک: ((ێک، ەکە، ەکان، ان)) ناتوانرێ بچنە نێو بەشەکانی وشە لێکدراوەکە لە کاتێکیشدا ئەمە ڕوو‌بدات ئەوا دوور دەکەوێتەوە لە کرۆک و واتای وشە لێکدراوەکە، بەمەش وشە لێکدراوەکە هەڵدەوەشێتەوە و دەبێتە گرێیەکی ئاسایی، بۆ نمونە:

- **گوڵەباخێکم بۆ بێنە.** **گوڵەباخ:** وشەی لێکدراو
- **گوڵێکی باخەکەم بۆ بێنە.** **گوڵێکی باخەکە:** گرێی ناوی خستنەسەری
- **دار گوێز لە چیاکاندا زۆرە.** **دار گوێز:** وشەی لێکدراو
- **ئەمە لە داری گوێز دروست کراوە.** **داری گوێز:** گرێی ناوی خستنەسەری

ڕەفتارکردن زاراوەی خستنەسەری ڕەفتاری وەکو وشەی لێکدراوەکانە، چونکە قبوڵی مۆرفیمی ڕێزمانی ناکات لە ناوەوەیدا، بێگومان زاراوەی خستنەسەری دەبێ وەک هەر وشەیەکی لێکدراو ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ، لە ڕووی بەکارهێنانی لەناو ڕستەوە، هەروەک چۆن وشەی لێکدراو قبوڵی مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی ناسیاوی

نەناسیاوی کۆیەکان ناکات بێتە نێو کەرتەکانی، بەهەمان شێوەش زاراوەی خستنەسەری ئەمە قبوڵ ناکات، هەرکاتێ ئەم جۆرە مۆرفیمانەی بخرێتە نێوانی کەواتە زاراوەکە هەڵدەوەشێتەوە و دەبێتە گرێیەکی ئاسایی وەک هەر جۆرێک لە جۆرەکانی گرێ ناوی خستنەسەری، وەک:

- **ئەم باسە هێڵی سوورە.   هێڵی سوور**   : زاراوەی خستنەسەری
- **ئەم باسە هێڵەکانی سوورە.   هێڵەکانی سوور**   : گرێ ناوی خستنەسەری

ئەوەی زاراوەی خستنەسەری جیادەکاتەوە لە وشەی لێکدراو:

١.بەکارهێنانی ئامرازی (ی) تایبەتە بەگرێی ناوی خستنەسەری و زاراوەی خستنەسەری، چونکە ئەو ئامرازانەی کە بۆ لێکدانی وشەی لێکدراو بەکاردێن بریتین لە: ((ە، بە ، تا ، لە ...هتد))، بەهیچ شێوەیەک تا ئێستا هیچ زمانەوانێک ئامرازی (ی) بە ئامرازێکی لێکدانی وشەی لێکدراو دانەناوە، ئامرازی (ی) تەنیا لەناو گرێدا دەبینرێ و بەکاردێ، کەواتە ئەو زاراوانەی بەهۆی ئامرازی ((ی)) دروستکراون، ناتوانین بڵێین وشەی لێکدراون یاخود لەناو وشەی لێکدراودا پۆلینیان بکەین، بەڵکو دەبێ وەک ڕێگایەکی تری وشە ڕۆنان بۆ زاراوە دروستکردن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ.

٢.ئامرازی لێکدانی (ە) ڕۆڵێکی کارای هەیە لە دروستکردنی وشەی لێکدراودا بە بەراورد بە ئامرازەکانی تری لێکدان، وەک: **((مێرگەسوور، وشکەساڵی، بەردەڕەش، گوڵەباخ، ڕەشەوڵاغ، سوورەماسی، مانگەشەو، کۆنەفرۆش، پیرەمێرد...))**

بەڵام زاراوەی خستنەسەر بە ڕێژەیەکی زۆر لە زۆربەی بارەکاندا بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەری (ی) دروستدەکرێن؛ بەڵام بە ڕێژەیەکی کەم بە یارمەتی ئامرازی خستنەسەری (ە) دروستدەکرێن، تەنیا لەو بارانەدا نەبێ، کە دیارخراوەکە کۆیە و نیشانەی کۆیەکەش دەچێتە سەر کۆتا کەرتی زاراوەکە – دیارخەرەکە- ، هاوکات نیشانەی ناسیاویشی لەگەڵ وەردەگرن، ئەگەر نا بەگشتی لەو سنوورە دەرناچن، وەک:

**الاشجار المتساقطة: درەختە گەڵاوەریوەکان**
**الحشرات الضارة: مێرووە زیانبەخشەکان**
**العناصر الغذائية: توخمە خۆراکییەکان**

**ئەنجام:**

لە ئەنجامدا گەیشتووم بە چەند خاڵێک لەوانە:

١.جیاکردنەوەی ڕێبازەکانی زاراوە وەرگرتن لە ڕێگەکانی زاراوەدانان ، چونکە ڕێبازەکانی زاراوە وەرگرتن بریتین لە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ چەمک و زاراوە نوێیەکان؛ بەڵام ڕێگەکانی زاراوە دروستکردن بریتین لە داڕشتنەوەی چەمکەکان لە بۆتە ڕێزمانییەکاندا، کە مەبەست لە بۆتەی ڕێزمانی یاساکانی ڕۆنانی وشە و گرێ و ڕستەکانی زمانێکی دیاریکراوە.

٢.ڕێبازەکانی زاراوە وەرگرتن بریتین لە: خواستن و کورداندن و وەرگێڕانی چەمکی و وەرگێڕانی پیتی و خوازە و پێوانەیی؛ بەڵام ڕێگاکانی دروستکردنی زاراوە بریتین لە: لێکدان و داڕشتن و داتاشین و خستنەسەر.

٣.ڕێگای خستنەسەر لە زمانی کوردیدا لە کۆنیشدا هەر هەبووە، ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە بەرهەمهێنانی چەندین زاراوە و ئیدیەم. ڕێگای خستنەسەر پێکهاتەیەکی سادەی هەیە و بەیارمەتی ئامرازی خستنەسەری ((ی / ە)) دروست دەکرێ، بۆیە ڕێگایەکی ئاسان و خێرایە بۆ زاراوەسازکردن.

٤.خستنەسەر لە ئاستی ڕستەسازیدا بریتییە لە ڕێگەیەک لە ڕێگەکانی دروستکردنی گرێ؛ بەڵام لەناو زانستی زاراوەسازیدا سوودی لێوەرگیراوە، بووەتە ڕێگەیەک لەڕێگە چالاکەکانی دروستکردنی زاراوە.

٥.تایبەتمەندییەتی زاراوەی خستنەسەر لە سەرێکەوە لە گرێ نزیکە و لەسەرێکی تریشەوە لە وشەی لێکدراو ، چونکە لە ڕووی پێکهاتەوە زاراوەی خستنەسەر لە گرێی ناوی خستنەسەریەوە هاتووە، هەروەها زاراوەی خستنەسەری دەچێتە ناو فەرهەنگەوە، مامەڵەی وەک هەر وشەیەکی داڕێژراو یا لێکدراو لەگەڵدا دەکرێ، جارێکی تر بەچاوی گرێوە سەیر ناکرێ.

**سەرچاوەکان**

**کتێبی کوردی:**

١. بەکر عومەر عەلی مەعروف (٢٠٠٠)، میتافۆر لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی.
٢. جەمال عەبدول (٢٠٠٨)، بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی: چاپی دووەم، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٤٥) دهۆک
٣. ڕەفیق شوانی (پ. د.) (٢٠١٤)، وشەسازی زمانی کوردی، چاپی دووەم، کەرکوک: کۆمەڵگای چاپخانەی داودی.
٤. ڕۆژان نوری عبدالله (٢٠٠٧)، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا سلێمانی.
٥. ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی (پ.ی.د) (٢٠١٣)، چەند لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی، هەولێر: چاپخانەی حاجی هاشم.
٦. ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی (پ.ی.د) (٢٠١٤)، جۆرەکانی خستنەسەر(الاضافة) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٢٩)، هەولێر.
٧. شەهاب شێخ تەیب تاهیر (د. )(٢٠١٢)، بنەما و پێکهاتەکانی زاراوە لە زمانی کوردیدا، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی.
٨. عەبدولجەبار مستەفا مەعروف (٢٠٠٥)، دروستەی فرێز لە زمانی کوردیدا، ماستەر سلێمانی
٩. کامل بصیر( د.) (١٩٧٤)، زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی، بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاری.
١٠.کامل حسن البصیر( د.) (١٩٧٩)، زاراوەی کوردی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی.
١١.کامل حەسەن عەزیز بەصیر (١٩٨١)، زانستی ئاوەڵواتا، بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق.
١٢.کەمال جەلال غەریب (٢٠١٢)، پڕۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، چاپی دووەم، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.
١٣.محەمەد وەسمان (٢٠٠٤)، گیرو گرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا، هەولێر. کامل حسن البصیر ١٩٧٩
١٤.نوری عەلی ئەمین (١٩٥٦) قەواعدی زمانی کوردی، بەغدا.
١٥.یوسف شەریف سەعید (٢٠١١) زمانەوانی، هەولێر: چاپخانەی ڕۆژهەڵات.
١٦.یوئێل یوسف عەزیز(د.)، سەلمان داود ئەلواستی (د.)، عەبدولوەهاب ئەلنەجم (١٩٨٢) وەرگێڕانی ئەدەبی، و. غازی فاتح وەیس. چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین.

**فەرهەنگی کوردی:**


١٧. بەدران ئەحمەد حەبیب (٢٠٠٥)، فەرهەنگی زاراوگەلی ڕاگەیاندن، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

١٨.جەلال مەحمود علی (١٩٨٢ ) ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا. بغداد: بڵاوکراوەی حسام.

١٩.جەمال جەلال حوسێن، دلێر سابیر ئیبراهیم (٢٠٠٨)، زاراوگەلی کاروباری مین، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

٢٠.حەمە ساڵح فەرهادی (٢٠٠٧)، چەپکێک لە زاراوگەلی کشتوکاڵ، هەولێر: چاپخانەی دەزگای ئاراس.

٢١.عوبێد خدر(٢٠٠٧)، فەرهەنگی کۆمەڵناسی، هەولێر: چاپخانەی دەزگای ئاراس.

٢٢.عەبدوڵڵا غەفور(د) (٢٠٠٧)، فەرهەنگی جوگرافیای دانیشتوان، چاپی یەکەم، دهۆک: چاپخانەی خانی.

٢٣.عەبدوڵڵا غەفور(د) (٢٠٠٨)، فەرهەنگی جوگرافیای کوردستان، چاپی سێیەم، دهۆک: چاپخانەی خانی.

٢٤.عەبدولوەهاب شێخانی (٢٠١٣). فەرهەنگی ڕەنگ، هەولێر: چاپخانەی موکریانی .

٢٥.کۆمەڵێك مامۆستا (٢٠٠٧)، فەرهەنگی هەراشان کوردی ــ کوردی. هەولێر: کۆڕی زانیاری کوردستان .

٢٦. کەمال غەمبار(٢٠٠٦) ، زاراوەی ڕاگەیاندن، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

٢٧.محمد چیا (٢٠٠٤)، فەرهەنگی فەلسەفی، سلێمانی، کتێبی کوردی.

٢٨.مەسعود عبدالخالق (٢٠٠٨)، مەوسوعەی جودی بۆ چەمک و زاراوەکانی سەردەم، بەشی یەکەم، هەولێر: نووسینگەی تەفسیر.


سەرچاوەی عەرەبی:


٢٩.محمد احمد

٣٠.محمد داود(د) (٢٠١٧) هل تموت اللغة؟!، صدى البلد،

https://www.elbalad.news/2908525

٣١.محمد علي الخولي (١٩٨٢)، معجم علم اللغة النظري، لبنان: بیروت.


**سەرچاوەی فارسی:**


٣٢.حسن انوری و یوسف عالی (١٣٨٩)، دستور زبان فارسی ١ ، تهران: مرکز چاپ و انتشارات دانشگاه پیام نور

٣٣.رشید یاسمی و دیگران (١٣٨٠) دستور زبان فارسی (پنج استاد)، چاپ ششم، تهران: چاپخانەی رامین.

**الملخص**

**دور الاضافة في علم المصطلح**

تعني هذه الدراسة الموسومة ب ((دور الاضافة في علم المصطلح)) ببيان الدور الذي تؤديه الاضافة في صنع المصطلحات وإيجادها في اللغة الكوردية، بوصفها وسيلة من وسائل المستعان بها في صنع العبارة الاسمية، من منطلق أن المصطلح هو بحد ذاته اسم.

و المصطلحات التي تصنع وتتكون عن طريق الاضافة شأنها شأن أية كلمة أو اسم مركب يتم التعامل معها في أثناء الاستعمال وفي المعاجم كذلك ويمكن الفرق بينهما في تركيبهما ولا سيما في المجال والأدوات التي تتمثل فيها.

وقد اعتمدت الدراسة منهجا وصفيا تحليليا ونطاق الدراسة هو اللهجة الكوردية والوسطى وأمثلتها مأخوذة من الكتب و المعاجم والمعاجم الاصطلاحية.

و الدراسة في مجملها مكونة من المقدمة ومحورين يعني محورها الأول المعنون ب ((علم المصطلح)) بالحديث بعلم المصطلح والمناهج المتبعة في صنع المصطلحات وطرق صناعتها.

أما محورها الثاني الموسوم ب((دور الإضافة في علم المصطلح)) فيلقي الضوء على مفهوم العبارة وتعريف الاضافة، وبيان نقاط التلاقي والتقاطع بين العبارة الاسمية والكلمة المركبة، ودور الاضافة في صنع المصطلحات في اللغة الكوردية. وتنهي الدراسة مشوارها بخاتمة، مودع فيها أهم الاستنتاجات التي توصلت إليها الدراسة.

**الكلمات الدالة:** علم المصطلح، المصطلح، الاضافة، العبارة الاسمية، الكلمة المركبة،

## Abstract

### The role of addition in terminology

The paper which is entitled ”The role of addition in terminology” focuses on terminology and the role addition plays in forming terms in Kurdish. Addition is a means of forming noun phrase and this is useful in terminology as terms themselves are nouns.

The terms that are used in this way are dealt with as words or compound noun in their use and in dictionaries, but they differ in their structure, which is obvious in their field and method.

The methodology of the research is an analytic description of middle Kurdish dialect. The examples are takes from books, dictionaries, and also from terminological dictionaries related to this dialect.

The research is made of two parts besides the introduction and conclusion:

The first aspect is “Terminology” takes terms, definitions, processes of borrowing terms and the ways of forming terms.

The second aspect is entitled” The role of addition in terminology” this part focuses on the concept and definitions of the phrase addition similarities and differences between phrases and compound words, noun phrase addition and the term of addition, this part focuses on the role of addition in terminology.

Finally, the conclusions arrived at are summarized in several points.


**Keywords:** Terminology**,** Term**,** Addition**,** Noun phrase**,** Compound word**.**

# بنەما فەلسەفی و زانستییەکانی ڕاڤەکردنی وشە لە دەقە ئەدەبییەکاندا

## کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دەیەم بە نموونە

**پ.ی. د. ئەحمەد محەمەد مام عوسمان قەرەنی**
ڕاوێژکاری پەروەردەیی خانەنشین

**کورتەی توێژینەوەکە:**

ڕاڤەکردنی وشەکان لە دەقە ئەدەبییەکاندا، کارێکی ئالۆزە و زۆر جاریش ئیشکالیەتێکی زمانەوانی و هزری دروست دەکات. بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنە نەرێنییەکانی ئەم پرۆسەیە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دەیەمی ئامادەیی بە نموونە وەرگیراوە، کە لە دوو لایەنەوە بنەما فەلسەفی و زانستییەکانی ڕاڤەکردنی وشەکان تێدا ڕەچاو نەکراون: لە لایێکەوە وشە بەرانبەر بە وشە دانراون، کە پێکهاتەی چەمکەکانیان یەکتر ناگرنەوە. لە لایێکی دیکەشەوە، هەندێك وشە بە هەڵە واتاکانیان ڕاڤەکراون. لە دوو بەشی ئەم توێژینەوەیەدا هەوڵدراوە ئەو هەڵە و کەموکورتییانە چارەسەر بکرێن و تێکالۆزبوونەکانیشیان سەرڕاست بکرێنەوە. بۆ ئەم مەبەستە، وشەکان لەڕووی فەلسەفەی ڕەوانبێژی و واتاکانیان بەپێی تیۆرە ئەدەبییەکانەوە لێکدراونەتەوە. دواتر لەگەڵ تیۆرەکانی زمانەوانیدا بەراوردکراون، دەرئەنجامەکانیشیان لەسەر چوار دەقی ئەدەبی کتێبی ناوبراودا پراکتیزە کراون و بەپێی ڕۆڵ و پێگەی وشەکان لە سیاقی ئاخاوتندا هەڵەکانیان ڕاستکراونەتەوە. توێژینەوەکە لە کۆتاییدا چەند ئەنجامێکی خستۆتەڕوو و دوو پێشنیازیشی پێشکەش کردووە بە مەبەستی ڕێکخستنەوەی بابەتەکانی ئەدەبی کوردی لە پرۆگرامەکانی خوێندندا.

وشە سەرەکییەکان: وشە، ڕاڤەکردن، واتای ناوەندی، زمانی ئەدەبی، سیاق.

**پێشەکی:**

بنەما تیۆرییەکانی ڕاڤەکردنی وشە لە زمانی کوردیدا، هێشتا لە چوارچێوەی بەرنامەڕێژییەکی زانستیدا لێك نەدراونەتەوە و ڕێکارە فێرکارییەکانیشی لە ناوەندەکانی خوێندندا تەواوکاری یەکتر نین. ئەمەش کێشەیەکە و دەرهاوێشتەکانی لەم دوو پرسیارەدا کۆدەکرێنەوە:

– بۆچی ڕۆنان و ڕاڤەکردنی وشە لە پرۆگرامەکانی خوێندنی زمانی کوردی لە قۆناغی زانکۆدا لەسەر بنەمای پرۆگرامەکانی قۆناغی ئامادەیی دانارێژرێن؟

– بۆچی پرۆگرامەکانی قۆناغی فێرکردنی ئامادەیی لەژێر ڕۆشنایی پرۆگرامەکانی خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی لە قۆناغی زانکۆدا دانانرێن؟

لەنێو ئەو هەردوو پرسیارەدا، پرسیارێکی دیکەی بنەڕەتی سەرهەڵدەدات: ئایا دابڕانێکی زانستی لەنێوان ناوەندەکانی خوێندنی هەردوو وەزارەتدا هەیە، کە ڕێگر بێت بۆ ڕێکخستنەوەی کارێکی لەو ئاستەدا پێویست بێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی سەرەوە، پشت بە دوو میتۆدی کارکردن بەستراوە:

– یەکەمیان، میتۆدی وەسفییە، کە لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی ڕەوانبێژییەوە لە وشە دەکۆڵێتەوە و ئەنجامەکانیشی لەڕووی فێرکردنەوە لەگەڵ تیۆرەکانی ئەدەبیدا بەراورد دەکرێن.

– دووەمیان، میتۆدی شیکارییە، کە بەپێی تیۆرییەکانی زمانەوانییەوە ڕۆڵی وشە لە ئاخاوتندا هەڵدەسەنگێنرێت و هەوڵدەدرێت هەڵەکانی لەنێو دەقە ئەدەبییەکاندا ڕاست بکاتەوە.

گرنگیی ئەم توێژینەوەیە خۆی لەو ئامانجەدا دەبینێتەوە، کە فێرخوازان ڕۆنانی وشەکان لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا بناسنەوە و واتاکانیان لە سیاقی ئاخاوتندا تێبگەن. سنووری توێژینەوەکەیش لەڕووی شوێنەوە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دەیەمی قۆناغی ئامادەیی دەگرێتەوە و لەڕووی کاتیشەوە چوار بابەت لە وەرزی یەکەم و دووەمی بەشی ئەدەبی کتێبی ناوبراو وەك نموونە وەرگیراون. لەڕووی ئاکادیمیشەوە تەنیا لە وشە دەکۆڵێتەوە و وەك یەکەیەکی واتایی لێکدەداتەوە.

ستراکچەری توێژینەوەکە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە، لەبەر ئەوەی ڕاڤەکردنی وشە لە کتێبەکانی پرۆگرامی زمان و ئەدەبی کوردیدا بابەتێکی نوێیەو - بەپێی زانیاریی توێژەر - یەکەم جارە بەپێی بنەما فەلسەفی و زانستییەکانەوە لێی دەکۆڵرێتەوە، بۆیە بەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیە بۆ لایەنی تیۆری تەرخانکراوە و تێیدا جەخت لەسەر چەمکی وشە دەکات و لە هەردوو لایەنی ڕووکار و ڕۆنانەوە لێکدەداتەوە و پێوەندییەکانیشی لەگەڵ یەکەکانی دیکەی زمان شیدەکاتەوە و جۆرەکانیشی دەستنیشان دەکات. بەشی دووەمیش، بۆ لایەنی پراکتیکی تەرخانکراوە و بەپێی بنەما زانستییەکانییەوە پێگەی وشەکان لەنێو بابەتە ئەدەبییەکاندا شی کراونەتەوە و هەڵەکانی بەکارهێنانیشیان ڕاست کراونەتەوە.

لە کۆتاییدا ئەنجامی توێژینەوەکە و دوو پێشنیاز و لیستی ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێوەرگیراوە و پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتەڕوو.

## بەشی یەکەم
## چوارچێوەی تیۆری توێژینەوەکە

### زاراوە و چەمك و تایبەتییەکانی زمانی ئەدەبی

زمانی ئەدەبی زاراوەیەکی ئاوێتەییە و دەکرێت چەمکەکەیشی لەم پێناسەیەدا کورت بکرێتەوە کە، ((دیالێکتێکی پاراوە و بەرهەمە ئەدەبییەکان چ شیعر بێت یان پەخشان پێی دەنووسرێنەوە)) (Al Khuli, 1986: 72). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ((ئەدەب زمانێکی تایبەتی بە خۆوە هەیە و لە نووسینەکانی دیکە جودایە، بۆیە زمانی ئەدەبی سەرەڕای واتا بنەڕەتییەکەی هەندێك واتایی دیکەیش بەخۆوە دەگرێت)) (عزام، ١٩٦٤: ١٤٤). ئەم فرەواتایەی زمانی ئەدەبی جودایە لەو زمانە گشتییەی ((خەڵك لە ژیانی ئاسایی خۆیاندا بەکاریدێنن، کە لەوانەیە شێوەزارێك بێت و دەکرێت زمانێکی دیکەیش بێت، بەڵام زمانێکی ئەدەبی نییە و زۆر جار ناشنووسرێتەوە)) (التونجی، ١٩٩٩: ٧٣٩)، بۆیە ئەو زمانە گشتییە زیاتر زارەکییە. هەندێك لە زمانەوانان لەو باوەڕەدان کە ((ئەو زمانە ئاساییەی

گەل قسەی پێدەکات، لەڕاستیدا زمانی پاراوەیی خۆی دەشێوێنێت)) (عبدالنور، ١٠٧٩: ٢٢٧). بەپێی ئەم کاریگەرییە ناهاوسەنگییەی، کە لەنێوان زمانی ئەدەبی و زمانی ئاسایی قسەکردندا هەیە، ڕاستییەك سەرهەڵدەدات، کە هەر یەکێکیان لە ئاستێکی جیاوازدا پێگەی خۆی لە پلەبەندیی زماندا هەیە. بنەماکانی ئەو جیاوازییەش لە وردیی دەربڕین و پانتایی جوگرافی بەکارهێنانیاندا دەردەکەوێت. کەواتە دوو جۆر گۆتار لە زماندا هەن: زمانی نووسراو و زمانی قسەکردن (نەنووسراو). هەر یەکێکیان لە چەندین بەش پێکهاتووە. ئەوەی هەموویان پێکەوە دەبەستێتەوە زمانی پێوانەییە، کەواتە چالاکی و گەشەکردنی هەر بەشێکیان ڕاستەوخۆ پێوەندی بە زمانی پێوانەییەوە هەیە. ئەوەی ئەم توێژینەوەیە جەختی لەسەر دەکات زمانی نووسراوە. زمانی نووسراویش لەدوو بەش پێکهاتووە: زمانی ئەدەبی و زمانی فەرمی. ئەوەی پێوەندی بەم توێژینەوەوە هەیە زمانی ئەدەبییە، ئەویش لە سێ بەش پێکدێت:

١– زمانی ئەدەبی دێرین، کە جێگەی لەنێو مێژووی ئەدەبیدا گرتۆتەوە و وشەکانیشی زۆر جار پێویستییان بە ڕاڤەکردنەوە هەیە، کە هەندێکیان تەنیا لەنێو فەرهەنگەکاندا ماون. بۆ ئەم مەبەستەیش فەرهەنگی تایبەت بە وشەکانی دیوانی چەندین شاعیری کلاسیکی کوردیش دانراون، لەوانە فەرهەنگی دیوانی شاعیران نالی ـ سالم ـ کوردی (مارف، ٢٠٠٧: ٤) و فەرهەنگی مەم و زینی ئەحمەدی خانی (گەردی، ٢٠١٦: ٥)... .

٢– زمانی ئەدەبی هاوبەش، کە ئاڕاستەکراوە و لەنێو خەڵکیشدا باوە و بەکاردەهێنرێت و دەقەکانیشی ـ کە هەردوو بەشی ئەدەبی میللی و ئەدەبی فۆلکلۆری نووسراو دەگرێنەوە ـ هەڵگری لایەنێکی گرنگی بەها جوانەکانی کۆمەڵن. هەندێکیان ئاستێکی هونەری بەرزیان هەیە وەك هەڵبەست و بەیت و چیرۆك. هەندێکی دیکەیان واتایەکی چڕ و نزیك لە هەست و بیرکردنەوەی خەڵکەوە هەیە، وەك (کورتە گۆتن ـ Aphorism) و (پەندی ناوداران ـ Maxim) و (قسەی نەستەق ـ Epigram)، کە نووسراونەتەوە و لە قسەکردنی ئاساییدا بەکاردەهێنرێن (قەرەنی، ٢٠١٧: ٢٢٦). ئەم جۆرە زمانە ئەدەبییە هاندەرێکە، کە زمانی ئاسایی بەرەو ئاستێکی باڵاتر ببات.

٣-زمانی ئەدەبی دەستکرد، کە ئەدیبان و بە تایبەتی شاعیران دایدەهێنن و وشەی نویٚ و دەستەواژەی سەروادار و دەربڕینە میتافۆرییەکان دەهێننە نێو زمانی ئەدەبییەوە. ئەمەیش زیاتر لە زمانی ئەدەبی نوێخوازدا بەکاردێت، کە بەهۆی لادانەوە بەرەو ئەندێشەیەکی فرەوانەوە دەڕوات و بەپێی فانتازیایەکی قووڵەوە لە ناخی مرۆڤدا شۆڕ دەبێتەوە و فۆرمێکی ڕامان ئاوێتەیی هەیە. لەو نێوەندەدا ڕەخنەی ئەدەبی کەلێنی لەنێوان دانەر و وەرگردا پڕدەکاتەوە.

بەپێی لێکدانەوەی سەرەوە، ئەو ڕاستییە سەرهەڵدەدات، کە ((زمانی ئەدەبی ورووژاندنی هەڵچوونەکانە و هەموو بێژەو وشە تەمومژاوییەکان و هاوواتا و هاودژەکان لەخۆ دەگرێت و ئایرۆنیشی بە بنەمای بووژانەوەی خۆی دادەنێت)) (عبدالرحمن، ١٩٧٩: ٥٠). ئەم تایبەتمەندییانەی زمانی ئەدەبی کە بە زمانی سۆزیش ناودەنرێت، بەشێکی سەرەکییە لە زمانی نووسراو، هەر وەکو لەم هێڵکارییەی خوارەوەدا ڕوون دەکرێتەوە:




بەپێی ئەم هێڵکارییەی سەرەوە، زمانی ئەدەبی پێگەیەکی کاریگەری هەیە و بەشێوەیەکی فرەوان بەکاردێت. بەواتایەکی دیکە دەتوانین بڵێین، کە زمانی ئەدەبی لە ئاستێکی باڵاترە و هەتا ڕادەیەکی زۆریش کۆکراوەی سەرجەم

دیالێکتـەکانی زمانـە، بۆیـە بـەردەوام هەوڵـدەدرێت هەڵکشـانێکی بـاڵا بـە زمـانی قسەکردن بدرێت، بۆ ئەوەی بەرەو زمانی ئەدەبی بڕوات. ئەو هەوڵدانـەش بـە دوو ڕێگە ئەنجام دەدرێت:

١– لـە ڕێگـەی خـودی زمانـەوە، کـە لـە نێـو دەقـە ئەدەبییەکانـدا داهێنـان دەکرێت و ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە نووسەرەکانیانەوە هەیە.

٢– لەڕێگەی فێرکردنەوە دەبێت، کە فێرخوازان لـە ناوەنـدەکانی خوێندنـدا فێربکرێن، پەرە بە زمانی ئاسـاییان بـدرێت و بـەرەو ئاسـتی زمـانی ئەدەبییـەوە بەرزبکرێتەوە.

ئەم توێژینەوەیە، پێوەندییەکانی هـەر دوو خـاڵی سـەرەوە لێکدەداتـەوە. کاریگەرییان بەراورد دەکات. لەو بەراوردکردنەوەشدا زیـاتر جـەخت لەسـەر خـاڵی دووەم دەکـات، کـە لـە ناوەنـدەکانی خوێندنـدا پێـڕەو دەکرێـت. ئـەو پێڕەوکردنـەوەش بـەپێی پلانێکـی پەسـەندکراوی پرۆگرامـەکانی خوێندنـەوە ڕێکدەخرێت.

**پێگەی وشە لە زمانی ئەدەبیدا:**

یـەکێك لـە لایەنـە سـەرەکییەکانی ڕێکخسـتنەوەی پرۆگرامـەکانی خوێنـدنی زمـان و ئـەدەبی کـوردی، دەستنیشـانکردنی پێگـەو ڕۆڵـی وشـەیە لـە ئاخاوتنـدا، ئەمەیش پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، ئەم ئاڵۆزییەش لە ئەنجامی ئەوەدا دروست دەبێت، کە ((وشە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە دەگوێزرێتـەوە بـۆ بەشـێکی دیکـەی ئاخـاوتن. لەئەنجامی ئەو ڕاگوێزانەشـدا، وشـە خاسـیەتی پێشـووی نـامێنێ و شـێوەی نـوێ وەردەگرێ و لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەرکی سینتاکسـی دەگۆڕێـت)) (مارف، ١٩٧٩: ١٣). لـەنێو ئـەو گۆڕانکارییەشـدا دەقـە ئەدەبییـەکان بـە شـێوەیەك ڕێکـدەخرێن، کـە ((وشـەکانی ڕسـتە تێکهـەڵکێش و تێکچـڕاون، لـەمیانی دەربڕینیانـدا بـە تونـدی پێکەوە بەستراون. هەر وشەیەکیش لەنێو ئاخاوتنی پێکەوە بەستراودا؛ توخمێکی دەنگی تێدا نییە، کە سـەرەتا و کۆتاییەکـەی دەستنیشـان بکـات)) (أنیس، ١٩٨٤: ٣٩). ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت، کـە واتـای ڕاسـتەقینەی وشـە لـەنێو ڕسـتەدا دەردەکەوێت، بۆیە لە فەرهەنگسازیدا بۆ هەر وشـەیەك نموونـەی بـەکارهێنانی لـە ڕستەدا ڕووندەکرێتەوە.

هەرچەندە ئەم بۆچوونانەی سەرەوە لەبارەی وشەوە پرسێکی کۆنە و لەنێو بابەتە زمانییەکان و بۆچوونە فەلسەفییەکاندا شیکراوەتەوە، بەڵام کە کراوەتە بنەمایەکی سەرەکی لە دانانی پرۆگرامەکانی خوێندندا، وەرچەرخانێکی گەورە لە پرۆسەی فێرکردنی فەرمیدا دروستبوو. توێژەران ڕەخنەی توندیان لە پێڕەوکەرانی ڕێچکەی کۆنی دانانی پرۆگرامەکانی خوێندن دەگرت، لەو باوەڕەدا بوون، کە ڕاڤەکردنی وشە بەرانبەر وشە لە هەمان زماندا کارێکی دروست نییە و ئەو ڕاستییەیان دەسەلماند کە ((دەبێت ئەو بۆچوونە ڕەت بکرێتەوە، کە وشەکان تەنیا واتای سنوورداریيان هەیەو ئەوەی گۆتاریش دەیکات تەنیا پێکهاتەی ئەوان واتایان شیدەکاتەوە)) (Richards, 1965: 9). بۆ سەلماندنی ئەم ڕەتکردنەوەش، بە پێویست دەزانرێت کە لە لایەنی فەلسەفی و زمانەوانی و ڕەخنەی ئەدەبییەوە لێکبدرێتەوە و ئەنجامی کارەکانیشیان لە یەك مەبەستدا کۆبکرێتەوە و بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- لە ڕووی فەلسەفییەوە:**

ڕاڤەکردنی وشە لەنێو بابەتە فەلسەفییەکاندا مێژوویێکی دێرینی هەیە. لە هزری یۆنانیی کۆندا لەژێر زاراوەی لۆگۆس لێکدراوەتەوە، کە ((فرە واتایە: بێژە، دەستەواژە، گۆتار، عەقڵ، هزر، بیرۆکە، واتای قووڵی بوون، هزری خوداوەندی، کە وشە خۆی ڕووناکی ژیانە)) (خلیل، ١٩٨٩: ٢٤٧). ئەم هەوڵە زۆرانەی کە لەبارەی وشە دراون، هەموویان لەنێوان شتە بەرجەستە و نابەرجەستەکاندا دەخولانەوە. دواتر لەنێو بیروباوەڕی ئایینی مەسیحیدا زیاتر بووژایەوە و سەرەتا و ناوەڕۆك و ئەنجامەکانی هەموو شتەکان لەنێو وشەکاندا شیدەکرانەوە ((لە سەرەتاوە وشە هەبوو، وشە لە لای خودایە و وشە خودا بوو. ئەمە لەسەرەتاوە لای خودا بوو. هەموو شت بەو دروستکراون و بەبێ ئەویش هیچ شتە دروستکراوەکان نەدەبوون.)) (زیادە، ١٩٨٦: ١٥٤). هەر چەندە ئەم بۆچوونانە، وەك کارێکی سەرەتایی و سادە دەردەکەون، بەڵام بە درێژایی چەندین سەدە وشەیان کردبووە پرسێکی فەلسەفی و لەسەر چەندین ئاستدا لێی دەکۆڵرایەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەوڵی دیکەیش لە دەرەوەی هزری ئایینییەوە نەبووبن و چەمکی وشەیان لێك نەدرابێتەوە و لەنێو زماندا شی نەکرابێتەوە، کە ((فرەواتایە و لە

سیاقی بەکارهێنانیدا مۆرکێکی خوازەیی هەڵدەگرێت... خوازەیش ئەوەیە کە ناوێك گوزارشت لە شتێك دەکات بۆ شتێکی دیکە بگوازێتەوە: گوازتنەوەکەیش یان لە ڕەگەزێکەوە بۆ جۆرێك، یان لە جۆرێکەوە بۆ ڕەگەزێك، یان لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دیکە ئەنجام دەدرێت..)) (أرسطوطاليس، ١٩٥٣: ٥٨). ئەم شیکردنەوەیەش، لەنێو بۆچوونە فەلسەفییەکاندا ڕەگی داکوتاوە و زۆربەی فەیلەسووفەکان هاوڕابوون کە ((وشەکان چەندین ڕێگەی جیاوازیان هەیە لە واتابەخشیندا، واتای هەر وشەیەکیش هەمیشە بەپێی ئەو سیاقەی تێدا بەکارهاتووە دەردەکەوێت)) (بدوي، ١٩٩٦: ٢٥٧). ئەمەش ئەنجامێکی لۆجیکییە و خۆی نزیکی ئەو بۆچوونە دەکات، کە دەبێت واتای وشە بەپێی شیکردنەوەی چەمکەکەیەوە ڕاڤە بکرێت. لێرەدا گرنگیی فێرکردنی چەمکەکان لە وانەوتنەوەدا سەرهەڵدەدات و بۆچوونی چەندین بیرمەندی دیکە سەرڕاست دەکاتەوە، کە ((فەلسەفە بە هونەری دروستکردنی چەمکەکان دادەنێن)) (اليعقوبي، ٢٠١٤: ٣٠٣). چەمکیش لەڕووی زمانەوانییەوە وشەیەکە یان هێمایەکی تایبەتە، کە ئاماژە بە جۆرێکی دەستنیشانکراوی شتەکان یان ڕووداوەکان یان هێماکان دەکات، بەڵام ئەم ئاماژە پێکردنە ((لە فەلسەفەدا هەموو وشەکان ناگرێتەوە. ئەوانەی بەکاردێنێت جیاوازن لەوانەی خەڵکی ئاسایی بەکاریاندێنن، بۆیە ئەرکیەتی کە تەنیا ئەو چەمکانەی تایبەت بە خۆوە شی بکاتەوە)) (هويدی، ١٩٩٣: ١٤٩). ئەم تایبەتمەندیەیش ڕێگە بۆ فێرکردنی بنەما فەلسەفییەکان خۆشدەکات. بە هەبوونی ئەم پرۆسەیە بۆشاییێکی گەورە لەنێو لایەنەکانی زانستی لە پەروەردەکردنی فەرمیدا پڕدەکرێتەوە، کە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر گەشەکردنی هزری فێرخواز هەیە. ئامانجەکانی وانەی ئەدەبیش لەم گەشەکردنە هزرییەدا مسۆگەر دەبێت. لە هاوسەنگکردنی هەردوو لایەنی ئەدەبی و فەلسەفی لە پیداگۆگیدا، دەرئەنجامێکی پەسەندکراو بەدەستەوە دێت، کە زۆربەی فەیلەسووف و توێژەرانی ئەدەبی لەسەری کۆکن ئەویش ((دەبێت دەست لەو داواکارییە هەڵبگرین، کە هەر وشەیەکی واتایەکی دەستنیشانکراوی هەیە. ئەمە لە سروشتی زماندا نییە، لەوانەیە وشەیەك بەپێی بارودۆخی جیاوازەوە چەندین واتای هەبێت)) (زيدان، ١٩٨٥: ١٨٧). بەپێی سەلماندنی ئەم ڕاستییەوە بنەمایێکی سەرەکی لە دانانی پرۆگرامەکانی خوێندنی ئەدەبدا فەراهەم دەبێت.

**٢- لەرووی تیۆرەکانی زمانەوانییەوە:**

زمان لە رووی رۆنانەوە لە فۆنێم و برگەو مۆرفیم و وشە و رستە و گوتار پێکدێت. بەپێی ئەم بۆچوونەوە بێت، فۆنیم بە بچووکترین یەکەی زمان دادەنرێت و گۆتاریش وەك هەندێك لە زمانەوانان بە ئاخاوتنیش ناودەبەن گەورەترین یەکەی زمانە. ئەوەی لە نێوەندی ئەم زنجیربەندییەوە جێگەی گرتووە وشەیە. چەندین تیۆری زمانەوانی جەخت لەسەر رۆڵی دەکەن، لەوانە (تیۆری واتایی ئۆزگود ـ The theory of meaning of Osgood) لەبواری واتا و کاردانەوە نێوەندگیرییەکانییەوە، کە جەخت لەسەر ئەندازەی وەلامدانەوەی واتا بەرانبەر وشە تاکەکان دەکەن، وشەکانیش وەك هێما بە مەرجەوە دەبنە بەشێك لە کاردانەوەی گشتی شتەکان (شمس الدین، ٢٠٠٣ : ١٧١). لەو کاردانەوەشدا، بەشەکان پێویستییان بە ریزبەندیێکی رێك هەیە، ئەوەی ((پێوەندییەکانی هەر توخمێکی لەگەڵ پێکهاتە گشتییەکەیدا لێکدەداتەوە و لە هەموو ئاستەکانی سینتاکسی و مۆرفۆلۆجی و فۆنۆلۆجیدا پێشەنگی بۆ ئەرك نەك فۆرم و بۆ واتا نەك رۆنانەکەی دادەنێت (تیۆری ئەرکی مۆرفیمەکانە ـ Tagmemic theory))) (خلیل، ١٩٨٩: ٢٤٨). ئەوەی بنەماکانی هەردوو تیۆری سەرەوە سەرراست دەکاتەوە (تیۆری واتای وشەکانی ماوەر ـ Mowrer's words meaning theory) ـە، کە پێوەندی لەنێوان بێژە و واتادا شیدەکاتەوە، بێژە تاکەکانیش دانەنراون بۆ ئەوەی واتاکانیان لە خۆیاندا بزانرێت، بەڵکو تا پێکەوە رێکنەخرێن سوودیان دەرناکەوێت (شمس الدین، ٢٠٠٣ : ١٧٢- ١٧٣). ئەوەی سوودی ئەو رێکخستنەوەیش شیدەکاتەوە (تیۆری واتایە ـ Theory of meaning)، کە((پێوەندیی وشە بە واتاوە و پێوەندیی هەردووکیان بە شتێك یان کەسێك یان بوونەوەرێکەوە لە دەرەوەی زمان دیاری دەکات)) (Al khuli, 1991: 28) . دەرئەنجامی لێکدانەوەی بۆچوونەکانی تیۆرەکانی سەرەوە، ئەو راستییە دەسەلمێنن کە، زمان تەنها کۆمەڵە وشەیەك نییە، بەڵکو ((سیستەمێکە وشەکان تێدا بەشێوەیەکی توند پێکەوە بەستراون و بەپێی هەندێ یاسای دەستنیشانکراوی هەر زمانێکەوە رێکدەخرێن)) (مراد، ١٩٨٣: ١٩٣). ئەوەی مەودای رێکخستنی وشەکانیش دەستنیشان دەکات (تیۆری واتای ناوەندی ـ Core Meaning Theory) یە. ئەم تیۆرە کار لەسەر ئەو راستییە دەکات کە ((هەر

وشەیەکی زمان چەندین واتای هەیە و یەکێکیان بە واتای ناوەندی و ئـەوانی دیکـە بە لاوەکی دادەنرێن و بـەپێی دووری و نزیکییـان لـە واتـای ناوەندییـەوە ڕیزبەنـد دەکرێن)) (شمس الدین، ٢٠٠٣ : ١٧١). کەواتە وشەی ناوەنـدی واتایـەکی ڕاسـتەقینەی هەیە و واتا لاوەکییەکانیشی وەك خوازە ئەرکێکی ناڕاستەوخۆی واتـایی دەبیـنن، لەوانەیە ((واتایەکەی بگۆڕدرێت ئەگەر لە سـیاقێکی دیکـەدا دانـرا و دەکرێـت ئـەو سیاقە وشەکەی بـۆ پێچـەوانەی واتاکەیشـی بگوازێتـەوە)) (ویس، ٢٠٠٥: ١٣٧). ئـەم گوازتنەوەیەش لەلایەن هەندێ زمانەوانانەوە بـە تێکـەڵی وشـە ناودەبـەن و ((لـەو باوەڕەدان کە بەشێك لە واتای وشە بـە هـۆی هاوڕێکانییـەوە دەردەکـەوێت "ئـەو وشانەی کە دەبنە دراوسێ یان دەوروبەری دەگـرن" ئاشـکرایە کـە بـە گـوێ دانـە قەوارەی وشە دەتوانین زۆر واتا لەیەکتر جیـا بکەینـەوە)) (فتـاح، ١٩٩٠: ١٧٦). ئـەم هاوڕێیەتییەی باس دەکرێت هەموو جۆرە وشەکانی دەگرێتەوە ((تەنانەت پێشـگر و پاشگرەکانیش بەپێی شوێنی بەکارهێنانیان واتاکانیان دەگۆڕێت)) (بدوی، ١٩٩٦: ٢٦٤)، بە تایبەتی کە واتاکەی جێگیر بێت و بەپێی ئەو مۆرفیمەی دەچـێتە سـەری واتای نوێی وشەکە دروست دەکات. وشەکانی زمانی کوردیش دوو جـۆرن: وشـەی تەواو (Auto-semantic word) کە دەتوانن وەك ئەندامێکی ڕستە خۆیان بنـوێنن و وشەی ناتەواو (Syntactic word) کـە ((سـەربەخۆ نـاتوانن وەك ئەنـدامێکی ڕسـتە خۆیان بنوێنن، بەڵکو دەوریان یاریدەدانی وشە تەواوەکانی بەشەکانی ئاخاوتنە لە بەجێهێنانی ئەرکەکانیاندا، بەتایبەتی لە دەربڕینی واتایانـدا و پێکـەوە بەسـتنیان لە ڕستەدا)) (مارف، ١٩٧٩: ١٠–١١). لە نێو وشە تەواوەکانیشدا وشەی لیکسیم هەیە، کە ((وشەیەکی ڕووتە و لەوانەیە چەندین واتا و چەندین بەکارهێنانی هەبێت)) ( Al khuli, 1991: 152). لـەم سـۆنگەیەوە ((پێویسـتە پێوەنـدیی نێـوان فـۆرمی وشـە و واتاکەی ڕوون بکەینەوە، کـە لـە ئـەنجامی هەنـدێ دیـاردەی زمـانی لـە وشـەکاندا ڕوودەدەن و دەبنــە هــۆی تەمومــژی واتــایی (فەرهــەنگی)، وەك لــە دیاردەکــانی هاوبێـژی و فرەواتـادا بەدیـدەکرێن)) (عـەلی، ٢٠١١: ٩٢). ئـەوەی زمـانی کـوردی لـە لۆژیکی نێوخۆییەوە دوور دەخاتەوە ئەوەیە، کە واتای هەنـدێ لـە مۆرفیمـەکانی پێشگر و پاشگر لە وشەدا جێگیر نین و چەندین واتا لەگەڵ هەمان وشەدا دروسـت دەکەن، کەواتە هەر یەك لەوانە دوو جار ئەرکی وشە دەگۆڕن، جارێك لەنێو خودی

خۆیدا و جارێك لە سیاقی ئاخاوتندا. بۆ نموونە پاشگری (وە) چەندین واتای هەیە کاتێ بە وشەوە دەلکێنرێت، لە یەکێ لە توێژینەوەکاندا واتای ئەم پاشگرەی دەستنیشانکراوە (فەخری، ١٩٧٣: ٢٥١). ئەو فرەواتاییەی پاشگری (وە)، کار لە واتای وشەکە دەکات و لە دەستنیشانکردنی وردی دەربڕینەوە دووردەخاتەوە و ((بەهای زمانیش لە تواناکانیدایە کە بە دەربڕینێکی توست و ورد گوزارشت لە واتا و هزرەکانەوە بکات)) (بدوي، ١٩٩٦: ٢٧١). بەپێچەوانەوە مۆرفیمی ڕێزمانیش هەیە، کە ((بەشی یەکەمی گوزارشت لە مۆرفیمێك دەکات و بەشی دووەمیشی ئەرکێکی ڕێزمانی هەیە)) (Al khuli, 1991: 176) ئەم جۆرە پاشگرانە واتاکانیان جێگیرە و بەپێی ئەو وشەیەی دەچێتە سەری، واتای وشە نوێیەکە دروست دەبێت، وەك پاشگری (ەر) کە دەچێتە سەر مۆرفیمێك و واتای پیشەیەك یان کارێك دروست دەکات، وەك (نووس + ەر: نووسەر) یان (پارێز +ەر: پارێزەر).

ئەوەی زانایانی زمان لەسەری کۆکن ئەوەیە کە ((ڕێکخستنی وشە لە ڕۆنانێکی ئاوێتەیی فرە ئاستدا بەهاییێکی ڕامانی یەکبوویی پێ دەبەخشرێت، کە بتوانێت لەسەر ئەو ئاستە جیاوازانەدا ئەرکەکانی جێبەجێ بکات)) (فضل، ١٩٧٨: ٢٣٢). ئەمەش ئەو ڕاستییە دەگەیەنێت، کە زمان لە سیستەمێك پێکهاتووە و ئەستەمە لە توخمەکانی تێبگەین ئەگەر لە چوارچێوەیەکی گشتی و پێوەندییە ئاڵوگۆڕییەکانی نێوانیاندا نەبێت. لەمیانی ئەم ڕاستییەشدا، کە پوختەییێکی هەڵێنجراوی کارەکانی فردیناند دی سوسێرە، گرنگییەکەی دەردەکەوێت و بە ئەڵقەیەکی بەستنەوە لەنێوان بۆچوونە زمانەوانییەکانی دێرین و تیۆرە هاوچەرخەکاندا دادەنرێت (Culler, 1997: 58). بۆچوونە زمانەوانییەکانی دێرینیش ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە کەلتووری دەقەرەکەمانەوە هەیە، بە تایبەتی بۆچوونەکانی عەبدولقاهیر ئەلجورجانی، کە ((دەکرێت ئاخاوتنەکە لە واتای خۆیدا لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیەکی دیکە بگوازییەوە، بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری لە گۆکردنەکەیدا بکەیت، یان وشەیەکی لە شوێنی خۆیەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگۆڕی)) (الجرجاني، ١٩٥٩: ٢٤٣). ئەم گوازتنەوەی جورجانی شیدەکاتەوە، نزیکە لەو ((دووالیزمەی کە لەنێوان ڕامانە دەق ئامێزەکان و ڕامانە قەراغ نشینەکاندا هەیە، کە ئەوانیش بە دوو چەمکی دیکەی هاوبەشەوە پەیوەستن: واتای ناوەندی

و واتای سێبەر)) (المسدي، ٢٠٠٤: ٩١). ئەم پێوەندییەیش دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو هاوکێشەیەی لەنێوان وشەی ڕاستەقینە و خوازەدا هەیە، کە هەردووکیان پێکهاتەیێکی هاوبەش لەنێوان ڕەخنەی ئەدەبی و زمانەوانیدا ڕێکدەخەن. تیۆرە زمانەوانییەکانی هاوچەرخیش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن، کە واتای وشە لە سیاقی ئاخاوتندا دەردەکەوێت، بەڵام لە کتێبەکانی زمان و ئەدەبی کوردیدا، نە ڕاستییەکانی کەلەپووری زمانەوانیی دەڤەرەکەمان لەبەرچاو دەگرن و نە بنەماکانی تیۆرە هاوچەرخەکانیش پێڕەو دەکەن.

**٣–لەرووی ڕێبازە ئەدەبییەکانەوە:**

واتای وشە لە ڕستەدا، مەرج نییە هەمان واتا فەرهەنگییەکەی وەربگرێت. ئەم لادانە لە دەقە ئەدەبییەکاندا زیاتر بەدی دەکرێت و مەودایێك لەنێوان واتا جیاوازەکاندا دروستدەکات. یەکێ لە شاعیران لەو باوەڕەدایە، کە دەقی ئەدەبی ((فەرهەنگی زمانی بژاردەیە و وشەکانیشی واتا باڵارییەکان لەخۆدەگرن)) (عبدالصبور، ١٩٩٣: ١٢٩). مەبەست لە واتا باڵارەکانیش ئەوەیە، کە وشەکان ((پەیام گەیەنەرن و چەندین واتا دەبەخشن، لە پەیامێکی ڕووتەوە بەرەو مەبەستەکانی ئاکاری و چاکسازی و ئایینی و سیاسی دەڕۆن)) (الطاهر، ١٩٨٣: ١٨). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بەپێی جووڵەی وشە لە ڕستەی ئەدەبیدا واتاکەیشی دەگۆڕێت. ئەم گۆڕانکارییەش ڕێژەییە و لە شیعردا پتر دەبینرێت، بەتایبەتی ((لە شیعری باشدا پێوەندییەکانی وشەکان یەکجار پتەون))(Wellek, 1980: 173). ئەم بۆچوونەیش خۆ لە بنەمایێکی تیۆری دەربڕینەوە نزیك دەکاتەوە، کە ((هەڵبەست ڕیزبەندییەکی تایبەتی وشەکانە و چێژەکەیشی خۆ لە ڕێکخستنەوەی ڕێکوپێکی زماندا دەبینێتەوە)) (ماضي، ٢٠٠٥: ٥١). زمانی ئەدەبیش بەپێی دوو ڕێبازی هاودژەوە واتاکانی لێك جیادەکرێنەوە، ئەویش:

– لایەنی شیعریەتە کە هەوڵدەدات لە ڕێگەی شیکردنەوەی ئەو بوارانەی کە واتا خۆی تێدا دەردەخات بهەڵێنجێنرێت.

– لایەنی دیکەیشی کە هێرمنیۆتیکایە لە دەقەوە دەست پێدەکات و هەوڵدەدات واتایێکی نوێی بۆ بدۆزێتەوە، کە لەگەڵ واقیعدا بگونجێت (Culler, 1997: 62). ئەو دۆزینەوەیەش ((هەر دیاردەیەکی دەگرێتەوە کە واتاکەی پێویستی بە

ڕاڤەکردن بێت)) (توفيق، ۲۰۰۲: ۸۷). ئەم جۆرە ڕاڤەکردنەیش لە واتای وشە دووردەکەوێتەوە.

لەنێوان هەر دوو لایەنی هاوکێشەی سەرەوەدا، واتای وشە زیاتر بەرەو لایەنی شیعرییەتەوە دەڕوات و لە ناوەرۆکی ئەم توێژینەوەیە نزیك دەبێتەوە و گریمانەکانیشی لە نێو تیۆری خولقاندندا بەشێوەیەك ڕەنگی دەداتەوە، کە ((شیکردنەوەی هەڵبەست لە لایەنی پێکهاتەی زمانەوانییەوە بە سیستەم و دەستە و ئاوێتە و پێوەندییەکانەوە ڕوون دەکرێتەوە و لەلایەنی پێکهاتەی تەکنیکییەوە بە واتا و هێماکانەوە شیدەکرێتەوە)) (ماضي، ۲۰۰۵: ٦٤). ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە واتای وشە بەپێی هەردوو لایەنی زمانەوانی و تەکنیکییەوە لە سیاقی دەقی ئەدەبیدا دەردەکەوێت، کەواتە لە ((سیاقی ئەدەبیدا؛ ئەو وشەیانەی لەپێش و لە پاش وشەکەدا دێن چۆنیەتی ڕاڤەکردنی دەستنیشان دەکەن)) (Richards, 1965: 32). ئەم ئەنجامە سەلمێنراوەیەش ئەوەندە خۆ لە ڕاستی نزیك دەکاتەوە، کە هەموو گومان و مژدارییەکان دەڕەوێنێتەوە و ئەو بۆچوونانەیش پووچەڵ دەکاتەوە کە لەو باوەڕەدا بوون وشە واتایێکی جێگیری هەیە.

لە ئەنجامی لێکدانەوەی بۆچوونەکانی هەر سێ لایەنی فەلسەفی و زمانەوانی و ئەدەبییەوە، واتای وشە لە سیاقی ئاخاوتندا دەردەکەوێت و مەرج نییە هەمان واتا فەرهەنگییەکەی جێگیر بێت. ئەمە ڕاستییەکە و لەنێو کەلەپووری زانستی دەڤەرەکەمان و تیۆرە زانستییەکانی هاوچەرخیشدا سەلمێنراوە. لەنێوانیاندا خاڵە وێکچووەکان زۆرن. بۆچوونەکانیشیان لە زۆر ڕوویەکەوە یەکدی دەگرنەوە.

ئەوەی پێوەندیی بە زمان و ئەدەبی کوردییەوە هەیە، لەڕووی بەرهەمەوە دەوڵەمەندە و لەڕووی جۆریشەوە داهێنانی باشی تێدا کراوە، بەڵام لێژنەی دانانی پرۆگرامەکانی زمان و ئەدەبی کوردی، پشتیان بە هەر دوو سەرچاوە نەبەستووە و فەرامۆشیان کردوون. بەپێی تێڕوانینە نەریتگەراییەکانیانەوە ناوەرۆکی کتێبەکانیان داڕشتووە و پشتیان بە هیچ تیۆرێکی زمانەوانییەوە نەبەستووە. ئەو ڕێچکەیەی پێڕەویان کردووە گەلەپرسیارێك دەورووژێنێت. لە بەشی دووەمدا هەوڵدەدرێت لەمیانی ڕاڤەکردنی چەند وشەیەکی لە نێو دەقە ئەدەبییەکانی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دەیەمدا وەڵامیان بدرێتەوە.

## بەشی دووەم:
## پراکتیزەکردنی ڕاڤەکردنی وشەکان لە چەند دەقێکی ئەدەبیدا

لە کۆتایی هەر بابەتێکی بەشی ئـەدەبی کتێبـی زمـان و ئـەدەبی کـوردی - پۆلی دەیەمی ئامادەییدا و لەژێر ناوونیشانی (لێکدانەوەی وشەکان)دا، خشتەیەکی دوو ئەستوونی وەك فەرهەنگۆکەك ڕێکخراوە و لەلای ڕاستەوە وشـەیەك دانـراوە و بەرانبەرەکەی واتایەکەی دەستنیشان کراوە، جاری واش هەیـە دوو وشـە بـە یـەك واتا ڕاڤەکراون و مانای دوو وشە یان زیـاتریش بـە یەکسـانی بـەراوردکراون، بـەبێ ئـەوەی ئامـاژە بـە پێگـە و ئـەرکیان لـە سـیاقی ئاخاوتنـدا بکرێـت، یـان لەگـەڵ پێچـەوانەکانیاندا بـەراورد بکـرێن، یـان چـەمکەکانیان ڕاڤـە بکـرێن، یـانیش بەکارهێنانیان لە ڕستەدا ڕوون بکرێتەوە، بەڵکو وشە بەرانبەر وشە دانراوە. ئەمـە ئیشکالیەتێکی ئاڵۆزە و لە دوو لایەنەوە گفتوگۆ هەڵدەگرێت. لـە لایەنێکـەوە ئـەم ڕاڤەکردنەی وشەکان پشت بە بنەمایەکی زانستی نابەستێت، لە هەندێك شوێنیشدا هاودژە لەگەڵ تیۆرەکانی تایبەت بە زمانـەوە. لـە لایـەنێکی دیکـەوە، هەنـدێك لـە وشەکان بە هەڵە لێکدراونەتەوە، کە واتاکانیان لەگەڵ وشە فەرهەنگییەکانی زمانی کوردیـدا یـەکتر ناگرنـەوە، تەنانـەت واتاکانیـان لـە دەربڕینـەکانی زمـانی ئاسـایی قسەکردنیشەوە نزیك نابنەوە. هەندێ لە شارەزایانی زمان و ئـەدەب، ئـەم جـۆرە ناساندنی وشەکان کە واتایەکی جێگیر و دەستنیشانکراویان هەیە، بە دیاردەیەکی ترسناکی پاشکەوتوو وەسف دەکەن و کاریگەری نەرێنیشی لەسەر ئاستی زانستی فێرخوازان دەبێت، لەم بارەوە ((جێگیربوونی واتای وشەکە لە بەرقەراربوونی ئـەو سیاقانەدا دروست دەبێت کە واتا بە وشەکە دەبەخشن، بۆیە جێگیربوون لە واتای وشەکاندا شـتێك نییـە کـە بـە گریمانـە وەربگیرێـت، بـەڵکو هەمیشـە دەبێـت شـی بکرێتەوە)) (Richards, 1965: 11). ئەگەر ئەم بۆچوونەی سـەرەوە لەگـەڵ نـاوەڕۆکی دوا چاپی کتێبی پرۆگرامی خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی پێڕەوکراو لە هەرێمی کوردستاندا بەراورد بکرێت، ئەوە کێشەیەکی دیکەی دوو لایەنی سەرهەڵدەدات:

١- لێڵـی و تەمومـژاوییێك لـەنێوان واتـای دوو وشـەدا پەیـدا دەبێـت، کـە ناولێنانیـان لـە ئـەنجامی کردەوەیـەکی هاوبەشـدا بەدەسـت نـەهاتووە. هـەر واتایـەکیش گوزارشـت لـە شـتێك بکـات، یـان تێگەهشـتنێك ڕووبـدات، ئـەوە بـە

کردەوەیەکی سێکوچکەیییەوە پەیوەستە، کە لەنێوان سەرچاوە و هێما و هێمابۆکراوەکاندا ڕێکدەخرێت (المسدي، ٢٠٠٦: ١١٨)، بەڵام کە ئەو پێوەندییەی لەنێوان پێکهاتەکانی کردەوەی ئەو سێکوچکەیە نەما، ئەوە واتاکەشی دەشێوێت و ئەرکی کردەوەی سێکوچکەیەکی دیکە هەڵدەگرێت.

٢- ستراکچەری زمان لەنێوان دەقە نووسراوەکان و قسەپێکەرانی تێکدەدات، بە تایبەتی کە قوتابی ناتوانێت توانا فێرکارییەکانی لەبارەی چەمکی وشەکانەوە لە قۆناغی چەمکە ئاسایییەکانەوە بەرەو قۆناغی چەمکە زانستییەکانەوە ببات. بە تێکچوونی ئەم هاوسەنگییەی لەنێوان هەردوو لایەندا، خوێندنی بابەتی ئەدەب یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی لەدەست دەدات.

لەنێو توێژینەوە ئەدەبییەکاندا ڕاستییەکی سەلمێنراو هەیە، کە ((جۆری شێواز بەپێی پێوەندییەکانی لەنێوان وشەکاندا دەستنیشان دەکرێت)) (Wellek, 1980: 179)، بەڵام ئەو شێوازەی لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دەیەمدا پەرە پێدەدرێت و لە دوا چاپیشیدا دووبارە کراوەتەوە، جەخت لەسەر جێگیربوونی واتای وشەکان دەکات. ئەمەیش تێکالۆزبوونێکی زمانەوانی ـ ئەدەبی دروستدەکات، بۆیە بە پێویست دەزانرێت، کە هەندێکیان وەك نموونە لێکبدرێنەوە و پێگەیان لەنێو فەرهەنگە زمانییەکان و دەقە ئەدەبییەکاندا بە درێژی ڕوون بکرێنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش لەمیانی ئەم چوار وشەی خوارەوەدا، هەموو لایەنەکانی کارەکە شی کراونەتەوە و بە هەمان شێوە، دەکرێت ئەنجامەکانیشیان، لەسەر چەندین وشەی دیکەی نێو کتێبەکەدا پراکتیزە بکرێن:

**یەکەم:** لە بابەتی ئەدەبی کلاسیزمی کوردی ـ شێوەزاری گۆراندا، ژیاننامە و هەندێ بەرهەمی شیعری مەلای پەریشان (١٣٥٦- ١٤٢١) هاتووە، کە لە سەرەتای یەکێك لە پاڕانەوەکانیدا دەڵێت:

**خودا من بەندەی <u>ناچیز</u> و زەلیل**

**گونام کەسیرەن، تاعەتم قەلیل** (لیژنەیەك، ٢٠١٩: ١٣٦)

لە (لێکدانەوەی وشەکان) دا، وشەی ناچیز بەم شێوەیە ڕاڤەکراوە (ناچیز: ناچیزە، خراب). بەڵام ناچیز بە واتای خراب ناهێت، بەڵکو وشەیەکی لێکدراوە و لە (نا) و (چیز) پێکهاتووە: (نا) کە ئامرازی نەرێیە و هەبوونی ناوەڕۆکی وشەی

دووەم ڕەتدەکاتەوە و پێچەوانەی واتاکەی دەسەلمێنێت. چیز وشەیەکی فارسییە بە واتـای (مـال، دارایـی) دێـت (نجفی، ١٣٧٨: ٤٥٩)، یـان شـتێك کـە بـوونی هـەبێت (التونجی، ١٩٦٩: ٢٢٥) و بەرانبەرەکەی لە زمانی کوردیدا بە (شت) یـان هـەر شـتێکی بێ گیان دێت (گولی، ٢٠٠٢: ١٥٦). وشە لێکدراوەی (ناچیز)یش وەك ئاوەڵناو بە واتای (اندك، کم، بی ارزش) دێت (عمید، ١٣٧٨هـ: ١١٤٦). ئەگـەر وشـە فەرهەنگییەکـەی لـە زمانی فارسیدا وەربگرین و بەرانبەرەکەی لە زمانی کوردیدا بەواتای (پچەك، کێم، بەرنەکەتی، بێ قیمەت) دێت (گولی، ٢٠٠٢: ٣٥٣-٣٥٤).. وشەی (ناچیزە)یش بە واتای ژنـێ کـە لـە فـەرمانی شـوو سەرپێچـی دەکـا. بـە فارسـیش دەبێتـە (زن ناشـزە) (شرفکندی، ١٣٦٩هـ: ٨٥٠). بەپێی ئەم ڕوونکردنەوەی سەرەوە، وشەی (ناچیز) دوورە لە واتای خراب، کە لە لێکدانەوەی وشەکانی نێو کتێبی ناوبراودا هاتووە. لەبارەی دەربڕینە ئەدەبییەکەیشی دێڕە شیعرەکە، بەم شێوەیە لێکدەدرێتەوە: (خودا مـن بەندەیەکی بێ بـەها و سـووك و ڕیسـوا، گونـاحم زۆرن و تاعـەتم کەمـە). ئەمـەش بۆچوونێکی ئاساییە بۆ کەسێکی زانا و باوەڕداری وەك مەلا پەریشـان، کـە خـۆی بە بچووك و بێ بەها بەرانبەر گەورەیی خودا دابنێت، تەنانەت خـۆی بـە مرۆڤێکـی بـێ کـەلك و ڕیسـوا و شـەرمەزار ئـەژمار بکرێـت، بـەڵام ناگاتـە ئاسـتی خرابـی. بەپێچـەوانەوە مـەلا پەریشـان ((دژی هەنـدێ لـە سـۆفیەکانیش بـووە و لەگـەڵ خۆبەزلزانـەکان بـە کافریـان دادەنـێ چـونکە خۆیـان کردۆتـە هاوشـانی خـوا و پێغەمبەر "د. خ")) (شوان، ٢٠١٢: ٩٥).

لەم لێکدانەوەی سەرەوەدا دەردەکەوێت، کـە ڕەچـاوی بنـەماکانی زانسـتی فەرهەنگسازی نەکراوە و بـەپێی تیـۆری واتایشـەوە بایـەخی بـە پـەروەردەکردنی سۆزداری فێرخواز نەدراوە، بە تایبەتی کە سیفەتی خراب دەدرێتە پاڵ شاعیرێکی گەورە و خوداناس. ئەمەش لە دوو لایەنەوە ئامانجە فێرکارییەکـەی ناپێکێـت. لـە لایەنێکـەوە بـەهای هونـەریی شـاعیر و شـیعرەکەی لـەپێش چـاوی فێرخوازانـەوە نامێنێـت. لـە لایـەنێکی دیکەشـەوە هاوکێشـەیەکی نـەرێنی دروسـت دەکـات، کـە لـەڕووی بیرکارییـەوە سـیفەتە جوانـەکانی خـودا کـە بـێ کۆتـایین بەرانبـەر بـێ سـیفەتی کەسـێکی خـراب بـەراورد دەکـرێن. بەپێچـەوانەوە، ئەگـەر ژمـارە بـێ کۆتاییەکانی لایەنی یەکەم بەرانبـەر ژمارەیـەکی بچووکی لایـەنی دووەم بـەراورد

بکرێت، ئەوە هەردوو لایەنی هاوکێشەکە: مەزنی و میهرەبانی خودا لە ئاسمان و داوابەخشین و خاکیبوون و گوێڕایەڵیی شاعیر لەسەر زەوی، وەك دوو بەهای باڵا لاسەنگ دەبن و لە مێشکی فێرخوازدا دەچەسپێن.. چەسپاندنی ئەم هاوکێشەیەش ئامانجێکی سەرەکی وانەکە بووە. بەڵام ئەوەی لەمیانی ڕاڤەکردنی وشەکانی کتێبی خوێندندا پێشکەشکراوە، ئامانجەکانی وانەکەی نەپێکاوە و مەبەستی سەرەکی شیعرەکەیشی تێکداوە.

دووەم: لەژێر ناونیشانێکی لاوەکی (جە و وارێن کوردستانێ) لە بابەتی (مەلای باتێ ١٦٧٥- ١٧٦٠) دا (لیژنەیەك، ٢٠١٩: ١٩٩)، هەڵبەستێك هاتووە، کە تێیدا وەسفی سروشت دەکات، ئەم چوارینە بەم شێوەیە نووسراوە:

**کە ڕۆڤێ گرتی نەسرینە**
**جەمەد شینبوو ل سولینە**
**گریا مە تێ ژ بۆ ئەسمینا**
**پەریشانم ل ڤی حالەی**

لە لێکدانەوەی وشەکانی کۆتایی بابەتەکەدا، سێیەم دێڕی چوارینەی سەرەوە، بەم شێوەیە ڕاڤەکراوە: (گریا مە تێ ژ بۆ ئەسمینا: گریانمان بۆ ئاسمان دێ) (هەمان سەرچاوە: ٢٠١). ئەسمین وشەیەکی باوە لە زمانی کوردیدا و ناوی گوڵێکە و بە هیچ شێوەیەك بە واتای ئاسمان نایێت. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی سەرەوەش هەوڵدەدرێت لەنێو ئەم بەڵگانەی خوارەوەدا شی بکرێتەوە:

١- ئەم گوڵە ناسراوە و ناوی لە زۆربەی فەرهەنگە زمانییەکانی کوردیدا هاتووە. لێرەدا هەندێك نموونە لەو فەرهەنگانە دەستنیشان دەکەین، کە کوردی-عەرەبین، یان کوردی ـ فارسی، یانیش کوردی ـ تورکین. لەبەر زۆریی ژمارەیان، تەنیا لە هەر جۆرێك ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین، بۆ نموونە: لە فەرهەنگی (الهدية الحميدية في اللغة الكردية)دا کە، فەرهەنگێکی دێرینی کوردی ـ عەرەبییە و لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا دانراوە، وشەی ((ئەسمین: الیاسمین)) (المقدسی، ١٩٨٧: ٨) هەر بە ناوی گوڵێك هاتووە. ((ئاسمین: گولا یاسەمینێ)) (پێندرۆیی، ٢٠١٢: ١٢). ((ئاسمین: ناڤێ گولەکێ یە، یاسمین)) (مشەختی، ٢٠٠٦: ١٦). ((ئاسەمین: یاسمین)) (قاضي، ٢٠٠٥. ١٢). ((ئاسمیین، یاسەمەن، یاسەمیین: جۆرە ڕووەکێکە کە گوڵی

یاسەمیین دەگرێ. گوڵی یاسەمیین ناوە بۆ کچانیش. زهـرة الیـاسمین المعروفـة. ویأتي إسماً للبنات أیضاً)) (گردعازبانی، ١٩٨٥: ١٠٦).

لە فەرهەنگە کوردی تورکییەکانیشدا، بە شێوەزاری بۆتانی وشەی ئاسمین (Asmin) هـاتووە و بەرانبەرەکـەی وشـەی تـورکی (Yasemin) هەیـە ( Farqînî, 1992:56). لە فەرهەنگـە کـوردی ـ فارسییەکانیشـدا، هـەر سـێ وشـەی (یاسـەمەن، یاسەمەنە، یاسەمین) گـوزارش لـە نـاوی گـوڵی ئـاسمین دەکـەن، بـۆ نموونـە: (١) یاسەمەن: داردەوەنێکە لە سەرەبەهاردا گوڵی سپی یان بنەوشـی زۆر بـۆن خـۆش دەکا. (٢) ناوە بۆ ژنان. (ف) ١ـ یـاسمین ٢ــ نـام زنانـه (شرفکندی، ١٣٦٩هـ: ١٠٢٧). لەنێو کوردانیشدا، زۆر جـار نـاوی کـچ بـە نـاوی گوڵێـك نـاودەنرێن، وەك: نێرگـز، بەیبوون، شلێر، سۆسن، لەوانەیش ئاسمین کە یەکجار زۆرە.

٢– زۆربەی شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد هەردوو وشەی فارسی (یاسەمەن) و (سەمەن) لەجیاتی گوڵی ئاسمینیان بەکارهێناوە. لە فەرهەنگی دیوانی شاعیران (نـالی ـ سـالم ـ کـوردی) دا، ئـەو هـەردوو وشـە بـۆ گـوڵی ئـاسمین لێکدراونەتـەوە (عارف، ٢٠٠٧: ٥٢٥ ـ ٩٧٨). ئەم دێڕە شیعرەی نالی وەك نموونە هێناوەتەوە:

**ڕەیاحین پەرچەم و لالە کولاهـ و یاسـەمەن تـورە**
**بەنەفشە خاڵ و نەرگس چاو و گوڵ زار و سەمەن ساقە**

ئەحمەدی خانیش وشەی (سەمەن)ی بۆ هەمان مەبەست بەکار هێناوە:

**گول پیرەهەنان، سەمەن قەبایان**
**شەککەر دەهەنان و قەندخایـان**

ئـەم دێـڕە شـیعرە بـەم شـێوەیە ڕاڤـەکراوە ((سـەمەن قـەبا: سـەمەندێرە، کەسا/ کەسێ کو فیستانێ وێ ژ پـەلکێ گـولا یاسـەمەنێ یـە)) (خانی، ٢٠٠٧: ٥٨١– ٥٨٢). لە (فەرهەنگی مەم و زینی خانی) یشدا وشەی (سـەمەن) هـەر بـە یاسـەمین هاتووە (گەردی، ٢٠١٦: ١٧٤).

٣– هەندێ لە شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد، کە زمانی شیعرییان نزیکبووە لـە زمـانی خـەڵك بـە زۆری وشـەی کوردییـان بـەکارهێناوە، لەوانـە فـەقێ تـەیران (١٥٤٩– ١٦٣١) ناوی گوڵی ئاسمینی هەر بە کوردی هێناوە:

**نە چیچەك مان، نە ئاسمین مان**
**نە زۆزانێ د ڕەنــگین مـــــان**
**نە گوییێ د خوەشخوین مــان**
**نە نیســـــان مـــان نە ئــادارە** (فەقێ تەیران، ٢٠٠٥: ١٦٥)

یەکێ لە خەسڵەتەکانی شیعری مەلایی باتەییش ئەوەیە، کە زیاتر وشە کوردییەکانی بەکارهێناوە. بۆ نموونە چەندین جار بە کوردی ناوی گوڵی (ئاسمین)ی لە شیعرەکانیدا هاتووە:

**ژ ئاسـمین و تـــەرازن بــــوو**
**ب ناز و عیشوە مـــازن بــوو**
**خڕینا تـــۆق و بــــازن بـــوو**
**گوهار شۆڕ بوون ل سەر سینە** (باتەیی، ١٩٩٨: ٩٨)

یان لەم دێڕە شیعرەدا:

**حەلقەیێ دابەست و هاتن عەقرەب و ئیلان و مار**
**نێرگزا شــــەهلا شـــەپالی ئاســـمینا میر غــوزار** (هەمان سەرچاوە: ١٠٠)

لە سیاقی دەقە شیعرییەکەیدا دیارە، کە شاعیر لە کۆتایی مانگی (چریا پاشین - تشرینی دووەم)دا لە جۆلەمێرگەوە بەرەو مۆکسێ سەفەر دەکا و ((لەڕێگا تووشی بەفرێکی ئەستوور دەبێ و ڕزگاری لێ نابێ و تا دەبێتە هۆی خنکانی لەناو زەریای بەفر.... گرنگیی ئەم شیعرە لەوەدایە کە باتەیی وەسفی دیوێکی تری سروشت دەکا، ئەمە کەژی زستانە. دروشمی گرژی و قوچانەوەیە)) (خەزنەدار، ٢٠٠٢: ٤٠٢)، بەڵام ئەو ناوی گوڵەکانی نێرگز و سولین و نەسرین و ئاسمین باسکراون، جگە لە وەسفی سروشت، شاعیر سەردەمی گەشتەکەی و شوێنی ڕۆیشتنیشی لە شیعرەکەدا باس دەکات.

٤- لە شیعری نوێخوازیی کوردیشدا، زۆر جار ناوی گوڵی (ئاسمین) دەبینرێت. د. عارف حیتۆ لە هەڵبەستی (ڕازا عەڤران و عشقا هەسپێن حێنج) بەم شێوەیە گوڵی ئاسمینی لەم وێنە شیعرییەدا هۆنیوە:

**بەری دل ببیتە خولیدانك**

**دێ کەمە گولدان و ئاسمینەکێ پێڤە شۆرکەم** (حیتۆ، ٢٠١٢: ١٩٢)

لە دیوانی (حافز ئەنوەر مایی)دا، کە هێشتا دەستخەتە، بەڵام هەڵبەستی (کەوا سپێدێ بخوینە) کە بووەتە گۆرانی، دەنگی داوەتەوە و کەم کەس هەیە نەیبیستبێت. شاعیر لە یەك کۆپلەدا ناوی شەش گوڵی هێناوە و ئەوەی زیاتر هەموویان خەملدار و دانسقەیە گوڵی ئاسمینە:

**ناڤ هەلال و بەیبوینا ناڤ حەودا ڤان ئاسمینا**

**ناڤ گول و گولشلێلا ناڤ سوسن و بویکینا**

**کەوا سپێدێ بخوینە**

لە ئەنجامی لێکدانەوەی ئەو بەڵگانەی سەرەوەدا، دەکرێت هەڵەکانی چوارینەی ناوبراو، لەم چەند خاڵانەدا کورت بکرێنەوە:

١- واتای وشەی ئەسمین بە هەڵە ڕاڤەکراوە و بە واتای ئاسمان داناوە، ئاسمان نییە گوڵە.

٢- سەروای چارینەکە تێکدراوە، دوو دێڕی یەکەم سەروایەکیان هەیە (نە، نە) و دێڕی سێیەم سەروایەکەی بووەتە (نا). ئەوەی ڕاستی بێت، دەبێت هەر سێ دێڕیان یەك سەروایان هەبێت، کە (نا)یە. سەروای دێڕی چوارەمی هەموو چوارینەکانی هەڵبەستەکە (نێ)یە، بەڵام ئەو دوو چوارینەی لەم کتێبەدا هاتوون، یەکێکیان سەروای (نە)یە و ئەوی دیکە (ـەی)یە. ئەمەیش هەڵەیەکی ئاوێتەییە، کە دوو گۆڕانکاری لە یەك دۆخدا کراون و هەردووکیان هەڵەن و ڕاستییەکەی (نێ)یە.

٣- هەندێك وشە لە ڕووی ڕێنووسەوە بە هەڵە نووسراون، وەك (گەرۆڤێ) کراوەتە دوو پارچە و بە هەڵە نووسراوەتەوە و بەم شێوەیە هاتووە (کە ڕۆڤێ)، کە لەڕووی ڕێنووسەوە هەڵەیە و لەهەمان کاتدا هیچ واتایەك نادات.

٤- دەستکاری لە دەقی هەڵبەستەکە کراوە و هەندێك وشەشیان گۆڕیوە، کە پێوەندییان بە واتای گشتی هەڵبەستەکەوە نییە، بۆ نموونە دێڕی چوارەمی چوارینەی دووەم، کە ڕاستییەکەی (پەریشانم ژ تالانێ)یە، لە کتێبەکەدا کراوەتە (پەریشانم ل ڤی حالەی).

٥– بەپێی ئەو هەڵە و کەموکورتیانەی، کە لەم چوار خاڵانەی سەرەوەدا دەستنیشان کراون و هەموویان لە یەك چوارینەدا هەبوون، بە پێویست دەزانرێت کە لەگەڵ دەقی چوارینە ڕاستییەکەی بەراورد بکرێت:

**گەرۆڤێ گرتی نەسرینا جەمەد شین بوو ل سۆلینا**

**گریا مە تێ ژبۆ ئاسمینا پەریشـانم ژ تـالانـێ** (باتەیی، ١٩٩٨: ١٠٤)

**سێیەم:** لە بابەتی (مەلا تاهای مایی ١٩٢٤– ٢٠٠٠)دا، باسی ژیاننامەی شاعیر دەکات و هەڵبەستی (شینی و تازیا شەهیدا)ی وەك نموونە هێناوەتەوە و لە کۆتایی بابەتەکەشدا لیستی (لێکدانەوەی پەیڤان) هەیە (لیژنە، ٢٠١٩: ٢١١– ٢١٥). ئەم دێڕە شیعرەی هەڵبەستەکە بەم شێوەیە نووسراوەتەوە:

**وان مەغولا ڕاڤ دبەستن شێر و مێر سەر دهنجنین**

**توخم و نڤشێ وان قەلاندن هەمـی گاڤا دپەچنین**

دەستەواژەی (شێر و مێر) هەڵەیە و ڕاستییەکەی (مێر و مێر)ـە. وشەی (نڤش)یش هەڵەیە و ڕاستییەکەی (نفش)ـە. ئەم ڕاستکردنەوەیش پشت بە دیوانی شاعیر خۆی دەبەستێت، کە دێڕە شیعرەکە، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**وان مەغولا ڕاڤ دبەستن مێر و مێر سەر دهنجنین**

**توخم و نفشێ وان قەلاندن هەمی گاڤا دپەچنین** (مایی، ١٩٩٨: ٧)

جگە لە شێواندنی ڕێنووسی ئەو دێڕە شیعرە، لە (لێکدانەوەی پەیڤان)یشدا، وشەی (نڤش) بەم شێوەیە ڕاڤەکراوە: (نڤش: زێمار) (لیژنەیەك، ٢٠١٩: ٢١٥). ئەمەش دوو جاران هەڵەیە: یەکەمیان، وشەکە (نڤش) نییە، بەڵکو (نفش)ـە. دووەمیانیش لەڕووی واتاییەوە وشەی نفش نە لە دوور و نە لە نزیکەوە پێوەندی بە واتای زێمارەوە نییە. زێمار بە واتای ((هاوار، شیوەن و ناڵە)) دێت (پێندرۆیی، ٢٠١٠: ٢٦٤). ئەو ڕاڤەی لەنێو کتێبی پرۆگرامی خوێندندا کراوە واتای وشەی (نفش) دەشێوێنێت و چەمکەکەیشی تێکدەدات. بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیەش، پێویستە لە چەندین ڕوویەکەوە لێی بکۆڵرێتەوە و پێگەی دروستی وشەی (نفش) لە نێو فەرهەنگە زمانییەکاندا دەستنیشان بکرێت و ئەرکیشی لەسیاقی ئاخاوتندا ڕوون بکرێتەوە: لە (فەرهەنگی کوردی ـ تورکی)دا وشەی نفش بەم شێوەیە ڕاڤەکراوە.((nifş: 1- soy, kuşak, zurîyet 2- nifş: nesil)) ((نفش: ١– سۆی،

کوشـاك، زۆرییـەت. ٢- نفـش: نەسـل)). بـۆ واتـای یەکـەم، کـە گوزارشـت لـە (زۆرییەت) دەکات، لەڕووی سیاقی ئاخاوتنیشەوە، ئـەم نموونەیـەی هێناوەتـەوە: (( Pêşberî nifşa nû em nezan tên hesibandin ـ پێشبەری نفشا نـوو ئـەم نـەزان تـێن حەسـباندن)). بـۆ واتـای دووەمـیش، کـە گوزارشـت لـە نـەوە دەکـات، ئـەم نموونەی هێناوەتەوە: ((Nifşa hunerê ya salên heftêyî ـ نفشا هونەریَ یا سـالێن هەفتێیی)). (Farqînî, 1992: 1302). لە فەرهـەنگی کـوردی ـ ئینگلیزیشـدا وشـەی نفش یان (جیل) بەرانبەر (generation)ی ئینگلیـزی ڕاڤـەکراوە و ئـەو نموونەیـەی هێناوەتەوە ((دڤیَ نفشا "جیلا" نوو خوە پێڤە مژوول بکە)) (Chyet, 2003: 415). لە فەرهەنگەکانی کوردی ـ کوردیشدا وشەی نفش هەر بەهەمان واتا هـاتووە ((نفـش: زۆرییەت)) (مشەختی، ٢٠٠٦: ٤٨٢). لە فەرهەنگـە کـوردی ـ عەرەبییەکانیشـدا وشـەی نفش گوزارشت لە هەمان واتا دەکات ((نفش: جیل، سـلالة)) (قـازی، ٢٠٠٥: ١٩٧). لـە فەرهەنگە کوردی ـ کوردی ـ فارسییەکانیشدا بەم شێوەیە وشەی نفـش ڕاڤـەکراوە ((نفش: ١- تۆرەمە، بەرە؛ نەوع، جۆر "ف" نسل؛ ٢- نوع.)) (شـرفکندی، ١٣٦٩هـ: ٨٦٧). لـــە ئـــەنجامی ئـــەم بەراوردکردنـــەوەی ســـەرەوەدا، هەولّـــدرا هەلّـــەکان دەستنیشان بکرێن و جێگرەوەکانیشیان لە شوێنی خۆیی ڕاستەقینە دابنرێن، کـە ئەمانەن:

١- لەڕووی ڕێنووسەوە هەر دوو وشە (نڤش، شێر) هەلّـەن و ڕاسـتییەکانیان ئەمانەن: (نفش، مێر).

٢- لـەڕووی واتـای وشـەی فەرهەنگییـەوە، وشـەی (نفـش) پێوەنـدی بـە ژێمارەوە نییە و دوو تشتی جودان.

٣-لەڕووی ڕەوانبێژییەوە، بە هیچ شێوەیەك لە سیاقی ئاخاوتنیشدا وشـەی (نفش) جێگەی (ژێمار) ناگرێتەوە.

٤- لەڕووی مۆرفولۆجییەوە، جیاوازی لـەنێوان مـۆرفیمی سـادە و مـۆرفیمی لێکدراو نەکراوە، کە وشـەی (مێـر) وەك مـۆرفیمێکی سـادە بـەواتای پیـاو دێـت و وشەی (مێر و مێر) کە دەستەواژەیەکە بـە واتـای (پیـاو و پیـاو) یـان تـاك و تـاك سەریان بە ئەردەوە دەشێلا. وشەی (مێر) ی یەکەم کراوەتە (شێر) کە لەبنەڕەتدا لەنێو ئەو دێڕە شیعرەدا نییە.

بۆ ئەوەی هەڵەکانی سەرەوە ڕوونـەدەن، وا باشـە دانـەرانی کتێبـی زمـان و ئەدەبی کوردی بە وردی دەقە ئەدەبییەکان لێك بدەنەوە و لەو زانیارییانە دڵنیابن کە لە بارەی ژیان و بەرهەمەکانی نووسەر و شاعیرانەوە وەردەگیرێن. ئەگـەر ئـەم لایەنە ڕەچاو بکرایە، بە ئاسانی شێوەی وشەی (نفش) بە دروستی دەنووسرا، کـە لە هەڵبەستێکی دیکەی شاعیردا هاتووە:

**کو یا هاتیە سەریٚ ڤی نفشیٚ بیٚ ڕێك**

**هەمی کوڤان و داخا دڤێت ڤەهینن** (مایی، ١٩٩٨: ١٧٨)

هەروەها واتاکەیشی دەزانرا، کە لە هەڵبەستی (زێمـار مرنـە) دا هـاتووە و بە ڕوونی واتای زێمار دیارە و لەگەڵ قیڕی و قژ ڕاکێشانەوە هاتووە و پێوەندی بە وشەی نفشەوە نییە:

**ویٚ دانا سینگی ب مستا ڕاکێشان بسـك و کەزی**

**خوەش کرن زێمار و قیڕی ئەسما بیٚ پێژن بەزی** (هەمان سەرچاوە: ١٥)

لەبەر ئەوەی وشەی زێمار لـەنێو شـیعرەکانی ماییـدا چـەندین جـار دووبـارە دەبێتـەوە، بۆیـە لـەڕووی ئامـاری ئەدەبییـەوە، وەك وشـەیەکی کلیلـی ئـەژمار دەکرێت:

**د بەر خو دا جلکا بدڕینین**

**هەر بکەین گری و زێمار** (هەمان سەرچاوە: ١٨٦)

لەم ڕوونکردنەوەی سەرەوەدا، ئـەو ڕاسـتییە سـەرهەڵدەدات، کـە لێژنـەی نـاوبراو ئاگایـان لـە بەرهــەمی شـاعیر نـەبووە و دەقەکـە لـە سەرچـاوەیەکی بـاوەڕپێکراو وەرنـەگیراوە. ئـەم جـۆرە حاڵەتانـە لـەنێو کتێبـە ئاسـاییەکانی خوێندنەوە ڕوودەدەن، بەڵام لەنێو کتێبەکانی پرۆگرامی خوێندنی فەرمیدا کارێکی پەسەند نییە.

**چوارەم:** لە بابـەتی (کامـەران مـوکری ١٩٢٩– ١٩٨٦)دا (لیژنەیـەك، ٢٠١٩: ٢١٦– ٢٢٢)، یەکێك لە مەبەستە شیعرییەکانی خۆشەویستییە، لـە هەڵبەستێکدا ئەم دێڕە شیعرە بەم شێوەیە هاتووە:

**کە پەرچەمت ڕشتە سەر ڕوو**

**ئاگــر لە دەروونم بەربــوو**

لەم دێڕە شیعرەدا (دەروون) وەك وشەیەکی فەرهەنگی وەرگیراوە و لە لیستی لێکدانەوەی وشەکانیشدا بە (هەناو، هناڤ) ڕاڤەکراوە (هەمان سەرچاوە: ٢٢٢). ئەگەر ئەم واتایە لە زمانی ڕۆژانەی خەڵکدا شتێکی ئاسایی بێت و لەنێو فەرهەنگە زمانییەکانیشدا هەمان واتا هەڵبگرێت، بەڵام لە ناوەندەکانی خوێندندا کارێکی زانستی نییە. لەڕووی زانستییەوە، دەروون زاراوەیەکە و چەمکەکەی زۆر فرەوانترە لە وشەیەکی فەرهەنگی. چەمکیش ناو و پێناسە و پێکهاتە و پێوەندییەکانی هەیە، دەبێت بە وردی بناسرێت و نابێت دوو واتای هەبێت. ئێستا (دەروون) زاراوەیەکە و لەنێو زانستی دەروونناسی و گشت بوارەکانیدا جێگیر بووە و لەنێو توێژینەوە ئەدەبییەکانیشدا بەکاردێت. لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبیدا (دەروون، النفس، Psyche) (لیژنەی ئەدەب، ٢٠٠٦: ٤٤) و لە فەرهەنگی دەروونناسیشدا (دەروون، نفس، Psyche) (شریف، ١٩٨٥: ١٦٢) هاتووە. شیکردنەوەی چەمکی هەر زاراوەیەك لە پرۆگرامەکانی خوێندندا دەبێت لە هەموو وانەکان و بابەتەکاندا هەمان بۆچوون و لێکدانەوەیان بۆ بکرێت و بە یەك جۆر بنووسرێت.

کاتێك فێرخواز فێری زاراوەکان نەکرێت و نەتوانێت چەمکەکانیان لێك بداتەوە، لێڵی و شێواندنێك لە مێشکیدا دروست دەبێت و ئەستەمە لە ئاستی زمانی ڕۆژانەی خەڵکەوە بەرەو زمانی زانستی یان زمانی ئەدەبی بڕوات. لە تێگەیشتنی ورد و دەستنیشانکردنی مەبەستەکانی ئەو زاراوەیە دوور دەکەوێتەوە. بۆ نموونە زاراوەی (دەروون) واتایەکی تایبەتی خۆی هەیە و پێکهاتەکانی چەمکەکەیشی زانراون. ئەگەر بەپێی ڕاڤەکردنی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بێت، کە دەروون و هەناو یەك واتایان هەیە، ئەوە فێرخواز ناتوانێت جیاوازی لەنێوان پزیشکی هەناو و پزیشکی دەروونیدا بکات، لای ئەو هەردوو یەك پسپۆری دەبن، یانیش نەخۆشییەکانی دەروونی و نەخۆشییەکانی هەناوی تێکەڵاو دەکات، کە لە بنەڕەتدا دوو پسپۆری جودان و هەر یەکێکیان بنەما زانستییەکانی تایبەت بە خۆوە هەیە. لێرەدا ئاستی مرۆڤی خوێندەوار و نەخوێندەوار دەردەکەوێت، کە کەسی خوێندەوار بە شێوەیەکی زانستی چەمکی زاراوەکان بەکاردێنێت و کەسی نەخوێندەواریش بە کەموکورتییەوە لە چەمکەکان تێدەگات. ئەرکی ناوەندەکانی خوێندنە هەردوو لایەنان لێك جیا بکاتەوە.

زاراوەکانی هەر زانستێك، لەنێو زانستەکانی دیکەیشدا هەمان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. لەوانەیە پێش جێگیرکردنیان، بە چەندین جۆرەوە لەنێو دەقە کۆنەکاندا بەکار هاتبن و لەنێو بابەتە شیکارییەکانیشیاندا وەك وشەی فەرهەنگی لێك دەدرێنەوە. سەرەڕای ئەوە، کە لەنێو شیعردا بەپێی سیاقی دەقەوە واتای دەگۆڕێت. بۆ نموونە لە هەڵبەستی (چراغ جەخاودا) ی بێسارانیدا (١٦٤٣–١٧٠١) وشەی (دەروون) دوو جار بەکارهاتووە:

**واتم مەر بدیە وە جەستەی حاڵم**
**بزانی پەی چێش دەروون زوخاڵم**
**تۆ جە طانەی بەد ڕەقیبان تەرسای**
**هیچ حاڵ دەروون سفتەم نە پەرسای** (بێسارانی، ١٣٨١هـ: ٦٤)

وشەی (دەروون) لەم دوو دێڕە شیعرەدا دووبارە بووەتەوە، هەر جارێکیش بە واتایەکی هەندێك جیاوازەوە مەبەستی شاعیر دەخاتەڕوو، بۆیە بە وشەیەکی فەرهەنگی دادەنرێت. ئەم وشە فەرهەنگییەیش زیاتر لای شاعیرانی سەر بە دیالێکتی گۆران بەکاردەهات، بۆ نموونە لە دیوانی بێسارانیدا زیاتر لە بیست جار دووبارە دەبێتەوە (هەمان سەرچاوە: ٥٨– ١٩٣)، بەڵام لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە ئەم وشەیە لە لایەن شاعیرانی دیالێکتی کورمانجی ناوەڕاستیشدا بەکارهاتووە، لەوانە کامەران موکری کە لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە و دواتر چەندین جار وشەی دەروون لە شیعرەکانیدا دووبارە دەبێتەوە (موکری، ١٩٨٧: ٤٥). خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە، کە لە چارێکی کۆتایی سەدەی بیستەمەوە و تا ئیستا (دەروون) وەك زاراوەیەکی زانستی پەسەندکراو لەنێو زمانی کوردیدا چەسپیوە، بۆیە وا پێویست دەکات، کە لە نێو بابەتەکانی خوێندنیشدا وەك زاراوە ڕاڤەبکرێت.

*　　*　　*

لەمیانی ئەو چوار نموونەی سەرەوەدا، هەوڵدرا هەڵە و کەموکورتییەکان دەستنیشان بکرێن و بەپێی بەڵگەی پێویست ڕاست بکرێنەوە. ئەگەر ئەم پرۆسەیە؛ لە بوارەکانی دیکەی پێداچوونەوە و هەڵسەنگاندندا، بابەتێکی ئاسایی بێت، بەڵام بۆ کتێبەکانی پرۆگرامی خوێندنی فەرمی کارێکی دروست نییە. ناکرێت ئەو هندە هەڵەی زانستی لە چاپی سێزدەمینی کتێبەکەدا هەبێت، بە تایبەتی کە

دوا چاپە و گوایە دوازدە جار پێداچوونەوەی بۆ کراوە و لە هەڵەکان پاك کراوەتەوە. ئەو هۆکارانەی ڕێخۆشکەربوونە کە کەموکورییان ڕووبدەن، دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵی سەرەکی:

١– لەدانانی کتێبی پرۆگرامی زمان و ئەدەبی کوردیدا، پشت بە تیۆرەکانی دانانی پرۆگرامەکانەوە نەبەستراوە، بۆ ئەوەی بتوانرێت پێوەندییەکانی لەنێوان پرۆگرام و وانەوتنەوە و فێربوون و فێرکردن لە یەکێ لە تیۆرەکاندا تێکهەڵکێش بکرێن. لەم بارەوە، سێ تیۆری گەورە هەن، کە گەشەیان کردووە و بابەتی پرۆگرامەکان چارەسەر دەکەن، کە تیۆری Miccia و تیۆری Gohnson و تیۆری Macdonald جگە لەمانە چەندین تیۆری دیکەی دەروونیش هەن، کە لەبیرکردنەوە و کردەوەی پرۆگرامەکاندا بەشدار دەبن (سلامة، ٢٠٠٨: ٨٥–٨٨).

٢– لێژنەی دانانی پرۆگرامی زمان و ئەدەبی کوردی، پشتی بە شارەزایی خودی و تێڕوانینە کەسایەتییەکانەوە بەستووە و، لە گرنگترین چوار بنەمای دانانی پرۆگرامەکان دوور کەوتوونەتەوە، کە ((بنەمای فەلسەفی، بنەمای دەروونی، بنەمای کۆزانیاری و بنەمای کۆمەڵایەتین)) (الخوالدة ،٢٠١١: ٥٠). بەپێی ئەم بنەما ستانداردەکانی سەرەوە، هەر هەڵسەنگاندنێك لە پرۆگرامەکانی کۆن یان پێڕەوکراودا بکرێت، تا ڕادەیەکی زۆر کەموکورییەکان بنبڕ دەکرێن.

ئەم شێوازەی سەرەوە، کە لێژنەی دانانی کتێبەکانی خوێندنی زمان و ئەدەبی کوردی لە وەزارەتی پەروەردە پێڕەوی دەکات، دوو هەنگاو لە ڕێچکەی زانستیی دانانی پرۆگرامەکانەوە دوورن:

١– چەندین وشە واتاکانیان بە هەڵە لێکدراونەتەوە و وەك دوو لایەنی یەکسان بەرانبەر یەکتر کراون. لەڕاستیدا وا نییە و واتاکانیان یەکتر ناگرنەوە. بەپێچەوانەوە دەبێت وشە پێناسە بکرێت و ئەرکی بزانرێت و پێگەیشی لە سیاقی قسەکردندا ڕوون بکرێتەوەو واتای لە ڕستەدا شی بکرێتەوە، بۆ ئەوەی قوتابی لێی تێبگات و لەگەڵ وێنە و ناوەڕۆك و قسەپێکردنەکەیدا ئاشنا بێت و زمانەکەی پێ دەوڵەمەند بکات.

٢– قوتابی بە گومانەوە، دەڕوانتە فەرهەنگی زمانەکەی. بە شێوەیەکی دروست فێری بەکارهێنانی نابێت. هەر وشەیەکی نوێ ببینێت، بەبێ ئەوەی بیر لە

پێکهاتە و ئەرکی بکاتـەوە، یەکسـەر لـەدوای وشـەی هاوواتاکـەی دەگـەڕێت. ئـەم جۆرە شێوازە لە وەرگرتنی واتای وشـەکان ڕێ لـە گەشەسـەندنی زمـانی ئـەدەبی دەگرێت و هونەرە شاراوەکانیشی وەك ئایرۆنی و پارادۆکس و سارکازم فێر نابێت. دەرئەنجام لە کەلتوورە نەتەوەییەکەی دوور دەکەوێتەوە.

سەرەڕای ئەنجامە نەرێنییەکانی هەردوو خاڵی سـەرەوە، ڕاسـتییەکی دیکـە سەرهەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە، کە دوورکەوتنەوەی پرۆگرامەکانی خوێندنی زمـان و ئەدەبی کوردی لە بنـەما زانسـتی و فەلسـەفییەکانی ڕاڤـەکردنی وشـە لـە دەقـە ئەدەبییەکانـدا، ڕاسـتەوخۆ کـارێکی نـەرێنی لەسـەر ئـەرکی بەشـەکانی زمـان و ئەدەبی کوردی لە زانکۆکاندا دەکات. ئەم کارلێکردنەیش لە دوو لایەنەوە زیان بـە کــار و پلانــەکانیان دەگەیــەنێت: لــە لایەنێکــەوە تواناکانیــان زیــاتر بــەرەو سەرڕاسـتکردنی هەڵـەکان دەڕوات. لـە لایـەنێکی دیکـەوە کـارە سـەرەکییەکانیان لەنێو ڕێکخستنەوەی زانیارییە سەرەتاییەکاندا قـەتیس دەبێـت. چارەسـەرکردنی کەموکورتییەکان و ڕێکخستنەوەی کارەکان پێویسـتی بـە ماوەیـەکی درێـژ هەیـە. لـەو ماوەیەشـدا، تـا ڕادەیـەکی زۆر بەشـە ناوبراوەکـان لـە کـاری ئـەکادیمی و پەرەپێدانی زمانی کوردی دوور دەکەونەوە.

## ئەنجام و پێشنیاز

**ئەنجام:**

لەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە چەند ئەنجامێك کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشان دەکرێن:

١– منداڵ لەماڵەوە فێری زمانی یەکەم (زمانی دایك) دەبێت. ناوی شتەکانی دەوروبەر دەزانێت. ڕێژەیەکی باش لە وشەی فەرهەنگی بە چەمکەکانیانەوە لە مێشکیدا دەچەسپێن. ئەو چەمکانەی بە هەڕەمەکی فێر بووە، لە قوتابخانەدا بەپێی بنەما زانستیەکانییەوە فێر دەکرێت و ئەویش دەتوانێت واتا وردەکانیان لێك جیابکاتەوە. بە پێچەوانەوە کە هەر دوو قۆناغ تەواوکاری یەکدی نەبن، ئەوە متمانەی منداڵ بەو زمانەوە سست دەبێت و بەپێی ڕادەی سستبوونەکەیشی دیاردەی پشتگوێخستن سەرهەڵدەدات و بیر لە بەکارهێنانی زمانێکی دیکە دەکرێتەوە.

٢– لە لێکدانەوەی بۆچوونەکانی هەر سێ لایەنی فەلسەفی و زمانەوانی و ئەدەبی لەبارەی وشەوە، واتا وردەکەی لە سیاقی ئاخاوتندا دەردەکەوێت و مەرج نییە هەمان واتا فەرهەنگییەکەی جێگیر بێت. ئەمە ڕاستییەکە و لەنێو کەلەپووری زانستی دەڤەرەکەمان و تیۆرە زانستییەکانی هاوچەرخیشدا سەلمێنراوە. لەنێوانیاندا خاڵە وێکچووەکان زۆرن. بۆچوونەکانیشیان لە زۆر ڕوویەکەوە یەکدی دەگرنەوە، بۆیە بە سەرچاوەی سەرەکی دادەنرێن کە پرۆگرامەکانی زمان و ئەدەبی کوردی لەسەری بنیات بنرێن.

٣– پرۆسەی پێڕەوکراو لەدانانی پرۆگرامەکانی زمان و ئەدەبی کوردی لە وەزارەتی پەروەردەدا، بنەمایەکی تۆکمە ناڕەخسێنێت کە پرۆگرامەکانی هاوشێوەیان لە کۆلیژەکانی زمان و پەروەردەی بنەڕەتی و پەروەردە لە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستیدا لەسەری بنیات بنرێت و هەردوو لایەن تەواوکاری یەکتربن، بەڵکو دابڕانێکی زانستی لەنێوانیاندا دروست کردووە و لەم مەودایەدا زۆربەی کێشە تەکنیکی و زانستییەکانی زمان و ئەدەبی کوردی سەرهەڵدەدەن.

٤- زۆربەی فەرهەنگەکانی زمانی کوردی، کە (کوردی - کوردی) یانیش کوردی - کوردی و زمانەکانی دیکەن، بنەما زانستییەکانی فەرهەنگسازییان ڕەچاو نەکردووە و کەموکورییان تێکەوتووە، بەڵام ئەوەی لەنێو کتێبەکانی زمان و ئەدەبی کوردیدا دەبینرێت، سنووری هەڵەکانی ئەو فەرهەنگانەیشی تێپەڕاندووە. هۆکاری ئەم لەڕێ لابردنەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە ئەندامانی لێژنەی دانانی پرۆگرامەکان، بەبێ گەڕانەوە بۆ فەرهەنگەکانی زمانی کوردی یان پشتبەستن بە تیۆرە زانستییەکانەوە، بەڵکو بەپێی شارەزایی کەسێتی و ئاستی زانستیی خۆیانەوە وشەکانیان ڕاڤە کردووە، بۆیە زۆر جار دەقە ئەدەبییەکان لەڕووی ڕوخسارەوە دەشێوێنرێن و لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە تێکدەدرێن.

٥- ڕاڤەکردنی وشەکان لەنێوان دوو زمانی جیاوازدا، دەکرێت وشە بەرانبەر وشە دابنرێت، بەڵام لە یەك زماندا وا باشە لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی ڕەوانبێژییەوە وشەکان ڕاڤە بکرێن، ئەویش لەڕێگەی شیکردنەوەی واتای وشە یان دەستنیشانکردنی پێچەوانەکەی، یانیش ڕوونکردنەوەی پێگەی وشەکە لە سیاقی ئاخاوتندا و چەند نموونەیەك بۆ ئەو مەبەستە بەکاربهێنرێن.

٦-لە ڕاڤەکردنی وشەکاندا، جیاوازی لەنێوان وشە فەرهەنگییەکان و زاراوە زانستییەکاندا نەکراوە. ئەمەش کێشەیەکی دوو لایەنی دروستکردووە: لە لایێکەوە واتای وشەکانی شێواندووە، لە لایێکی دیکەشەوە لێڵی لە چەمکی زاراوەکاندا دروستکردووە. لە ئەنجامی ئەم هاوکێشەیەدا شیکردنەوەی دەقە ئەدەبییەکان ئالۆز بووە، بۆیە دەبێت ڕاڤەکردنی وشە فەرهەنگییەکان بەپێی سیاقی ئاخاوتنەوە ڕاڤە بکرێن. زاراوەکانیش بەپێی ڕێکخستنی نەخشەی چەمکەکانیان ڕوون بکرێنەوە. هەروەها پێوەندییە تایبەتییەکانی هەر زاراوەیەك لەنێوان پێکهاتەکانی خۆی و پێوەندییە گشتییەکانی لەنێوان ئەو و زاراوەکانی دیکەدا، کە پێوەندییان بەوەوە هەیە دەستنیشان بکرێن.

**پێشنیاز:**

١- پێشنیاز دەکەین کە لێژنەی دانانی پرۆگرامی زمان و ئەدەبی کوردی لە وەزارەتی پەروەردە دەستبەرداری ڕێچکەی کۆنی ڕاڤەکردنی وشەکان بێت، کە لە کۆتایی بابەتەکاندا ڕێکدەخرێت، بەڵکو بەپێی تیۆرەکانی زمانناسی و فەلسەفەی ڕەوانێژییەوە ڕاڤە بکرێن، بۆ ئەوەی فێرخواز بە شێوەیەکی زانستی فێری ڕێزمان ببێت و هونەرەکانی ئەدەبیش ببنە بەشێك لە ڕۆشنبیریی ئەو و لایەنی مەعریفییەکەیشی پێ دەوڵەمەند بکرێت.

٢- گشت شارەزایی و تواناکانی تەرخانکراو بۆ دانانی فەرهەنگەکانی زمانی کوردی ڕێك بخرێن و لەبری ئەو ژمارە زۆرەی کە تا ئێستا بە ناتەواوی چاپکراون و بڵاوکراونەتەوە، فەرهەنگێکی گشتگیر و بەپێی بنەما زانستییەکانی فەرهەنگسازی دابنرێت، بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو و دەزگە پەروەردەیی و ئەکادیمی و ڕۆشنبیرییەکان و خوێنەران پشتی پێ ببەستن.

**سەرچاوەکان:**

**یەکەم: دیوان**


١- بێسارانی، مەلا موستەفا بن قطب الدین (١٣٨١هـ)، ئامادەکردن و ساغ کردنەوەی: صدیق صەفی زادە، انتشارات کردستان، سنندج.

٢- تەیران، فەقێ (٢٠٠٥)، ئامادەکرنا: سەعید دێرەشی، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر.

٣- حیتۆ، عارف (٢٠١٢)، <u>سترانێن پەلا - کۆبەرهەمی شیعری</u>، ب ٢، چاپخانەی ڕۆژهەڵات. هەولێر.

٤- خانی، ئەحمەدێ (٢٠٠٧)، <u>مەم و زین</u>، ب ١، ب ڕاڤە و شرۆڤەیەك نوو: پەرویز جیهانی، چاپخانا خانی، دهۆك.

٥- باتەیی، مەلا حوسەین (١٩٩٦)، کۆمکرن و ڤەکۆلین: تەحسین ئیبراهیم دۆسکی و محسن ئیبراهیم دۆسکی، چاپخانا هاوار، دهۆك.

٦- مایی، طە (١٩٩٨)، <u>دل دەرێژکرن</u>، چاپخانا خەبات، دهۆك.

٧- مایی، حافز (دەستخەت).

٨–موکری، کامەران (١٩٨٧)، پێشەکی نووسین و پەراوێزلێدان: عەبدوڵڵا عەزیز خالد، چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر.

**دووەم: کتێب**

**بەزمانی کوردی:**

٩–پێندرۆیی، محەمەد ساڵح جگەرسۆز (٢٠١٠)، فەرهەنگا کانی/ کوردیا ژووری ـ کوردیا ناوەڕاست، چاپخانەی سپیرێز، دهۆك.

١٠– ________ (٢٠١٢)، فەرهەنگی ڕەسەن/ کوردی ناوەڕاست ـ کوردی ژووروو، ب ٢، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر.

١١– خەزنەدار، د. مارف (٢٠٠٢)، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

١٢– شرفکندی، عبدالرحمن (١٣٦٩)، هەنبانە بۆرینە فرهنگ کردی ـ فارسی، ب ٢، سروش، تهران.

١٣– شەریف، د. عەبدولسەتار تاهیر (١٩٨٥)، قامووسی دەروونناسی/ ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، چاپخانەی عەلا، بەغدا.

١٤– شوان، د. ئیبراهیم ئەحمەد (٢٠١٢)، ئەدەبی کۆنی کوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین. هەولێر.

١٥– عارف، د. محەمەد نووری (٢٠٠٧)، فەرهەنگی دیوانی شاعیران نالی ـ سالم ـ کوردی، چاپخانەی دەزگای ئاراس. هەولێر.

١٦–عەلی، د. تالیب حوسێن (٢٠١١)، واتاسازی ـ چەند بابەتێکی لێکدانەوەی واتای وشە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر.

١٧–فتاح، محمد معروف (١٩٩٠)، زمانەوانی، مطابع دار الحكمة، هەولێر.

١٨–Farqînî, Zana (1992), Ferhenga Kurdî – Turkî, Enstîtuya Kurdî ya Stenbolê, Stenbol.

١٩– قازی، حافز (٢٠٠٥)، فەرهەنگا قازی/ کوردی ـ عەرەبی، چ ٢، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر.

٢٠– گەردی، عەزیز (٢٠١٦)، فەرهەنگی مەم و زینی خانی، دەزگای چاپ و پەخشی نارین، هەولێر.

٢١– گولی، مسعود خالد (٢٠٠٢)، فەرهەنگا گولی فارسی ـ کوردی، چاپخانەیا وەزارەتا پەروەردەیی، هەولێر.

٢٢-لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان (٢٠٠٦)، زاراوەی ئەدەبی / کوردی - عەرەبی - ئینگلیزی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
٢٣-لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە (٢٠١٩)، زمان و ئەدەبی کوردی - پۆلی دەیەمی ئامادەیی، چ ١٣، لەلایەن کۆمپانیای قەیوانەوە چاپکراوە.
٢٤-مارف، د. ئەورەحمانی حاجی (١٩٧٩)، ڕێزمانی کوردی - بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم - ناو، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا.
٢٥-مشەختی، مەلا خەلیل (٢٠٠٦)، فەرهەنگا مەرگ و ژی، دەزگای ئاراس، هەولێر - کوردستان.
٢٦-نیزامەدین، فازیل (٢٠٠٧)، فەرهەنگی "شرین"ی نوێ/ عەرەبی - کوردی، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی - کوردستان.

**بەزمانی عەرەبی**

٢٧- أرسطوطاليس (١٩٥٣)، فن الشعر، ترجمه عن اليونانية وشرحه وحقق نصوصه: عبدالرحمن بدوي، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة.
٢٨- التونجي، د. محمد (١٩٦٩)، المعجم الذهبي فارسي - عربي، ط ٢، دار العلم للملايين، بيروت.
٢٩- ____________ (١٩٩٩)، المعجم المفصل في الأدب، ج ٢، دار الكتب العلمية، بيروت.
٣٠- أنيس، د. ابراهيم (١٩٨٤)، دلالة الألفاظ، ط ٥، دار تكنوبرينت للطباعة، القاهرة.
٣١-بدوي، عبدالرحمن (١٩٩٦)، ملحق موسوعة الفلسفة، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت.
٣٢- توفيق، سعيد (٢٠٠٢)، في ماهية اللغة وفلسفة التأويل، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت.
٣٣- الجرجاني، عبدالقاهر (١٩٥٩)، دلائل الإعجاز، تحقيق: محمد رشيد رضا، مصر.
٣٤-خليل، د. خليل أحمد (١٩٨٩)، مفاتيح العلوم الإنسانية - معجم عربي. فرنسي. انكليزي، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت.
٣٥-الخوالدة، د. ناصر أحمد و يحيى إسماعيل عبد (٢٠١١)، المناهج - أسسها ومداخلها الفكرية وتصميمها ومباديء بنائها ونماذج تطويرها، زمزم ناشرون وموزعون، عمان.
٣٦- زيادة، أغناطيوس (١٩٨٦)، جمع وتقديم وترتيب الحواشي للكتاب المقدس، منشورات دار الشروق ش م م، بيروت.

٣٧- زيدان، د. محمود فهمي (١٩٨٥)، في فلسفة اللغة، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت.
٣٨- سلامة، عادل أبو العز (٢٠٠٨)، تخطيط المناهج المعاصرة، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان.
٣٩- شمس الدين، د. جلال (٢٠٠٣)، علم اللغة النفسي – مناهجه ونظرياته وقضاياه، ج ١، مؤسسة الثقافة الجامعية، الأسكندرية.
٤٠- الطاهر، د. علي جواد (١٩٨٣)، مقدمة في النقد الأدبي، ط ٢، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت.
٤١- عبدالصبور، صلاح (١٩٩٣)، الأعمال الكاملة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة.
٤٢- عبدالرحمن، د. نصرت (١٩٧٩)، في النقد الحديث ـ دراسة في مذاهب نقدية حديثة وأصولها الفكرية، مكتبة الأقصى، عمان.
٤٣- عبدالنور، صبور (١٩٧٩)، المعجم الأدبي، دار العلم للملايين، بيروت.
٤٤- عزام، محمد (١٩٦٤)، التحليل الألسني للأدب، منشورات وزارة الثقافة، دمشق.
٤٥- فضل، د. صلاح (١٩٧٨)، نظرية البنائية في النقد الأدبي، مطبعة الأمانة، القاهرة.
٤٦- گرد عازباني، صابر حمد علي عبدالله (١٩٨٤)، قاموس آري/ كُردي ـ كُردي: عربي، ج ١، راجعه: بابا علي الشيخ عمر القرداغي، مطبعة أسعد، بغداد.
٤٧- ماضي، د. شكري عزيز (٢٠٠٥)، في نظرية الأدب، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت.
٤٨- مراد، وليد محمد (١٩٨٣)، نظرية النظم وقيمتها العلمية في الدراسات اللغوية عند عبدالقاهر الجرجاني، دار الفكر، دمشق.
٤٩- المسدي، د. عبدالسلام (٢٠٠٤)، الأدب وخطاب النقد، دار الكتاب الجديد المتحدة، بنغازي.
٥٠- ____________ (2006)، الأسلوبية والأسلوب، ط ٥، دار الكتاب الجديد المتحدة، بنغازي.
٥١- المقدسي، يوسف ضياءالدين باشا الخالدي (١٩٨٧)، الهدية الحميدية في اللغة الكُردية/ معجم كُردي ـ عربي، ط ٢، مكتبة لبنان، بيروت.
٥٢- هويدي، د. يحيى (١٩٩٣)، قصة الفلسفة الغربية، دار الثقافة للنشر والتوزيع، القاهرة.

٥٣–ویس، د. أحمد محمد (٢٠٠٥)، الانزياح من منظور الدراسات الاسلوبية، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت.
٥٤–اليعقوبي، عبدالرحمن (٢٠١٤)، الحداثة الفكرية في التأليف الفلسفي العربي المعاصر، مركز نماء للبحوث والدراسات، بيروت.

**بەزمانی ئینگلیزی**

55-Al khuli, Dr. Muhammad Ali (19٨٦), A Dictionary of Applied Linguistics: English - Arabic, Librairie du Liban, Beirut.
56-______________________ (1991), A Dictionary of Theoretical Linguistics: English - Arabic, New Impression, Librairie du Libanon, Beirut.
57-Chyet, Michael L. (2003), Kurdish English Dictionary, Yale University Press, New Haven.
58-Culler, Jonathan (1997), Literary Theory – A very Short Introduction, Oxford University Press, Oxford.
59-Richards I.A.(1965), The Philosophy of Rhetoric, Oxford University Press. Oxford.
60-Wellek, Rene and Austin Warren (1980), Theory of Literature, Pelican Books, London.

**بە زمانی فارسی:**

٦١– عمید، حسن (١٣٧٨)، فرهنگ عمید، چ ١٦، چاپخانهْ سپهر، تهران.
٦٢– نجفی، ابوالحسن (١٣٧٨)، فرهنگ فارسی عامیانه، جلد١، انتشارات نیلوفر، تهران.

**سێیەم: گۆڤار**

٦٣– فەخری، د. نەسرین (١٩٧٣)، پاشگر و پێشگری: (ڤە - یان - وە) لە زمانی کوردی دا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم - بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا، ل ل٢٢٤– ٢٧٣.
٦٤– قەرەنی، د. ئەحمەد محەمەد عوسمان (٢٠١٧)، بنیاتێن تەکنیکیێن گۆتنێن پێشینانێن کوردی و پۆلینکرنا جۆرێن وانێن ئەدەبی، گۆڤارا ئەکادیمیا زانینگەها نەورۆز، هەژمار ٧–٢، دهۆك، ل ل٢٣٤–٢٤٤.

## الملخص

## الاسس الفلسفية والعلمية لتفسير الكلمات في النصوص الادبية كتاب اللغة والادب الكردي للصف العاشر انموذجاً

يتناول البحث الإشكالية المتبعة في توضيح معاني الكلمات الصعبة بنهاية موضوعات الأدب الكُردي في الكتاب المدرسي للصف العاشر الإعدادي. وهي طريقة تفتقد الى منهجية علمية في تبيان الأبعاد المترابطة بين معنى الكلمة كوحدة لغوية وكيانها المنطوق ودورها في تشكيل المعنى العام للنص. وفي الوقت نفسه تتناقض هذه الطريقة مع ماتوصلت اليه النظريات المتداخلة بين المباحث اللسانية و مدارس النقد الأدبي.

يتكون البحث من قسمين: يشمل القسم الأول على الجانب النظري لدراسة الكلمة من منظار فلسفة البلاغة وتضمينات معانيها في سياقات النظريات الأدبية ومن ثم مقارنتهما مع إنتظامات النظريات اللسانية التي تؤكد على تمحور دور الكلمة في تكوين الجملة ومن إتحاد الجمل يُبنى الخطاب الأدبي.

ويركز القسم الثاني على ضوء ما توصل اليه في القسم الأول من إستنتاجات وتطبيقها على أربعة نصوص شعرية لتبيان مساوىء الطريقة المتبعة لتفسير الكلمات، ومن ثم تحديد الأخطاء ومعالجتها وإستخلاص المنشأ المثبت في توظيف معاني الكلمات حسب السياقات التي تستخدم فيها اللغة والفكر على حد سواء.

# Abstract

## The philosophical and scientific bases for explaining the meaning of vocabulary in literary texts
### (The tenth grade kurdish language and litrerature textbook as an example)

In defining vocabulary in literary texts, there are linguistic and cognitive contradictions. To explain this mismatch, the tenth grade Kurdish language and literature textbook has been used as an example, in which scientific and philosophical principles are ignored, the meaning of vocabulary is defined by giving dictionary meaning which don't fit the concept. This research is made into two parts:

Part one involves theory, vocabulary is explained according philosophy of rhetoric and their meaning according to their literary contexts, they are also compared to linguistic theories, the role of the word in sentence composition has been analyzed.

In part two, the conclusions of the first part has been applied to four texts of the mentioned textbook, their mistakes highlighted and corrected according the role of the words in cognition and linguistic contexts. At the end the most significant conclusions are presented.

# هزر و بیرێن بەرگری
# د هۆزانێن (حاجی قادرێ کۆیی) دا


**پ. ی. د. عەبدوڵلا یاسین عەلی ئامێدی** کۆلیژی پەروەردە و زمان/ زانکۆی لوبنانی فەرەنسی

**م.ی. موحەمەد عومەر ئیبراهیم** کۆلیژی پەروەردە و زمان/ زانکۆی لوبنانی فەرەنسی

**م.ی. هاوکار موحەمەد رەشید** مامۆستا لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی پشدەر


**پێشەکی**

ئەدەبی بەرگری پشکەکا گرنگە ژ ئەدەبێ نڤیسێ کوردی، چونکە هندەك ژ هۆزانڤانێن مللەتێ مە ئەڤ جۆرە هۆزانە د بەرهەمێن خۆدا ئاماژە پێکریە و هاتینە بەلاڤکرن. ئێك ژ وان هۆزانڤانێن بە رنیاس و بناڤ و دەنگ (حاجی قادرێ کۆیی) یە. ئەم دڤێ ڤەکۆلینێدا دێ رۆناهیێ بەردەینە سەر ناڤەرۆکێ وان هۆزانا ئەڤێن هزر و بیرێن بەرگری تێدا دیار و خویانە.

— ناڤ و نیشانێن ڤەکۆلینێ :

هزر و بیرێن بەرگری د هۆزانێن حاجی قادرێ کۆیی دا.

— رێبازا ڤەکۆلینێ :

دڤێ ڤەکۆلینێدا، رێبازا وەسفی شرۆڤەکاری هاتیە پەیڕەوکردن.

— گرنگییا ڤەکۆلینێ:

گەلەك ڤەکۆلینێن جۆراوجۆرێن ئەدەبی دەربارەی حاجی قادرێ کۆیی هاتینە ئەنجامدان. گرنگییا ڤێ ڤەکۆلینێ دهندێدایە، کو بشێوەکێ نوی بەرێ خۆدایە هزرا بەرگری د هۆزانێن هۆزانڤانیدا و سەر راوەستیان هاتیەکرن بەرامبەر وان پارچە هۆزانا ئەڤێن هەلگرێن ناڤەرۆکێن بەرگری بخۆڤە دگرن.

— کەرستێ ڤەکۆلینێ:

کەرستێ خاڤێ ڤەکۆلینێ بریتییە ژ دیوانا حاجی قادرێ کۆیی، کو سالا ١٩٨٦، ژ ئامادەکرن و خڕڤەکرنا سەردار میران و کەریم شارەزا.

– سنوور و توخیبێ ڤەکۆلینێ :

ئەڤ ڤەکۆلینە ب دیالێکتا کوردی کرمانجی سەروو هاتیە نڤیسین و ڤەکۆلینێ لسەر شرۆڤەکرنا هۆزانا حاجی قادرێ کۆیی دکەت، کو ب دیالێکتا کرمانجی ناوەراستە کو هزر و بیرێن بەرگری تێدا هاتینە دەستنیشان کرن.

– ئارمانجا ڤەکۆلینێ :

حاجی قادرێ کۆیی هۆزانڤانەکێ کوردێ رووناکبیر و بەرنیاسە، خەمخۆرێ دۆزا مللەتێ خۆ بوو. دەنگ و رەنگێ هزرا خانییێ مەزنە ل باشوورێ وەلاتی،لەوما ئارمانج و مەبەستا سەرەکی دڤێ ڤەکۆلینێدا، ئەوە کو ئەم وی دەنگێ زەلالێ حاجی وەکی هەی دیار و دەستنیشان و خویا بکەین و وان هۆزانێن حاجی ئەڤێن هەلگرێ وێ هزرێنە ئاماژێ پێ بکەین و ناڤەرۆکێ وان شرۆڤە بکەین و بخەینە روو.

– ناڤەرۆکا ڤەکۆلینێ:

ئەڤ ڤەکۆلینە ژبلی پێشەکی و ئەنجاما و لیستا ژێدەرا،وەك پلان بۆ هاتیە بەرهەڤکرن ژ دوو پشکا پێکدهێت، پشکا ئێکێ ڤان سەرە بابەتا بخۆڤە دگریت : هزرا بەرگری چییە؟ ئەدەبێ بەرگری چییە؟ چەمك و زاراوێ ئەدەبێ بەرگری، مێژوویا سەرهەلدانا بیرا بەرگری د ئەدەبیاتادا، هزرا بەرگری د ئەدەبێ کوردیدا.پشکا دووێ : ئەڤ پشکە ڤان ناڤونیشانا بخۆڤە دگریت، کورتییەك ژ ژیانا حاجی قادرێ کۆیی، کاودانێن کۆییێ دناڤبەرا سالێن (١٨٠٠ – ١٩٢٠)

کاودانێن سیاسی، کاودانێن جڤاکی، هزرا بەرگری د هۆزانێن حاجی قادرێ کۆییدا.

پەیڤێن سەرەکی: هۆزان، وەلات، داگیرکار

## پشکا ئێکێ
## هزری بەرگری چییە ؟

بەری ئەم بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بدەین، پێدڤییە بەحسێ هندەك لایەنێن دیرۆکا کوردا بکەین، نەخاسمە دیرۆکا نوییا کوردی. پشتی شەرێ دەشتا چالدێران سالا ١٥١٤ کو ب مەزنترین جەنگ دناڤبەرا سولتان سەلیمێ ئێکێ یێ عوسمانی و شاه ئیسماعیلێ سەفەوی هاتیە رویدان.

ئەڤ شەڕ و جەنگە کارەکێ مەزهەبی بوو، دناڤبەرا سوننە و شیعا دا، دەولەتا عوسمانی کو سوننە مەزهەب بوون شییان ب هاریکارییا میرنشینێن کوردی کو سوننی بوون ب سەر سەفەوییادا سەرکەڤن و زالٚ بن.

ب ئاخفتنەکا دی کوردستان بوو ب کاروان سەرایێ شەڕو شۆرو ئالۆزیێن دناڤبەرا وان هەردوو هێزێن مەزندا.

بڤێ چەندێ ژی ئەڤ کارەساتە بۆ ئەگەرا هندێ کو کورد هەمیشە د رەوشەکا بەرگریکرنێدا بیت ژ هەبوون و مانا خۆ و پاراستنا وێ چەندێ. ڤان هێزان نەشیان مللەتێ کورد ب رێکا کوشتن و کوشتاریدا ژناڤبەرن و قڕبکەن. بەلێ ژلایێ زمان و ئەدەبیات و کولتوور و چاند و فەرهەنگێ.. ....ڤە شیان تا رادەیەکا باش بسەر کوردا سەربکەڤن. بۆ نموونە هەردوو نڤیسەرێن کوردنەژاد (ئیدریسێ بدلیسی و میرشەرەفخان) لشوینا هندێ کو بەرهەمێ خۆ بزمانی کوردی بنڤیسن وان بنەچاری ب زمانی فارسی نڤیسینە، بەلێ ((شێخ مارفی نودێ تەنیا بەرهەمێکی بە کوردی نووسیوە، ئەویش ئەحمەدییە بۆ ئەوەی کوڕەکەی فێری عەرەبی بکات، لەکاتێکدا پتر لە ٤٦ بەرهەمی بە هەردوو زمانی فارسی و عەرەبی نووسیوە)) (حوسێن محمد : ٢٠٠٥،ل٣٢٢).

بگشتی کاودانێن نەتەوە و وەلات د ئەدەبیاتادا رەنگ ڤەددەتن، ژبەر هندێ ((ناتوانین باسی بەرگری هیچ میللەتێك بکەین بەبێ ئەوەی دەسنیشانی بارو زرووفی ئەو ماوە مێژووییە نەکرێ چونکە، رووداوی مێژوویی ئازاراوی گیانی بەرگری شاعیر دەخولقێنێ و دەورووژێنێت.)) (د. عبدالله ئامێدی : ٢٠٠٥،ل٣٠٠) .

کەواتە هزرا بەرگری دوەختەکیدا دروست دبیت، کو حالەتەکێ بەرۆڤاژی بوونێ هەبیت، بۆ نموونە ئەگەر کارەکێ خراپ بەرامبەری کەسەکی ئەنجام بدەین،

ئەوژی کاردانەڤە بەرامبەری وی کاری دێ هەبیت. ئەڤە سروشتێ ژیانێیە. ئەگەر ڤێ نموونا سادە بکەینە پێوەر دشێین بێژین هزرا بەرگری کوردی وی دەمی سەر هەڵدایە، دەمێ ئیمبراتۆریەتا میدیا لناڤ چووی، چونکە ل وی سەردەمی کورد کەفتنە ژێر دەست، ڤێجا هەولێ و پێکول و بزاڤا پاراستنا خۆ دکر و دگەل هندێ ژی هەولا دووبارە خۆ رێکخستن و بنیادنانا وەلاتی بوون.

هزرا بەرگری گەلەك جۆر و شێوەی هەیە، ئەو ژی یاگرێدایە ب گۆهڕینا کاودانێن شێوێ ژیانێ ڤە، لەوما ئەڤ جۆرە شێوەیە بەر چاڤ دکەڤن: هزرا بەرگری تاکە کەسی و بەرگری ئایینی و بەرگری جڤاکی و بەرگری سیاسی و بەرگریکردن لە ئاشتی و لە ژیان و لەتەبایی و لەخۆشەویستی و لە لێبوردەیی و پێکەوە ژیان و یەکسانی و لە کرێکار و جووتیار و لەخوێندن و رەوشەنبیری و لە نیشتیمان و نەتەوە و لە سروشت و ژینگەه و لەپەروەردە و زانست خوازی.....
بەلێ مەرج نینە ئەڤ جۆرە بەرگریکرنە د بەرهەمێ هەمی هۆزانڤانەکیدا رەنگبداتەڤە بەلکی هندەك ژوان جۆرا د بەرهەمێ واندا خویا دبن، لەوما تێبینی دکەین کو ئەڤ هزرە لکەسەکی بۆ ئێکێ دی، یان ژ نڤیسەرەکی بۆ ئێکی دیتر جیاوازە. بەلێ بگشتی هزرا بەرگری وی چاخی پەیدا دبیت بشێوەیەکێ پەراکتیزەکرن دەمێ وەلات و نشتیمان دکەڤیتە بەر گەف و هێرشکرنێ ژلایێ داگیرکارانڤە.

**پێناسا ئەدەبێ بەرگری چییە ؟**

هەروەکی یا دیارە،کو هەتا نهۆ بەرامبەر ئەدەب پێناسەیەکا تەڤاڤ و کۆنکریتی نینە، ژ نڤیسەرەکی بۆ ئێکێ دی د گۆڕانێدایە، پێناسە دهێتە گۆهڕین، چونکە هەر نڤیسەرەك د روانگێ بیر و بۆچوونێن خۆ و ئەو قوتابخانا وی باوەری پێ هەی بەرێ خۆ ددەتە ئەدەبێ، هەروەسا ژی پێناسەیەکا تەڤاڤ بۆ ئەدەبێ بەرگری نینە. گەلەك ژنڤیسەر و ڤەکۆلەرا پێناسا ئەدەبێ بەرگری یاکری، بتایبەتی د ئەدەبیاتێن عەرەبیدا و نەخاسمە ژی د ئەدەبیاتێن فەلەستیندا، بەلێ ئەم دڤێرەدا ئاماژێ بوان پێناسا دکەین، کو ژ لا یێ ڤەکۆلەرێن کورد ڤە هاتینە پەژراندن :

د. عەبدوڵلا ئامێدی لە بارەی ئەدەبی بەرگرییەوە دەڵێت ((بەرهەمێکی بیرییە و رۆڵی رەفزو سەرپێچی دەگەیێنێت لە کاتی داگیرکردندا، هەروەها جەماوەر ئاراستە دەکات و هانیان دەدات بۆ پارێزگاری بوون و بنەماکانی بوونیان لەلایەنەکانی بیرو باوە ڕی زانستی و کلتووری و کۆمەڵایەتی.)) (د. عەبدوڵلا ئامێدی، ٢٠٠٥،ل١٨٤)، هەروەسا بەرێ خوّ بدە (د. قصی الحسین، ص ١١).

د. عوسمان عەبدول بەرزنجی بڤی شێوەی لەبارەی ئەدەبی بەرگریی ڤە دبێژیت ((ئەدەبی بەرگری لە جەوهەردا بریتییە لە ئەدەبی هۆشیارکردنەوەی نەتەوایەتی چینایەتییە لە رووی زەبرو زەنگدا، واتە رەفزکردنی واقعی ژێر دەستی لەگەڵ پەرەسەندنی نەتەوایەتی و تیژبوونەوەی ململانێی چینایەتی و کۆمەڵایەتی، ئەم جۆرە ئەدەبە سەری هەڵداوە.)) (د. عوسمان بەرزنجی:٢٠٠٣، ل٢٥٨).

سامی شۆڕش دەربارەی ئەدەبێ بەرگری دبێژیت ((ئەدەبی کوردی لە جەوهەردا ئەدەبێکی بەرگرییە، چونکە ئەدەبی میللەتێکی بەرگریکەرە و لە دێرزەمانەوە بۆ پاراستنی نەتەوەیی خۆی هەموو چست و چالاکییەکانی خۆی خستۆتە شەڕی بەرگری کردن)) (سامی شۆڕش :١٩٨٣، ل).

ئەبوبەکر خۆشناو ئەدەبی بەرگری بەم شێوەیە پێناسە کردووە ((شیعری بەرەنگاری، شیعری ناڕەزایی و داکۆکی کردن لە ئازادی زەوت کراوە و جۆرێکە لە دژە هێرشی رۆشنبیری بەرامبەر رۆشنبیریی داگیرکردن.)) (ئەبوبەکر خۆشناو : ٢٠٠٢، ل ٣٤).

ئەوا دڤان پێناسادا دەردکەڤیت، هەر چەندە ژلایێ فۆرم و هندەك لایەنێن ناڤەرۆکی ڤە ژئێکتر جودانە، بەلێ هەمی لسەر وێ خالێ کۆکن کو، ئەدەبەکە ئەدەبەکێ رەفزکارە. بەلێ جۆرێ رەفزکرنا وانژی یا جودایە. دپێناسا ئێکێدا یا ژویڤە ئەگەر داگیرکار وەلاتی داگیربکات ئەدەبێ بەرگری دروست دبیت، بەلێ د هەر دوو پێناسێن دیدا ئێك ژوان هەڤ رایە و ئەوێ دی ژی یاژ ویڤە بتنێ داگیرکار هۆکارنینە بۆ دروست بوونا ئەدەبێ بەرگری. بەلێ گەرمبوون و تیژبوونا هەڤڕکیا چینایەتی هۆکارەکە بۆ دروست بوونا ئەدەبێ بەرگری.

**چەمك و زاراڤی ئەدەبێ بەرگری:**

وی دەمێ مرۆڤـ ل سەر ڤێ هەسارێ پەیدا بووی. دگەل سروشتی ژلایەکی و رێساو رەوشت و تیتالێن جڤاکی و ژیانێ ژ لایەکێ دیڤە د ململانێ و هەڤرکی دابوو. هۆزان ژی وەك ژانرەکا ئەدەبی یا بەرهەڤـ بوو وێ چەندێ بستوویێ خۆڤە بگریت، چونکە هۆزانڤان کورێ جڤاتەکێیە، بێگومان کاودانێن جڤاکی هەر د چەوابن، ئەڤە رەنکدانەڤێ لسەر هۆزانڤانی ژی دکەتن. بڤێ چەندێ هۆزانا بەرگری د وی دەمێدا پەیدا دبیت، چاخێ جڤاك د رەوشەکا بەرگریکرنێ دابیت، ئە ڤە ژ رییێ بەرگریی داگیرکاریڤە ژلایێ داگیرکارانڤە، بەلێ هندەك جۆرێن بەرگریی و بەرهنگاری دی ژی هەنە بێی هندێ کو داگیرکار د ئارادابیت بوونا هەی هەروەکی بەری نۆکە مە ئاماژە پێکری.

هۆزانا بەرگری چەمك و پێناسەی جودای هەیە، ژ نڤیسەرەکی بو ئێکێ دی، بۆ نموونە هۆزانڤانێ بەرنیاسێ عەرەبێ فەلەستینی دەربارەی چەمکێ هۆزانا بەرگری دبێژیت ((هۆزانا بەرگری هەروەکی ئەز تێدگەهم دەربرینەکە ژ کەتوار و پێدڤی گۆهرین و باوەر ئینانە ب شیانێن گۆهرینێ، بەلێ ژبو هندێ کو هۆزان وی رۆلی ببینیت، دڤێت خۆ ب تیورە کا شۆرە شگێری خودان ناڤەرۆکێ جڤاکی ڤە چەکدار بکەت)) (د. عەبدوللا ئامێدی : ٢٠٠٥، ل ٢١)، هەروەسا بەرێ خۆ بدە (عزالدين اسماعيل، ١٩٧٨، ص ٤٦).

ئەوا دڤێ چەمکیدا دیار و خویا دبیت ئەوە نڤیسەر دوێ باوەرێدایە،کو دبیت ئەڤـ جۆرە هۆزانە هۆزانەکا رەفزئامێز بیت، ئەو کەتوارێ کو هەیە رەد بکەتەڤە و بەرەف گۆرانا کونجای ببەت. واتە جۆرە هزرەك ئاراستە بکەت، کو بناڤەرۆکێ جڤاکی وی سەردەمی بیت، سەر هندێ را دڤێت هاندان تێدابیت بۆ ب ئەنجام گەهاندنا شۆرەش و شۆرەشگێرییێ.

ئەڤە ژی بەرەف وێ بۆچوونێ دێ مەبەت کو بێژین هۆزانا بەرگری (ئەو شیعرە ئازادیی خوازانەیە کە، لەلایەك دژی زۆرداری و خۆسەپاندن و داگیرکارییە، لە لایەکی تریش بە بەهای ئازادی و فیداکاری و یەکێتی دا هەڵدەڵێت.) (د. عوسمان دەشتی : ٢٠٠٩، ل ٥٢).

لدویف ڤێ بیت هۆزانا بەرگری ب دوو ئاراستا كار دكەت، یائێكێ رەفزو رەدكرنا داگیركار و داگیركارییە، یا دووێ هاندان و بلندكرنا ئاستێ مۆرالا تاكێن كۆمەلگایە، ژپێخەمەت هندێ دژی داگیر كارا یان هەر تشتەكێ دی راوەستن كو دژی وانە. بڤی چەندێ بیت دێ شێین بێژین ئەدەبێ بەرگری ((ئەدەبێكی واقعی مرۆڤایەتییە.)) (د. عەبد وڵلا ئامێدی :٢٠٠٥، ل ١٣).

دەربارەی زاراڤێ ئەدەبێ بەرگری، د زمانێ كوردیدا ژبلی ڤی زاراڤەی هەر ئێك ژڤان زاراڤان ژی (ئەدەبێ بەرهنگاری و بەرهەلستی و بەرە ڤانی) ژی بكاردێن. دزمانێ عەرەبیدا هەر ئێك ژڤان زاراڤا (ادب المقاومة، ادب المقاوم، ادب التصدي، ادب مقاومة الاحتلال. بكاردێن. د زمانێ ئنگلیزیدا بۆ هەر وی مەبەستی زاراڤێ (resistant Literature) ی بكاردێت.

**مێژوویا سەرهەڵدانا هزر و بیرێن بەرگری د ئەدەبیاتادا :**

مرۆڤ بوونەوەرێكە لەسەر كۆی زەڤی دژیت، هەرگاڤ پێكۆلا هندێ كرییە كو، هێز و دەستهەلاتا خۆ لسەر وێرێ بسەپینیت، مرۆڤ ب رییێ مرۆڤاتیا خۆڤە هەر ئێكن، واتە ئەم هەمی ژ ئادەمین ئادەم ژی ژ ئاخێیە، بەلێ دەمێ نەڤیێن ئادەمی زۆر بوون و لسەر ئەردی بەلاڤ بوونەڤە هەڤكێشە هاتنە گۆهرین ئا بڤی رەنگی، مرۆڤ هەر دكەڤندا لوی چاخێ كو (قابیل) ی (هابیل) ێ برایێ خۆ كوشتی، كێشە و ئارێشە سەرهڵدان و دوو بەرەكی و هەڤرکی و شەڕ و شۆر دناڤبەرا مرۆڤاندا پەیدابوو چونكە جیهان مللەتەكی دناڤبەرا مللەتاندا كار و تشتەكێ پەیدابوونا شەڕو پێكدادان حەتمییە. پێوەندی و گرێدان ب رابردوو نهۆ ڤە هەیە و گەلەك كارەسات و وێرانكردن بخۆڤە گرتن و گەلەك دیمەن و وێنێن قارەمانی پاڵەوانی.هاتنە خویاكرن.

ئەڤ هەژموونگەرییە كاردانەڤە هەبوو ژلایەن گەل و نەتەوێن جیهانێ ڤە، بۆ نموونە سەرهڵدانا هزرا بەرگریی ل كوردستانێ جودایە دگەل یا مللەتێ ڤێتنامێ، بەلێ بگشتی ل هەر جهەكی شەڕ و جەنگ هەبیت، هۆزانا بەرگری یان بێژین بەرگریی سەر هڵدەدەت، مێژوویا پەیدابوونا بەرگریێ لجیهانێ ب سەر دوو ئاستا پارڤە دبیت، ئاستێ ئێكێ ل رۆژئاڤادا و ئاستێ دووێ ل رۆژهەلاتدا، پشتی چەرخێ (١٧) رۆژئاڤا بەرەف ڤەكرنێ چوو بەرەف دروستبوونا چەند دەولەتێكێن

نەتەوەیی پێنگاڤ هاتنە هاڤێتن، ژیان بشێوەکی هاتە گۆهڕین چەندین دیکتاتۆرێن سەر سەخت دروستبوون مینا (ناپلیۆن و ماسولینی و هێتلەری... .هتد) ئەوان پێکولا بەرفرەهکرنا دەسەلاتا خۆ بوون، لەوما تووشی بەرهنگاریا چەکداری بوون ئەڤەژی ب سەرەتا ژ دایکبوونا هزر و بیرێن بەرگریی دهێنە دانان،چونکە هۆزانڤان لکۆمەلگادا دژیت و پشکەکا نەڤەقەتیایە ژوێ بەرهنگارییێ و هەست و نەستا خۆ بەرامبەر وێ چەندێ دەردبڕیت.

بەلێ ل رۆژهەلاتێ ب جۆرەکا دییە، پشتی نەمانا هەر ئێك ژ ئیمپراتۆری عوسمانیا و سەفەویا و هاتنا ئیستعمارا ئەوروپی بۆ دەڤەرێ، هەڤکێشە گۆهڕین بسەرداهاتن و کاردانەڤە بەرامبەر هاتە دی و شۆرەش و راپەرین هاتنە ئەنجامدان و بەرگریکرن ژ نەتەوە و ئایین دژی داگیرکەران دەست پێکر.

**هزرا بەرگرییێ د ئەدەبیاتێن کوردیدا :**

کورد هەر دکەڤندا کەفتییە بەر زیڤرك و نەهامەتی و کارەساتێن هەمە جۆر و هەمەرەنگ، بەلێ دگەل هندێدا مللەتی کورد شیبا خۆ لبەر ڤان کاودانێن دژوار بگریت و هەبوونا خۆ لسەر خاك و نشتیمانی بپارێزیت و ئەڤ چەندەژی دزڤریتەڤە بۆ نەبەزی و دلێری و مێرخاسی و بەرەڤانیا مللەتێ کورد کو، بهیچ شێوەیەکی سەرێ خۆ نەچەماندیە بەرامبەر دوژمن و دوژمنکارا، ئەڤ هەلوێستە ژی بگشتی ئاماژە پێ هاتیەکرن، هەروەکو د بابەتێن ئەدەبێ فۆلکلۆری و مللیدا بشێوەکێ بەرفرەه رەنگدایەڤە، نەخاسمە د داستان و گۆرانی فۆلکلۆری و پەندێن پێشینانداا...هتد. هەروەسا ئەڤ چەندە د ئەدەبیاتێن کلاسیکیدا ژی دهێتە بەدیکرن پتریا هۆزانڤانێن کورد کێم یان زێدە بەحسێ ڤی بابەتێ بەرگرییێ هاتیەکرن، چونکە رەوش و کاودانێن مللەتی کورد ئەڤ چەندە دخاست، مینا ڤان هۆزانڤانا ئەحمەدێ خانی، سالم ساحێبقڕان، شێخ رەزا، پیرەمێرد، ئەحمەد موختار جاف، بێکەس، دلدار، جگەر خوین.........هتد. حاجی قادرێ کۆیی ئەو ژی دهێتە هژمارتن ئێك ژوان هۆزانڤانێن بەر نیاس و بناڤ و دەنگ د وی بیاڤیدا، لەو ما من ئەڤ ڤەکۆلینە ئامادەکر و ئەنجامدا.

**کورتیەك ل ژیانا حاجی قادرێ کۆیی :**

هۆزانڤانێ ناڤدارێ مللەتێ مە ناڤێ وی (حاجی قادری کوڕی مەلا ئەحمەدە کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە) یە، دەربارەی ساڵا ژ دایکبوونا وی بیر و هزرێن جودا هەنە، هەتا نهۆ ساڵا ژدایکبوونا وی نە هاتیە دەستنیشانکرن، هەر بۆ نموونە (سەردار میران و کەریم شارەزا) کو دیوانا حاجی ب چاپ گەهاندییە. یاژوانڤە ساڵا ژ دایکبوونا حاجی دزڤریتەڤە بۆ سالێن (١٨١٥ –١٨١٦) (میران و شارەزا : ١٩٨٦، ل١٠).

هەر دەربارەی وێ مژارێ (فخرەدین ئامێدیان) دبێژیت ((لە ساڵی ١٨٢٧ لە دایك بووە)) (فخرەدین : ١٢ ٢٠، ل ٣٩٣).

هەروەسا د. مارف خەزنەدار ژی یاژویڤە ((حاجی لە ساڵی ١٨١٦ لە دایك بووە)) (د. مارف : ٢٠١٢، ل ١٣١). مامۆستا عەلائەدین سجادی دبێژیت ئەو ((حاجی لە ساڵی ١٨١٥ لە دایك بووە)) (م. سجادی: ١٩٧١، ل ٢٥٣). مەسعوود محمد دەربارەی وی بابەتی دبێژیت ((ئیحتیماڵە لە ساڵی ١٨٢٨ لە دایك بووبێ.)) (مەسعوود محمد: ١٩٧٣، ل ٩٨). لپەی ڤان بیر و بۆچوونێت سەرێدا هاتین ساڵا ژ دایکبوونا حاجی دکەڤیتە ناڤبەرا ساڵێن (١٨١٥ – ١٨١٦ – ١٨٢٧) ئەگەر ئەم هەر ساڵەکا د سەریدا بۆ ساڵا ژ دایکبوونا حاجی پەسند بکەین ئەڤە دگەل ڤێ دێرا هۆزانێ دگونجیت :

**سەرو ریشم ســـەراپا بۆتە لۆکــە**

**شەوێ هەمرازمە پشمین و کۆکە** (دیوانی حاجی : ١٩٨٦)

حاجی ل گوندێ (گۆڕ قەرەج) ژدایك بووە، کو دکەڤیتە ناوچەیا کۆیە، لدویڤ وان ژێدەرێن بەر دەستێ مەدا حاجی خۆی ئاماژێ بناڤێ دایك و بابێ خۆ دکەت و دڤێ دێرێدا دبێژیت :

**باوکم ئەحمەد بوو ناوی فیکرم دێ**

**خەڵقی لادێ بوو دایکی من فاتـــێ** (دیوانی حاجی: ١٩٨٦ : ل ٩)

لدویڤ ڤێ دێرا هۆزانا سەرێ بیت بابێ وی ناڤێ وی (ئەحمەد) بوو و دەیکا وی ژی ناڤێ وێ (فاتێ / فاتە) بوو، بەلێ ناڤێ جهێ ژدایکبوونا خۆ ب ئاشکرایی نەئینایە، هەر چەندە رەخنەگرو ڤەکۆلەرێن ڤی باری گوندێ (گۆڕ قەرەج) جهێ ژدایك بوونا حاجی دادنن.

ل ژیێ حەفت سالیدا بوو بابێ وی چوو بەر دلۆڤانیا خودێ، پشتی وی دەیکا وی دانا بەرخوێندنێ، چونکە ((لە نەریتی کوردەواریدا وا باو بووە، کوڕی تاقانە گەر باوکی کۆچی دوایی کردبێت، دایکی دەیخستە بەرخوێندن، خوێندنی بەرایی لەلای مەلا ئەحمەدی ئۆمەر بووە، دوای دوو ساڵیش دایکیشی کۆچی دوایی کردووە.)) (د. مارف خەزنەدار :٢٠١٢، ل ١٣١) لپەی ئاخفتنێن د. مارفی بیت ئەو دژییێ (٩) سالیدا بوو دەمێ دەیکا وی چوویە بەر دلۆفانیا خودێ مەزن، بەلێ حاجی دەستبەردار نەبوو هەر بەردەوام بوو لسەر خوێندنێ هەتا بییە فەقە ((لەساڵی ١٨٥٣ دا لەگەڵ مەلا عبداللە ی جەلیزادە وەك فەقێیەك روو دەکەنە شێخ وەتمانی باڵەکایەتی لەلای مەلا محمدی کاك عبدالله.)) (ژێدەرێ بەرێ :ل ١٣١).

پشتی هەیامەکی حاجی بۆ خاندنێ دچیتە رۆژهەلاتێ کوردستانێ، بۆ هەر ئێك ژ باژێرێن (سەردەشت و مهاباد و سابلاغ) ((بۆ ماوەی شەش حەوت ساڵێك لەم شارانە دەمێنێتەوە تاخوێندنی حوجرە تەواو دەکات.)) (ژێدەرێ بەرێ : ل ١٣٢). پشتی تەمامکرنا خویندنا خۆ حاجی دزڤریتەڤە بۆ باشوورێ کوردستانێ، لدویڤ هندەك ژێدەرا هەر لکۆیێ دمینیتەڤە، بەلێ پشتی ماوەیەکی ((حاجی سەرئەنجام دوای ئەو هەموو خەمخۆرییە بۆ خەڵکی کۆیە.. ...... بەرامبەر بەشاعیر وخەمخۆری وەك خۆی کەمتەرخەمن بۆیە بڕیار دەدات بچیتە ئیستەنبول.)) (میران و شارەزا :١٩٨٦،ل ١٢).

سەبارەت نازناڤێ وی (حاجی) مامۆستا عەلائەدین سجادی دبێژیت ((هەر منداڵێك لە مانگی حاجییانەوە بێتە دنیاوە، پێی دەڵێن حاجی. ئەم رەوشتەش تا ئێستا ماوە لە لادێکان.)) (م، سجادی : ١٩٧١، ل ٣٣٩).

دەربارەی کۆچکرنا وی د رۆژناما کوردستان ژمارە (٣) سالا ١٨٩٨ هاتبوو نڤیساندن ((ساڵی پار حاجی قادر کۆچی دوایی کردووە و شیعری زەمانەشی بڵاوکردۆتەوە.)) (عبدالواحید ئیدریس : ٢٠١٦،ل ٧٣).

لدویڤ ڤێ چەندێ بیت سالا وەغەرکرنا حاجی دزڤریتەڤە بۆ سالا ١٨٩٨. بەلێ میران و شارەزا دێ بێژن ((هەروەکو ساغیش بۆتەوە حاجی لە ساڵی ١٨٩٧ لە شاری ئەستەمبوڵ لە ئاوارەیی و بێ کەسیدا سەری ناوەتەوە و کۆچی دوایی کردووە لەبەری ئۆسکدار لە گۆڕستانی قەرەج ئەحمەد نێژراوە)) (میران و شارەزا: ١٩٨٦،ل ١٧).

**کاودانێن  کۆییێ  ل سالا ١٨٠٠ – ١٩٠٠**

ژ پێخەمەت  تێگەهشتن و شرۆڤەکرنا هۆزانێن حاجی،پێدڤییە ئاورەکێ ل وان کاودانان بدە ین ئەوێن حاجی تێدا ژیای و تێدا تێپەری، بێگومان ئەو رە وش و بارۆدوخە هەر چەوابن، کارتێکرن و رەنگدانەڤە  ل سەر حاجی هەبوو. هەر چەندە حاجی ل سەردەمێ  قوتابخانەیا هۆزانا کلاسیکا کوردیدا ژیاییە، بەلێ دەمێ حاجی کۆییێ بجهدهێلیت و بەرەو ئیستەمبولێ دچیت، مەبەست و بابەتێن هۆزانێن وی گۆڕانکاری بسەردا هات.

**کاودانێن سیاسی**

**کاودانێن سیاسی ناوچەیا کۆییێ دناڤبەرا سالێن (١٨٠٠  –  ١٩٠٠)**

ب چەندین شێوە  گۆڕانکاری بسەردا هاتبوو، واتە سەردەمەکی لـژێر دەستێ دەستهەڵاتا بابانیاندا بوو و سەردەمەکێ دی لـژێر دەستێ میرنشینا سۆراندا بوو، ماوەیەکی ژی لژێر دەستێ حوکمڕانیا عوسمانیادا بوو. پشتی نەمانا میرنشینا بابان  ل باشوورێ کوردستانێ، کۆیە کەفتە بن دەستێ میرنشینا سۆران ((شا عەلی جلـەوی دەسەڵاتی گرتە دەست و هەوڵی زۆری دا ئەو مەملەکەتەی فراوان بکات، دوای نەمانی میر بۆداقی کوڕی جێی گرتەوە وردە وردە مەملەکەتەکەی فراوان کرد تاوەکو گەیاندییە (سوماقولق) کە سماقولی ئێستا دەگرێتەوە.)) (کەریم شارەزا و ئەوانی تر : ٢٠٠٩،ل ٦٣). ئەڤ  ئاخفتنە نیشانا هندێنە کو میرنشینا سۆران ناوچەیا کۆییێ ئێخستیە ژێر رکێفا خۆ،چونکە سماقولی ئێکەکە ژ وان گوندان کو کەفتییە باکوورێ کۆییێ، ل سەردەمێ میر محەمەدپاشای  گەورەی رەواندوز کۆییێ بتەمامی کەفتە ژێر دەستێ  میرنشینا سۆران ((میرمحەمەد لە ساڵی ١٨٢٧  پەلاماری کۆیەی داوەو هێزەکانی بابان بێ شەڕ چۆلیان کردووە، لەڕێگەی دووکانەوە چوونەتەوە سلێمانی.)) (کەریم شارەزا  و ئەوانی تر : ٢٠٠٩، ل ٧٠).
بڤێ چەندێ کۆییێ  سەردەمەکی ژێر دەستهەڵاتا بابانیا بوو، وان حوکمڕانیا کۆییێ دکر. واتە باژێرێ کۆییێ  د کاودانەکێ باشدا نەبوو، بۆ جهێ ململانێ و هەڤڕکییێ دناڤبەرا میرنشینیاندا، واتە هەر ئێك ژ میرنشینا بابان و سۆران پێکولا هندێ دکر کو کۆییێ بێخنە ژێر دەستهەڵاتا خۆدا. بێگومان ئەو جهێ ئەڤ جۆرە ململانێ بکەڤیتە تێدا، دێ تووشی گەلەك گرفت و ئاریشان بیت. چونکە هەر هێزەك پێکولا

خۆ سەپاندنێ دکەت، بگشتی رەوش و بارۆدوخ ژ هەمی لایەکیڤە باش نەبوو، ئەو بوو بابانیا کوشتنەکا زۆر لوێرێ ئەنجامدا، ژپێخەمەت خستنە سەر میرنشینا خۆ و سەربەخۆ برێڤە ببەن ((لەشکری کۆیە و دەوروبەری شکا لەو شەڕە گەورەکانیان بەدیل گیران و ئەوانی تر کوژران، سێ شەو و سێ رۆژ کوشتاریان لێکرا....... ئەوجا بەکر بەگ لەپەنا چۆمێ دانیشت، یەك بەیەك سەریانی دەپەڕاند و تەرمەکانیانی دەخستە ناو زێی کۆیە.)) (ژێدەرێ بەرێ، ل ٧٦).

پشتی نەمانا دەسەلاتا میرنشینان لسەر کۆیێ،کۆیێ کەفتە ژێر حوکمڕانیا عوسمانیا و راستەوخۆ ژلایێ وانڤە هاتە برێڤەبرن ((پۆلیسی ئەو دەولەتە کە پێیان دەگوترا هەیتە بەشار و دێهاتەکان بلاوبوونەوە زولمێکی زۆریان لە خەلك دەکرد.)) (ژێدەرێ بەرێ، ل ١١٢). ئەگەر کۆیێ ل سەردەمێ حوکمڕانیا میرنشینا هندەك دواکەفتی پێڤە دیاربیت، ئەڤە ل سەردەمێ حوکمڕانیا عوسمانیا بتەمامی تووشی دواکەفتن و نەهامەتی و نەخویندەواری بوو، چونکە داگیرکارێن عوسمانی ئامادە نەبوون بهیچ شێوەیەکی چاکسازی بکەن، بەلکی برێکا بکارئینانا ئایینی و ئۆلی ڤەپێکولا هندێ دکر کو خەلکێ سەردابن و تووشی دەردەسەریێ بکەن. ل سەردەمێ حوکمێ عوسمانیان بتنێ پیتەو گرنگی ب ((گومرگ و باج کۆکردنەوە دراوە، لە رووی خوێندنیشەوە تاوەکو سالی ١٩٠٠ قوتابخانە نەبووە تەنیا پشت بەحوجرەکان بەستراوە، کاتێ قوتابخانەی سەرەتایی لە کۆیە دانرا، ئەوە هەر زوو بەزوو داخرا، تاوەکو حوکمی عوسمانییەکان نەما ئینجا لە کۆیە قوتابخانە کرایەوە.)) (کەریم شارەزا و ئەوانی تر : ٢٠٠٩، ل١١٤).

**کاودانێن جڤاکی :**

وەك هەڤکێشیەکا زانستێ بیرکاری هەرچەندە کاودانێن سیاسی ناجێگیر و خراپ بیت و جهێ ململانێ و هەڤڕکیێ بیت، هندە ژی کاودانێن جڤاکی تێك دچن و کۆمەلگە خراپ دبیت، چونکە کاودانێن هەر جڤاکەکێ ل سەر لایەنێ (سیاسی، ئابووری، ئایینی.. .....هتد) بەندە و گرێدایە. وەك بەری نهۆ مە ئاماژە پێکربو و کو کۆیێ ژلایێ سیاسی ڤە سەقامگیری و تەنایی بخۆڤە نەدیتبوو بۆ جهێ ململانێ و هەڤڕکیەکا توند دناڤبەرا میرنشینان ژلایەکی ڤە و ژ لایەکێ دیڤە بۆ جهێ تورکێن داگیرکار، بڤێ چەندێ کاودانێن کۆیێ و رەوشا جڤاکی یا باش نەبوو،

ژلایێ خویندەواری ڤە ئەگەر حوجرە و مزگەوت نەبانا ئەڤە کۆیێ دابیتە بازێرەکێ تاری و ئەڤە و سەر هندێ را د ناڤبەرا سالێن ١٨٠٠ – ١٩٠٠ دا ژلایێ ئایینی ڤە هندەك کەسان و لایەنا بناڤێ ئایینێ پیرۆزێ ئیسلامێ فێل و حیلە و سەختە گەلەك بەرامبەری خەلکێ کۆیێ دهاتەکرن، هەر ڤێ رەوشا خراپ ئێکا هند کر کو کەسەکێ زانا و هزرمەندەکێ وەکی حاجی، کۆیێ بجهـ بێلیت و قەستا ئستەمبولێ بکەت، سەر هندێرا خەلکێ وی سەردەمی لدویڤ هزرێن هیچ وپووچ وخورافی دکەفتن، کەسانێك هەبوون بناڤێ ئایینی بچاڤەکێ نزم و سڤك و کێم بها تەماشەی هۆزانڤان و رەوشنبیریان دکر، هەروەکی حاجی دهۆزانەکێدا ئاماژێ بڤێ چەندێ دکەت :

**هەمـــوو خـــزمی خۆمـن دەزانـم دەڵێن**

**لە بێ حورمەتیمان بوو حاجی هەلات** (دیوانی حاجی : ل ٥٦ )

## پشکا دووێ

## هزرا بەرگری د هۆزانێن حاجی قادرێ کۆییدا

بەری بەحسێ هزرا بەرگری بکەین د هۆزانێن حاجیدا، پێدڤییە روهنکرنەکێ بدەین لسەر هزرا بەرگریکرنێ دڤێ ڤەکۆلینێدا. دەمێ ئەم بەحسێ هزرا بەرگرییێ دکەین، بتنێ مەخسەد و نیازا مە تەنیا ئەو بەرگرییە نینە کو بەرامبەر دوژمن و داگیرکەرا دکەین. بەڵکی بەحسێ هەمی وان جۆرێن بەرگرییێ دکەین کو حاجی د هۆزانێن خۆدا ئاماژە پێکرییە.

لپەی دیرۆکا ژ دایکبوونا حاجی و کۆچکرنا وی، حاجی سەر ب قوتابخانا هۆزانا کلاسیکی بوون واتە حاجی ژلایێ فۆرم و شێوێ هۆزانێ ڤە سەر ب قوتابخانا هۆزانا کلاسیکییە، دگەل هندێ حاجی ل کوردستان و کۆیێ دابوو ناڤەرۆکێن هۆزانێن وی ژی هەر بسەر وێ قۆتابخانێ بوون. بەلێ دەمێ حاجی قادر کۆیێ بجدهێلیت و بەرێ خۆ ددەتە ئیستەمبۆلێ هەستا نەتەوی و بەرهنگاری بتەڤاڤی لدەف دروست دبیت. ئەڤە ژی ژبەر دوو هۆکارێن سەرەکی، یائێکێ حاجی ل ئیستەمبۆلێ دگەل کۆمەکا رەوشەنبیر و نڤیسەرا تێکەل بوو نەخاسمە

((بنەماڵـەی بەدرخانییـەکان، بـووە بـە مامۆسـتای تایبـەتی کوڕەکـانی ئـەم خانەوادەیە.)) (میران و شارەزا : ١٩٨٦،ل٢٣).

یا دووێ دەمێ حاجی ل ئیستەمبولێ دژیت، دکەڤیتە ژێر کارتێکرنا هـزر و بیرێـن رۆژئاڤـا، ژ لایـەکێ دیڤـە ((دیباجـەی مـەم و زینـی خـانی خوێنـدەوە و لـە ئەنجامی خوێندنەوەی کتێبە تازە رۆشنبیرییەکانی ئەوروپا کە دەکران بـە تـورکی هەستی نەتەوەیی لای سەری هەڵدا.)) ژێدەرێ بەرێ، هەمان لاپەرە.

ئەڤە هەمی هۆکار و ئەگەرێ ڤەکرنا هزر و بیرێن حاجی بوون، ژبەر هنـدێ د دیوانا وی ژیدا دبینین کـو، حـاجی بـەرهنگاری زۆر کـەس و لایـەنا بوویـە بگشـتی حاجی ئێکە ژ وان هۆزانڤانا کو دەرد و دەرمانێ گەلێ کورد دیارکرین.

حاجی دهۆزانێن خـۆدا بـەرگریی ژ گەلـەك بابـەت و مـژارا دکـەت. بۆنموونـە بـــەرگریکرن ل هـــەر ئێـــك ژ بابـــەتێن خوینـــدن و خوینـــدەواری دکـــەتن دژی نەخوێندەواری. بەرگری ژ ئێك رێزیێ دکەتن دژی بـژیان وپەرتـەوازیێ و هەروەسـا دژی پاشمەڤایا ئابووری دراوەستیت. حـاجی بشـێوەکێ زۆر دانایانـە د هـۆزانێن خـۆدا پەنجـە دانایـە سـەر ئـێش و دەرد و کۆڤـانێن مللـەتێ خـۆ و هـەر ب هنـدێ نەراوەستیایە، بەلکی دەرمان ژی بۆ دەستنیشان و دیار کرییە.

داخازا ئێکەتی و تەبایی و ئێك رێزییا کوردا دکەتن و بـەرۆڤاژی ڤـێ چـەندێ ژی ئەگەر ئێك رێزنەبن ئەڤە تووشی ماڵوێرانی و خولی سەریێ دبن :

**تا ڕێك نەکــەون قەبیلی ئەکــراد**

**هــەروا دەبــن خــەرابە ئابــاد**

**ئەنواعی میلەل لەگەورە تا بچووك**

**خەمڵیوە مەمالیکی وەکــو بــووك** (دیوانی حاجی : ل١٩٩)

دڤان هەردوو مالکێن هـۆزانێن سـەرێدا، حـاجی بەحسـێ هنـدێ دکـەت، کـو ئەگەر هاتوو کورد وەکی نەتەوەیەك ئێك نەبوون و نەشیان رێزێن خۆ بکەنـە ئێـك و تـەبابن. ئەڤـە بێگومـان هـەردێ بـوی شـێوەی مینەڤـە و دوژمـن و داگیرکـارێن کوردستانی دوی دەلیڤەی دگەڕن داکو پتر مـاڵوێرانی و کاڤلکـاریێ بسـەر کـورد و کوردستانێدا بینن و بکەنە گەلەکێ خۆخۆر و پاشـکەتی. پاشـی تیشـکێ بەردەتـە سەر هنـدێ، داکـو هەسـتا نەتـەوی دەف مللـەتێ کـورد دروسـت بکـەت، بەحسـێ

نەتـەوێن دى ژى بـۆ دكـەت و كـا چـەوان ئێكگرتـى بـوون و سـەركەفتن دهـەمى بوارەكيدا ب دەستڤە ئينايە.

**هەركوردن ئەگەرچى پاكى مەردن**
**پـامالـى زەمـانە ميسلى گـەردن**
**هــەر مانەوە بێ نــەواو مەزلـوم**
**وەك بومى خــەرابە زار مەشــئوم**
**گەر باعيسى ئەم دەپرســى كامە**
**شــەرتێكە كە بـۆ هەموو تەمـامـە** (ديوانى حاجى : ل ١٩٩)

حاجى دڤێرەدا دهێتە سەر بەحسێ باشـى و چـاكيێن مللـەتێ كـورد دگـەل هندێ كو ئەڤـ هەمى سەخلەت و پەسنێن جوان و باش هەين، هەر زۆلم و ستەم لێ دهێتەكرن ئەڤەژى دزڤريتەڤە بۆ هنـدەك كەسـان كـو، بووينـە داردەسـتێ كەسـێن دى. حاجى دەنگـێ خـۆ ئاراسـتەى هـەمى كـوردەكى دكـەت هـەمى پێكڤـە ئێـك و دووبگرن و دەستا ژئێك بەرنەدەن، ئەڤ چەندە ژى دڤان چەند دێرێن خوارێدا ديـار و خويايە كو، سيما و موركێ هزرا بەرگرى پێڤە ديارە.

ديارە دەمێ كوردسـتان ژلايـێ عوسمانياڤـە دهێتـە داگيركـرن، چـاخێ كـێم بەرگرى دهاتەكرن، ئەڤەژى پشكەكێ بۆ ئايينێ دزڤريتەڤە.چونكە عوسمانيا ئايين و ئۆل د بەرژەوەندييا خۆدا بكاردئينا. دوى وەختيـدا دناڤـ كوردسـتانێدا كۆمـەكا خەلكێ هەبوون بناڤێ ئايينى فێلبازى و سەختە ل خەلكێ دگـرن و مـژوولى كـەيف خۆشى يێن خۆ بوون.

**لــە گاوان و شــوانى كوردان يــەك**
**بەسە بۆ لەشكرى سەدكەڕە دوولەك**
**فيداى جووتيارتان بێ حاتەمى تـەى**
**بەقوربانى سەپانتان بێ ئالى بەرمـەك**
**مـريشكى ئێوە ســەيادى شــەهێنە**
**لەكن عەنقا فرووجـە حاجـى لەكلەك** (ديوانى حاجى : ل٥٨)

دڤان دێرێن سەرێدا، حاجی تیشکێ دئێخیتە سەر ئازایەتی و قارەمانییا مللەتێ کورد، ژلایێ دیڤە مللەتەکێ گەلەك دلێر و چاڤ نەترسە، شیانێن بەرگریکرنێ د هەمی تەخ و چینێن مللەتیدا هەنە، هەمی ئامادەنە بۆ خۆ بەخت و گوری کرنێ،نموونا شڤان و گاڤانا دئینیت کو، وان هیچ پەیوەندی بسیاسەت و شۆرەشاڤە نینە بەلێ دگەل هندێ، کەسانێن وەلات پارێزن و رۆژا قەوماندنێ هەر ئێك ژوان ب سەد مێرانە، جووتیارەکێ کورد ژ حاتەم تائی گەلەك دەست ڤەگریترە و چاڤتێرە. وێنێ دوژمنێ داگیر کەر، ئەگەر باز و شاهین ژی بیت نموونا هەردوو باڵندەیێن هەرە بهێز دئینیت، ئەڤە مریشکەکا کوردی راڤەکەرێ وانە. مەخسەد ئەڤەیە ئەگەر دوژمن چەندێ ب هێز و توانابیت، ئەم کورد ژوان ب هێزترین. بەلێ دەردێ مەیێ سەرەکی ئەوە ئەم دناڤ خۆدا دگەل ئێکتر راست و دروست نینین، مژوولی سەردابرنا ئێکین و نزانین و ئاگادار نینین کا دوژمن چ پیلانەکێ بۆ مە دادرێژن و نەخشێ بۆ دادنن. حاجی ددرێژیا هۆزانا خۆدا دبێژیت :

هەتا وەکی ئاگری بن کابن لەگەڵ یەك
ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەك
لە گوێی گادا نووستوون بۆیەکە رێوی
لەسەر ئێوە وەها شێرگیرە وەك سەگ
سەلاحی ئێوە ئێستا کە سیلاحە
تەماعی گەورەیی نەکەن بێ چەك
کراوە ئینتخابی وشکە سۆفی
لە دیوانی کەر بێ نوقتەیی شەك (دیوانی حاجی : ل ٥٩ )

حاجی د بێژیتە مە هووین بخۆ مژوولی پلان دانانن دژی ئێکدی، وی دەمی ژمارا هەوە هەر چەند بیت. ئەڤە ب کێمی دکەفتە پێش چاڤێن دوژمنا. چونکە هندەك ژ هەوە خەریکی سەختەو سەردا برنا ئێك و دوونە هووین نزانن کا دوژمن چ لبەرە، ژبەر هندێ ئەو دوژمنە ب شێوەکێ ریڤیەکێ بهێزدایە. دشێت مللەتەکێ وەکی کوردێ ئازا ل شێوێ شێرەکی برەڤینیت و وەکی سەیەکێ پاسەوانی.

هەروەسا حاجی خەلکەکێ دی ژی بهێزتر نیشان ددەت. وەسا دبینیت کو هەتا سۆفی و شێخ پێشرەوێن مللەتی بن رەوش و حالێ مللەتی ژ ڤێ باشتر نابیت.

**وەها مەشغولی تۆیە جیسم و جانم**
**بەروح کێشانی خۆم زەحمەتە بزانم**
**رەقیب و سەگ چ لازمە تا ئەمن هەم**
**بە رۆژ دەرگەوان بە شەو پاسەوانم** (دیوانی حاجی : ل ٧٣)

حاجی خۆ ب پاسەوان و دەرگەهڤان دقەلەم ددەت. دبێژیت تاکو ئەز هەبم پێدڤییا مە ب سیخورِ و سەیا نینە بۆ زێرەڤانی و پاسەوانیێ،چونکە ئەز بجۆرەکی سەرقالێ و مژوولی پاراستنا ڤی وەلاتیم. وی دەمی روحا من ژی بهێتە کێشان چ خەم نینە و گوھ نادەمێ :

**ئەوەی شاعیر نەبێ کۆرە وجاخی**
**لەسایەی شیعرەکانم بابی کوڕانم**
**مەڵێن بێ کارە بوو حاجی لە رۆما**
**ئەمن پیاوم لەنێو شاری ژنانم** (دیوانی حاجی : ل٧٤)

حاجی دبێژیت نە بێژنە من تۆ ل دەرڤەی وەلاتی و ئاگاداری مە نینی و بتنێ تۆ هۆزانا دنڤیسی، دگەل هندێ ئەز ئاگاداری هەوە مە و هۆزانێن من کوڕێن منن، ئەز ل دەرڤەی وەلاتی ژی مژوول و خەمخورێ هەوەمە و وە ژ پیلان و پیلانگێرێن دوژمنا ئاگەهدار دکەم.

**ئەگەر کوردێك قسەی بابی نەزانی**
**موحەققەق داکی حیزە بابی زانی** (دیوانی حاجی : ل ١٤٨)

دڤێ هۆزانا سەرێدا حاجی بەرگری د زمان و مێژوویا کوردا دکەت، وەکو بنەمایەکێ سەرەکی بۆ پێکهێنانا نەتەوەیی،حاجی وەسا هزر دکەت، دڤێت هەمی تاکەکێ کورد ئاگاداری پێشینەی خۆی بیت، کییە و ژ کویرێ هاتیە و پێناسا وی چییە، ب وێ رامانێ پێدڤییە هەمی کوردەك رابردوویا خۆ بزانیت، ئەگەر نا ئەڤا ل رابردوو هاتیە روودان دووبارە ب سەرێ واندا دهێتەڤە. هەروەسا د درێژیا هۆزانا خۆدا حاجی دبێژیت دڤێت مللەتی کورد مللەتەکێ خوێندەوار بیت، دڤێت دیرۆکا خۆ بزانن. چونکە ئەو کەسێ مێژوویا دیرۆکا خۆ نەزانیت. بێگومان نەشێت

بەرگری و بەرەڤانییێ ژ نەتەوێ خۆ بکەت. ئەڤە چەندە ژی بەرگریکرنە ژ کەسانێن رەوشەنبیر و خویندەڤان و ئەوێن خۆ ب خوێندنێ ڤە مژوول دکەن.

**ئەمانـــە پاکیان کـــوردن نیهایـــەت**
**لە بەر بێ دەفتەری ون بوون و فانی**
**کتێب و دەفتەر و تائریـــخ و کاغـــەز**
**بە کـــوردی گەر بنووسـرایە زوبانـــی**
**مـــەلا و شـــێخ و میر و پـــادشامان**
**هەتا مەحشـــەر دەمـا ناوونیشـــانی** (دیوانی حاجی : ل ١٥٢)

ژ لایەکێ دیڤە حاجی ئاورەکێ ل رەوشا مللەتێ کورد ددەت و دگەل خـانییێ مەزن رێك دکەڤیت کو، ئەڤا بسەرێ کوردا دێت دزڤریتەڤە بۆ حاکم و میرێن کـوردا و کەمتەرخەمی و بێ هەڵویستێ وانە:

**گوتی : بۆ غوربەت و رووتیم نییە ئەفغان و هاوارم**
**لەداغی حاکمی خۆمە لە شان و شەوکەتی تورکان**
**وادیـــارە رەســـم قـــانوونێکـــی دەوران دادەنـــێ**
**کوردی ئێمە گەردشی گەرمێن و کوێســـتان دادەنێ**
**ئەی ئەمیری کـوردەکان بۆ ئێوە عەیبە وشـــوورەیی**
**حیـــــزەکـــی وەك.........................دادەنـــــــێ**
**بـــۆ یەك نامـــووس وعـــار و بۆ چییە ئیمان ودیـــن**
**خاچ و ئینجیلی لە جێی تە فسیر و قورئان دادەنـێ**

(دیوانی حاجی : ل ١٧٩)

دڤـان چـەند دێـرێن هـۆزانێن سـەرێدا،حاجی بـەرگرییێ ژ کـەلتوور و ئـایینێ کوردا دکەت، گلەیی و گازندێن خۆ ئاراسـتەی سـەرکردێن کـورد دکـەت و دبێـژیتێ ئەم کورد خودان زۆزان و گەرمیانین و خودانێن ئایینا ئیسلاما پیرۆزیـن. چ پێـدڤی دکەت ئایینەکا دی برێکا داگیرکەراڤە بهێتە د ناڤـ مللەتێ کوردا،ل شوینا قورئانێ ئنجیل بیت و لشوینا قوتابخانێن ئایینی و حوجرا دێرو کەنیسە هەبن.

حاجی خەلکێ هاندەدەت ژ بۆ شۆل و کارکرن و کەسابەتیا خۆ بزانن و پارێزن و نەبنە بارگرانی سەر ملێت جڤاتێ، حاجی ڤێ پەیامێ ئاراستەی وان کەسانە دکەت کو، بناڤێ ئۆل و ئایینێ ڤە وەك مشەخۆرەك ل سەر رەنج و کەدا کەسانێن دی ژیانێ دبەنەسەر،ب ئاشکرای ژی مەبەستا وی سۆفی و شێخن. ئەڤە ژی جۆرەکە ژ بەرکریکرنێ بۆ ئەنجام نەدانا کار و شۆلا بناڤێ ئایینێ ڤە، واتە بناڤێ ئۆلی ڤە مژوولی خرڤەکرنا سامان و پارە پەیداکرنێ.

**گەلێکم بیستووە پەستی و بڵندی دەوڵەتان ئەمما**
**جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان**
**لە وەقتی خۆی هەموو شا بوون سەراپا بێ غەم و شابوون**
**لە وجوودا حاتەمی تەی لە شەڕدا ڕۆستەمی مەیدان**

(دیوانی حاجی : ل١٠٤)

حاجی داد و فیغانی بۆ رووت و برسی و بێ جل و بەرگا نینە، بەلکی هەمی داخ و نالینێن وی بۆ وارگەهـ و وەڵاتێ خۆیە، لداخا داگیرکار و وان کەسانە یەکو داگیر کار دادنیت بۆ حوکمڕانیا خەلکێ، حاجی ئاگاداری رەوشا گەلانێن دی ژی بوو، ژبەر هندێ وەکو کوردا چ بسەرێ وان نەهاتیە،چونکی ئەو ئێککگرتی بوون و ئێك دەست و ئێك هەڵویست بوون، هەرچەندە کورد خودان گەلەك میر و پاشا بوون. بەلێ کورد هند مژوولی ململانێ و دووبەرەکیێ بوون و پێکول و هەولا بەرفرەهکرنا دەسەلاتا خۆ بوون، ئەڤێ چەندێ ژی رێك خۆشکربوو بۆ داگیرکارا کو کوردستانێ داگیر بکەن بچەندان فێل و حیلانڤە.

**لە دەشت و دێ ویلایەت ببنە ئەحباب**
**وەکو شەخسێکی واحید بن لە هەر باب**
**لە بۆتان تا بابان و سەرحەدی ڕەی**
**لە ئەولاتر وەها نۆش بێتە سەردەی**
**ببنە یەك لە تەعلیم و لە نووسین**
**جل و بەرگ و زوبان و ڕەسم و ئاین** (دیوانی حاجی : ل ٢٣١)

دیارە ئەڤ چەند دێرێن هۆزانێن سەرێدا، دیسانەڤە داخازا هەڤگرتن و ئێککگرتنا گەلێ کورد دکەت، حاجی وەك هۆزانڤانەکێ رووناکبیر هەر زوی هەست ب وی دەردیێ کوژەك و پەرتەوازەیی کرییە.ژ بەرهندێ وەکی دەرمانەکی داخازا هەڤگرتنێ کرییە، ئەوا دڤێ هۆزانێدا دهێتە دیتن، ئەوە حاجی ب تەڤایی داخازێ ژ هەمی تەخ و چینێن مللەتێ کورد دکەت، کو بێ جوداهی ئێك و دوو بگرن. ئەڤ داخازا بەردەوامیا حاجی بۆ ئێککگرتنێ ژ ڤالاتییێ نەهاتیە، بەلکی حاجی کەسەکێ ئاگاهداری دیرۆکێ بووە. کاودانێن کوردستانێ بباشی ڤەدخاندن. هەروەکی نموونە هەر ئەو دوژمنێ سەردەمێ ئەحمەدێ خانیدا هەبوو، هەمان دوژمن بەردەوام و درێژبوویە بۆ سەردەمێ حاجی ژی. بۆنموونە دڤێ دێرا هۆزانێدا دبێژیت.

**لە مابەینی کڵاو سوور و کڵاو رەش**
**پەرێشانین دەبینە میسلی گای بەش**

(دیوانی حاجی : ل ٢٢)

ڤێرەدا مەخسەد ژکلاڤ سۆر و کلاڤ رەشا، ئاماژەیە ژ هەردوو دەولەتێن داگیرکاری، عوسمانی و سەفەوی، ئەڤ هەردوو لایەنەنا نها ژی تەخسیری نەکرییە ژبوو ناڤبرن و قرکرنا مللەتێ کورد و هەمی دەما مژوولی پیلانگیر و دانان بوون ژپێخەمەتی نەهێلانا مللەتێ کورد. ژ بەرڤێ چەندا دهاتەکرن حاجی بانگەوازی هەڵددەت و داخازێ ژ کوردا دکەت کو هەڤبگرن و دەستا ژێك بەرنەدەن ل دژی وان هەردوو دەولەتا. دیارە حاجی بڤێ چەندێ ناراوەستیت، بەلکو داخاز دکەت کو چەکی پەیدا بکەن و بکاربینن لدەمێ پێدڤیدا داکو رزگار و ئازاد ببن ژدەستێ رۆم و عەجەما دا.

**بە شیر و خامە دەوڵەت پایەدارە**
**ئەمن خامەم هەیە شیر نادیارە** (دیوانی حاجی : ل ٢٢)

حاجی بشێوەکێ ژیرانە و حەکیمانە دوو مژارێن گرنگێن خۆ بەرهەڤکرنێ پێکڤە دگرێدەت و بتەمامکری ئێك دوو دبینیت، چونکە شۆرەشکرن بتنێ ب چەکی ناهێتەکرن و نەبتنێ ب خامە و پێنڤیسی دهێتەکرن، ئەگەر چەك رۆلێ خۆ بگێریت و خامەژی بیرو هۆشا خەلکێ رەوشەنبیر دکەتەڤە. وی چاخی شۆرەش

دێ سەرکەڤیت. حاجی بەحسێ چەوانیا سەرکەفتنێ دکەت و ژلایێ وی ڤە دڤێت هەمی لایەك یەککگرتیبن، پشتی وێ پلان و بەرنامە هەبیت،پاشی چەك و جەبلخانە پەیدا بکەن و مفای ژێ وەرگرن بۆ شۆرەش و بەرخۆدان و خۆراگرتنێ.

**جۆشەك بدەن وەکوو هەنگ تەکبیر بکەن بەبێ دەنگ**
**ئەسبابی شەڕ پەیدا کەن تۆپ و تڤەنگ و هاوان**

(دیوانی حاجی : ل ٢٢ )

حاجی یا ژویڤە رزگاربوون و شۆرەشکرن ژ دەستێ داگیرکارا، پێدڤی ب کۆمەکا پێنگاڤانە هەیە. کو بەری نهۆ هاتنە بەحسکرن، ڤێجا دهێتە سەر هندێ بێژیت دڤێت وەختەك ئەم هەمی پێکڤەبین و هەڤگرتی بین و چەك و پلان ژی هەبیت و ئەڤە پێدڤیا مە ب سەر کردە و رێپیشاندەرەکی هەیە. ئەڤەژی دهۆزانا (لە رۆما کەوتە بەر چاوم) دا خویا دبیت.

**ئەمیرەك ماوە پاشایە گوتی کێیە؟ گوتم شێرە**
**گوتی لێرە گوتم لێرە هەتا تاران و هیندستان**
**بەخۆی شێرە وەکو ناوی لە شەڕدا دوژمن ئەندازە**
**تەمایان هەر بە ئەو ماوە جەمیعی خاکی کوردستان**
**هەرچی جێگەی ئومێدمانە و ئەوی دڵخۆش دەکا ئەمڕۆ**
**کەسی دی لەو بەدەر نابێتە غەمخۆری گەلی کوردان**

(دیوانی حاجی : ل ١٠٢)

د ڤان چەند دێرادا، دەردکەڤیت کو حاجی دەسنیشانا سەرکردەی ب توانا و هێز دکەت بۆ گەلێ کورد، ژ بۆ هندێ داکو ژ وی کاودانێن سەخت و دژوار و خراپ رزگاربن، دبێژیت بتنێ کەسەك دشێت ڤی باری دەرباز بکەت و تێپەرینیت. ئەوژی (یەزدان شێرە) کو ئێکەکە ژ بنەمالا بەدرخانیایە، دیارە حاجی باوەریەکا موکوم ب وی کەسی هەیە و باندورا وی وەکو فریاد رەسەك بۆ رزگار کرنا گەلێ کورد.

## ئەنجام

پشتی ئەڤ  ڤەکۆلینە دەربارەی هزرا بەرگری د هۆزانێن حاجیدا ب دوماهی هاتی ئەم گەهشتینە ڤان ئەنجامێن خوارێدا دیارکری  :

١.    ئەڤ مەبەست و ناڤەرۆکە شیعرییە گەلەکێ کەڤنە و نەیا نوییە، ل وی چاخی سەرهلّدایە دەمێ مرۆڤایەتی کەفتیە دمەترسیێدا و هەرەشە و کـەف هاتیـە بکارئینان ژلایێ ستەمکار و داگیرکاران ڤە ل سەرانسەری گێتیدا.

٢.    نـاکرێ و نەشـێین بەحسـێ هۆزانـا بـەرگرییا هـیچ ملەتـەکی بکـەین، ئەگەر ئاماژێ ب وان کـاودان و بـارودۆخێن هەمـەرەنگێن وی مللـەتی نەهێتـەکرن، چونکە یاخوبایە کو رووداوێن کارەساتێن مێژوویی گیانێ بەرگریێ  لدەف هۆزانڤانا خورت و بهێز و دئەفرینیت.

٣.    هۆزانـا بـەرگری هـەلگرا ناڤەرۆکـەکێ مرۆڤایـەتی و پێشـکەوتنخواز و شۆرەشـگێرییە، ئارێشـەو کێشـێن مللـەتی بسـەر هـەمی کێشـێن خـودی زالـن، هۆزانڤانێ بەرگری هۆزانەکێ بەرهەم دئینیت کو راستەوخۆ پەیوەنـدی ب رەوش و کاودانێن ملەتی و ملەتێن جیهانێ ڤە هەیـە، ئەڤـ چـەندە ژی دهـۆزانێن حاجیـدا دیار و خویانە.

٤.    هۆزانا بەرگری جەخت  ل پاراستنا زمان و کولتوور و ئەدەب و دیرۆکا نەتەوی و گرنگیدان ب خوێندن  دکەت و ئەڤەژی ل شیعرێن حاجیدا ئاشکرایە.

٥.    حاجی داخازەکا سەرەکی ئاراستەی گـەلێ کـورد دکـەت، ژپێخەمـەت یـەکگرتن و هـەڤگرتن و تـەبابن، دوور بکەڤنەڤـە ژ ئـاخفتن و قسـەیێن سـۆفی و شێخێن سەختەباز، کو بەرگری و بەرخۆدانێ بەردلێ خـەلکێ سسـت و لاواز دکـەن، ئەڤ چەندە ژی ل گەلەك جهان مە ئاماژە پێکربوو.

٦.    پەیڤ و دەربڕینێن هۆزانا بەرگری تیژ و راستەوخۆ و روونـن، شـێوازێ بەلّێن و گەف و گڕی پێڤە دیارە بەرامبەر دوژمن و ستەمکار و داگیرکـەرێن خـودێ نەنیاس.

## لیستا ژێدەران

### بەزمانی کوردی


١. ئامێدی، د. عەبدوڵڵا یاسین، هۆنراوەی بەرگری لە بەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا، ساڵی ٢٠٠٥، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چ١، هەولێر.

٢. بەرزنجی، د. عوسمان عبدول معروف، شیعری نوێی کوردی لە ساڵانی ٦٠ –٧٠ لە خوارووی کوردستان دا، ساڵی ٢٠٠٢ نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی.

٣. خۆشناو، ئەبوبەکر، شیعری بەرەنگاریی کوردی ١٩٧٥ –١٩٩١، ساڵی ٢٠٠٢ چاپخانەی رووناکبیری.

٤. خەزنەدار، د. مارف ، مێژووی ئەدەبی کوردی (٢٠١٢) چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چ ٢، هەولێر.

٥. دەشتی د. عوسمان، دەربارەی ناوەڕۆکی شیعرە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی هێمن، (٢٠٠٩) چاپخانەی رۆژهەلات، چ٢، هەولێر.

٦. سجادی، عەلائەدین، مێژووی ئەدەبی کوردی، (١٩٧١) چاپخانەی دارالجاحظ چ٢، بغداد.

٧. شارەزا، کەریم و ئەوانی تر، کۆیە لە رەوتی شارستانیەتدا (٢٠٠٩) چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری چ ١، هەولێر.

٨. شەریف، عبدالواحید ئیدریس،حاجی قادری کۆیی شاعیری بەرەنگاری و هاواری نەتەوە، ساڵی ٢٠١٦، د. عوسمان دەشتی و کەسانی تر.

٩. سامی شۆڕش، شیعر لە گۆڕێکی پێشمەرگەدا، لە بلاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان (٨) ساڵی ١٩٨٣

١٠. سجادی، عەلائەدین، مێژووی ئەدەبی کوردی، ساڵی ١٩٧١، چاپخانەی دار الجاحظ، چ ٢، بغداد.

١١. عزیز، حسێن محمد، سەلیقەی زمانەوانی و گیروگرفتەکانی زمان، ساڵی ٢٠٠٥، چاپخانەی ئارۆ، چ ١، سلێمانی.

١٢. محمد، مەسعوود، حاجی قادری کۆیی، ساڵی ١٩٧٠، چاپخانەی السعدي، چ ١، بغداد.

١٣. میران و شارەزا، سەردار حەمید، کریم، دیوانی حاجی قادری کۆیی، ساڵی ١٩٨٦، بەغدا.


### به زمانی عەرەبی


١. د. عزالدين اسماعيل، الشعر في اطار العصر الثوري، بيروت، دار القلم،؟

٢. د. قصي الحسين، الموت والحياة في شعر المقاومة، قدمه لە د. ياسين الايوبي، بيروت، دار الرائد العربي.

## الملخص

### فكرة المقاومة في شعر حاجي قادر الكويي

أحتل فكرة المقاومة مكاناً متميزاً في النتاج الشعري للشاعر المعروف (حاجى قادر)، ولاسيما استخدامه هذا الغرض الشعري بشكل بارع وملفت للنظر وفي مكانه المناسب. ولتوضيح ذلك تطرقنا في هذا البحث، الى بعض الجوانب الاساسية المتعلقة بهذا النمط الشعري وبيان الظروف الحياتية للفترة التي عاش فيها الشاعر. ومن ثم التطرق الى نماذج من ابياته الشعرية التي تضمنت هذه الفكرة.

## ABSTRACT

### Haji Qadri Koiy's Perspectives in poetry of resistance

The idea of resistance occupied a distinctive place in the poetic product of the well-known poet (Haji Qadir), especially the use of this poetic purpose in a masterful, striking and appropriate manner. In order to clarify this, we discussed in this research some basic aspects related to this poetic line and an indication of the life conditions of the period in which the poet lived. Then he touched upon examples of his verses that included this idea.

# بۆشایی گوتاری شیعر
# لە دەقی (ئۆدیسیۆس نێرە یان مێیە؟)ی
# (ع. ع. یوسف) دا

**غازی حەسەن**

ماجستێر لە زمانی کوردی زانکۆی سۆران

**پێشەکی**

**۰-۱ گرنگی بابەتەکە**

گەڕان و دۆزینەوەی بۆشایی (البیاض/ بەیاز)، لەنێو دەقی شیعر، یان گوتاردا پێویستی بەوردبوونەوەیەکی قووڵ هەیە. ئەو بۆشاییانەی لەنێو دەقدا وەکو تەکنیک و شێوە و ڕوخسار، هەروەها نێوەڕۆک و واتا و مەبەست بەکارهێنران لەشێوەی گوتن و دەربڕین و واتا و جوولاندنی عەقڵ و مەبەست، ئەمەش پەیوەستە بە شیکردنەوەی پراگماتیکی و دەسەڵاتی زمان لە بەدیهێنانی وێنەیەکی فکری و بیرکردنەوەی جدی لە دەقی شیعر و جوولاندنی توانا و عەقڵی خوێنەر و چۆنیەتی ڕاپەڕاندنی کردە قسە لە بەدیهێنانی بۆشایی لەنێو گوتاری شیعردا.

**۰-۲ کەرەستە و سنووری لێکۆڵینەوە**

لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەقی شیعری "ئۆدیسیۆس نێرە یان مێیە؟"ی (ع. ع. یوسف) شی دەکەینەوە، کە ئاراستەکانی ئەم بنەمایانەی تێدا بەرجەستەیە، کە ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەماندا پشتی پێ دەبەستین.

**۰-۳ ڕێبازی لێکۆڵینەوە**

ڕێبازی وەسفی شیکاری پەیڕەو کراوە، بەپشت بەستن بە کردە قسە وەکو بەشێک لە زانستی پراگماتیکدا.

### ٠-٤ گرفتەکانی بەردەم لێکۆڵینەوە

بابەتێکی نوێ و تازەیە لەنێو زمانی کوردیدا، نەبوونی سەرچاوە بەزمانی کوردی، لەم لێکۆڵینەوەیەدا لەبارەی بۆشایی هزری کارمان کردووە، نەک فۆرم، ئەمەش هانمان دەدات بەدوای وێنە و هزر و دەربڕین و تێفکریندا بگەڕێین.

### ٠-٥ بەشەکانی لێکۆڵینەوە

لێکۆڵینەوەکە لە دوو بەش پێکدێت. کە بریتییە لەلایەنی تیۆری دەربارەی (بۆشایی/ بەیاز) و ئەرکی زمان و گوتار و کردە قسە. بەشی دووەم بریتییە لەشیکردنەوەی پراکتیکی هەندێک دەقی شیعریی (ع. ع. یوسف)، بەپێی ئەو کۆد و ڕێسایانە بۆ شیکاری بۆشایی لەنێو دەقی گوتاری شیعردا بەرجەستەیە.

## بەشی یەکەم

### ١-١ زمانی شیعر

زمانی شیعر بەشێوەیەکی گشتی جیاوازە لەگەڵ زمانی زانستەکانی دیکە، شیعر بەهۆی زمانەکەیەوە تایبەتمەندی لە وێنە و هزر و ڕووداو و گێڕانەوە و هەتا تەکنیکی نووسیندا هەیە. زمان وەکو دەسەڵات و هێز دەقەکە دروست دەکات، ئەمەش بۆتە سەرچاوە بۆ دروستبوونی "بۆشایی لە گوتاری شیعر"دا.

زمان کاریگەری لەسەر واتاکان و شێوەی ڕێکخستنی گوتن و ڕستەکان و تەنیا دەربڕینی دەنگەکان و ئاوازەکەشی دەبێت، هەروەها خوێندنەوە و بوارەکانی دەربڕینیشی تێدا نوێ دەکاتەوە. (محمد شداد الحراق، ٢٠١١،

.(http://www.diwanalarab.com/%D8%A7%D9%)

شاعیر زمان لەپێناو بەدیهێنانی مەبەستێک بەکاردەهێنێت، لە دروستکردنی (بۆشایی/ بەیازەکان)دا مەبەستێکی هوشیارانەی هەیە و بەوریاییەوە لەپێناو دروستکردنی واتا و واتای پشت واتاکان ئامانجەکانی دادەڕێژێت.

(ع.ع. یوسف) یەکێکە لەو شاعیرانەی بەمەبەست بۆشایی لەنێوان دەنگێک و دەنگێک، پیتێک و پیتێک و بڕگە و وشەیەک لەنێو یەک ڕستەدا، تەنیا بۆشایی لەنێوان وشەیەک و پەرەگرافێک، بۆشایی لەنێوان وێنەیەکی شیعری و بیرکردنەوەی خوێنەرەکانی دروست دەکات.

### ١-٢ گوتار

گەلێک پێناسەی جودا بۆ گوتار لەزمانە جیاکان کراوە، بەشێوەیەکی گشتی (گوتار/ الخطابDiscourse/) پەیوەندی بەگوتن و قسەکردنەوە هەیە. گوتار قسەیەکی مەبەستداری ئاراستەکراوە لەلایەن (من، ئێمە)وە بۆ وەرگری گوتارەکە (تۆ، ئێوە، ئەو ئەوان)، بۆ ئەوەی لە مەبەستە ئاشکرا و ڕاستەوخۆکە، یان خوازەکە، یان خستنەڕوویەکی نێو دەقی گوتارەکە تێبگەن، کە قسەکردنێکە بۆ پەیوەندیکردن. (د. محمود عکاشة، ٢٠١٤، ١٧).

لەدۆخی دووەمدا، کە پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە (بەیاز، بۆشایی) هەیە، گەلێک ڕەگەزی شاراوە و دەربڕینی نادیار و خوازە و واتای هەمە لایەنە و فرەیی و خواستن و دووبارە و ڕەوانبێژی و پاساوهێنانەوە و پرسیار و هەواڵ و مەبەستی نادیار لەنێو دەقی شیعردا لەخۆ دەگرێت.

لەم سەردەمەدا دەقی نووسراو، چاپ و وشەکان بەشێوەیەکی زۆر توند دەخاتە بۆشاییەک، نووسین بەدرێژایی مێژوو ئەمەی کردووە. دەق دەنگ و وێنە دەگرێتەوە. (والترچ . اونج، عالم المعرفة ،١٩٩٤، ١٧٩- ١٨٢). کاتێک شیعر لەگوتنەوە دەگوازرێتەوە بۆ دەقێکی نووسین، لەئەنجامدا بۆشایی لەنێوان وشەکان، پرسیار و ڕستەی تەواو نەکراوەکان بەئامانجی بەدیهێنانی پرسیار و بۆشایی بەکاردێت.

**١-٣ بۆشایی (بەیاز) و ئەرکەکانی لەنێو گوتاری شیعردا**

(بەیاز/ البیاض) وشەیەکی عەرەبییە لە کۆندا لەنێو دەقی نووسراودا بەکارهێنراوە، لە کوردیدا بۆشاییمان بەرانبەری بەکارهێناوە، کە لەڕووی کارەکی و واتاییەوە لەنێو دەقدا مەبەستی بەدیهێنانی ئەو بۆشاییە، کە نووسەر بەئامانج و مەبەستێکی دیاریکراو بەکاری دەهێنێت. هەمان شت لەزمانی ئینگلیزی پێی دەگوترێت (Gutter). (Megan Dowd Lambert, 2015, p 124-126)، هەروەها لە دەقی گوتارێکی نووسراودا ئەو بۆشاییانە دەگرێتەوە، کە ئاوازەی بینراو بەدی دەهێنێت، لەڕێگەی دروستکردنی دەق لەسەر کاغەزدا. (مجموعة، ٢٠٠٨، ١٤٦).

دەکرێت بەشێوەیەکی دیکە وەکو (ڤۆلتێر) دەڵێت "نهێنی بوونت، بەرپرس دەبێت لەبەرانبەر ئەو هەموو شتەی دەیڵێیت" (Paule LaRocque, 2003, 124). ئەگەر لە ڕوانگەیەکی زمانەوانی پشت بەو ڕێباز و بیرکردنەوەیە ببەستین، کە بڕوای بەو سەرەتایە هەیە "هەموو شتێک مەبێژە، یان بەلای کەمەوە ئێستا مەیبێژە". ( Paule LaRocque, 2003, 124).

لە بوارێکی دیکەدا (مینسکی) تیۆرێک لەبارەی بوونی نیشانەی (....) لەنێو دەقدا باس دەکات ئەویش بریتییە لە بەکارهێنانی ئەو نیشانانە لەچوارچێوەی ڕێزماندا، کاتێک مرۆڤ ڕووبەڕووی شێوەیەکی نوێی لەم جۆرە (...) دەبێت، لە

یادگا و بیرهاتنەکانیدا چوارچێوەک ناو دەبات. ئەم چوارچێوەیەش بۆ بە خۆگونجاندن لەگەڵ واقیع ناو دەبرێت لەڕێگەی گۆڕانکاری بەپێی درێژەی پێویست لەنێو باسەکەدا. (براون و یول) ئاماژە بەوە دەکەن، کە (مینسکی) تیۆرەکەی پەرەپێداوە و لە بنەڕەتدا بایەخ بەدرککردنی بینراو و بیرهاتنەوە لەڕێگەی بینینەوە دەدات. (محمد الخطابي، ،١٩٩١، ٦٣).

ئاماژەمان بەوە کرد بۆشایی لەڕووی تەکنیکییەوە ئەو بەشە بەجێهێڵراوەیە، کە هیچی تێدا نەنووسراوە، یان لەشێوەی خاڵ بەدوای یەک دروستکراوە، یان لەکاتی درک پێکردندا هەست دەکرێت بۆشاییەکی نادیار هەیە و پێویستی بەوەڵام و پڕکردنەوە و تەواوکردن دەبێت، کە لەنێو دەقێکی نووسراو، یان گوتراو ، هەروەها وێنەدا بەجێ دەهێڵرێت، بەڵام لە بوارەکانی دیکەدا بریتییە لەو ئەنجامە نادیارەی، یان ئەو زانیارییە دیاریکراوە نادیارانەی پەیوەندییان بەڕووداو و کەسایەتی و کات و شوێنەوە هەیە، کە لەلایەن کەسێکی بزرەوە دەگێڕدرێتەوە. (محمد بن سليمان القويفلي، ١٤١٢ هجری ).

هەندێکی دیکە بۆشایی بە(کردەیەکی گێڕانەوە) دەزانن، ئەمەش لەئەنجامی جیاکردنەوەی لەگەڵ بۆشاییەکی سپی جێهێڵراو دەردەکەوێت. (والتر چ. اونج، ١٩٩٤، ٢٣٢). (ڕۆبیر ئیسکاربیت) ئاماژەی پێکردووە خوێنەر هەمیشە لە هۆشی نووسەردا ئامادەیی هەیە. (رۆبیر ئیسکاربیت، ١٩٨٠، ١٣٦-١٣٧). ئەم ئامادەییەی خوێنەر بەواتای پڕکردنەوەی هەر بۆشاییەک و تەواوکردنی هەر دەقێک دێت، لە گوتاریشدا بەرهەم بێ بوونی ڕۆڵی نووسەر و خوێنەر بەشێوەیەکی یەکسان، کارێکی ناتەواوی گریمانەدار دەبێت.

بەدیهێنانی بۆشایی بێ خوێنەرێکی چالاک و کارا هیچ ئەنجامێکی ئەرێنی نابێت، (میشیل بوتور) دەڵێت نووسەر پێویستی زۆری بەخوێنەر هەیە، بۆ ئەوەی وەکو هاوبەشێک لەنووسیندا بەسەرکەوتنی بگەیەنێت. (وین بوث،١٩٩٤، ١٢٤). مەبەستمان لەو ئاماژانە ئەوەیە نێرەر لەکاتی گێڕانەوەی باسێکدا، پێویستی بەگوێگر و وەرگرێکی وریا و زیندوو دەبێت.

لە بۆشاییدا نێرەر لەنێو گوتارەکەیدا دەیەوێت کارێک لەڕێگەی پرسیارکردن و وروژاندنی عەقڵ لای وەرگرەکانییەوە ڕاپەڕێنێت. لەنێو دەقی گوتاردا ئەو بۆشاییەی دروست دەکرێت، ئامانجی ئەوەیە وەرگر بجوولێنێت بۆ ئەوەی بەدوای وەڵامی شتێکدا بگەڕێت، کە خودی وەرگرەکە بەپێی تێگەیشتن و لێکدانەوە و زانیاری و تێڕوانین و فکر و ئایدیۆلۆژیا و قەناعەتی خۆی پڕی دەکاتەوە.

بوارێکی دیکەی لێکدانەوەی بۆشایی لەنێو دەقدا پەیوەستە بەوێنەوە، (مێگان دۆود لامبێرت) لەبارەی بۆشایی لەنێو وێنە و هێڵکاری کتێبی منداڵان دەڵێت: پرسیم سەیری سەری ئەم کچە لەوێنەکەدا بکە، سەیری بەشی خوارەوەی وێنەکەش بکە، ئایا جەستەی کچەکە هەر ئەوەندەیە، کە لە وێنەکەدا دیارە و کۆتایی هاتووە، یان بەشێکی دیکەی جەستەی هەیە و کەوتۆتە دەرەوەی وێنەکە. ( Megan Dowed Lambert, 2015, 57 ). لەوێنەکەدا سەری کچێک کێشراوە و پشتی وێنەکە بۆشاییە و هیچی تێدانییە، بەڵام جەستەی هیچ دیارنییە.

کاتێک باسی (بۆشایی) لەنێو دەقێکدا دەکەین، مەبەستمان وروژاندنی پرسیارە ئاسایی و زهنییەکانە، وروژاندنی هەست و نەستە لەڕێگەی وێنەپرسیار و دەربڕینەپرسیار و سەرسامییەپرسیار و پرسیارەپرسیار و ڕاگەیاندنەپرسیار و وەسفەپرسیار و تەواونەکردنەپرسیار و فەرمانەپرسیار و حوکمەپرسیار و .... تاد. (ڕۆلان بارت) لە وەڵامی ئەو بۆچوونەی، کە مارکسییەکان پێیان وایە شێوە بەرپرسیارەتییە و نووسەر مولتەزیمە بەئەنجامی دەق، دەڵێت: زۆر بەسادەیی ئەرکی نووسین خستنەڕووی پرسیارە، نەک لەخودی نووسین وەڵامەکە بداتەوە و چارەسەریش بدۆزێتەوە..". (فرانک ایفرار، اریک تینە، ٢٠٠٠، ٤٤). دەق، پرسیار واتە (بۆشایی/ بیاض) ێک لەئاست و جۆر و شێوازی جودا دروست دەکات، ئەوە خوێنەرە بەدوای وەڵامەکەدا دەگەڕێت، نەک خودی دەقە نووسراو و گوتراوەکە.

ئەوە ناڕوونی و ئاڵۆزی بەرهەمی ڕەمزی، تاکو دەگاتە فرەواتایی، وای لێهاتووە بێ سنوور بێت (فرانک ایفرار، اریک تینە، ٢٠٠٠، ١١٨). ئەمە لەنێو بۆشایی دەقیشدا دەتوانێت فرەواتایی ببێتە سەرەتایەکی دیکە بۆ بەدیهێنانی بۆشایی . (ع.ع. یوسف) دەڵێت:

خۆ له زەمی نالی نین..... خاکێشه بگرین. (ع.ع.یوسف،٢٠٠٩، ٨٤)

واتای (خاکێشه) نامۆبوون و دوورکەوتنەوه و ئازاری دوورکەوتنه له خاک و ئازاری ژیان لەسەر خاکێک، که بەخۆیەوه ناگرێت، دووره وڵاتی، نامۆبوون لەنێو وڵات و شتی دیکەش دەگرێتەوه. ئەگەر (نالی) لەدێڕی یەکەمدا نەبووایه (گەڕان بەدوای وەڵامی خاکێشه) فره وەڵام و فره بیرکردنەوه و فره ڕەهەند دەبوو، هەرچەنده ئێستاش خوێنەر دەتوانێت لەگەڕان بەدوای وەڵامی (بۆچی و لەبەرچی و لەکوێ و چۆن و کەی و لەبەرچی خاکێشه)دا بگەڕێت، سەرباری گەڕان بەدوای (ئێمه) کێین؟ ئایا (خودی (نالی) و (ئێمەش) وەکو ئەومان لێهاتووه، یان خوێنەر دەتوانێت لەجیاتی (خاکێشه)، که وشه و دەستەواژه و دەربڕینێکی تایبەتیی شاعیره، ژمارەیەک واتا و مەبەست و شێوازی هاوشێوه و یەکسان بەوەسفی خاکێشەمان پێ ببەخشێت، لەوانه (ژان و ئازار و ئێش و ناخۆشی و سەریەشه و مەینەتی و سەرگەردانی و ئاوارەیی و دابڕان و دوورکەوتنه و ڕاکردن له وڵات و پیشاندانی مەینەتییەکانی نالیی شاعیر و گێڕانەوەی ڕووداوێک و بەسەرهاتێک و وەسفێک، خۆ پێ چواندن و پێوانەکردن لەسەر شتی دیکه و هاوئازاری و هاودەردی... تاد) . بەپێی شیکردنەوەی کرده قسه هەندێک کردەی دیکەمان لەڕێگەی وشەی (خاکێشه) پیشان دەدرێت، لەوانه:

**حوکمه**: خاکێشان ئازاربەخش و ناخۆش و مەینەته. **ئاگادارکردنەوەیه**: نالی له ئاوارەیی ئێشانی دووره خاکی هەبوو. **وەسفه:** وەسفی ئەوه دەکات، که نالی تووشی خاکێشان بوو. **ڕەتکردنەوەیه:** له زەمەنی ئەو نین، خاکێشه بگرین. **زانیارییه:** له زەمەنی نالی خاکێشه هەبووه. **لێکچوواندن:** لێکچوواندن لەنێوان ئێمه و نالی. **کات و شوێن:** زەمەن و سەردەم و شوێن (دوێنێ و سەردەمی کۆن، سەردەمی ئێستا و ئەمڕۆ) . شوێنیش دوو کردەی جودامان پیشان دەدات، لەجیاتی ئەو بین، یان خاک و جوگرافیا دەگرێتەوه. **سەلماندن:** کردەی سەلماندنی تێدایه، که خاکێشه لەکاتی نالی هەبووه. **ڕەخنه:** بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕەخنه دەگرێت و کردەی پیشاندان و بەراورد لەڕێگەی ڕەخنەکەوه ڕادەپەڕێنێت. **جەختکردنەوەیه:** کردەی جەختکردنەوەی تێدایه، که بەراوردی هەردوو سەردەم بەخاکێشان دەکات.

لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی بۆشایی لەنێو هەر دەقێکدا مەبەست و ئامانجی سەرەکی بەدیهێنانی خوێنەرێکی چالاکە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکان بدۆزێتەوە و لای خۆی بەشێوەیەکی زهنی، یان لەشێوەی دەقێکی نوێدا دەقەکە سەرلەنوێ بەرهەم بهێنێتەوە.

**١-٤ بەرگ و ناوونیشان و بۆشایی**

(ع.ع.یوسف) لەسەر ئەو بنەمایە لە ناوونیشانی دەقە شیعرەکەیدا نووسیویەتی (ئۆدیسیۆس نێرە یان مێیە؟) لە بەرگی یەکەمی دەقە شیعرەکەیەوە پرسیارێکی کاکلداری بێ کۆتایی لەپێناو دروستکردنی پرۆسەی بیرکردنەوەی لای خوێنەرەکانی دروست کردووە. کورد گوتەنی (من دەڵێم نێرە و ئەو دەڵێت بیدۆشە!!)، (زەمانێکە باسی ڕۆستەم دەکات، تازە دەڵێت ڕۆستەم نێرە، یان مێ؟. (ع.ع. یوسف، ٢٠٠٩، ١٠). جارێکی دیکە لەپێناوی دروستکردنی وێنەیەکی پڕاوپڕ لە بۆشایی، هەمان شتی ناوونیشانی یەکێک لە شیعرەکانیشی.

لەنێوان کەسەکە و سیفەتی کەسەکە بەشێوەی (...) بۆشاییەکی بیرکردنەوەی بەخوێنەر داوە، دواتر لەشێوەی هێمای (؟) و (!) بۆشاییەکی دیکەی بیرکردنەوەی بەخوێنەر بەخشیوە. بۆشایی یەکەم وەکو شێوە دەربڕاوە، لەدۆخی دووەمدا بۆشاییەکە لەشێوەی هزری و بیرکردنەوە و واتایەکی فکری و دەروونی دەردەکەوێت.

لە ناوونیشانێکی دیکەدا دەڵێت: "بەندە لە ڕابردوو ئیستە و ئاییندە". شاعیر بەردەوام لە ناوونیشاندا پرسیار و وێنەپرسیارێک دەورووژێنێت، (خۆی) لە سێ کاتی جودا پیشان دەدات، بەڵام چی و بۆچی و لەبەرچی و چۆن و لەکوێ و کێ و کەی و چ؟ ئەمە پێویستە خوێنەر بیری لێبکاتەوە. مەبەستمان ئەوەیە ئەم دەقە گوتارە شیعرییانە، یەکسانی و هاوبەشی لەنێوان دەقنووس و خوێنەرەکانی دروست دەکەن، دەرفەت بەخوێنەرەکانیان دەدەن دەقەکە (بەشێوەیەکی چالاک بخوێننەوە، بیری لێبکەنەوە و بەرهەمی بهێننەوە).

لە ناوونیشانی (فۆتۆگرافی نووسەر بە جغارەوە، (ع.ع.یوسف، ٢٠٠٩، ٩٧) جارێکی دیکە شاعیر بۆشاییە وێنەیەکی دروستکردووە، بەقووڵی بیری لێ دەکەمەوە (فۆتۆگرافی نووسەر) بەتەنیا چی دەگەیەنێت و (نووسەر بەجغارەوە) چی دەگەیەنێت، ئایا فۆتۆگرافەکە (ی) خاوەندرایەتی چۆتە سەر و بۆتە موڵکی نووسەرەکە، یان (بە جغارەوە) چی دەگەیەنێت؟. هەموو ئەو دەربڕینانە دەکرێت واتایەکی تایبەت و لە هەمان کاتدا گشتیمان پێبدەن. بەسەر یەکەوە ئەم ڕستە وێنە لەخۆگرە بۆشاییەکی لەخۆگرتووە (فۆتۆگرافەکە چییە، کێیە، کاری چییە و دەیەوێت چ بکات..). لە(کوێ و کەی) ئەم سیفەتەی پێدراوە. ڕستەیەکی وەسفییە سەبارەت بەنووسەرەکە، یان جۆرێک لەگاڵتەکردنی کاریکاتێرانەی تێدایە، کە بڵێین (نووسەر بەجغارەوە) وێنەیەکی کۆمیدی، یان بەزەیی پێدا هاتنەوەی تێدایە، یاخود ئەمە وێنەی نووسەرێکی داماوە و لەداخی ژیان جگەرە دەکێشێت. گرنگتر لەهەموویان (فۆتۆگرافی نووسەر بە جغارەوە) ڕستەیەکی تەواو نەکراوە، مەبەست و واتاکەی نیوەچڵە و مەبەستی کۆتایی بەدەست نەهێناوە. بەم کارەشی بۆشاییەکی (فکری، وێنە، واتا، دۆخ و پلە و دەروونی و پەیام و مەبەستی) دروستکردووە.

وەکو زانایانی ئەم بوارە لێکدانەوەیان بۆ کردووە بۆشایی نێو دەق لە سێ شێوە و بواری زمانی بەکاردەهێنرێت:

یەکەمیان: فەرمانە.. نێرەر لەشێوەی فەرمان وا لە وەرگر دەکات بۆشاییەکە پڕ بکاتەوە. دووەم: هەواڵ و ڕاگەیاندنە.. نێرەر زانیاری بەوەرگر دەدات و ئەویش بەپێی زانیاری و مەعریفەی خۆی کار بۆ پڕکردنەوەی پرسیارەکە دەکات. سێیەم: شێوەی داڕشتنە و لەشێوەی داواکردن دەردەکەوێت. نێرەر داوا لە وەرگرەکانی دەکات بۆشاییەکان پڕ بکەنەوە بەپێی ئەو پرسیارەی لەنێو دەقەکە ئاراستەیان دەکرێت. (مجموعة، ٢٠٠٨، ١٤٨) . چوارەم: من خۆم وەکو توێژەری ئەم باسە پێم وایە بواری دیکەش هەیە، ئەویش وێنە زهنیەکانن.. پێم وایە لەچەند دۆخێکی دیکەدا دەکرێت بنە شێوە و شێوازی دروستکردنی بۆشایی، نەک هەر تەنیا لەنێو دەقێکی نووسراو (دەنگ و وشە و ڕستە و پەرەگراف) بەڵکو لەنێو واتا و فرە واتایی و واتا زهنی و وێنە زهنیەکانیشدا دەتوانرێت بۆشایی دروست بکرێت لەچوارچێوەی دەوروبەری

بەکارهێنانی زمانەکەدا. پێنجەم: شێوەی دەربڕینی سەرسوڕمانە. شەشەم: شێوە و دۆخی وەسفکردنە. حەوتەم: شێوە و دۆخی ڕیکلامە. هەشتەم: شێوە و دۆخی تەمسیلی و جووڵەی دەست و جەستەیە. نۆیەم: لەنێو گوتاری گوتراوی زارەکیش لەئەنجامی (دەقی گوتراو و ئاوازە و شێوەی دەربڕین و شێوەی ئاخاوتن و جووڵەی جەستە .. تاد) بۆشایی دروست دەبێت، کە عەقڵی وەرگر دەجووڵێنێت و مژوولی دەکات بۆ ئەوەی وەڵامێکی گونجاو بۆ بۆشاییەکان بدۆزێتەوە.

لەبیری نەکەین لە گوتاردا، کە شێوازی (داوا و مەبەست و وەسف)ی تێدایە بۆشاییەکان خودی پەیامەکە ئاراستەی وەرگرەکان دەکەن.

بەشێوەیەکی بنەڕەتی و سەرەکی کردەی "بۆشایی" داواکارییەک لای وەرگر دەخولقێنێت بۆ ئەوەی کردەیەک بەدی بهێنێت" . (مجموعة، ٢٠٠٨، ١٥١). واتە نێرەر قسە لەگەڵ وەرگرەکانی دەکات و فەرمانیان پێدەکات، وەڵامی بۆشاییەکان بەو زانیارییانە و شتانەی دەیزانن بدەنەوە، داوایان لێ دەکات بۆشاییەکان بەپێی تێڕوانین و خواست و فکری خۆیان پڕ بکەنەوە.

**١-٥ سیمیۆلۆجیا نیشانە و هێما**

یەکێک لەو زانستانەی بایەخ بەلێکۆڵینەوە لەنیشانە و هێمای زمان دەدات. تیۆر، یان زانستی نیشانەکانە. لە یۆنانی کۆندا لە بنەڕەتدا بەواتای نیشانە/ هێما و تیۆر و گوتارەوە هاتووە. پێناسەی سیمیۆلۆجیا بەجۆرێک کراوە، کە بریتییە لەسروشتی نیشانەکان ئەوەش ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە عەقڵ بۆ تێگەیشتن لەشتەکان بەکاری دەهێنێت، یان گەیاندنی زانیارییە بەخەڵکی دیکە، کە لەنێو شتەکاندا نین، بەڵکو تەنیا عەقڵ تێی دەفکرێت بۆیە پێویستە شتێکی بۆ ئامادەبکرێت وەکو وێنە و نواندن لەبارەی ئەو شتەی، کە هیوای بۆ دەخوازرێت، بێگومان ئەمەش فکرە. (جان کلود دومینجور، ١٩٩٨، لاپەڕەی نییە).

واتە فکر و بیرکردنەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەئەرک و ڕۆڵی نیشانە و هێماکانەوە هەیە. ئەم بۆچوونە سەرەتایەکی گرنگە بۆ چۆنیەتی دەستنیشانکردن و دۆزینەوەی بۆشایی لەنێو دەقدا، هەروەها دەرفەت بەگوێگرەکانی دەدات بەدوای

دۆزینەوەی (مەبەست و وێنە و تێفکرین و مەزەندە و خواستەکانی قسەکەردا) بگەڕێت. ئەو شتانەی بیرکردنەوە بەرهەمی دەهێنێت و پێویستییان بەنیشانەکان هەیە بۆ ئەوەی بەرجەستە بکرێن.

(چارل مۆریس)ی زانای ئەمەریکی پێی وایە نیشانە پێکهاتەیەکە لەکردەی پەیوەندیکردن، واتای "پێڕاگەیاندن" ناگرێتەوە، بەڵکو "واتای دروستکردنی پەیوەندی". دەگرێتەوە. (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

لە دەقەکانی (ع. ع. یوسف)یشدا نیشانەکان مەبەستی پەیوەندیکردنیان بە وەرگر بەکارهێنراوە، ئەو بەردەوام لەپێناو بەدیهێنانی دۆخێکی عەقڵی، نەک گواستنەوە پەنا بۆ نیشانە و هێما و ڕەمزەکان دەبات، لەپێناوی بەدیهێنانی خوێنەرێکی وریا و خاوەن دەسەڵات بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بۆشاییانەی لە ئەنجامی بەرهەمهێنانی دەقەکە دروست بوون، بیر لە بەرهەمهێنانی گوتاری دەق دەکاتەوە.

**١-٦ شێوازی نووسین**

شێواز و شێوە لەدەقدا گرنگە، شێوەی بینراوی شیعرەکە بەشێوەیەکی سەرەکی کار بۆ گواستنەوەی واتا دەکات. (والترچ . اونج، عالم المعرفة ١٨٢،١٩٩٤، ١٨٢). (ع ع یوسف) شێوە و پێکهاتەی ناوەوە و دەرەوەی هەر دەقێک وەکو مەسەلەیەکی هزری و ڕێباز و تێفکرین مامەڵە لەگەڵ دەکات، بەهەڵچوونەوە ناپرسێت و بیرناکاتەوە و وێنەکان ناخاتە دۆخێکی دەروونی تەنگەژەدار، بەڕیتمێکی ئارام وێنەکان دروست دەکات و پرسیارەکان دەورووژێنێت و بۆشاییە تەواو نەکراوەکان دەخاتە بەردەم خوێنەر، بۆیەشە ئەمە لەناونیشانی بەرگ و ناونیشانی شیعرەکانی و شێوەی نووسین و داڕشتنی نووسینەکانیشی ڕەنگی داوەتەوە.

**١-٧ ئابوورەزمان و بۆشایی لە دەقدا**

لەکورتی گوتن و بەناتەواویی جێهێشتنی ڕستە و دەربڕینەکان و چڕکردنەوە، ئەمانەش هەموویان دەبنە هۆکار بۆ دروستکردنی (بۆشایی/ البیاض) لەنێو دەقدا. "وشەکان دراوی بیرکردنەوەن". (فلۆریان کولماس، ٢٠٠٠، ٤).

نووسەری شارەزا و وریا لەپێناو کارتێکردنی فکری و جووڵاندنی خوێنەر پەنا وەبەر پرسیار و دروستکردنی بۆشایی لەنێو دەق دەبات. (ع ع یوسف) دەڵێت: (دایە ... داد). (ع ع یوسف ، ٢٠٠٩، ١٣). بۆشاییەکی دیار لەنێوان ئەم دوو دەربڕینە (دایە و داد) لەڕێگەی بەکارهێنانی (...) دروستکردووە، لەپێشدا وشەی (دایە) و لەپشت وشەکەش بۆشاییەکی دەروونی، کۆمەڵایەتی و تێفکرین و لێکدانەوە بۆ (دایە) هەیە، لە چ کات و شوێنێک، وەکو دەربڕینێکی پیشاندەری کردەی (پاڕانەوە، بێ ئومێدی، سەرسوڕمان، داواکردن، ئاگادارکردنەوە، هۆشداری ..) گوتراوە، (داد)یش، کە واتای (دادگا، دەربڕینی بێزاری و ناڕەزایی) دەگەیەنێت، لەکردەوەدا واتای (دادپەروەری و نییە و گومان و ڕەوایەتی و ناڕەوایەتی، نەبوونی دادپەروەری و دادگاش) دەگەیەنێت. کردەی گەیاندنی (مەبەست و فکر) لەڕێگەی دروستکردنی بۆشایی و ئابووریکردن بە وشە بەکارهێنراوە.

**١-٨ بۆشایی و هۆکارەکانی دروستبوونی**

گەلێک هۆکار بۆ پەنابردنە بەر بۆشایی وەکو شێوە، بۆشایی وەکو فکر و وەڵامی شتە شاراوەکان لەنێو دەقدا هەیە. "کەموکورتی" و "تەواو نەکردنی بابەتەکە". بەلای کەمەوە دەکرێت لەم بارەوە بۆچوونەکەی (ئیکۆ) لە دوو خاڵ کورت بکرێتەوە. یەکەمیان: نێرەر بەمەبەست ئەو بۆشاییەی لەنێو دەقدا دروستکردووە. دووەمیان: مەبەستی ئەوەیە پێشوازی لەپڕکردنەوەی بۆشایی نێو دەقەکە لەلایەن هاووڵاتی و وەرگرەکانییەوە بکرێت. مەبەستەکانی (ئیکۆ) سێ ئامانجی سەرەکی لەخۆ دەگرێت:

یەکەم: پڕۆژەی نێرەر سووربوونییەتی لەدروستکردنی بۆشاییەکان و خستنەڕووی، بۆ ئەوەی وەرگر پڕیان بکاتەوە. ئەگەر وردتر سەیری بکەین (جۆن ئۆستن) لە بەدیهێنانی شت لەڕێگەی قسەکردنەوە سێ ئامانجی دیارکردووە. یەکەم: بەدیهێنانی کردەیەکە وەکو دەنگ و وشە و ڕستە. دووەم: کردەی مەبەست. سێیەم: کردەی کارتێکردن لەڕێگەی تەنیا قسەکردن و بەکارهێنانی وشەوە.

دووەم: وەرگری نموونەیی. چۆن لەڕێگەی ئەو بۆشاییەی هەیە وەرگرێکی نموونەیی و جددی دروست دەکرێت. سێیەم: کردەی لێپرسینەوە. لەم بوارەدا نێرەر دەیەوێت لەڕێگەی وەرگرەوە لەو شتانە بپرسێتەوە و زانیاری وەرگرێت، کە وەکو بۆشایی لەنێو دەقی گوتاردا بەکاریان دەهێنێت. ئەمەش توانستی وەرگر دەئەزموونێت و وەکو پلانێکی پڕۆژەی خوێندنەوە لەنێو دەقدا بەدی دەکرێت. (مجموعة، ٢٠٠٨، ١٥٤-١٦٠).

(پاولا لارۆسکوی) لەبارەی گرنگی کورت نووسین، کە توانای دەربڕینی زۆر دەبێت دەڵێت: "نووسەر و قسەکەران بەپێداگری زۆر و ورووژانەوە پشت بە وشەی کورتی سادە دەبەستن، بەگشتی ئەم وشانە بەشێوەیەک دروست دەکرێن، کە تێکەڵە و لەژێر کاریگەریی سووکایەتی و سادەیی و ڕێزگرتندان، هەروەها وشەی کورت بەشێوەیەکی ئاسایی ناچنە جەنگەوە لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، ئەمەش خاوەنی تۆڕێکی بەخشندەیە". (Paula LaRocque, 2003, p34-35)

بۆشایی لەچاپکردن هەر تەنیا کاریگەری لەسەر خەیاڵی زانستی و فەلسەفی نییە، بەڵکو کاریگەری لەسەر خەیاڵی ئەدەبیش هەیە. (جۆرج هەربرت) بۆشایی لەچاپدا بۆ بەرهەمهێنانی واتا لەدەقە شیعرییەکانیدا بەکار دەهێنێت. (والتر چ . اونج، عالم المعرفة ١٩٩٤،١٨٢، ١٨٨).

(ع ع یوسف) لەدەقی (بانگێشتەیەکی بێڕیایی بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی). (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٣٣) بەمەبەستێکی ئاشکرا و هونەریانە، لەپێناو جوولاندنی خوێنەرەکانی و دەڵێت من هەندێک شتم گوت، ئێوەش بەپێی تێگەیشتن و لێکدانەوە و تێڕوانین و مەبەست و خواست و کاردانەوەی خۆتان ئێرە پڕبکەنەوە.

## بەشی دووەم

### ٢-١ فره وێنەیی

وێنەی شیعری یەکێکه لەکاره چالاکەکانی دەقی گوتاری شیعری، هەندێک وێنه بۆته وێناکردن، هەندێک وێنه بۆته بەدیهێنانی بابەت و کێشه و تێڕوانینێکی بێ وەڵامی فکری. لەوانه (خاتوو نوونی کەونه میم)، کێشەی ئافرەت و (لەجیهانی لەپت دا) سیحر و میتۆلۆجیا، (پاسپۆرتەکەت بدڕێنه تاکناوەکەت بکه به فرەناو)، ناسنامه و دەرچوون لەبازنەیەکی داخراوی ناوەخۆیدا و بەرەو بەجیهانیبوون، یان دەڵێت (فینیقی به... بابلی به.. گەردوونی به شوورەییه... چیدی باسی نۆستالیژا مەکه). (چیدی فەلسەفه به تەنبەڵاتی لێ مەده) کاریگەریی بێکاری، (لۆرییەکی پڕ جووجکه مریشک له جەهەنەمدا)، هەروەها دەڵێت (گومان یەککوژ دەدۆزێتەوه). (ڕووتیش خۆ لەئاوێنه دەبینن). ئەمانه هەر یەکەیان بۆشاییەکیان لەنێو گوتارەکەیاندا لەخۆ گرتووه. (ع.ع. یوسف، ٢٠٠٩، ٨٠، ٨٢، ٨٤، ٨٧، ٩٩، ١٢٢، ١٣٠)

(ع ع یوسف) دەڵێت:

که فلچەی دانشۆرینم لێ ون دەبێ  
وادەزانم، زریپۆشێکی سەردەمی شیر و تیر  
لێم قیت دەبێت و ڕاوم دەنێ  
خەمی ئەوەم نییه،  
به ئەنگاوتەی تیرێک یا شیرێک، دەکوژرێم  
خەمی ئەوەم نییه،  
به ئەنگاوتەی تیرێک یا شیرێک، دەکوژرێم  
خەمی ئەوەمه  
ئەو جەنگاوەره، ددانی پیسن  
ئەی تۆ که فلچەکەت لێ ون دەبێ؟  
..................................  
..................................  
.................................  
.................................. (ع ع یوسف، ٢٠.٩، ٣٣).

وێنەکان بەرەو گێژاوێکی دژ بەیەکی بیرکردنەوەمان دەبەن (کەی لەسەردەمی شیر و تیر، زرێپۆش هەبوو)، (خەمی کوژرانی خۆی نییە، بەڵکو بیر لەوێنەی ددانی پیسی جەنگاوەرێک دەکاتەوە). وێنەکە چییە؟ ئایا بە ددانە پیسەکانی گەزەی لێ دەگرێت و دەیخوات؟، یان لەسەردەمی نوێخوازی و کۆمپیۆتەر ددان شوشتن نەبۆتە خوو؟. ئەمانە وێنەی وێناکردنێکی فکریی قووڵن، لەنێو وێنەیەکدا وێناکردنێکی فکری دروست دەبێت، هەر خۆشی لەم دۆخە دەروونییەدا دەپرسێت، (ئەی ئەگەر تۆ فلچەکەت ون کرد؟) بۆشاییەکە پێویستە لەلایەن خوێنەرەوە بەئارەزووی خۆی پڕ بکرێتەوە.

نێوەڕۆکی بابەتەکەش لایەنی فکر و هەست و نەست و خەیاڵ و باری دەروونی و کارتێکردنەکانی ناوەوەی شاعیر دەگەیەنێت. (حافظ محمد عباس درويش الشمري، ٢٠١٣، ١٦٥)

وێنە لەزمانەوە سەرچاوە دەگرێت، وەسفکردنی باری دەروونی و هەڵچوون و ڕووداوەکان و فەرمان و ئاگاداری و هەموو پێکهاتە مادی و هزرییەکان لەزمانەوە سەرچاوە دەگرن، لەبەر ئەوە کاتێک، کە دەبینە خاوەنی ژمارەیەک وشە، کردەی پەیوەندیکردنمان پێدەگات و دەوڵەمەندیش دەبێت. (PaulaLaRocque,2003, p38). لەڕێگەی زمانەوە فرە وێنەیی و فرە واتایی دروست دەبێت، ئەمەش دەبێتە بنەمایەکی بەهێز و دەوڵەمەند بۆ پەرەپێدانی کردەی پەیوەندیکردن لەنێوان نێرەر و وەرگر و شاعیر و خوێنەرەکانی، سەرباری دروستکردنی بۆشایی و گرێی وەڵام نەدراوە.

سەیری ناوەوەی ناخی ئەم وێنانە بکەن، کە دەڵێت:

"لەگەڵ هانیبال نان و پیازم خواردووە

لەگەڵ یۆلیۆس قەیسەر جگانێم کردووە

لەگەڵ عەنتەر باسی ئەپارتیدمان کردووە. (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٢٥)

ئەگەر دیقەتێکی نێوەڕۆک و وێنەی وێناکراوی نێو ئەو دەقە وێنانە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت ژمارەیەک وێنەی فکری، کۆمەڵایەتی و دەستەواژەی سەرزاری کوردەواری بەکارهێناوە، کە دەڵێت: منی (بابپەرست)، (قووڵبوونەوەیەکی فەلسەفی، فکری هاوچەرخانەی) لەخۆگرتووە. ئێمە لەجیهانێکی ئاڵۆزدا دەژین، بۆیە

لەهەندێک دۆخدا پێویستە هەندێک وشەی ئاڵۆز بەکاربهێنین، ئەو وشانە بەکاردەهێنین، کە باشترینن، یان وشەگەلێکن لەگەڵ دەوروبەرەکەدا دەگونجێن. (Paula LaRocque, , 2003, p39). دەقنووسی سەرکەوتوو هەمیشە بەدوای ئەو وشە و دەستەواژە و دەربڕینانە دەگەڕێت، کە لەگەڵ دەوروبەری دەق و نێرەر دەگونجێت.

**٢-٢ واتا و هێما و هێمابۆکراو**

(ع ع یوسف) بەتەنیا وزەی خۆی بەکارناهێنێت، بەڵکو خوێنەریش دەجووڵێنێت بۆ ئەوەی وزەکانیان بۆ دۆزینەوەی واتا نادیارەکانی لەشێوەی بۆشایی بەکاربهێنن. ئەو (هێما) ئەگەر یەکێکیش بێت، بەڵام (هێما)یەکە دەتوانێت بەچەندین شێوە بۆ یەک واتا و بابەتی (هێمابۆکراو) بەکاربهێنرێت. (هێما بۆکراویش) دەکرێت لەجۆرێک و شێوەیەک پتر لەخۆ بگرێت.

(ئەویش ژنیش). (ع ع یوسف،٢٠٠٩، ١٢٦)

واتا .... هێما (ئەو) .... هێمابۆکراو (ژن) و وەکو کەرەستەیەکی واتایی بەکارهێنراوە. (ش) بۆ جەختکردنەوە و بەراورد و دڵنیایی و هۆشداری بەکارهێنراوە.

**٢-٣ کردە قسە**

یەکێک لەبوارەکانی شیکردنەوەی پراگماتیکی چۆنیەتی بەدیهێنانی کارێکە لەڕێگەی قسەکردن و بەکارهێنانی وشەوە. خاوەنی ئەم تیۆرە زمانەوانییە (جۆن ئۆستن)ە. پێی وایە کردە قسە هەر بەتەنیا کردەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ناگرێتەوە، بەڵکو چەندین بواری دیکەی وەکو (حوکم و بڕیار و فەرمان و ئاگادارکردنەوە و هۆشداری و هەواڵ و پەیوەندیکردن و ڕیکلام و وەسف و گەیاندنی زانیاری و جەختکردنەوە و ئاگاداری و ئامۆژگاری و بەراورد .. تاد) دەگرێتەوە.

شیکردنەوەی کردە قسە پەیوەستە بەتێگەیشتن لە خودی چەمکەکە، کە "بواری دەنگی فۆنەتیکی و بواری قسە گۆکردن و بواری گوتار دەگرێتەوە". (ئۆستن:١٩٩١، ١٤١). (بڕوانە غازی حەسەن، ٢٠١٧، ٣٨). بڕوانە ( Austin, J.L., 1962 ).

*ئێرە گەرمە* "It's hot in here"

واتا مەبەستی کەسەکە مەرج نییە باسکردن و گەیاندنی هەواڵی گەرمیی شوێنەکە بێت، ڕەنگە مەبەستێکی دیکەی هەبێت، ئەویش مەبەستی ڕاپەڕاندنی کارێکە، ئینجا داوا بێت، یان فەرمان و ڕەتکردنەوە. کەواتە بەشێوەیەکی هەمیشەیی دوو واتا لێرە بەرجەستە دەبێت، یەکەمیان فەرهەنگییە و دووەمیشیان بەدیهێنانی کردە قسەییە، یان هێزی کردە قسەییە (غازی حەسەن،٢٠١٧ ، ٣٩)

(ئۆستن) لە کتێبی (How To Do Things with use Words 1962 ) ، کە دەڵێت "سەرکەوتن لە بەدیهێنانی کردار و بەتاڵبوونەوە لێی، پەیوەستە بەحەقیقەتی (ئەنجامەکان و کارتێکرن) دەبێت کارتێکردن و کارتێکران لەسەر گوێگر ڕووبدات، تا هێزی کردە قسەیی بەدەستبێت، بۆیە بەهای دەربڕینەکە لەوەدایە، کە بەئامانجی بەدیهێنانی مەبەست بگات". (ئۆستن:١٩٩١ ،١٣٥).

**٢-٤ بەدیهێنانی کردە قسەیی**

چۆنیەتی بەدیهێنانی کردە قسە لای (جۆن ئۆستن) لەم هەنگاوانە کورت کراوەتەوە:

یەکەم: دەبێت پرسیارکەر و وەڵامدەرەوەش بین لەبارەی پرسیارەکانمان. دووەم: دەبێت لەهەواڵ، ئاگادارکردنەوە، یان دڵنیاکردنەوە لەبارەی شتەکان بدەینە بەرانبەرەکەمان، بێ ئەوەی داوای لێمان کردبێت. سێیەم: بڕیاری حوکمێکی یاسادانان دەردەکەین، یان ئیرادەی خۆمان ڕادەگەیەنین. چوارەم: بەڕستەیەک دەئاخڤین، بەرانبەرەکەمان ئەو شتە پتر تێدەگەن، لەوەی خۆمان ویستوومانە. پێنجەم: دەبێت ڕوون بین لەوەی ناومان لێناون، یان دەستمان پێکردووە، یان ڕەخنەمان لێگرتوون. شەشەم: ڕوودەدات بیناسێنین، یان پێناسەی بکەین، یان بیانوێنین. (Austin:1964,119.) لەشیکردنەوەی پراگماتیکیدا باشتر لەچۆنیەتی بەدیهێنانی کارەکە دەگەین ، ئەمەش پێویستی بەهێزی قسەکردن و پێویستییەکانی هەیە.

بۆ نموونە، کە دەڵێین: (پشوو بدە). واتە مەبەستمان ئەوەیە ڕەنگە کەسەکە (بە پێ وەستابێت)، یان (زۆر ماندووە)، (لەڕووی دەروونی کارەساتێک ڕوویداوە). (تەنگەتاوە). دوور نییە پێی بڵێین (پشوو لە کارەکەت وەربگرە)، یان، کە دەڵێین

(پەنجەرەکە بکەرەوە). ڕەنگە مەبەستمان ئەوە بێت ژوورەکە گەرمە. (ع ع یوسف) لەم بەرهەمە شیعریەیدا کردە قسەی لەزۆر بواری بەدیهێنانی مەبەست و دەربڕین و وێناکردن و بۆشایی لە گوتاردا بەکارهێناوە. لەوانە:

### ٢-٥ کردەی وەسف

(ع.ع. یوسف) دەڵێت:
بەپاڕانەوە و نووزانەوە و بەدکردنم
منتان خستۆتە فۆلکلۆرەوە. (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٩).
دەڵێت:
پاڵەوان لە هەڕەتیا
وەک قەشمەر پەیکەری بۆ دەکرێ. (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ١٧).

لەم دەقانەدا شێوازی جۆراوجۆری (ئەرێنی و نەرێنی، باش و خراپ، کاریکارتێری، مێژوویی.. تاد) بەکارهێنراوە، شاعیر وێناکردنەکەی لە سێ دۆخدا نیشان داوە (پاڕانەوە و نووزانەوە و بەدکردنی)، گریمانەی ئەوە دەکرێت مەبەستی شاعیر لە فۆلکلۆر لەقاڵبدان بێت، بۆیە ئاساییە فۆلکلۆر ببێتە کەرەستەیەکی هێمابۆکراوی نێو دەقی نوێخوازی. (پەیکەری وەک قەشمەر) واتە کارەکە بۆتە فشە و جێگەی بایەخ نییە و گرنگی کەم بۆتەوە.

### ٢-٦ کردەی بەراورد

شاعیر دەڵێت: بەم بۆنەوە یا بە بۆنەی پێشوو. (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٢٤) بەراوردی دوو دۆخ و بۆنە لەڕێگەی (یا) دەکاتن، بۆنەکە دیار نییە چییە و لەکوێ بووە و بۆ کێ و لەپێناوی چی و لەبەر چی گیراوە. ئەمەش بۆشاییەکی زانیاری لەبارەی ڕوودانی (بۆنە)کە تێدایە، خوێنەر پێویستە بیری لێ بکاتەوە ئەم بۆنانە چین.

### ٢-٧ کردەی گفتوگۆ

(ع.ع. یوسف) دەڵێت:
بەر لە مردن لە ئاوزینگێکدا گوتی....
لەگەڵ ئەمەشدا، من دەتانم

دامەنێکی هۆشمەندانەی بۆ بنووسمەوە
یان دەڵێت:
گویٚ لەوانی دیکە بگریٚ. (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٦٨-٦٩)

ئەمە گفتوگۆی نێو ناخە، کەسێک لەگەڵ خۆیدا دەئاخڤێت، لەدۆخی دووەمدا دەبێت گویٚ لەوانی دیکە بگرێت. دەقەکانی شاعیر گفتوگۆی تێدایە، گفتوگۆی ئاشکرا و شاراوە، (ئای ئادەمینە ناڵێم کێوە دەچن)، یان (بەزمانی ئابووری ناسان بدوێین)، یان (خۆی پیس دەکات.. هەی دەبەنگ!). دەڵێت: ( ئەو ناوبژی دەکات: ڕۆڵە ئێوە بران، ئەمە ئۆین و فیتی دوژمنە)، یان (هەمووشیان بەتەوس و گاڵتەوە دەجرتێنن: - کیٚ کردی و کیٚ بردی سەداکەشیان هەر دەقاقینیٚ)، (ئەی کە تۆ فلچەکەت لیٚ ون دەبێت)، (ئەو پیرە یۆنانییە ناڕازی بوو: - نەکەن برادەرمە و گیانگۆڕکیٚ بووە بە دۆبلاژێکی سەقەت فۆرتەچییەک زاری داپچڕاند: وای لەو شینە درۆیە!). (ع.ع. یوسف، ٢٠٠٩، ٩، ١١، ١٨، ٢٢، ٢٦، ٣٣، ٤٠، )، کە وێنە شیعرییەکان دەتوانن وەسفیان بکەن، هەندێکیان فکر و لێکدانەوە و مەزەندە و تێڕوانین. لەم گفتوگۆیەدا دەڵێت: (گوتی .....) چی گوت، باسی چی کرد و قسەکانی چەند بوون، لەم وێنە سینەماییەدا بۆشاییەکی کراوە، زەمەن و شوێنێکی کراوە لەبیرکردنەوە لای خوێنەر دروست دەکات، تاکو بزانن ئەو کەسەی، کە لە ئاوزینگدا بوو، چی گوت. ئەو لە قسەکانی گفتوگۆی کەسێک دەگەڵ خودی خۆیدا نیشان دەدات، وێناکردنێکی کراوەی دروست کردووە، کردەی (بڕیاری) بەدوادا هێناوە ئەویش خۆی لە(دەتانم) دەنوێنێت. پێویستی کردە قسە و هێزی کردە قسە خراوەتە نێو بۆشاییەکی بەفراوان، بۆ ئەوەی هەر کەسەو بەمەزەندە و دیقەت لێدانی تایبەتی خۆی شتەکان لێک بداتەوە. ئەمە ئەرکی دەقە لە دروستکردنی بۆشایی، هەروەها ئەمە ئەرکی پراگماتیکە لە شیکردنەوەی دەقدا. ئەمەش ئەرکی دەقنووسە چەند دەتوانێت هێز و توانا و دەسەڵات بەدەقێک ببەخشێت، بۆ ئەوەی خوێنەری وریای هەبێت و دەقێکی زیندوو بەرهەم بێنێت.

**٢-٨ کردەی هۆشداری**

**دەقنووس دەڵێت:**

نە نووستنێکی هەتا هەتایە

نە بێدارییەکی هەتا هەتایە. (ع ع یوسف،٢٠٠٩، ٢٥).

دەنگی هەڵدانەوەی قەپاغی شووشەیەکی تریش

هەند، دەمباتە پێشەوە

تێر نیگام کرد

ناهومێدم، بە تەماشا لێرە کەس نابتە پاشا. (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٣٩).

لەکردەی هوشداریدا دەقنووس دیسان پشتی بەبۆشاییەکی نادیار بەستووە، کە پێمان دەڵێت نەنووستن و نەبێداری هەتا هەتایە. ئەنجامەکی چ دەقەومێت وەکو بۆشایی بۆ خوێنەر بەجێهێشتووە. دەسەڵات و هێزی هەر دەقێک لەوەدایە هۆشداری وەکو ڕێنمایی و پەلبەستکردن بەکارنەهێنێت، بەڵکو خوێنەر بخاتە کەشێکی ئازاد، بۆ ئەوەی وەڵامێکی ئازادی پڕ بەخواست و فکری خۆی هەبێت. دەنگی قەپاغی شووشەیەک (بێگیانە) هۆشداری بە(مرۆڤە قسەکەرە خاوەن گوتارەکە دەدات)، نەک هەر ئەوە کردەی (بڕیاردانیشی) لا دروست دەکات و وای لێ دەکات هەندێک بیباتە پێشەوە. ئەو کردەیە کردەی (بڕیاری) بەدوای خۆیدا هێنا و کردەی بڕیاریش (کردەی ڕەوشتی و دەروونی و خود ئاسوودەکردن) بەرهەم دەهێنێت.

دەڵێت: (تێر نیگام کرد). واتایەکە پێچەوانەیە شاعیر، خۆی خۆی بەنیگاگرتن لەو تێر تێر کردووە، نەک نیگا لێگیراوەکەی تێر کردبێت..

**٢-٩ کردەی داواکردن**

یەکێکی دیکە لەکردەکانی نێو ئەم دەقانە داواکردنە. هیچ مەرج نییە ڕاستەوخۆ داواکردن بەدیار بکەوێت، کاتێک یەکێک دەڵێت "برسیت نییە" دەکرێت کۆمەڵێک داواکردن لەنێو ئەم دەربڕینە هەبێت.

یەکەم: با داوای خواردن بکەین، یان بچینە چێشتخانە. دووەم: من برسیمە. سێیەم: جەختکردنەوەیە لەدۆخی کەسی گوێگر. چوارەم: سەرنجڕاکێشانە. پێنجەم: گۆڕینی بابەتە لەکاتی قسەکردن. شەشەم: ڕەتکردنەوەیە.

لەهەر دەقێکدا کارێک دەتوانێت بەپێی دەوروبەرەکە ژمارەیەک کردەی دیکە ئەنجام بدات، ئەم کردانەش هەمووی لەڕێگەی قسەکردنەوە ئەنجام دەدرێت. شاعیر کە باسی مەرگەساتی ژیان دەکات، واتا ژیانێکی ئاسوودەی دەوێت، کە باسی مردن دەکات، واتا ژیان ئاڵۆزە، یان ژیانێکی کامەرانی پێ خۆشە، یان مردن وەکو ڕەتکردنەوەی ئازارەکانی ژیان بەکاردەهێنێت.

**۲-۱۰ کردەی پرسیار**

له دەقێکی ناونیشاندا بەناوی (هات ... کێ هات؟ لۆکینات ... هات). (ع ع یوسف، ۲۰۰۹، ٦۰) هەوڵیداوە بۆشاییەکی ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی نیشانەی (؟) بۆشاییەک لەڕێگەی (...) سێ خاڵەوە دروست بکات و بۆشاییەکی دیکەی لەڕێگەی کردەی هەواڵ له وەسفی (لۆکینات ... هات) دروستکردووە. له (هات)ی یەکەم هەواڵە و بەدانانی خاڵەکان بۆشاییەکی لەبارەی کەسەکە و چۆنیەتی و جۆر و شێواز و هۆکار و کەرەستەی هاتنەکە دروستکردووە، بەڵام له بەشی دووەمیدا دوای بۆشایی یەکەم لەڕێگەی پرسیارەوە بۆشاییەکی دیکەی دروستکردووە. (کێ هات) ئەو کەسەی هەواڵی هاتنی بەئێمە درا کێیە؟. له بەشی سێیەمی دەقەکەدا (لۆکینات) بێ ئەوەی ئاماژە بەوەکرابێت هات، تەنیا ناوی کەسەکە وەکو کردەی جەختکردنەوە و ساخکردنەوە و سەلماندن و ئاشکراکردن ئاماژەی پێکراوە، بەڵام بەهۆی (...) بۆشاییەکە ئاشکرا وەسفکردنی لەخۆگرتووە. بەم جۆرە دەقنووس گەمەیەکی زمانی لەنێو دەق و وێنەکاندا کردووە، کە هەریەکەیان دەتوانن کردەیەک، یان پتر له کردەیەک له دروستکردنی بۆشایی ڕاپەڕێنن.

**۲-۱۱ کردەی کاریکاتێر**

کاریکاتێر وەکو هونەری هێڵکاری و وەکو بەرهەمێکی فکری و دەقێکی نووسراوی ساتیر، یان گێڕانەوە و گاڵتەئامێز و پیشاندانی وێنە و هەقیقەت و کەسایەتی کەسێک و بەهای شتێک بەپێکەنیناوی، پەنا وەبەر بیرۆکەی کاریکاتێری دەبرێت. ئەم بیرۆکەیەش بۆشایی لەپێش (چاو/ هونەری هێڵکاری) و بۆشایی لەنێو (مێشک/ بیرکردنەوە و وێناکردنی وێنە و بیرۆکە و گێڕانەوە و وەسفکردن.. تاد) دروست دەکات.

(ع ع یوسف) لەم بوارەشدا پەیوەندییەکی پتەوی لەنێوان وێنەی کاریکاتێری لەنێو دەقە نووسراوەکانی و بۆشایی و پرسیار و ئەگەر و کێشە و تێڕوانینی تەواو نەکراوی بینراو و هەستپێکراوی پیشاندراو وپیشان نەدراوی شاراوە دروستکردووە.

لەنێو دەقەکانی (زەلامێک لە ناو جەستەم دایە) و (تەڕ هۆنراوەم نووسی ؟؟؟؟؟) و (فۆتۆگرافی نووسەر بە جغارە) و (لاوێک بە مریشکەوە) ... تاد. وێنە کاریکاتێرییەکان دەجوولێن، گێڕانەوەی گاڵتەئامێز، قەشمەریکردن بە شتەکان، هەڵگێڕانەوەی وێنەی ڕووداوەکان و کارەکتەرەکان بێت، دەشکرێت فکرەیەکی جدی بێت و بەشێوەیەکی کاریکاتێریانە و بەنیشاندانی جووڵەی سەرسوڕهێنەر پیشان درابن، ئەمانەش (وێنەی تەواو نەکراو، زانیاری تەواونەکراو و مەبەستی پرسیار وروژێنەر و هاندانی خوێنەری بۆ بیرکردنەوە لە هۆکار و ئەنجامی ڕووداوەکان) دروستکراون، کە خوێنەر بۆ بیرکردنەوە و بەشداری لە دروستکردنی دەقەکە هان دەدەن.

**٢-١٢ سەرسوڕمان وەکو کردەی بۆشایی**

لەم کردەیەدا لەڕێگەی بەکارهێنانی نیشانەی سەرسوڕمان(!) یان لەشێوازی دەربڕین و هێزی ئاوازەی گوتنەکەی و دۆخی وێنە شیعرییەکە دروست دەبێت. دەقنووس لەناونیشانێکی دیکەدا دەڵێت (پخ شێفرە!). (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٩١). بۆشاییەک لەنێوان (پخ و شێفرە و نیشانەی سەرسوڕمان هەیە). لەبەرچاومان بێت کاتێک (پخ) وەکو دەنگێک لەناکاو یەکێک بەهۆش دەهێنێتەوە. ڕەنگە بۆ سووکایەتی و ترساندنیش بەکاربهێنرێت. لەدوای نیشانەی سەرسوڕمانیشەوە بۆشاییەکی وێنەیی هەیە، وێنەی ئەو کەسەی پخی لێکراوە، دەبێت لە چ دۆخێکدا بێت؟.

ناونیشانێکی دیکەی هەیە بەناوی (تەڕ هۆنراوەم نووسی !!!!!!!). (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٩٩) لەنێوان (تەڕ) و ( هۆنراوە و نووسی) و نیشانەکانی (!!!!!!!) بۆشایی هەیە. (تەڕ) کردەیەکی نیمچە گاڵتەپێکردنی بەخۆی تێدایە، گەلێک جار لەگفتوگۆیەکی نێوەخۆییدا کەسێک بەم جۆرە نیمچە گلەییەک لەکار و کردەوەی خۆشی دەکات؟.

**٢-١٣ بۆشایی لەدوای (ئەگەر)، (بەڵام) و (مەگەر)**

لەنێو دەق بەگشتی بەکارهێنانی هەندێک دەستەواژەی وەکو (ئەگەر/ بەڵام) لای (ع ع یوسف) (مەگەریش) بەکارهێنراوە، هاوکارن لەدروستکردنی بۆشایی لەدوای ئەم دۆخەی لەدوای دەستەواژەکان، یان هەندێک جار هیچیان بەدوادا نایێت و وەکو پرسیار و سەرسوڕامان و گومان و تەواونەکردنی مەبەستداری شتەکە و گریمانە.. تاد بەمەبەستی بەجێهێشتنی بۆشایی لەپێناو گەڕان بەدوای دۆزینەوە واتایەکی گونجاو مەبەستێکی شیاو و بیرکردنەوەیەکی دروست بەکاردەهێنرێن.

دەقنووس دەڵێت:

کەسێک گوهداری دەنگی خۆی نابێ

مەگەر

لە ملیۆنان، شارێک لە گەڕەکێک، لە کۆڵانێک، لەماڵێک لە خێزانێک ئەگەر

مەگەر

... ساتێک ئەگەر. (ع ح یوسف، ٢٠٠٩، ٦٩).

زمان هەستپێکردن، یان درککردن و مەعریفەیە. (د. محمد المفتاح، ١٩٩٠، ٤٩) بەیەکەوە بەستراون. لەم ڕوانگەیەوە دەقنووس ئەم دەستەواژانەی بەکارهێناوە، کە بەشێوەیەکی گشتی ڕستەیەکی تەواو نەکراو لەدوای خۆیان بەجێ دەهێڵن، کە پێویستە خوێنەر بیر لەپڕکردنەوەیان بکاتەوە.

**٢-١٤ گوتاری بۆشایی لە دەقدا**

لایەنێکی دیکە دروستکردنی بۆشایی لەنێو دەقدا هەندێک بواری وەکو (واتا و وێنەی شیعری و هەڵگێڕانەوەی گوتار و دەقی تەواو نەکراو و ئاماژە و کردەی تەواو نەکردنی ئاماژەکە و کاریکاتێر و فیلم و گێڕانەوە و بیرکردنەوەیە ..).

لەبوارێکی دیکەدا دەکرێت ئاماژە بەوە بکرێت، کە بۆشایی لەنێو دەقی گوتاردا مەبەستێکی پێشوەختەی دەقنووسە، بۆ ئەوەی وەرگرەکانی بجووڵێنێت، (دەقنووس داوا لە خوێنەرەکانی دەکات بەشداریی بەردەوام لەپڕکردنەوەی ئەو

بۆشاییانه بکەن، که نەگوتراون، یان ئەو شتانەن، که گوتراون بەڵام هێشتا بۆشایەتییان تێدا ماوه). (المصطفى العمراني، http://www.aljabriabed.net/n67_05amrani.htm).

گوتاری دەق، مەبەستی دروستکردنی پەیوەندییه لەنێوان نێرەر و وەرگر، ژمارەیەک بنەما و شێوازیش بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی گوتارەکه بەکاردێت. لەم دەقه شیعرییانەدا لەتەک دەیان وێنەی واتایی، که بۆشایی (فیزیکی و هەستپێکراو و هزرییان) دروستکردووه، وێنه شیعرییەکانیش پێویستییان بەوەیه لەلایەن خوێنەرەوه جارێکی دیکه و سەرلەنوێ بەزانیاری و تێگەیشتن و دونیابینیی نوێ، بەرهەم بهێنرێنەوه.

نموونەی گوتاری بۆشایی:

دەڵێت: (من ... ڕۆڵەی ... ڕابردوو ... یا ... ئێستا ... یا ... دوارۆژم؟!) ئەمه دێڕی، یان بەشه دەقی کۆتایی دەقێکه بەناوی (بەنده لەڕابردوو و ئێستا و ئاینده). (ع ع یوسف،٢٠٠٩، ٢٧). لەم گوتارەدا، که قسەکەر خودی شاعیره، وەسفی خۆی دەکات، بەڵام لەنێو هەر بەشێکی گوتنەکەیدا بۆشاییەکی لەشێوەی خاڵ دروستکردووه، لەنێو هەر یەکێک له بۆشاییەکانیشدا، لەنێو وێنەی هەر وشه و کار و وەسف و کات و شوێنێکدا بۆشاییەک، یان پتر له بۆشاییەک هەیه. لەنێو (من) (خۆشیدا) وێنەیەکی دیکه، یان پتر لەوێنەیەک هەیه، یەکێک لەوانه ڕەنگه (تۆ) بیت، یان (ئەوان) و (ئێمه) بین

## ٢-١٥ بۆشایی ڕستەی تەواو نەکراو

دەقنووس لەم بواره وێنەی شیعری، گوتار و دەربڕین و تەنیا له هەندێک بواردا (دەنگ و پیت و هێماشی) بەکارهێناون. فرەیی له کەرەستەی بەدیهێنانی گوتاری شیعری دەسەڵاتی دەقنووس پیشان دەدات، هێزی دەربڕین و بەکردەوه بەدیهێنانی کرده قسه لەپێناو گەیاندنی مەبەست ڕادەپەڕێنێت. لەچەند نموونەیەکدا دەڵێت (هەرچییەک مەڕ بیخوات، تۆش)، (لەدوور، فانۆسی کوخێکی ڕۆخ شار)، دوای ئەوه لەڕستەیەکی دیکەدا دەنووسێت (دیاره).

له بوارێکی دیکەدا وەکو (ئیکو) ئاماژەی پێدەکات دەقی کراوه و دەقی داخراو هەیه، ئەوەی دووەمیان خوێنەری سنوورداریان هەیه، بەڵام ئەوەی یەکەمیان کراوەیه سنووری بۆ خوێنەر نییه (فرانک شویرویجن، مجلة علامات ١٩٩٨، ٩٧). بڕوانه (اومبرتو ایکو، ٢٠٠٣). مەبەست لەم بۆچوونه دەقی کراوه، واتا بەجێهێشتنی بۆشایی و کرانەوه لەبەردەم خوێنەر و وەرگر بۆ ئەوەی بەشداری لەپڕکردنەوەی دەقەکه بکەن. ئەمه بواری واتا و لێکدانەوەش دەگرێتەوه. بەڕای من لەمەش پتر تێدەپەڕێت، هەندێک دەقی کراوه، که بۆشایی مەبەستداری فیزیکی لەشێوەی خاڵ خاڵ (.....) تێدایه، خوێنەر و وەرگر دەتوانن شێواز و مەبەست و بیرکردنەوه و لێکدانەوەی خۆشیان بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکه تێدا بەکاربهێنن.

لەشوێنێکی دیکەدا دەنووسێت:

(شەممه کودی و باینجان و بامیه به خاوی

لەکاتی پێویست، سەیری وێنەیەکی ناو ئەلبۆم بکرێت). (ع ع یوسف ،٢٠٠٩، ١١٢-١١٤).

(بووه کۆتر... عەجەب!

بۆ عەجەب؟). (ع ع یوسف، ٢٠٠٩، ٩٨).

ئەم دەربڕین و گوتارانه هەموویان لەشێوەی ڕستەی تەواو نەکراو نووسراون، هەرچەنده خوێنەر دەتوانێت لەڕێگەی بەکارهێنانی وشەیەک، ئینجا ئەم وشەیه (کارێک، فەرمانێک، وەسفێک، کاردانەوەیەک و کردەوەیەک و سیفەتێک بێت) بۆشاییەکان پڕبکاتەوه.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوە

یەکەم: بۆشایی( البیاض) لەنێو دەقدا یەکێکە لەکردەکانی پەیوەندیکردن، ئەم کارە لەئەنجامی بەجێهێشتنی بۆشایی، یان فکرە و وێنە و وێناکردنیکی زهنی لەلایەن دەقنووسەوە بەشێوەیەکی مەبەستدار دروستکراوە بۆ ئەوەی خوێنەر بجوولێنێت و بەشداری پێبکات بۆ بەرهەمهێنانەوەی خودی دەقەکە، یان تەواوکردنی دەقە (نووسراو، یان گوتراوەکە). بۆشایی دەکرێت واتایەکی فکری، فەلسەفی، یان کۆمەڵایەتی لە دەوروبەرێکی دیاریکراو هەبێت، یان دروست بکات.

دووەم: بۆشایی بەرهەمی دەقێکی مەبەستدارە، هەندێک جاریش بۆشایی لەئەنجامی فرەواتایی و ڕەوانبێژی و هێزی دەربڕینی وشەکە دروست دەبێت. بۆیە ئاساییە هەندێک بۆشایی لەدەرەوەی مەبەست و خواستی دەقنووسدا دروست بێت. بۆشایی ژمارەیەک کردەی زمانی ڕادەپەڕێنن، کە هاوشێوە و لە ڕەگەزی کردە قسە دەچن، لەوانە کردە( داواکردن، پرسیار، سەرسوڕمان، ڕەتکردنەوە، فەرمان، بڕیار، جەختکردنەوە و لایەنگیری و ڕیکلام و هەواڵ و گەیاندنی زانیاری و تەئیدکردن و پاساو.. تاد).

سێیەم: هەندێک پێیان وایە بۆشایی یەکسانە بەهیچ، شوێنێکی بەتاڵ و بێکار و کردەوەیە، نەخێر لەڕووی هزر و مێشک و واتا و درککردنەوە، بۆشایی خۆی شتێکە و پڕاوپڕیشە لە شتی دیکە، کە هەندێکیان لەبنەڕەتدا شتی نەبینراوی نادیارن، تەنیا لەکاتی بەکارهێنان و کاریگەریی واتاکانیان لەدۆخی دەوروبەردا بەدیاردەکەون.

چوارەم: (عەباس عەبدوڵلا یوسف) پاشای زمانە لەنێو دەقدا، فەرمان بەزمان و پێکهاتەکانی دەدات، ئەرکیان پێدەبەخشێت و لێیان دەپێچێتەوە و خۆشی بەدەسەڵات و هێز و سامێکی زۆرەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات. دەقنووس بەشێکی زۆری شێوازەکانی دەقنووسینی بەکارهێناوە، بەڵام لەهیچیان زمانی لەبیر نەکردووە، هەمیشە شێوازی خستۆتە خزمەت زمان، نەک بەپێچەوانەوە.

پێنجەم: بۆشاییەکان هەندێکیان بۆشایی بەرجەستە و فیزیکین، لە هەندێک بواریشدا بۆشاییەکان لەئەنجامی وێنە، یان وێنە لەنێو خودی وێنە دروستکراوەکان و وێنە زهنییەکانی نێو مێشک و لێکدانەوە و تێڕوانین و فکردا پەیدا بوون.. (عەباس عەبدوڵلا یوسف) لە دەقە گوتارە شیعرییەکەیدا گوتاری بەپاڵەوان کردن و دروشم و

پیرۆزکردنی بۆنەکانی لەدەقدا بەکارنەهێناوە و کاری لەسەر ئەو بوارە نەکردووە، ئەو گوتاری زمان و فکر و وێنەی نێو وێنە شیعرییەکان و درک پێکردنی دیاردەکانی لەڕووی فەلسەفی و فکرییەوە لا گرنگە، بۆیە وەرگر و خوێنەری تایبەتی دەبێت.

شەشەم: دەقنووس دەسەڵاتی بە خوێنەر داوە، دەقەکانی بۆ تەواو بکەن، ئەمەی لەدەقێکی شیعری وەکو کردەیەکی ئاشکرای (بۆشایی بەجێهێشتن و داواکردنی ڕاستەوخۆ لەخوێنەر بۆ ئەوەی دەقەکەی بۆ تەواو بکەن). گوتاری شیعر توانیویەتی هاوکارییەکی بەرچاو لەدروستکردنی پەیوەندی لەنێوان نێرەر و وەرگر دروست بکات، بەتایبەتیش لەو بوارانەی بۆشاییان تێدایە و پێویستیان بەپڕکردنەوە و تەواوکردن و دۆزینەوە و خەیاڵاندن و وێناکردنەوە و هەتا دروستکردنی واتا و وێنەش لەنێو وێنەی وشەکاندا هەیە.

### سەرچاوەکان بەعەرەبی


- اومبرتو ايكو، ٢٠٠٣، التأويل بين السميائيات والتفكيكية، ترجمة سعيد بنگراد، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء، الطبعة الثانية.
- المصطفى عمراني، القراءة والتأويل بين اوبرتو ايكو وفوللفغانغ ايزر. (http://www.almadapaper.net/ar/news/446025
- اوستن، ١٩٩١، نظرية افعال الكلام العامة، ترجمة عبدالقادر قيتيني، افريقيا الشرق، رقم الايداع القانوني ٩٠/٩١٦، افريقيا الشرق، بيروت ، لبنان.
- جان كلود دومينجور، ١٩٩٨، المقاربة السيميولوجية، ترجمة جمال بلعربي، هذه دراسة قدمه في اطار الدورة الاولى ضمن برنامج التكوين ١٩٩٨-١٩٩٩ المقولات الاساسية للغة المرئية سبتمبر . (file:///D:/%٢٠%٢٠و%٢٠%٢٠ %٢٠.pdf).
- حافظ محمد عباس درويش الشمري،٢٠١٣، الفكر في الشعر العربي الحديث ١٩٠٠- ١٩٥٨م، بغداد.
- د. محمد المفتاح، مجهول البيان، ١٩٩٠، دار توبقال للنشر، دار البيضاء، المغرب.
- د. محمود عكاشة، ٢٠١٤، تحليل الخطاب في ضوء نظرية احداث اللغة، دار النشر الجامعات، قاهرة.
- روبير اسكاربيت، ١٩٨٠، سوسيولوجيا الادب، ترجمة امال عرموني، طبعة ٢، بيروت ، منشورات عويدات.

- فرانك ايفرار، ٢٠٠٠، اريك تينه، رولان بارت مغامرة في مواجهة النص، ترجمة د. وائل بركات، دار الينابع، دمشق، طبعة الاولى
- فرنك شويرويجن، نظريات التلقي، ترجمة د. عبدالرحمان بوعلي. مجلة (علامات في النقد) الجزء ٢٧ مجلد ٩مارس ١٩٩٨ النادي الادبي الثقافي بجدة.
- فلوريان كولماس، ٢٠٠٠، اللغة والاقتصاد، ترجمة د. احمد عوض، عالم المعرفة ، ٢٦٣ ، نوفيمبر.
- مجموعة، ٢٠٠٨، مقالات في تحليل الخطاب، كلية الاداب والفنون والانسانيات بجامعة نبوية وحدة البحث في تحليل الخطاب.
- محمد الخطابي، ١٩٩١، ليسانيات النص مدخل الى انسجام الخطاب، المركز الثقافي العربي، دار البيضاء، الطبعة الاولى.
- محمد بن سليمان القويفلي، البياض السردي: الاعراف ودلالات العدول، جامعة ملك السعود، السعودية، ١٤١٢ هجري
- محمد شداد الحراق، اللغة الشعرية وهوية النص، ٢٠ اكتوبر ٢٠١١، ( http://www.diwanalarab.com/%D8%A7%D9% ).
- والتر ج. اونج، فبراير ١٩٩٤، الشفاهية والكتابة، ترجمة حسن البنا عزالدين، كويت المجلس الوطني للثقافة والفنون والادب، سلسلة عالم المعرفة، ١٨٢.
- وين بوث، ١٩٩٤، بلاغة الفن القصصي، ترجمة احمد عردات و علي الغامدي، رياض، جامعة الملك سعود.
- **سەرچاوە بەکوردی**
- ع ع یوسف، ئۆدیسیۆس نێرە یان مێ؟، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، چاپی یەکەم،
- غازی حەسەن، ٢٠١٧، گوتاری سیاسی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی کوردستان شیکردنەوەی پراگماتیکی، نامەی ماستەر زانکۆی سۆران ٢٠١٧.
- **سەرچاوە بەئینگلیزی**
- Austin, J.L. 1962, Ho To Do Things With Words, printed in Great Britain, Oxford Universtiy Press.
- Mehan Dowed Lambert, 2015, Redading picture books with children, Charlebrdge , watertown MA, .
- Paula LaRocque,2003, The Book on Writing the Ultimate Guide to Writing Well, Marion Street Press Portland, Oregon,ISBN-0-9665176-9-5.

## ملخص البحث

## أين البياض في خطاب الشعر للشاعر " ع.ع. يوسف" الذي يحمل عنوان "هل أديسيوس ذكر أم أنثى؟"

يحلل هذا البحث ويوضح الفراغ بين خطاب النص الشعري ( عباس عبدالله يوسف) وهو طريق أو اتجاه يستند على الخطوط البراكماتيكية وخاصة افعال الكلام، وتحليل كيفية ظهور أو خلق الفراغ (البياض) بين نص الخطاب على صورة النوع أو الشكل، أو الخيال والصورة والفكر والتصوير الذي يبين المعنى الظاهر والمخفي. وفي تحليلنا هذا إستندنا الى مجموعة من الرموز اللغوية التي لها العلاقة في خلق (البياض) المقصود و(البياض) الغير مقصود. وكل نص خطابي يتضمن تسيير فعل ما أو أكثر من الفعل ما للحصول على المقصود .الفراغ (البياض) في النص هو أحد عملية الإتصال، ويأتي هذا الفعل نتيجة لترك الفراغ.... وان الفكرة والصورة أو التصوير الخيالي من قبل كاتب النص بصورة مقصودة لتشجيع وتحريك القاريء نحو ذلك العمل وجعله يشارك في اعادة إنتاج النص ذاته، أو تكملة النص المكتوب . والفراغ من الممكن أن يكون ذات معنى فكري أو فلسفي أو إجتماعي في محيط معلوم او من خلال عمل لخلق ذاك المحيط.

## Abstract

**Poetic Discourse gaps of the text: “Is Adissius Male or Female?“ written by (Abbas Abdulla Yousf)**

The research is about analyzing the gaps between the discourses of the poetic text of (Abbas Abdulla Yousf). This is a methodology based on the pragmatic theory, in particular the speech act, the analysis of the manner of creation of “gutter talk” in the discourse text in the manner of form and shape, or idea and image and imagination and thought, and explicit and implicit meaning. In this research, we have relied upon a group of linguistic codes that are related to the creation of gap (with purpose) and (out of purpose).

The discourse text is about carrying out an action, or more than an action for achieving a purpose. Gutter talk in the text is one of the actions of communication. The action has been created on purpose by the author of the text as a result of leaving gutter, or idea, image, and mental imagination, to move the reader and engage him/her in reproducing the text itself or completing the text (written or spoken).

The gaps could create a mental, philosophical, social meaning in a specific environment

# هزری سۆفیزم
# لای (بابا تاهیری عوْریان)

**م. ئارام قادر صابر**
بەشی فەلسەفە
کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان
زانکۆی ڕاپەڕین

**م. محەمەد جەودەت عومەر**
بەشی فەلسەفە
کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەدین

**پێشەکی**

توێژینەوە و بەکێشەکردنی بابەتێک لە خۆیدا هەڵگری ئیشکالیەتی جۆربەجۆرە، کە بۆ توێژەران کارێکی ئاسان نییە. چونکە لە ڕەوتی توێژینەوەدا، توێژەران ڕووبەڕووی سەرچاوە و ئارگیومێنت و دیدی جیاواز دەبنەوە و هاوکاتیش ئارگیومێنت و دیدی جیاوازی دیکەیش دێنە ئارا، بەڵام ئەم ئاڵۆزی و ئیشکالیەتە دواجار بەرهەم و ئەنجامێکی مەعریفی تازە دەخاتەوە، بە تایبەت بۆ ئەو بابەتانەی کە هێشتا لایەن و دیوی تاریک و لێڵ و ناڕوونیان هەیە.

توێژینەوە لە سۆفیزم، هەروەها سۆفیزمی کوردی- ئیسلامی، ئایین و ئایینزا کوردی و ئیسلامییەکان، هەڵگری خەسڵەتی ئیشکالیەت ئامێزن، ئەمەش تەنها بۆ سەرچاوە و دیدی جیاواز ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ شێواندن و بەلاڕێدابردنی گوتار و مێژوو و ڕووداوەکان و بابەت و گێڕانەوەکان دەگەڕێتەوە، لێرەشدا سەبارەت بە هزری سۆفییانەی (باباتاهیر) هەمان کێشە لە ئارادایە. کەواتە ئەم توێژینەوەیە بە مەبەستی ساغکردنەوەی هەندێ ئیشکالیەت لەبارەی سۆفیزمی (باباتاهیر)ەوە، هەروەها ئەنجامدانی ئەرکێکی ئەکادیمی، کە پێشتر توێژینەوەی وردی ئەکادیمی لەو بوارەدا دەگمەنن، بەڵکو زیاتر لە شێوەی وتار و گێڕانەوەی مێژووی ئەدەبی نووسراون، لە کاتێکدا هەندێک لەوان پەیوەست بە ئەدەبیات و سۆفیزمی فارسی و عەرەبی زیاتر هەوڵی شێواندنی ڕاستینەی مێژوویی کوردانیان داوە.

توێژینەوەکە بە لێکدانەوە و راڤە و شرۆڤەی بەرهەمەکانی (باباتاهیر) و سەرچاوەکان لە هەردوو میتۆدی شیکاری و هێرمیونیتیکی کەڵک وەردەگرێت و دەیەوێت لە کۆنتێکستەکانەوە ئەرگیومێنت و بەڵگە زانستی و لۆژیکییەکانی بکاتە پاساوی عەقڵانی بۆ تێز و تیۆر و بۆچوونەکان.

سەبارەت بە پەیکەرە و بونیادی توێژینەوەکە، لە شێوەی باس و تەوەرەدا بە دوو باس و چەند تەوەرەیەک هەوڵدراوە، (باباتاهیر) و هزر و هۆزان و پەیڕەوی ئایینی و تێز و تیۆرەکانی و پەیوەندیی لەگەڵ رێبازەکان و ژیانی کۆمەڵایەتیی سۆفییانە بخرێنەڕوو. بۆ ئەم مەبەستەش زیاتر هەوڵدراوە سوود لە سەرچاوەکانی خۆی و ئەوانە وەربگیرێت کە لەبارەیەوە نووسراون.

## باسی یەکەم: (بابا تاهیر) و پەیوەندی بە ئایینی (یارسان[١])ەوە

### تەوەری یەکەم: (بابا تاهیری عۆریان[٢]) کێ بووە؟

(بابا تاهیری عوریان) یاخود (بابا تاهیری هەمەدانی) سۆفییەکی کوردی هەمەدانی بووە و ساڵی (٤١٠ی کۆچی) مردووە، کە بە ناوبانگ بووە بە هۆزانەکانی لەسەر شێوەی غەزەل، بەیت و چوارینە و (عومەری خەییام)ی هۆزانڤان کێبڕکێی ئەم شێوە چوارینانەی لەگەڵدا کردووە، هەرچەندە بەیتەکانی (باباتاهیر) زیاتر بۆن و بەرامەی ئیمان و عەشقی هەق دەدەن و لەم لایەنەوە لە پێگەی (فریدالدین عطار) و (مولانا جلال الدين رومی)یە. خۆی وەک (سۆفییەکی قەلەندەر)ی گەڕیدە و بێ ماڵ نیشانداوە (الحفنی، ٢٠٠٣، ٥٥). سۆفییەکی پایەبەرزە دڵسوتاوە و هەمیشە لە بیری خودا و مردندا بووە، سۆز و نیاز و خەم و خەفەتی هەر یادی خوا و باسی مردنە (خاڵ، ١٩٧٧، ٢٣). هەروەها، بێ ناونیشان، گۆشەگیر، بێ نیاز و خاوەن دڵ بووە، یەکێ بووە لە عاریف و پیاوچاکانی (ئەهلی هەقی یارسان)ی موسڵمان.

بە گوێرەی سەرچاوە و توێژینەوەکان (بابا تاهیر) لە کۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە، نزیکترین ژێدەریش بۆ ئەم بابەتە بریتییە لە کتێبەکەی (راحة الصدور و آية السرور در تاريخ ال سلجوق)ی (محمد بن سليمان الراوندي) کە ساڵی (٥٩٩ی کۆچی) نووسراوە، ناوی بابا تاهیر لە رووداوێکی

مێژوویی دەبات لە سەردانی (سوڵتان توغروڵبەگی سەلجوقی) بۆ شاری (هەمەدان) و تیایدا باس لە دیداری نێوان (سوڵتان توغروڵبەگی سەلجوقی) و (بابا تاهیر) دەکات، لێرەدا دانەر دەیەوێت ئەوە دەربڕێت کە پلە و پێگەی دەروێش و سۆفییان لەو سەردەمەدا باڵا بووە. ڕووداوی دیدەنییەکەش بەم جۆرە دەگێڕێتەوە: "بیستم لەو کاتەی کە (سوڵتان تۆغروڵبەگ) هاتە شاری (هەمەدان) ئەولیای سۆفییان سێ پیر بوون (بابا تاهیر و بابا جەعفەر شێخ حەمشا) لەلای شاخێ کە ناوی (خدر) بوو لە دەروازەی (هەمەدان) وەستابوون، کە سوڵتان چاوی پێیان کەوت پیاوەکانی خۆی ڕاگرت و خۆیشی لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و لەگەڵ وەزیری (ئەبوو نەسری کەندەری) بەرەو ڕوویان ڕۆیشت و ویستی دەستیان ماچ بکات، (بابا تاهیر) لەو کاتەدا لە حاڵەتی (جەزبدا) بوو ڕووی کردە سوڵتان پێیگوت: ئەی تورك دەتەوێت چی لەگەڵ خەڵکی خودا بکەیت؟ وتی: ئەوەی ئەمر دەکەی ئەوە دەکەم. (بابا تاهیر) وتی ئەوە بکە کە خودا دەیەوێت، خودا دەفەرموێت (ان الله یأمر بالعدل والاحسان). سوڵتان دەستی کرد بە گریان وتی: وا دەکەم. بابا تاهیر دەستی گرت و پێیگوت: ئەم دیارییە لە من وەردەگریت؟ سوڵتان وتی بەڵێ. ئیتر (بابا تاهیر) گەرووی مەسینە شکاوەکەی لە ئەنگوستی دەرهێنا، ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر بۆ دەستنوێژ بەکاری هێنابوو، وە لە ئەنگوستی سوڵتانی کرد و پێیگوت: من هەموو سامانی سەر زەویم خستە ناو دەستت لەو کاتەی کە ئەم ئەموستیلەیەم لە ئەنگوستت دەکەم دادپەروەر بە. سوڵتان دیاری بابا تاهیری پاراست و بۆ هەر شوێنێك بچوایە لە دەستی دەکرد" (الراوندي، ١٣٦٣، ٩٩) هەروەها بڕوانە (ذبیح الله، ١٣٧٩، ٥٣٨). کەواتە بە گوێرەی ئەم سەرچاوە نزیکە مێژووییە بێت، (بابا تاهیر) لە کۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە.

هەرچی سەبارەت بە پێشناوی (بابا) بێت، ئەوا لە میتۆلۆجیای یارسانیدا، (بابا) فریشتە و پیاوچاکێک بووە لە ئەهلی هەق و یارسانەکان. بەکارهێنانی وشەی (بابا) لەپێش ناو بۆ ڕێبەرانی ئایینی یارسان و تەریقەتی سۆفیگەری (خەزنەدار، ٢٠٠١، ١٨٤) و هاوشێوەی وشەی (پیر) بەکاردەهێنرێت (بۆ نموونە لە ئایینی زەردەشتی و یەزیدیدا). ئەم بەکارهێنانە ئێستاش لە ئارادایە، (وەک: بابا شێخ، بابایەکی وەک فلانەکەس...)،

توێژەر (رەحیم لوقمانی) لە پێشەکی وەرگێڕانەکەی بۆ چوارینەکانی (بابا تاهیر) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە ئایینی مەسیحیشدا (پاپا) بەکاردەبرێت بۆ گەورە پیاوان و باوکانی کەنیسە. بەڵام لەناو فارس (بابا) زیاتر واتای باوک دەدات نەک کەسانی مەزن و پاک و رێنوێن و پیرۆز وەک لای (یارسان) (لوقمانی، ١٣٩٢، ٢).

به باوەڕی ئێمە، جیا لەو واتا و تێگەیشتنانە، دەشێ وەها لە پێشناوی (بابا) تێبگەین کە لە پەیڕەوانی سۆفیزمی یارسانیدا بۆ کەسانێک بەکارهاتووە کە تەرکی دونیایان کردووە و لە خەمی خۆشگوزەرانی و چێژە دنیاییەکاندا نەبوون، زیاتر گۆشەگیر و رەجاڵ بوون و حەزیان لە ناو و نێوبانگ نەکردووە، بۆ بەڵگەی ئەمەش، تا ئێستا لە کوردەواریدا بە کەسانێکی لەو شێوەیە کە حەز بە ناو و نێوبانگیان نەکرێ دەگوترێ (بابا-یەکی وەک فلان و فیسارە کەس، بابایەکی نەدیو و نەناسیو...)، کە بێگومان ئەم وشەیە لە زمانی کوردی و پەهلەوییەوە پەڕیوەتەوە نێو زمانی فارسیش و ئەوانیش بە هەمان مەبەست بەکاری دەبەن. ئەم جۆرە ناونان و بانگکردنەش تایبەتمەندییەکی سۆفییانە و هزرییانەیە، چونکە ئەوان هێندەی حەقیقەت و ژیانی ناخەکی (باطني)یان لا گرنگە هێندە بایەخ بە رووکەش نادەن، هەروەها دەشێ ئەم پێشناوە بۆ جۆرێک لە نەناسراوی و پێناسە نەکراویش بێت، چونکە سۆفیزم و عیرفان زیاتر دەچنەوە سەر زمانی ئاماژە (هێمایی) و تەنانەت لە هەندێ رێباوەڕ ناوی خوداش وەک ئاماژە و کینایە دەبەن و تەنها دەڵێن (ئەو)، بۆ ئەوەی دوور بن لە پێناسە و شوبهاندنی دنیایی و ئەزموونگەرایی کە خەڵکی عەوام و ئەهلی شەریعەت زیاتر رووی تێدەکەن. ئەم تێگەیشتنە زیاتر لە رێباز و قوتابخانەی (ئەسکەندەرانی فەلسەفی)دا، بە رابەرایەتی (پلۆتین/ئەفلۆتین) دەبینرێت، کە لە مێژووی فەلسەفەدا بە پلاتۆنیزمی نویێ ناسێنراون. باوەڕیان وایە خودا بە هەر شتێک پێناسە بکرێت یان بچوێنرێت هەڵەیە، چونکە خودا لەو شتە گەورەتر و هاوکاتیش دروستکەری هەر شتێکە.

هەروەها (عۆریان)یان پێگوتووە یان خۆی ئەم ناوەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە واتە (ڕووت، سادەپۆش، ڕووتەڵە) بە مانا عیرفانییەکەی بەکەسێك دەگوترێت پێشتر پلە و پایەکی ئیلاهی وەرگرتبێت (اذكايی، ١٣٧٥، ١٢٧)، هەروەك لەلای ئەهلی حەق

(یارسانەکان) دەڵێن 'بەشی درابێت'، واتە لە زاتی خوایی بەشی هەبێت، چونکە باوەڕی بە هزری سۆفیزم بووە بەتایبەت تیۆری (یەکێتی بوون- وحدة الوجود)، ئینجا هەمەدانیان پێوتووە چونکە لە هەمەدان ژیاوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و نێژراوە. لە شیعردا ناوی ڕاستەقینەی خۆی کە (تاهیر)ـە بەکارهێناوە (خەزنەدار، ٢٠٠١، ١٨٤).

هەرچی لەبارەی بەرهەمەکانی (بابا تاهیر)ەوەیە، سەرچاوەکان ئاماژە بۆ هۆزان و گوتەکانی دەکەن، ئەوەی بە ئێمە گەیشتووە و ساغکراوەتەوە و چاپکراوە بە دوو شێوەیە: هۆزان و گوتە کورتەکانی. کە لەلایەن (رازی) شاعیر و (قەدری یەڵدرم) و (ناسری حیسامی) بە شێوە زاری جیاوازی کوردی و ڕێنووسی جیاواز وەرگۆڕدراون. بەڵام سەرچاوەی بەردەست بۆ ئێمە بریتین لە هۆزانەکانی لەسەر شێوەی دووبەیتی (چوارینە) بۆ سەر شێوەزاری کورمانجی خواروو لەلایەن (رەحیم لوقمانی) وەرگۆڕدراون و گوتە کورتەکانیش لەلایەن (د. ابراهیم احمد شوان) وەرگێردراونەتە سەر زمانی کوردی و گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی زانست و شەریعەت، حیکمەت و حەقیقەت، سۆفیزم و ڕێباوەڕی (باباتاهیر)ن کە باس لە قۆناغەکانی سۆفیگەری دەکات و بابەتەکانی بریتین لە (زانین، مەعریفە، ئیلهام، کەرامات، نەفس، عەقڵ، سەماع، یاد، ئیخلاس، مانەوە لە پەرستگا). کەواتە نووسینەکانی (بابا تاهیر) جگە لە دوو بەیتییەکانی، هەندێك بەرهەمی بە عەرەبی و فارسیش نووسیوە وەك (کلمات قصار) یان (الاشارات) کە بریتین لە کۆمەڵێك پەند و وتە بەعەرەبی لەبارەی جیهانبینیی سۆفیزم، ئەم کتێبەی شیکردنەوە و لێکدانەوەی زۆری بۆ کراوە، کە یەکێکیان بە ناوی (الفتوحات الربانية في الاشارات الهمدانية) بەڵام ئەوەی ناوبانگی (بابا تاهیر)ی گەورە کردووە بریتییە لە هۆزانە دوو بەیتییەکانی (مقصود، ١٣٤٣، ٦٩٨).

هەردوو سەرچاوە هزرییەکەی (بابا تاهیر) لە هۆزان و گوتەکانی لەم توێژینەوەیەدا بەکارهێنراون. ئەمە سەرەڕای توێژینەوە و نووسین لە سەرچاوە و گۆڤارەکاندا لە نموونەی هەوڵە بە نرخەکەی (د. مارف خەزنەدار) بە ناوی (مێژووی ئەدەبی کوردی- حەوت بەرگ). هەرچەندە (بابا تاهیر) کورد بووە و بەو پێیەش دەبێ بە زمانی کوردی نووسیبێتی، هەروەک ئاماژە بەوە دەکرێت کە بە شێوەزاری گۆران و

لوڕی کوردی نووسیویەتی، چونکە (بە بڕوای مینۆرسکیی رۆژهەڵاتناس) خۆی لە هۆزی لوڕی کورد بووە، هاوکاتیش زمانی فەرمی یارسانەکان دیالێکتی (گۆران)ە، لەبەرئەوە نووسینەکانی شێوەزارێکی تێکەڵی نێوان گۆران و لوڕە، بەڵام بە هۆی دۆخی کورد و ناوچەکە و جیهان زمانی بەرهەمەکانی شێوێنراون بە تایبەت لەلایەن فارسەکانەوە و لە هەندێ سەرچاوەشیان (بابا تاهیر) لە نێو ئەدەبی فارسی هەژمار دەکەن! (لوقمانی، ١٣٩٢، ١١). سەرەڕای ئەوەش پێگە و رۆڵی (بابا تاهیر) لە سۆفیزمی ئیسلامی و قووڵبوونەوە لە ئایینی ئیسلامدا، وایکردووە عەرەبەکان بۆ خۆیانی کێش بکەن، وەک ئەو گێڕانەوەیەی (د. عبدالمنعم الحفني) لە کتێبەکەیدا (الموسوعة الصوفية)دا هێناویەتی سەبارەت بە هێز و کەراماتی (بابا تاهیر) کە لەلایەن موریدەکانییەوە گێڕدراوەتەوە، گوایە ئێوارەیەک لە نێو گۆمێکی شەختەبەندا ماوەتەوە، بەڵام بە گڕی ئیمانی توانیویەتی سەهۆڵەکە بتوێنێتەوە و سەرلەبەیانی وەک نوورێک دەرکەوێت، لەو حاڵ لێهاتنەدا گوتوویەتی ''ئێوارە کوردییانە و بەرەبەیان عەرەبییانە بووم/ امسيت كرديا و اصبحت عربيا'' (الحفنی، ٢٠٠٣، ٥٦). هەرچەندە دەربڕینی سۆفییانە و ئاماژەییانە لە دۆخی حاڵ لێهاتنی سۆفییەکان زۆر قورسە بە زمانی ئاسایی تەرجەمە بکرێت و لێی تێبگەین، بەڵام زۆر روونە کە (بابا تاهیر) کەسێکی دەمارگیر نەبووە، بەڵکو لە ناو سۆفی و عاریفاندا بە یەکێک لە هەرە جیاوازترینیان دادەنرێت لە داننان بە ئەوانیدی و بڕوابوونی بە جیاوازییەکان، ئەمەش لە چوارینەکانیدا رەنگیداوەتەوە و دواتر ئاماژەیان بۆ دەکەین.

**تەوەری دووەم: پەیوەندیی بابا تاهیر بە ڕێبازی (یارسان)ەوە**

**١- ئاینی (یارسان):**

لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا، هزری (ڕەنگدانەوەی خودا لە مرۆڤدا) یان تێخزانی گیانی خودا بۆ نێو گیانی مرۆڤ بڵاو بۆوە، بە تایبەت لەلای عاریفانی ئەو سەردەم، لە ناوچەی کوردستان و لوڕستان، کاتێ ئایینی (ئەهلی هەق) سەری هەڵدا. هەروەک لای گەورە پیاوانی عیرفان (بایەزید بوستامی، مەنسووری حەلاج، سوهرەوەردی، بابا تاهیری هەمەدانی، و عەینولقوزاتی هەمەدانیی و هتاد...) ئەم عاریفانە کۆك بوون لەسەر ئەو بیرۆکەیەی، کە عاریف دەتوانێت لە کۆتایی قۆناغی گەیشتن بە حەقیقەت واتە تەجەلی و تێخزان، بگات بە وەجد و شهود (بینینی زاتی خودا) و دۆخی توانەوە لەگەڵ خودا پلە و دۆخە باڵاکانی بوون لەگەڵ خودا، (من ئەوم و ئەویش من).

لە کۆتایی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچیدا، کەسێك بە ناوی (سوڵتان ئیسحاق) پەیدابوو، کە بانگەشەی بۆ هزری تەجەلی دەکرد و پەیڕەوانی خۆیشی فێری ئەوە دەکرد کە چۆن بتوانن بە قۆناغی تەجەلی دەست پێبکەن، بەم هۆیەوە بە پەیڕەوانی سولتان ئیسحاق گوترا (ئەهلی حەق). بەم شێوەیە ئایینێک لە کوردستان و لوڕستان پەرەی سەند کە دواتر پێیانگوترا (یارسان) واتە (دۆستی حەق/خودا) (یزدان پناه، ١٣٩٨، ٢٤٨-٢٥٠).

ئەم گرووپە ئایینیە، بەهۆی تایبەتمەندیی ئایینەکەیان و دەوروبەریانەوە بەشێکی زۆری بیروباوەڕ و مەراسیمەکانیان بەشێوەیەکی شاراوە و نهێنی ماوەتەوە، جگە لە خۆیان، خەڵکانی دی زۆر ئاگاداری ناوەرۆکی بیروباوەڕیان نەبوون. تا ئێستاش سەرجەم نووسین و گوتە و وێردەکانیان بەتەواوی چاپ نەکراون و تەنها بەشێوەی دەستنووس لای هەندێك توێژەران و خەمخۆرانی زمان و ئەدەبی کوردی پارێزراون و هێشتا زۆربەشیان ساغ نەکراونەتەوە، جگە لە (زەبووری حەقیقەت) کە بەشێک لە گوتە و سرووتە رۆحانییەکانی ئەم ڕێباوەڕەی لەخۆگرتووە.

دیاریکردنی مێژووی سەرهەڵدانی (ئایینی یارسان) ئاسان نییە، چونکە وەك دەردەکەوێت، ئەم ئایینە بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕبووە و پاشان پەرەی سەندووە و

شێوەی ئێستای وەرگرتووە، بەگشتی هەریەك لە قۆناغەکانیش تایبەتمەندیی خۆیان هەیە و بە ڕوونی ناتوانرێت وەک خاڵی دەسپێکی مێژووی ئایین و ڕێبازەکە دابنرێن و بە یەقینەوە وەك سەرەتای مێژووی یارسان یان (ئەهلی هەق و کاکەیی) هەژمار بکرێن.

یەکێك لە نووسەر و پێڕەوانی ئەم ئایینە بە ناوی (نوور عەلی ئیلاهی) سەرەتای مێژووی (یارسان) بۆ پەیمانی (ئەلەست/ألست)ە دەگێڕێتەوە، بەگوێرەی (قورئانی پیرۆز) (سورەتی الاعراف، ئایەتی ١٧٢) پەیمانی ئەلەست بریتییە لە پەیمانی خودا و نەوەی ئادەمی، کە خودا خۆیانی کردووە بە شاهید بەسەر بەڵێنەکەی خۆیانەوە کە بریتی بووە لە باوەڕیان بەڕبووبییەت و بەدیهێنەری و پەروەرێنیی خودا و خەڵقیان لە تۆوی پشتی ئادەم و ئەوانیش بە شێوەی (قالوا بلی شهدنا) وەڵامیان داوەتەوە، وشەی (ئەلەست) کە لەلای ئەهلی تەسەوف شێوەی ناوی وەرگرتووە، لە بنەڕەتدا نیوە ڕستەیەکی پرسیارییە و لە ئایەتەکدا بە (ألست بربکم) هاتووە.

لەبارەی بنەچەی ئایینی (یارسان)ەوە بیروڕای جیاواز هەیە، هەندێك لایان وایە ئەم ئایینە پاشماوەی بیروباوەڕی کۆنی کوردانی ئێرانییەکانە، هێندێکیش ڕەگی بەشێك لە بیرو بۆچوونەکانیان دەگێڕنەوە بۆ ئایینی مەسیحی و یەهوودی، تەنانەت بوودایی و هندۆسی. بەڵام ئەوەی کە روونە لەم ئایینەدا کاریگەریی سۆفیگەری و عیرفان بەتەواوی دەردەکەوێت. هەندێك لە پەیڕەوانی (یارسان) یان کاکەیی نەك هەر دان بەوەدا دەنێن کە موسڵمانن، بەڵکو بەرگری لە موسوڵمانبوونی خۆیان دەکەن و بەرپەچی ئەوانە دەدەنەوە کە وەك لادەر و بیدعەتکار لێیان دەڕوانن. نووسەرێکی وەك (د. محەمەد عەلی سوڵتانی)، بە جەختکردنەوە داکۆکی لەوە دەکات کە بیروباوەڕی (یارسان) لە ئیسلامی عەلەوییەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام هەندێکی تریان بە توندی ئەوە ڕەتدەکەنەوە کە بەموسوڵمان هەژمار بکرێن (جووتیار نەریمان). دەکرێت بگوترێت، ئایینی (یارسان) یەکێکە لە ئایینە رۆحییەکان کە زیاتر بایەخ بە ناوەوە و شوناسی ناخەکی دەدات و هێندەی پەیڕەوی لە حیکمەت و حەقیقەت دەکات هێندە ناپەرژێتە سەر شەریعەت، بەڵام وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا لە رەوتی ستەم و مێژووی پەرەسەندنی ئایینیدا، هێندێ لە ئایینەکان لە پێناو مانەوە و

پاراستن چوونەتە ژێر باری بە (مەزهەب بوون) و لای خەڵک جەوهەرە سەربەخۆیەکەی خۆیان ون دەکەن، هەروەک شیعەگەری لای (یارسان و کاکەیی و هەق) و سوننەگەری لای (یەزیدی).

**٢- سۆفیزم لە (یارسان)دا**

سۆفیگەری یان تەسەوف لە ئایینی یارساندا بە روونی دیارە، دیارترین جیاوازیی ئەم ڕێباوەڕە لەگەڵ ڕێباوەڕ و ئایینزا ئیسلامییەکان بریتییە لە بیروباوەڕی عیرفانی و تەئویلی ناخەکییانەی دەقە پیرۆزەکان (مردانی، ١٣٧٧، ٨٩). هەروەها هاوبەشییەکی زۆر لەنێوان میتۆلۆژیای یارسان و تەسەوفی ئیسلامیدا هەیە (خەزنەدار، ٢٠٠١، ١٨٧)، ئەو چیرۆکە ئەفسانەییانەی کە لە نووسراوەکانی ئەهلی هەقدا سەبارەت بە سەرەتای بەدیهاتنی بوونەوەر بەرچاو دەکەون، لە کەلەپووری نووسراوی ئەهلی تەسەوفدا زۆرن، دەستپێکردنی چیرۆکی سەرەتای بەدیهاتن لەکتێبی (تذکرە الاعلی) دا وەبیرخەرەوەی هەمان چیرۆکە کە لە کتێبی سۆفییانەی (مرصاد العباد)ی (نجم الدین رازی)دا هاتووە، بوونی ناوی گەورەپیاوانی تەسەوف وەك (حەسەنی بەسری، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، ئەبو حەسەنی خەرقانی، عەبدولقادری گەیلانی، و جونەیدی بەغدادی و هتاد... )، هەروەها بوونی چەندین زاراوەی سۆفییانە لەلای ئەهلی هەق و هاوشێوەیی زۆربەی ئاداب و تەوحیدی لەبیروباوەڕی یارساندا.

پێشتریش ئاماژەی بۆ کرا، کە ئایینی (یارسان) و هاوشێوەکانی زیاتر جەخت لەسەر رۆحانییەت و حیکمەت و حەقیقەت و پاکبوونەوە و دەروشانەوەی ناخەکی دەکەنەوە، لەسەر ئەم بنەمایە، پەیوەندیشیان لەگەڵ خودا پەیوەندییەکی ناخەکییە، کە چەقی پەیوەندییەکە دەبێتە دڵ و دەروون، بەم جۆرەش لەم جۆرە ئایین و تەفسیرانە بۆ ئایین ڕێگە بۆ سۆفیزم و عیرفان خۆش دەبێت و پەیڕەوانی زیاتر لە نێو نەریت و هەوا و حاڵی سۆفییانە دەژین و پەیڕەوی لێدەکەن.

**٣- پەیوەندیی (بابا تاهیر) بە ئایینی یارسانەوە**

(بابا تاهیر) لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی هزری سۆفیزم و سۆفیگەریدا ژیاوە، بە تایبەت پەرەسەندنی تێگەیشتن و راڤەی ئایین بە خۆشەویستی و عەشق بەرامبەر

بەخودا، لە سەردەمی ژیانی (بابا تاهیر)دا ئایینی ئەهلی هەق (یارسان) زیاتر وەکو ڕێبازێکی موسوڵمانان خۆی دەنواند، کە پێدەچێت بە هۆی سەرکوت و مەترسییان بووبێت لە شەڕ و لەناوبردنیان کە بەدرێژایی سەردەمەکان، یارسانەکان بەربەرەکانی دەکران بەتایبەتی لە سەردەمی عوسمانییەکان بە (غولاتی شیعە) و (باتینی) و (علی ئیلاهی)ش ناویان دەبرا (خەزنەدار، ٢٠٠١، ١٨٧).

بێگومان هەوای ئایینی یارسان کە تێکەڵ بە سۆفیزمی ئیسلامی بوو، نەك تەنیا لە هۆزانەکانی بابا تاهیرا دەردەکەوێت، بەڵکو خۆشی ئەندامێکی گەورە و خاوەن پایە و پلە و مەقامێکی تایبەتی بوو لە ناو پەیڕەوانی ئایینی یارسانەکان. کە زمانی ڕەسمییان دیالێکتی (گۆران)ی زمانی کوردییە. بێگومان (بابا تاهیر) کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەم تەوژمە ئەو سەردەم بە تایبەت لەلای ئێرانییەکان سۆفیزم وعیرفان مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە، دیداری (شاه خوە شین) و (بابا تاهیر) و میوانداریکردنی (بابا تاهیر) لە (شاه خوە شین) لەماڵەکەی خۆیدا، سەرەتای ئاشنایەتی (بابا تاهیر) بوو لەگەڵ ئەهلی یارسان، هەروەها هاوسەرگیریی (بابا تاهیر) لەگەڵ دڵبەرەکەی خۆی (فاتیمە لوڕە) بە سەرەتای ئاشنایەتی ئاماژەی پێکراوە (محمود، ٢٠١٨، ص ١٨٠)، هەروەها لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا (بابا تاهیر) چەند شیعرێکی بە شێوەی گۆرانیی پەتی داناوە و ناردوویەتی بۆ (هەقەکان) بۆئەوەی کە لە بیروباوەڕی یەك بگەن و وەک وێرد بەکاري بێنن، ئەوانیش بخاتە سەر ئەو ڕێگەیە کە خۆی لەسەری بووە. هەروەها ئاشنایەتیی نێوان (بابا تاهیر) لەگەڵ (ئەهلی هەقە)کاندا ئەوە بووە کە ئەوان (بابا تاهیر)یان بە فریشتەی چوارەمی (خشین) داناوە کە لە لوڕستان بووە. لەم ڕوانگەیەوە (یارسانەکان) (بابا تاهیر) بە فریشتەی چوارەم و ڕێبەری خۆیان دەزانن (خەزنەدار، ٢٠٠١، ١٨٠).

لەم ڕوانگەیەوە (بابا تاهیر) پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەبووە لەگەڵ (یارسان) و یەکێك بووە لە یارسانە موسڵمانەکان بە بەڵگەی ئەوەی لە دووبەیتییەکانی زۆر سوودی لە ئایەت و چەمکەکانی (قورئانی پیرۆز) وەرگرتووە و بەکارهێناوە، و ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەی پەیامبەری ئیسلام ڕەنگیداوەتەوە لەناو دووبەیتییەکانیدا، دەکرێ وەك نموونە ئاماژە بەم دوو بەیتییەیە بکەین.

"مو از قالوا بلی تشویش دیرم گنه از برگ و باران بیش دیرم
**اگر لا تقنطوا دستم نگیر مو از یاویلنا اندیش دیرد**[٣]"

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٥٩)

لەم چوارینەیەدا، (قالوا بلی) ئاماژەیە بۆ ئایەتی ژمارە (١٧٢)ی سورەتی (الاعراف) "الست بربکم قالوا بلی". هەروەها (لا تقنطوا) ئاماژەیە بۆ ئایەتی ژمارە (٥٣)ی سورەتی (الزمر) "لا تقنطوا من رحمة الله". هاوکاتیش (یا ویلنا) ئاماژەیە بۆ ئایەتی ژمارە (٥٢)ی سورەتی (یس) "قالوا یا ویلنا من بعثنا من مرقدنا".

## باسی دووەم: هزری سۆفیزمیی (بابا تاهیر)

### تەوەری یەکەم: سۆفیزم لای (بابا تاهیر)

بەرهەمەکانی (بابا تاهیر) رەنگدانەوەی بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیەتی سەبارەت بە گەردوون و مرۆڤ و خودا، زۆر بە روونی جیهانبینیی ئەم زاتە لە بەرهەمەکانیدا بە تایبەت لە دوو بەیتییەکانیدا رەنگیداوەتەوە، کە هەموو ئەمانە رەنگدانەوە و شێوەی بیرکردنەوەی ئەم زاتە دەردەخات بە تایبەت تێڕوانینی لە بارەی هزری سۆفیزمەوە، و رێچکەی (بابا تاهیر) رێچکەیەکی عیرفانی و دەروێشیزمییە، هەوڵیداوە حاڵەتە ناخەکی (قەلبی) و عیرفانییەکانی خۆی بخاتەڕوو، و بە زمانێکی زۆر سادە و پڕ مانا و کاریگەر لەسەر (دڵ) دەربڕێت. کەواتە خامەی ئەو بۆ (دڵ) بووە نەك رازاندنەوەی وشە و کێشەی کێش و سەروای شیعری، عاشقی حەقیقەت و مەعریفەیەکی ناخەکی (قەلبی) بووە بە مەبەستی گەیشتن بەمەعشووقی راستەقینەی خۆی و توانەوەی لە نێو ئەم ماشووقەدا .

(بابا تاهیر) لەبارەی پێناسەی سۆفیگەرییەوە دەڵێت: "التصوف حیاة بلا موت، وموت بلا حیاة". واتە "سۆفیگەری ژیانێکی بێ مەرگە، و مەرگێکی بێ ژیانە". هەروەها سۆفیگەری بە هەژاری و پشتکردنە سامان و ماڵی دونیا و دەزانێت (شوان، ٢٠٠٦، ٢٤٦). لێرەدا، (بابا تاهیر) لە قۆناغەکانی تەسەوفدا بە تۆبە و زوهد و خۆپارێزی و خۆپاککردنەوە لە مادیاتی دونیا و روو وەرگێڕان لێیان دەست پێدەکات (هەمان، ١٧٤)، و روودەکاتە جیهان و بوونی حەقیقی لە حەقی رەها (خودا) تاکو دەگاتە پلەکانی

(فەنا) و (بەقا) و (وەجد و شهود) لە زاتی ئەودا (هەمان، ٨٧، ١٢٧). هەروەها لە بەشی (٤٣)ی کتێبی (گوتە کورتەکان)دا بە (٩) نۆ گوتە باس لە تەسەوف دەکات، هەرچەندە هەر (٥١) پەنجاویەک بەشەکەی کتێبەکە (کە لە ٤٢١ گوتە پێکهاتووە) تەرخانە بۆ بابەتی سۆفیزم و رۆحانییەت و قۆناغ و چەمکەکانیان. چونکە تەسەوف بۆ ئەو بریتییە لە پانتاییەکی فراوان کە بە (دەریا) ئاماژەی بۆ کردووە. وەک دەڵێت:

**"تو خود گفتی که مو ملاح مانم**
**بهـ آبدید کانکش تیبرانم**
**همی ترسم که کشتی غرق وابو**
**درین دریاي بیپایان بمانم**[٤]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٦٨).

به بڕوای (بابا تاهیر) سۆفیزم زانستێکە لە دەروونەوە پەیدا دەبێت و دواتر لە رواڵەتدا دەردەکەوێت، واتا لە دڵەوە سەرەتا دەگرێت و بەسەر جەستە و رووکەشدا رەنگدانەوەی دەبێت (شوان، ٢٠٠٦، ٢٤٨). لە سۆفیگەریدا پراکتیزەکردنی رادەبەدەر و زیادەڕەوی ئەرکە ئایینییەکان و سازشکردن و گونجان لەگەڵ شەریعەتدا دەبینرێت، هەروەها بڕینی قۆناغەکانی وەك (تۆبە، زانین، بێ نیاز، توحید، هتاد...) پابەندە بەخانەقا و رابەر و پرۆگرامەکانیان، راهێنانی دەروونی و خۆ پاککردنەوە و پەروەردەکردنی و زاڵبوون بەسەر حەز و ئارەزووەکانی و پاراستنی خۆی لە خراپەکانی کۆمەڵگا، بە مەبەستی گەیشتن بە پلەی عیرفان، بۆیە عیرفان قۆناغێکی رووحی و هزرییە پاش قۆناغی زوهد و دەروێشگەری و سۆفیگەریی دێت، چونکە عیرفان لە ئەنجامی رامان و بیرکردنەوەیەکی قووڵی ناخ و دەروون و دڵ و رۆحانییە بۆ تێکستە ئایینییەکان (محمود، ٢٠١٤، ١٢٠). دەکرێ عیرفان لەم رستەیەدا کورت بکەینەوە (خۆناسی و خوداناسی) و لەو قۆناغەدا پرۆسەی بوون بە مرۆڤ بە واتای وەردەکەی لە کردار و جیهانبینیدا تەواو دەبێت و مرۆڤ دەگاتە ئارامیی رۆحی و کامەرانی لە ژیاندا. ئەویش بە نواندنی عیشق و عاشقییە بۆ هاوچەشنەکەی. لەم روانگەیەوە هزری سۆفیزمیی (بابا تاهیر) ئەگەر بە وردی سەیری بکەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن (بابا تاهیر) لە سۆفیگەرییەوە نەخشە رێگایەك بنیاد دەنێت بۆ گەیشتن بە عیرفان

بە تایبەتیش تیۆری (یەکێتی بوون). کەواتە هزری سۆفیزمی لای (بابا تاهیر) لە سۆفیگەرییەوە دەست پێدەکات لە یەکێتی بووندا کۆتایی پێدێت .

یەکێتی بوون (وحدة الوجود) ڕێبازێکی عیرفانییە، جەخت لەسەر یەکتایی خودا و بوونەوەر دەکاتەوە بە میتۆدێکی فەلسەفی و لەسەر بنەمای ڕۆشنایی و بینینی قەلبی (کشف و شهود). واتە بوون یەکەیەکی بەستراوە و یەك یەکەیە. یەکبوونی ڕاستەقینە هەیە ئەویش بوونی خودایە، بوونەکانی تر ڕاستەقینە نین بەڵکو ڕەنگدانەوەی بوونی خودان (دینانی و پندری ١٣٨٩، ٨-١٠)، ئەم هەموو گەرد و ئەتۆمی جیهان و گەردوون رووکەش و ڕەنگدانەوەی ڕووی خودان، ئەهلی عیرفان لەسەر ئەو بڕوایەدان یەکایەتی (وحدة) لە نێو زۆرێتی (کثرة) دایە، هەروەها پێیانوایە زۆرێتی کۆدەبێتەوە دەبێتە یەکێتی بوون، ئێمە لە خواوە سەرچاوەمان گرت و دووبارە دەگەڕێینەوە بۆ خودا، هەروەها هەموو ڕووبارەکان لە کۆتاییدا لەگەڵ دەریا دەبنەوە بەیەك. لەکاتێکدا سەرچاوەی ڕووبارەکان دەریا بووە هەروەك چۆن ئاو لە دەریاوە دێت و دەڕژێتە نێو ڕووبار و دواتر بڵاو دەبێتەوە و دووبارە دەڕژێتەوە نێو دەریا، دڵۆپە و دەریا یان شەپۆڵ نموونەی دیار و ناسراوی ئەهلی دڵن بۆ بابەتی یەکێتی بوون، چۆن تیشکی خۆر بەر دەریا دەکەوێت و ئاو دەکات بە هەڵم و هەڵم بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە، دواتر هەڵمەکان بە هۆی ساردبوونەوە چڕ دەبنەوە و لە شێوەی دڵۆپەی باران دەکەونە سەر زەوی، ڕووبار و جۆگەلەیان لێوە پێکدێت، لە کۆتاییدا ئەم دڵۆپانە دەگەڕێنەوە بۆ دەریا. (بابا تاهیر) کە زۆر بە ڕوونی ئاماژەی بە یەکێتی بوون کردووە لە دوو بەیتییەکانیدا. ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ژیاندۆستیی سۆفی، کە ئاو وەک بنچینەی ژیان و شتی زیندوو لە دەریای بەریندا دەبێتە ئاماژە، تا لەو بەرینییەدا خۆی ون بکات و بوونی ئەبەدی بۆ بمێنێتەوە، وەک چۆن لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئاو بنچینەی هەر شتێکی زیندووە (وجعلنا من الماء كل شيء حي، الانبياء، الآية ٣٠).

بە گشتی (بابا تاهیر) لە هۆزانەکانیدا لە هەوڵی یەکێتی بوونە و بە شەیدایی و پەرێشانییەوە بە دوایدا دەگەڕێ، لەڕێگای قۆناغەکانی سۆفیگەرییەوە و هەنگاونان پلە بە پلە بەتایبەت قۆناغی مەعریفەت، شەیدایی، میهرەبانی، وەجد و ڕۆشنایی و

شەوق، عەشق، بۆگەیشتن بەم یەکێتی بوونە. ئەو ئیستاتیکا و جوانی لە هەموو شتێك دەبینێت، بۆیە دونیای وەك تابلۆیەکی جوان دەبینێ کە لەلایەك شێوەکاری راستەقینەی بوونەوە کێشراوە. هەروەک ئەوەی خودا بە نێو بوون و گەردووندا رژابێت و هەر شتێک بەشێک لە بوون و جوانی ئەوی بەرکەوتبێت، هەروەك خۆی ئاماژە بەم حەقیقەتە دەکات و دەڵێت:

**"به صحرا بنگرم صحرا ته وینم — به دریا بنگرم دریا ته وینم**
**بهر جا بنگرم کوه و در و دشت — نشان از روی زیبای ته وینم[٥]**

" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٧٠)

لێرەوە، (بابا تاهیر) زۆر چێژی لە روانین لە سروشت و گەردوون بینیوە، زۆربەی کاتەکانی بە گەڕان بە ناو سروشت و گەڕیدەیی بەسەر بردووە، ئەمە بە روونی لە هۆزانەکانیدا دەردەکەوێت، کە بەشێکی زۆریان بۆ وەسفی عاریفانەی سروشت تەرخانکراون. بە بڕوای ئێمە هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو پێیوابووە خودا لە هەموو شوێنێکە و تەنها بە توانەوە و هەڵاتنی نووری ئەو لە دڵدا دەتوانرێت ببینرێت، ئەمەش دوای بڕینی قۆناغ و دۆخ و پلەکان. لەم هۆزانە دوو بەیتییەدا دەڵێت:

**"چه خوش بی وصلت ای مه امشبک بی**
**مرا وصل تو آرام دلک بی**
**زمهرت ای مه شیرین چالاك**
**مدامم دست حسرت بر سرك بی[٦]"** (بابا طاهر، ١٣٧٤،١٠٨)

بۆ دەربڕینی ئەو چێژ و شادییەی لە دیداری یاردا، لە حاڵی وەجد و شهودی ئیلاهیدا دەڵێت:

**"خوش آنساعت که دیدار ته وینم — کمند عنبرین تار ته وینم**
**نوینه خرمی هرگز دل مو — مگر آن دم که رخسـارت ته وینـم[٧]"**

(بابا طاهر، ١٣٧٤، ٧٠)

لەم دۆخەدا، کە سۆفی و عارف لەگەڵ خودا و یار و ماشووقی خۆیان تێکەڵ دەبن و لەیەکدا دەتوێنەوە، دنیای ماددی و جەستەیی لەبیر دەکەن و (حەلاج) ئاسا

باکیان بە ئازاری جەستە نامێنێ، چونکە بنچینەی عیرفان و سۆفیزم پاک و باڵایی ڕۆح و لە یادکردنی جەستەیە، بۆ ئەمەش (بابا تاهیر) دەڵێت:

**"بود درد مو و درمانم از دوست**
**بود وصل مو و هجرانم از دوست**
**اگر قصابم از تن واکره پوست**
**جدا هرگز نگردد جانم از دوست**[٨]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٢٨)

**تەوەری دووەم: چەمکە بنەڕەتییەکانی سۆفیزم لای (بابا تاهیر)**

سۆفیزم و عیرفان ژمارەیەکی زۆر چەمک و ئاماژە لە خۆ دەگرن، کە واتا و مەغزای فراوان و جیاواز دەبەخشن، سۆفی و عاریفانیش چەمکەکان لە گوتە و شەتەحات و نووسینەکانیان بەکاردەبەن، هەرچەندە (بابا تاهیر)یش وەک یەکێک لەوان زۆرینەی چەمکەکانی بەکارهێناوە، بەڵام توێژینەوەکە تەرخان نییە بۆ زاراوەسازیی سۆفیزم و وەک کارێکی فەرهەنگی و مەعریفی خەریکبوون و توێژینەوەی دیکەی پێویستە، لەبەر ئەوە لێرەدا تەنها وەک نموونە چەند چەمکێک و واتا و ڕەهەندەکانی لای (بابا تاهیر) دەخەینە ڕوو کە وەک چەمک و زاراوەی (چەتری) دەتوانن چەندان چەمکی دیکە لە خۆ بگرن، ئەگەر نا دەتوانرێت فەرهەنگی سۆفییانەی (بابا تاهیر) وەک پرۆژەیەکی ئەدەبی، فیکری، مەعریفی و عیرفانی کاری لەسەر بکرێت و بخرێتە بەردەست خوێنەر و توێژەری کورد.

**١- دڵ**

لە فەلسەفەی عیرفاندا، دڵ شوێن و پێگەی تایبەتی خۆی هەیە و سەرچاوەی مەعریفەی پەتی و حەقە، دڵ بە سەنتەری مرۆڤ هەژمار دەکرێت لە دۆخەکانی زانین و ناسین و گەیشتن بە حەقیقەتی ڕەها، لەبەرئەوە (بابا تاهیر) بایەخێکی یەکجار زۆری پێداوە بە تایبەت لە دوو بەیتییەکانیدا. بەتێگەیشتنی ئێمە واباشترە بە دیوانی (بابا تاهیر) بڵێین (دڵنامە)، بە جۆرێک زیاد لە (**٣٠٠**) سێ سەد جار ئاماژە بۆ دڵ کراوە. دڵ لەلای شاعیر مەڵبەندی عیشق و موحیبەتە، مەنزڵگای دۆست و

گەوهەرێکی مەلەکووتییە، بە تەنها پارچە گۆشتێکی بێبایەخ نییە. دڵ هێز و بوونێکی پیرۆزە، شوێنی ماشووق و نزیکترین بەشی مرۆڤە لە خودا، شوێنی بینینی خودا و یەکبوون و ئاوێتەبوونە لەگەڵ ماشووق/خودا.

دڵ شوێنی (وەجد)ە، وەجدیش نووری خودایە لە دڵ و دەروونندا، یان (نارالله)یە و دڵێک نوور و ئاگری خوایی تێدا نەبێت شەیتان بە تاریکی پڕی دەکاتەوە (شوان، ٢٠٠٦، ١١-١٢). هەر بە وەجد و نووری خوداش دڵ دەتوانێت خۆی لە پیسییەکانی دنیا و جەستە و مادییات رزگار بکات و پەیوەندییان لەگەڵ بپچڕێنێت و تاوەکو رۆح زیاتر باڵا بکات و بدرەوشێتەوە (هەمان، ٨٧). دڵ وەک سەرچاوەیەکی ناخەکی و کانییەکی شاراوە توانستی پەیبردنی بە رێگای حەق و گەیشتن پێی هەیە، لە کاتێکدا زمان ئەو توانستەی نییە، وەک ئەوەی زمان درۆ بێت و دڵ راست و دروست بێت، لێرەدا ئاماژە بۆ جۆش و خرۆش و کوڵانی ناخەکی سۆفی و عاریفانە لە پەیوەندییان لەگەڵ خودادا (هەمان، ١٩٨) وەک ئەوەی زمان پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان رێکبخات و دڵیش تایبەت بە خودا. هەروەك بابا تاهیر خۆی ئاماژەی پێدەکات کە لە حاڵەتی توانەوەی دڵ و دڵبەر و دڵدار لە یەکبووندا بە جۆرێك کە نایزانێ کامەیان ئەوی تریانە، ئەمەش توانەوە (حلول) و فەنا و بەقا و خۆ بزرکردن لەوی دیکەدا دەگەیەنێت، فەنابوونی سۆفی بە دڵ دەبێت و بە سێ شێوەی (کردەوەیی، سیفەتی، خودی) (هەمان، ٢٣١) ئەمانەش ئەستەمە زمان دەروەستیان بێت و مەگەر تەنها نووسینێکی بێ گیان بن. ئەمە نامۆترین قۆناغە و بوونە بە یەک لەگەڵ ئەویدی. (بابا تاهیر) دەڵێت:

**"اگر دل دلبر و دلبر کدام است　　وگر دلبر دل و دلرا چە نام است**
**دل و دلبر بهم آمیتە وینم ندونم　　دل کە و دلبـــر کدام اســـــــت"[9]**

(بابا طاهر، ١٣٧٤، ٢٧)

لێرەدا (بابا تاهیر) ئاماژە بە حەقیقەتێکی دڵ دەکات، کە عاریف لەم حاڵەتەدا خووڕەوشت و خەسڵەتەکانی خۆی دادەماڵێت و خوو بە خەسڵەت و سیفەتەکانی (ئەو/خودا) دەگرێت و دەگاتە دوا پلەی سۆفیگەری کە قۆناغی نەمان/لەبەینچوون

(فنا)یە ئیتر بۆی جودا ناکرێتەوە کە عاشق کێیە و ماشووق کێیە (کاکەیی، کوردیپیدیا).

بابا تاهیر ئاماژە بەشەیدایی و وابەستەبوون بە دۆستی راستەقینە، کە خودایە، دەکات. کە ئەم وابەستەگییە مایەی ژیان و بەختەوەرییە و پچڕانیش لە دۆست و ماشووق و دوورکەوتنەوە لێی مایەی ژان و دەرد و بەدبەختییە، چونکە ژیانی راستەقینە لەم جیهانە لەگەڵ دۆستە، ئەگەر ژیان خاڵی بێت لەم وابەستەگی و پەیوەندی و تێکەڵاوییە، ئەوا مەرگ زۆر باشترە. لەبەرئەوەش بوو گوتی قەساب جەستەم پارچەپارچە بکات باشترە نەک دڵم وابەستە نەبێت بەخودا، واتە سەرچاوەی خۆشی و ناخۆشی لەم جیهانە وەصل بوون و نەبوونە بە خودا. ئازار لە پچڕانی پەیوەندی و چێژیش لە پەیوەندییەکەدایە.

هەروەها (بابا تاهیر) جیا لە چوارینەکانی، لە کتێبی (گوتە کورتەکان)یشدا لە زۆر جێگە ئاماژە بە پێگە و گرنگی و ئەرکی دڵ دەکات و لە یەکێک لە پێناسەکانیدا لە بارەی دڵەوە دەڵێت: "القلب میزان الحق" واتە "دڵ تەرازووی حەق/حەقیقەتە" (شوان، ٢٠٠٦، ٦٦). کە ئەگەر وردبوونەوەی زمانەوانی و زاراوەیی، هەروەها ئاماژەناسی سۆفییانە تەنها لەم پێناسەیەدا بکرێت، ئەوا هەر سێ چەمکی (دڵ، تەرازوو، حەق) واتا و لێکدانەوە و رەهەندی جۆر بەجۆر لە خۆ دەگرن.

بە بڕوای (بابا تاهیر) دڵ دەتوانێت رێگەی حەق بدۆزێتەوە و پێی بگات و پلەو پێگەی مرۆڤ و عاریف باڵا بکات، بە گڕی عەشق بسوتێ و کڵپە بسێنێ تا گەوهەری وجوودی تێدا بدرەوشێتەوە، کە زۆربەی هۆزانەکانی لەبارەی دڵ و دڵی شەیدا بە یار ئاماژەیە بە ئاشوفتەگی و سووتان و گڕ و ئاگر و رۆشنبوونەوەی وەک کوورە (بۆ ئەمەش دیوانەکەی نموونەی زۆری تێدان). بەڵام گەر دڵێک رەش بێت و بە نووری حەق رووناک نەبێتەوە، هەمیشە دەبێتە مایەی دەرد و ئازار و هیچ چێژ و بەرهەمێکی جاویدانی لە عیشقی ئیلاهیدا ناچنێتەوە. کەواتە دەشێت دڵی دوور لە عیشق و وەسڵی یار ببێتە مایەی ئێش و ئازار، وەک لەم نموونە شیعرییانەدا دەردەکەوێت:

**"دڵێ ئەشقت نەکا، نرخێ نەهێنێ**
**دڵم ناوێ کە ئەشقی تۆی نەمێنێ**
**ئەوەی ئێخە دڕاوی ئەشقی تۆ بێ**
**هەزاران موددەعـــی دنیا دێنــــێ"** (لوقمانی، ١٣٩٢، ٧٤).

**"خدایا داد از این دل داد از این دل**
**نگشتم یک زمان من شاد از این دل**
**چو فردا داد خواهــان داد خواهنــد**
**بر آرم من دو صد فریاد از ایــن دل**[١٠]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٤٨)

**"بڕۆم بێژم کە سۆزباری بکا دڵ** **لە بەختم شیوەن و زاری بکا دڵ**
**ئەتۆ یارێ پەیا ناکەی وەکو من** **کە بۆ گیان و دڵت یاری بکا دڵ"**

(هەمان، ٣٤).

**"دلا غافل ز سبحانی چه حاصل**
**مطیع نفس و شیطانی چه حاصل**
**بود قدر تــــو افــزون از ملایک**
**تو قدر خود نمیدانی چه حاصل**[١١]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٥١)

**٢- عەشق**

عەشق پێناسە ناکرێت، چونکە بابەتێکی ئەزموونی و کەسییە پەیوەندی بە جیهانی سۆز و چێژەوە هەیە، بابەتێکی زانستی و هەواڵی نییە، چونکە عاشق لە بارودۆخێکی تایبەتدایە، واتە حاڵ و هەوای عاشق. لەبەرئەوە هەر شتێك لەبارەی عەشقەوە بگوترێت لە رووی زانستییەوە بایەخی نابێت، جگە لە عیرفان و خوداناسی و دانایی سۆفییانە. کەواتە باشترین پێناسە بۆ عەشق ئەوەیە کە پێناسە ناکرێت و هەر هەوڵێکیش بۆ پێناسەکردنی کات بە فیڕۆدانە. عاریفەکان گوتوویانە هەرکەسێك بیەوێت پێناسەی بکات ئەوە لە عەشق تێنەگەیشتووە، بۆ دەرککردنی عەشق یەك رێگە هەیە ئەویش عاشقبوونە، ئەمەش بە واتای ئەوەی عەشق پێناسە مەکەن بەڵکو

ئەزموون و پراكتیزەی بكەن. هەرچییەك لەبارەی عەشق گوترابێت تەنها وەسفی حاڵ و هەوای عاشق بووە دەكرێ بڵێین عەشق وەسف دەكرێت بەڵام پێناسە ناكرێت، لەحاڵێكدا كۆمەڵە چەمكێكە و چەند واتایەك لە نێو بازنەی عەشقدا دەخولێنەوە، وەك (مەی، وابەستەگی، ویساڵ و فیراق، بێ هۆشی، مەستی، نەمان و فەنا، بەقا و مانەوە، توانەوە و هتاد...). (بابا تاهیر)یش لە زۆربەی دوو بەیتییەكانیدا ئاماژەی بۆ كردووە، هەروەك دەڵێت:

**"بود درد مو و درمانم از دوست　　　بود وصل مو و هجرانم از دوست**
**اگر قصابم از تن واكره پوست　　　جدا هرگز نگردد جانم از دوست[١٢]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٢٨).

**"اگر آئی بجانت وانواجم　　　وگر نائی به هجرانت گداجم**
**ته هر دردی كه داری بر دلم نه بمیرم یا بسوجم یا بساجم[١٣]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٥٤).

**"زدست عشق هر شو حالم این بە　　　سـریرم خشت و بالینم زمین بی**
**خوشم این بی كه موته دوست دیرم　　　هر آن ته دوست داره حالش این بی[١٤]"**

(باباطاهر، ص ٣٦٤).

**"ز عشـقت آتشـی در بو دیـرم　　　در آن آتش دل و جان سوته دیرم**
**سگت ار پا نهد بر چشمم اي دوست　　　بمژگان خاك راهش رو ته دیـرم[١٥]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٥٩)

هەروەها (بابا تاهیر)، لەبارەی خوشەویستی وعیشقەوە ئاماژە بەوە دەكات كە خوشەویستی خودا لەنێودڵی مرۆڤدا بوونی هەیە و شاراوەیە، بۆیە عاریف هەندێكجار بێ ئەوەی هەست بە خۆی بكات دەست دەكات بەمەدح و سەنای ئەو (مقصود، ١٣٤٥، ٨٢) بە تایبەت لەكاتی مەستیدا. كەواتە خوشەویستی وعیشق پلە وپایەكی بەرزی هەیە لە هزری (بابا تاهیر)، هەندێك گوتوویانە پێویستە بە دووبەیتیەكانی (بابا تاهیر) بڵێین (عیشقنامە). لە راستیدا هەموو قسە و باس و شیعرەكانی رەنگدانەوەی عیشقن بۆ خودا، ئەو بۆ ماشووقی خۆی شیعری زەمزەم كردووە، وەك دەربڕینێك لە شەیدایی و مەست بوونی عاشق كە تیایدا ژیاوە.

کاتێك عاریف خوشەویستەکەی خۆی دەدۆزێتەوە، لە چاوی ئەو بادەی مەی نۆش دەکات. هەر بۆیە لە تاریکی شەوی تاردا و لە ڕێگای پڕ لە کۆسپ و تەگەرەی حەقپەرستیدا ئەم مەستە و سەرخۆش، مەستی عیشقێکی یەزدانییە، کە هیچ شتێکی دی پێی لەق ناکرێت، تەنانەت ئەگەر چی کۆسپ و تەگەرە بادەی عیشقەکەی لەدەست بخەن، بەڵام بادە ناشکێت، چونکە ئەم هیچ گومانێکی بەرامبەر بە ماشووقەکەی نییە، و ئامادەیە لەپێناویدا هەموو زەحمەتییەك قبوڵ بکات و بچێژێت. ئەو بەهۆی تاعەتەوە هەمیشە لەگەڵ دڵدارەکەی ژووانی هەیە. ئەگەر ئێوارەیەك غافڵ بێت و پێی نەکرێت بچێتە خزمەتی، ئەوا پەنا دەباتە بەر ئەوانەی ئەو ئێوارەیە لە تاعەت غافڵ نەبوون و دەچێتە زیارەتی ئەوان (کاکەیی، کوردیپیدیا).

**"شب تاریك و سنگستان و مو مست**
**قدح از دست مو افتاد و نشکســـت**
**نگه دارندەاش نیکـــو نگه داشـــت**
**وگرنه صد قـــدح نفتاده بشکســـت**[١٦]" (باباطاهر، ١٣٧٤، ٢٨)

**"عاشق اون بی که دایم در بلابی**
**ایوب آســا به کرمــون مبتلا بی**
**حسن آســا بنوشه کاســـه زهر**
**حسین آسـا شــهید کربلا بـــی**[١٧]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ١٠٢)

هەموو ئەم دوو بەیتانە و چەندانی دیکەش لە دیوانی (بابا تاهیر)دا نموونەی هەڵوەدایی و ئازارکێشی و شەیدایی عاشقن بۆ خودا ماشووقەکەیان، ئیدی ئامادەی هەموو قوربانییەکن بۆ گەیشتن بە دولبەریان. تەنانەت عاشق دەبێ هەمیشە بە بەڵا و دەردی (ئەییوب) و تراژیدیای (حەسەن و حوسەین) و پێست دارنین و تەواوی ئازارەکانی جەستە تاقیبکرێتەوە، بۆ ئەمەش نموونەی زۆری هاوشێوەی (حەللاج) و (سوهرەوەردی) هەن. (بۆ راڤەی زیاتری بەیتەکان بڕوانە: شوان، ٢٠١٥).

بە گشتی، بە هۆی پێگەی عیشق و خۆشەویستی خودایی، بە عیرفان و سۆفیزم دەگوترێت (ئایینی خۆشەویستی)، کە ئەم تێگەیشتنە تەنها لە پەیوەندیی نێوان

کەسایەتی عاریف و خودا کورت نەکراوەتەوە، تەنانەت دەکرێ بگوازرێتەوە ناو ژیانی رۆژانە و هەقیقی، بەمەش ئایینی خۆشەویستی دەتوانێت زیاتر رووەو پێکەوە ژیان و لێبوردەیی و پاراستنی شکۆ و بەهای مرۆڤ ئاراستە بکرێت و چیدی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤ نەکوژرێ و نەچەوسێتەوە، کە لە تەوەری دواتردا لەسەر ئەم رەنگدانەوەیە دەوەستین.

## تەوەری دووەم: بەهای مرۆڤ و فەلسەفەی کۆمەڵایەتی لە سۆفیزمی (بابا تاهیر)دا

### ١- جیاوازی و لێبوردەیی

لە ئایینی خۆشەویستی و عیرفاندا مرۆڤ پلە و پایەی تایبەتی پێدراوە، گەوهەرێکی بێ وێنەیە، خۆی بەها و رێزە، نوێنەر و جێنشینی خودایە لەسەر زەوی، تەنانەت پێگەی لە فریشتە گەورەتر و پیرۆزترە (سرامی و خیریە، ١٣٩١، ٢١)، کە ئەمانە ئاماژەن بۆ سەرچاوە دینییەکانی عیرفان، بۆ نموونە لە قورئانی پیرۆزدا (انا جعلناک خلیفة في الأرض، ص، الاية ٢٦) و (ولقد کرمنا بني ادم، الاسراء، ٧٠).

ئەوەی کە عیرفان لە هەموو رێبازە هزرە فەلسەفییەکان جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە عیرفان لە مرۆڤەوە دەست پێدەکات. مرۆڤ کائینێکی گیانی و ماددییە، بەڵام لایەنە گیانییەکەی گرنگترە لە لایەنە ماتریالییەکەی، لەبەرئەوە عاریفان هەمیشە خەریکی پەروەردەکرنی رووح و دڵن، کە لایەنی چییەتی و زاتیی حەقیقەتی مرۆڤن، لە کاتێکدا لایەنی ماددی تەنها فۆرمە. لە عیرفاندا میتۆدێکی تایبەت هەیە بۆ ناسین و مەعریفەی مرۆڤ و خودا، بە جۆرێک ناسینی مرۆڤ لەپێش ناسینی خودا دادەنێت، هەروەك گوتراوە (من عرف نفسه فقد عرف ربه)، (هەرکەسێك خۆی ناسی واتە خوای ناسی)، ئەمە بنەما و ریشەی عیرفانە، کەواتە گەوهەری عیرفان زاتی مرۆڤە. لە هەمان کاتیشدا لە هزری عیرفانیدا مرۆڤ ئاوێنە و مەزهەری خودایە، ئامانجیش لە بوونی جیهان و گەردوون مرۆڤە، واتە هەموو بوونەوەر لەپێناوی مرۆڤدا دروست کراون، هەموو قۆناغەکانی عیرفان بریتییە لە گەیشتنی مرۆڤ بە گەورەترین پلە واتە (یەکێتی بوون) لەگەڵ خودا. بەمەش ناو و سیفەتەکانی خودا لە مرۆڤی کامڵدا

ڕەنگدەدەنەوە، واتە مرۆڤ هێما و سیمبوڵی فۆرمی خودایە لەسەر زەوی، مرۆڤ لە هەموو بوونەوەرکانی تر پیرۆزتر و بەڕێزترە هەروەك (بابا تاهیر) ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات:

**"دل غافل ز سبحانی چه حاصل مطیع نفس شیطانی چه حاصل**
**بـــود قـــدر تو افزون از ملک قدر خود نمی‌دانی چه حاصل[١٨]"**

کەواتە، مرۆڤ خاوەن وجوودێکی ڕێزلێگیراوە، ئەم ڕێزەش تەنها وابەستەی بیروباوەڕ و ئایینێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو تایبەتە بە جەوهەری مرۆڤبوون. جەوهەری مرۆڤبوون بۆ عاریفان لە خۆناسی و خوداناسیدایە نەک شەریعەتێکی دیاریکراو و بەجێهێنانە رووکەشییەکان، واتا مرۆڤ خاوەن دڵ و دەروون و خودێکی باش و پاک و جوان و ڕۆشن بێت و ڕۆحی بە دیدار و عیشقی خودایی پاراو بووبێت. (بابا تاهیر) لێرەدا خاوەن تایبەتمەندییەکی گرنگی قبوڵکردنی جیاوازی و دانانان بەوانی دی و پێکەوەژیانە، چونکە خاڵی گرنگ کە دەتوانێت مرۆڤە جیاوازەکان و ئایینە جیاوازەکان کۆبکاتەوە سۆفیزم و عیرفان و پاکبوونەوە و تەجەللای ڕۆحییە.

بەم پێوەرە پەیڕەوانی ئایینی هەق و خۆشەویستی ناکەونە سووکایەتی بە باوەڕ و ئایینی کەسانی دیکە، بەڵکو دان بە ڕێگەی جیاوازی گەیشتن بە خودا دادەنێن، کە لە ڕاستیدا ئامانجەکەش گەیشتنە بە خودا نەک پەیڕەوی لە نەریت و شەریعەتی دنیایی و رووکەشی، یان زمان و ڕەگەز و نەتەوەی جیاواز، دەکرێ لە دیوانەکەی (بابا تاهیر) چەندان بەڵگە بخرێنە بەرچاو بۆ ئەم مەبەستە، بۆ نموونە:

**" اگر مستان هستیم از ته ایمان وگر بی پا و دستیم از ته ایمـان**
**اگر گبریم و ترسا ور مســلمان بهر ملت که هستیم از ته ایمان[١٩]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٧٧)

تەنانەت (بابا تاهیر) زیاتر لەوەش دەڕوات و پێیوایە کە مرۆڤی باوەڕدار و عاریف گەیشتە چێژی مەستی و دیداری خودا، هیچ جیاوازییەک لە نێوان پەرستگەی ئایینە جیاوازەکان و بوتخانە نامێنێ:

**" خوشا آنانکه پا از سر ندونند مثال شعله خشک وتر ندونند**
**کنشت و کعبه و بتخانه و دیــر ســـرائی خالی از دلبر ندونند[20]"**

(بابا طاهر، ١٣٧٤، ٣٩)

(د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان) لە راڤەی ئەم دوو بەیتییەدا دەڵێت: سۆفییەکان لە هەموو شوێنێکی پیرۆز خودا دەپەرستن بە بێ جیاوازی، چونکە پەرستگاکانماڵی دولبەرن لە هەر ئایینێکدا (شوان، ٢٠١٥، ٢٣). ئەمەش باوەڕێک دەخاتەوە کە خودا خاوەنی تەنها رەنگێک و پەرستگەیەک و ماڵێک نییە، وەک پێشتر باسکرا خودا بەناو هەموو گەردووندا بە پانتاییەکی فراوان رژاوە و لە تەنیا جێگەیەک نییە، بەڵکو بەر لە هەر شوێنێ دەبێ لە دڵدا بۆی بگەڕێین.

**"کجا بی جاي ته اي بر همه شاه که مو آیم بدانجا از همه راه**
**همه جا جاي ته مــو کور باطــن غلط گفتم غلط اســـتغفرالله[21]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٨٦)

هەروەها ئەو پێیوایە ئایینی راستەقینە نابێ بۆ مەبەستی بچوکی دنیایی بەکار بێت و ببێتە مایەی شەڕی نێوانیان و بەرژەوەندی گروپ و رێبازێک نەخەنە سەرووی جەوهەری مرۆڤ و ئەرکی راستەقینەی ئایین، لێرەشدا پێیوایە ئەمە لە رەوتێکدا دروست دەبێت کە ئایین بۆ رێبازێک بچوک دەکەنەوە، ئەمە تەنانەت لە ئایینێکی وەک ئیسلامیشدا پێشبینی کراوە کە گروپ و رێبازی جۆربەجۆر دوور دەکەونەوە لە جەوهەری راستەقینەی ئایینەکە، وەک ئەوەی باس لە (٧٢) گروپی جیاواز دەکرێت لە رۆژانی کۆتایی جیهاندا:

**"دلم دردین و نالین چه واجم رخم گردین و خاکین چه واجم**
**بگردیدم به هفتاد و دو ملت بصد مذهب منادین چه واجــم[22]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٥٤)

لە هەموو هۆزانەکانی ناوبراودا، هیچ جۆرە دەمارگیری و رەگەزپەرستی و زاڵکردنی مەزهەب و دین نابینین، بەڵکو تەنها هەوڵی دۆزینەوەی هەوێنی هاوبەش هەیە لە عیشق و خۆشەویستی ئیلاهی و گەیشتنی هەمووان بە چێژی بینینی حەقی رەها و ئاوێزانبوون لەگەڵیدا و بەدەستهێنانی نەمری و جاویدانی و دڵڕۆشنی. واتە ئەوەی گرنگە خودایە نەک ئایینەکە:

**"کە من دوورم لە تۆ 'زوننار' دەبەستم　　کە خۆشیم بێ، یەهود و بوت پەرەستم**
**لە دووی پەیمانی تۆ یاری وەفادار　　لەگەڵ هیچ کەس دەبێ پەیمان نەبەستم"**

(هەمان، ٥٣).

**٢-دادی کۆمەڵایەتی**

هەر پەیوەست بە ژیان و شکۆی مرۆڤەوە، (بابا تاهیر) دەیەوێت سەرچاوەی بێدادی نایەکسانی و هەژاری و نەهامەتی بدۆزێتەوە. لەبەرئەوە، بەردەوام بیر و هزری لای مرۆڤ بووە، هەستی بە ئازار و بێهیوایی مرۆڤ کردووە بەتایبەت لە سەردەمی خۆی، بێگومان یەکێك لە ئازار و دەغدەغەی مرۆڤ بریتییە لە پرسیارکردن سەبارەت بە بوون و چارەنووسی خۆی یان هۆی بوونی لەم دونیایی کە لە راستیدا ئەم پرسیارانە سەرەتای هەستکردنن بە دۆخ و پرسی مرۆڤ (روحانی، ١٣٧٤، ٢٥).

(بابا تاهیر) هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە کە بۆچی دەبێت ژیانی مرۆڤ بەم شێوەیە بێت هەندێك کەس لە ناز و نیعمەتدا بژین و هەندێکی تر لە نارەحەتی و بەدبەختی پارووە نانێکی جۆی دەست نەکەوێت یان ئەگەر دەستیش کەوت بە خوێن و رەنجێکی زۆر، هەروەها بوونی ناعەدالەتی و زوڵم و ستەم بەتایبەت لە لایەنی کەسانی دەست رۆیشتوو، بۆچی دەبێت مرۆڤ ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیە بکێشێت.

(بابا تاهیر) گازندەی زۆری هەبوو لە ژیان و گەردوون، تا رادەیەك نائومێدییەکی زۆر لە دوو چوارینەکانیدا دەردەبڕێت سەبارەت بە ژیانی خۆی و هەموو مرۆڤایەتی و رەخنە لە بوونی خۆی و هاتنی بۆ ئەم جیهانە دەگرێت، خۆزگە بۆ نەبوون و نەهاتن دەخوازێت، چونکە پێیوایە ئەم ژیانە جگە لە رەنج و ئازار و مەینەتی هیچی تر نییە، مەگەر لە رێگای بڕینی قۆناغەکانی سۆفیگەری و عەشقێکی ئیلاهی و پاك لە نائومێدی و ئازار و رەنجی ژیان رزگاری بکات.

لە هۆنراوەکانی (بابا تاهیر) بە دوو مەبەست باس لە نەبوونی و هەژاری کراوە، رەهەندێکی ناخەکی کە پەیوەستە بە شێوەژیانی سۆفییانە و عاریفانە، کە هەمیشە هەژار و رووتورەجاڵ بوون و تەرکی دونیا و ماڵی دنیا و چێژەکانیان کردووە، بۆ ئەوەی ناخ و رۆحیان بەرز و درەوشاوە بێت، وەک خۆی دەڵێت "هەژاری دەریای

بەڵایە" واتە بوونێکی ناتەواوە و پێویستی بەویدیە (شوان، ٢٠٠٦، ١٦٦). هەروەها لە رەهەندێکی ترەوە، روانگەی ژیانی کۆمەڵایەتیانەی خەڵکی بێدەرەتان و هەژارە، کە جیاوازیی چینایەتی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە و کەسانێک دەوڵەمەند و خۆشگوزەران و بەهرەمەند لە خۆشییەکانی دونیا و کەسانێکیش بێبەش و بێبەهرە دەبن لێی. بۆ نەهێشتنی جیاوازیی دووەم (بابا تاهیر) هەوڵدەدات دەستی بگاتە پێگە و دەسەڵاتە باڵاکانی بوون و گەردوون تا بتوانێت چەرخی گەردوون بە قازانجی هەژاران و مرۆڤایەتی و یەکسانی و دادی نێوانیان بچەرخێنێ.

**"اگر دستم رسد بر چرخ گردون      از او پرسم که این چین است و آن چون**
**یکی را میدهی صد ناز و نعمت      یکی را نـــان جو آلوده در خـــون**[٢٣]"

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٧٨)

به گشتی لە زۆر هۆزاندا باس لە هەژاری و خەم و دەربەدەری دەکات، زۆر جاریش سەرباری ماریفەت و دانایی و پاکی و دڵسۆزی، بەڵام چەرخی گەردوون هەر بە دڵ و کامی ئەو ناگەڕێ و نائومێدی دەکا:

**"ز دست چرخ گردون داد دیرم**
**هزاران نالــه و فریـــاد دیـــرم**
**نشنید دستانم بـا خس و خـــار**
**چگونه خاطر خـــود شاد دیـرم**[٢٤]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٥٨)

بەڵام لە ئەنجامدا، (بابا تاهیر) لە ناخ و دڵییەوە هەست بە ئارامییەک دەکات کە خودای هەیە، ئەگەر دنیاشی نەبێت بۆی نابێتە کێشە، بەڵکو نەبوونی خودا کێشە گەورەکەیە، وەک ئەوەی بڵێین هەژاران لانیکەم خاوەنی خودان:

**"خداوندا بفریـــاد دلـــم رس**
**تو یار بیکسان مو مانده بیکس**
**همه گویند طاهر کس نـــداره**
**خدا یار مو چه حـــاجت کس**[٢٥]" (بابا طاهر، ١٣٧٤، ٤٦)

**"مو آن رندم که نامم بی قلندر**      **نه خان دیرم نه مان دیرم نه لنگر**

**چو روج آیو بگردم گرد گیتی**      **چو شو آیو به خشتی وانهم سر[٢٦]"**

(باباطاهر، ١٣٧٤، ٤٠)

**ئەنجام**

١.(بابا تاهیر) سۆفی و عاریفێکی خاوەن پێگە و ئەزموون بووە، بە وردی ئاماژەی بۆ قۆناغ و هەنگاوەکانی ئەزموونی سۆفیگەری و عیرفان کردووە لە بەرهەمەکانیدا.

٢.(بابا تاهیر) لە پەیڕەوانی ئایینی هەق بووە، لە نێویاندا ئایینی (یارسان)، بەڵام وەک موسوڵمانێک خۆی نیشانداوە. هەرچەندە خاوەن پێگەی بەرز بووە لە نێو (یارسان) و لە هەندێ سەرچاوە وەک ڕێبەری ڕۆحانی و تەنانەت وەک یەکێک لە فریشتەکانیان هەژمار کراوە.

٣.باوەڕی زۆری بە پاکدڵی و خاوێنبوونەوەی ڕۆح هەبووە، بە تایبەت بە ڕێگەی تەسەوف و عیرفان، بۆ ئەم ڕێگەیەش تەنها ئایینێکی دیاریکراوی بە تاکە ڕێگە دانەناوە، بەڵکو ڕێگاکانی هەموو وەک یەک سەیر کردووە، بەڵکو گرنگ ئەوە بووە بتگەیەنێت بە ماشووق و یار/خودا، ئەمەش بە خاڵێکی گرنگ و جیاکەرەوەی ئەو دادەنرێت لە باوەڕبوونی بە جیاوازییەکان و پێکەوە ژیانی ئاشتییانە و ڕۆحییانە و وەلاوەنانی مەزهەبگەرایی و دەمارگیری.

٤.لە ڕوانگەی فەلسەفەی کۆمەڵایەتییەوە باوەڕی تەواوی بە دادی کۆمەڵایەتی و یەکسانیی نێوان خەڵکی هەبووە، تا ئەو ڕادەیەی خواستی ئەوەی هەبووە دەستی بگات بە چەرخی گەردوون و دەسکاری دنیای بێدادی بکات و یەکسانی بگێڕێتەوە بۆ نێوان مرۆڤەکان و بەها و شکۆی مرۆڤ بگێڕێتەوە.

٥.(بابا تاهیر) وەک دەسپێکی ئەدەبی کوردی، بەرهەمەکانی خۆی تەنها لە چێوەی هۆزاندا دەرنەبڕیوە، بەڵکو بە شێوەی گوتەی کورت و کتێبی تر نووسیویەتی، هاوکات لە زمانی کوردیدا بە تێکەڵی لە شێوە زارەکانی گۆران و لوڕی هۆزانی چڕیوە، جگە لەمەش بە زمانەکانی عەرەبی و فارسیش نووسیویەتی.

**پەراوێزەکان:**

[1] (یارسان) یان (ئەهلی هەق) لە هەندێ نووسین بە ئایین و لە هەندێکیش بە ڕێبازێکی ئایینی ئیسلام یان ئایینزایەکی ئەو ئایینە دادەنرێت. بەڵام (د. عرفان مستەفا) لە بابەتێکدا بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە هەردوو (یارسان) و (یەزیدی) ئایینن و بە ئایینی حەق ناویان دەبات، بۆ ئەم تێز و بۆچوونەشی کۆمەڵێک ئارگیومێنتی ئۆنتۆلۆژی و زمانی و سیستمی دەخاتە ڕوو، پێیوایە هەردوو ئایینە رۆحییەکە خاوەن سیستم و رۆح و جەوهەری تایبەت بە خۆی و جیاواز لە ئایینە سامییەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا هەریەکە لە (یارسان) و (یەزیدی) دوو فۆرم و بونیاد و سیستم و جەوهەری جیاوازیان هەیە لە یەکتر. بەڵام بە هۆی دۆخی سیاسی و سەرکوتەوە، زۆرجار بە مەزهەبکردنی ئایین دروستبووە و لە هەمان روانگەشەوە هەندێ جار هەمان تەفسیر و لێکدانەوە بۆ ئەوانیش دەکرێت کە گوایە ریبازێکی شیعی یان سوننی سەر بە ئیسلامن (هەورامی، ٢٠١٣، ٣٨-٦٣).

[2] هۆکاری ئەوەی کە ئێمە نازناوی (عۆریان)مان لە بری (هەمەدانی) هەڵبژاردووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە (بابا تاهیری عۆریان) زیاتر واتای سۆفیزم و عیرفان و ژیانی سۆفییانە دەبەخشێت وەک لە (هەمەدانی) کە ئاماژەیە بە شوێن. عۆریان جگە لە واتاکەی کە بریتییە لە (رووت و رەجاڵی، سادەپۆشی، شەفافی، ژیانی قەلەندەری و هەژارانە و سۆفییانە) هەروەها بە واتای گەیشتن بە حەقیقەتی رووت و جەوهەری و شەفافیش دێت. هەروەها لە زۆر شوێندا لە پاڵ ناوەکەیدا ئەم نازناوە عیرفانییە بەکاردەبرێت.

[3] "لەبەر 'قالوبلی' شێتم لە تاوان — لە باران و گەڵا زۆرترمە تاوان
ئەگەر 'لاتقنطوا' نایە بە فریام — لەبەر 'یا ویلنا' ترسم فراوان"

(لوقمانی، ١٣٩٢، ٣٧).

[4] "ئەتۆ فەرمووت کە میوان بم لە ژیندا — گەمی رادەم لە ئاوی چاوی شیندا
دەترسم گەر گەمی یەکسەر نوقوم بێ — ببم وەیلان لە نێو دەریای بەریندا"

(لوقمانی ، ١٣٩٢، ٥٤)

[5] "لەسەیری دەشت و مەزرا تۆ دەبینم — کە دەڕوانم لە دەریا تۆ دەبینم
کە دەڕوانم لە هەر کێو و دەرودەشت — نیشانەی بەژن و باڵای تۆ دەبینم"

(لوقمانی، ١٣٩٢، ٣٨)

[6] گەلێک خۆشە ببی تێکەڵ بە یەزدان — منیش شادیم بە رووی تۆیە لە جێژوان
لە دووری تۆ گوڵی جوانی شیرینم — ئەوا دەستی خەمانم وا لە سەردان

(لوقمانی، ١٣٩٢، ٨٦).

[7] "دەمێ خۆشم کە دیدارت دەبینم — کە من بسکی عەتربارت دەبینم
نییە هەرگیز لە دڵما رەنگی شادی — مەگەر ئەودەم کە روخسارت دەبینم"

(هەمان، ٤٢).

[8]''ئەمن دەردان و دەرمانم لە یارێ ئەگەر قەسساب لەش و پێستم بگروێ
هەموو دەم وەسڵ و هیجرانم لە یارێ جودا نابێتەوە گیانم لە یارێ''
(لوقمانی، ۱۳۹۲، ۱۷).

[9]''ئەگەر دڵ دڵبەرە، دڵبەر نەزانم دڵ و دڵبەر ئەوەندە تێکەڵاون
ئەگەر دڵبەر دڵە، دڵ دەن نیشانم جودا نین بۆم دڵ و دڵبەندی گیانم''
(لوقمانی، ۱۳۹۲، ۱٦).

[10]''خودا هاوار لەبەر دڵ داد لەبەر دڵ کە سۆزی دادوەر دادم بپرسن
کە هیچ ساتێ نەبووم دڵشاد لەبەر دڵ دەبێژم سەد هەزار بێداد لەبەر دڵ''
(لوقمانی، ۱۳۹۲، ۳۵).

[11]''دڵە غافڵ لە سوبحانی چ حاسڵ ئەتۆ رێزت زیاتر لە فریشتان
لە رێی فەرمانی شەیتانی چ حاسڵ بەها و پێگەت کە نازانی چ حاسڵ''
(لوقمانی، ۱۳۹۲، ۳٤)

[12]''ئەمن دەردان و دەرمانم لە یارێ ئەگەر قەسساب لەش و پێستم بگروێ
هەموو دەم وەسڵ و هیجرانم لە یارێ جودا نابێتەوە گیانم لە یارێ''
(لوقمانی، ۱۳۹۲، ۱۷).

[13]''ئەگر هاتی بە گیانم پایەنازم وەرە و دەردت بنێ باری دڵی من
نەیەی ئاگر بە جەستەی لانەوازم دەبێ بمرم، بسووتێم، یان بسازم''
(هەمان، ۳٦

[14]''لە دەردی تۆ دڵم دایم خەمینە گناهم خۆشەویستی تۆیە تەنها
نوێنگەم سەر زەوی، خشتم سەرینە کەسی ئاشق بە تۆ، وەک من حەزینە''
(هەمان، ٦٦)

[15]''لە عەشقی تۆ گڕێ بەربۆتە حاڵم سەگت گەر پێ بنێتە سەر چەمانم
بە گیان و دڵ دەسووتم وەک زوخاڵم دەبێ تۆزی بە برژانگم بماڵم''
(لوقمانی، ۱۰۹).

[16]''شەوی تاریک و ڕێ سەخت و منیش مەست عەجەب نەشکا کە جام بەر بوو لەسەر دەست
بەڵێ راگر بە چاکی بۆمی پاراست دەنا سەد شووشە نەشکەوت و شەقی بەست''
(هەمان، ۱٦).

[17]''کەسێ دڵدارە دایم بەر بەڵایە حەسەن ئاسا دەنۆشێ کاسەیەک ژار
وەکو ئەییوب برینی کرمەزایە حوسێن ئاسا شەهیدی کەربەلایە''
(هەمان ، ۸۰).

[18]''دڵە غافڵ لە سوبحانی چ حاسڵ ئەتۆ رێزت زیاتر لە فریشتان
لە رێی فەرمانی شەیتانی چ حاسڵ بەها و پێگەت کە نازانی چ حاسڵ''
(لوقمانی، ۳٤).

[19]ئەگەر مەست و نەبانین، تۆیە بڕوا — کە بێ هەست و نەزانین، تۆیە بڕوا
ئەگەر هیندوو، وە یا گاور و مسوڵمان — لە کام خەڵک و زمانین تۆیە بڕوا"

(هەمان، ٥٦).

[20]"چ خۆشن ئەو کەسانەی شادمانن — لە ئاگردا تەڕو وشکی نەزانن
پەرستگە و کابە و بوتخانە و دەیر — لەچاوی وان هەموو جێی دڵبەرانن

(هەمان، ٢٢)

[21]"مەکانت یاری دڵبەر لە کامە لایە؟ — هەتا بگرم منیش ڕێی بارەگایە
لە هەرلا تۆی ئەمن کوێری دەروونیم — هەڵەم کرد وا پەشیمانم خودایە"

(هەمان، ٧٣)

[22]"دڵم پڕ دەرد و ناڵینە چ بێژم سەرم پڕ تۆز و خۆڵینە چ بێژم
بە نێو حەفتا و دوو میللەتدا گەڕاوم — بە سەد مەزهەب شەڕی دینە چ بێژم"

(هەمان، ٤٧).

[23]"کە دەستم چێتە چەرخی زەمانە — دەڵێم ئاکاری تۆ بۆ وەک نەزانە
یەکێ بەخشیتە پێی سەد نازونیعمەت — یەکێ نانی بە زووخاو، ژینی ژانە"

(لوقمانی ، ٥٨).

[24]"لە دەستی چەرخی چەپگەڕ من دەکەم داد — دەکەم هاوار هەزاران بانگ و فەریاد
کە دڵبەر هاونشینی دڕک و داڵە — ئەدی چۆن من بژیم ئارام و دڵشاد"

(هەمان، ٣٧).

[25]"خودایا بێ بە هاوار دڵی زار — کەسی بێکەس ئەتۆی من بێکەس و کار
دەڵێن خەڵکی کە تاهیر بێکەسی تۆ — کەسم ناوێ خودا بۆ من کەسە و یار"

(هەمان، ٣٠).

[26]"من ئەو ڕەندەم کە پێم ئێژن قەلەندەر — نە نانێکم، نە مانێکم، نە لەنگەر
کە ڕۆژ هەڵدێ دەسووڕێم دەوری ماڵت — کە شەو دادێ، لەسەر خشتێ دەنێم سەر"

(هەمان، ٢٦).

## سەرچاوەکان:

- قورئانی پیرۆز

**بە زمانی کوردی**

- **کتێب**


١. لوقمانی، رەحیم، ١٣٩٢ هـ ، چوارینەکانی بابا تاهیری هەمەدانی، بە شێوەزاری کورمانجی خواروو (سۆرانی)، پەخشانگای زانستی کالێج، چ ١، سنە.

٢. شوان، د. ابراهیم احمد ، ٢٠٠٦، گوتە کورتەکانی بابا تاهیری هەمەدانی، وەرگێڕان، چاپخانەی زانکۆ، هەولێر.

٣. شوان، د. ئیبراهیم ئەحمەد، ٢٠١٥، راڤەی دوو بەیتەکانی بابە تاهیری هەمەدانی، هەولێر.

٤. خەزنەدار، د. مارف، ٢٠٠١، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.

٥. محمود، سالار عزیز، ٢٠١٤، هزری فەلسەفی لە شیعری مەلای جزیریدا، چ ١، دەزگای موکریانی، هەولێر.


- **گۆڤار**


١. خاڵ، شێخ محمدی، ١٩٧٧، بابا تاهیری هەمەدانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی٥، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا.

٢. هەورامی، د. عرفان مستەفا، ٢٠١٣، ئێزدی و یارسان وەک دوو دەرکەوتەی ئایینی حەق، گۆڤاری لالش، گۆڤارێکی وەرزیی رۆشنبیرییە، بنکەی لالش دەریدەکات، ژمارە (٣٨).


- **ئینتەرنێت**


١. کاکەیی، فەهمی، رەنگدانەوەی فەلسەفەی یارسان لە چوارینەکانی بابا تاهیری لوڕدا، https://www.kurdipedia.org/default.aspx?q=2013082100110589124&lng=6. ٢٠١٣/٨/٢١

٢. حوسێن، جوتیار نەریمان، گوزەرێك بە مێژووی بیروباوەڕی ئایینی کاکەییدا، http://www.historyofkurd.com، (2017/12/3)

**به زمانی فارسی**

- **کتاب**

١. اذکایی، پرویز، ١٣٧٥، باباطاهر نامه، ناشر: توس، چ١.
٢. باباطاهر، اشعار باباطاهر، ١٣٧٤، ناشر: قاسمی، مشهد.
٣. الراوندی، محمد بن سلیمان، ١٣٦٣، راحته الصدور و آیه السرور در تاریخ آل سلجوق، به سعی و تصحیح محمد اقبال، چ٢، انتشارات علی اکبر علمی، تهران.
٤. ذبیح الله، صفا، ١٣٧٩، تاریخ ادبیات ایران، جلد دوم، انتشارات امیرکبیر، تهران.
٥. پناه، شهناز یزدان، ١٣٩٨، نگاهی نو در عقاید عرفا، نشر اینده درخشان.
٦. مردانی، محمد، ١٣٧٧، سیری کوتاه در مرام اهل حق، چ١، انتشارات مؤسسه دفاع از حریم اسلام.
٧. مقصود جواد، ١٣٤٥، شرح احوال، اثار دوبیتی های باباطاهر عریان، به انظمام شرح وترجمه کلمات قصار وی، منسوب به عین القضاه همدانی، انتشارات انجمن أثار ملی ایران.
٨. روحانی، بابامردوخ، ١٣٧٤، تاریخ مشاهیر کرد، جلد اول، ناشر: سروش، تهران.

- **گۆڤار**

١. دینانی، ارزو ابراهیمی و یدالله جلالی پندری، ١٣٨٩، بنیان گذار وحدت وجود، حلاج یا ابن عربی؟، مجله علمی- پژوهشی، دانشکده علوم انسانی_دانشگاه کاشان، شماره یازدهم بهار- تابستان.
٢. سرامی، قدم علی و بهروز خیری، ١٣٩١، قلهای در دامن الوند، تأملی درعرفان باباطاهرعریان، فصلنامەی تخصصی عرفان اسلامی، شماره٣٤، سال ٩.

**به زمانی عەرەبی**

- **کتێب**

١. الحفني، د. عبدالمنعم، ٢٠٠٣، الموسوعة الصوفية، مكتبة مدبولي، ط١، القاهرة.

- **-گۆڤار**

١. محمود، د. سالار عزیز، ٢٠١٨، بابا تاهیری هەمەدانی و یەکیەتی بوون له دوو بەیتییەکانیدا، مجلة الاستاذ، تصدر عن جامعة بغداد/كلية التربية للعلوم الانسانية، مجلة علمية محكمة فصلية، العدد ٢٢٦، المجلد الأول.

## الملخص:

### الفكر الصوفي عند ((بابا طاهر العرياني)).

هذا البحث قراءة تحليلية في عمق الفكر الصوفي (الهرمونطيقا) عند ((بابا طاهر العرياني)). ركزنا في هذه الدراسة على اقواله واشعاره خصوصا الرباعيات والثنائيات الشعرية، وايضا حققنا في مصادر افكارها الصوفية خصوصا علاقته مع طائفة (اليارسان)) والتصوف الاسلامي.

وايضا هذا البحث يتناول الفكر الصوفي ومراحله، والرؤية الفلسفية والاجتماعية و وحدة الوجود الذي تعتبر من الاتجاهات الصوفية والعرفان والاتحاد بين الله والكون والمفارقات عند ((بابا طاهر العرياني))، وكيف عبر بابا طاهر بأسلوبه في كلماته واشعاره عن رؤيته عن المصطلحات الصوفية وطريقة اهل الحق وخصوصا مصطلح القلب الذي عبر عنها باسلوب عرفاني، وايضا أشار الى اهمية مكانة وقيمة الانسان، وتجلي الله في الانسان، مع اشارته الى الجانب الاجتماعي في التعايش ومعرفة الحق في الدين.

## Abstract:

### Sufi (mysticism) thought in ((Baba taher Al-Auryani)).

This paper is an indexical analysis reading in the depth of Sufi (mysticism) thought (hermeneutical analysis) in ((Baba taher Al-Auryani)). In this study, we focused on his sayings and poems, especially the quatrains and dualistic poems, and we also investigated the sources of his Sufi ideas, especially his relationship with the (Yarsan) sect and Islamic Sufis. Also, this research deals with Sufi thought and its stages, the philosophical and social vision and the unity of existence which is considered one of the Sufi trends, gratitude and union between God and the universe, and the paradoxes of ((Babataher Al-Aryani)), and how Babathar Al-Aryani expressed his vision in his words and poems. Sufi terminology and the way of the people of truth, especially the term of the heart, which was expressed in a ritualistic manner, and also referred to the importance of the status and value of man, and the revelation of God in man, with its reference to the social aspect of coexistence and knowledge of the truth in religion.

# پەیوەندیی واتایی ئاسۆیی و ستوونی لە شیعرەکانی (لەتیف هەڵمەت) دا

م. ی. ئەژین ئیبراهیم سالح
بەشی زمانی کوردی
کۆلێژی پەروەردە- کەلار/ زانکۆی گەرمیان

**پێشەکی**

**١-ناونیشانی توێژینەوە:**

ئەم توێژینەوەیە بەناونیشانی (پەیوەندیی واتایی ئاسۆیی و ستوونی لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت)دا کە تیایدا پەیوەندی و پێکەوەهاتنی وشەکانی ناو دێڕە شیعرەکان لە هەردوو ئاستی ئاسۆیی و ستوونیدا دەستنیشان کراوە.

**٢-گرنگی و هۆکاری هەڵبژاردنی توێژینەوە:**

پەیوەندییە واتاییەکان بابەتێکی واتاسازییە بریتین لە پەیوەندی و پێکەوە هاتنی وشەکانی زمان بەمەبەستی گەیاندنی واتای تەواو بەئەنجام گەیاندنی کردەی ئاخاوتن، یان گونجاندنی وشەکانی زمانە لەگەڵ یەکتریدا و دووبارە بوونەوەی لە ژمارەیەکی بێ کۆتا لە ڕستەی واتاداردا، ئەم دیاردانەش بەزۆری لە زمانی ئەدەبیدا ڕەنگ دەداتەوە.

هۆکاری هەڵبژاردنی توێژینەوەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تائێستا توێژینەوەی لەم جۆرە لە شیعردا بەتایبەتیش لە شیعرەکانی شاعیر (لەتیف هەڵمەت)دا بەرچاو ناکەوێت.

**٣_ ڕێباز و کەرەستەی توێژینەوە:**

بۆ لێکۆڵینەوەکە ڕێبازی وەسفی پەیڕەو کراوە چونکە شیعرەکان بە زمانی ئاخاوتنی ئەمڕۆی کوردی دەربڕاون. بۆ کەرەستەی توێژینەوەکە سوود لە شیعرەکانی شاعیر لەتیف هەڵمەت وەرگیراوە و دیاردەکانی ناو پەیوەندییە واتاییەکانی تێدا خراوەتە ڕوو.

**٤_ بەشەکانی توێژینەوە:**

ئەم توێژینەوەیە جگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەش پێکهاتووە:

لە بەشی یەکەمدا باس لە چەمک و پێناسەی پەیوەندیی واتایی و جۆرەکانی پەیوەندیی واتایی کراوە و دیاردەکانی ناو پەیوەندییە واتاییەکان بەڕوونی خراوەتە ڕوو.

لە بەشی دووەمدا دیاردەی واتایی لە هەردوو ئاستی ئاسۆیی و ستوونیدا لە شیعرەکاندا خراونەتە ڕوو.

**بەشی یەکەم/پەیوەندییە واتاییەکان**(semantic relations):

**١- چەمکی پەیوەندیی واتایی:**

((پەیوەندییە واتاییەکان لە فەلسەفەوە نزیکترە وەك لە زمانەوانییەوە، بەڵام تائێستاش زمانەوانان خۆیان لە تووشبوونی قەیرانی لێکدانەوەی فەلسەفی واتا و جیاوازیی نێوان پەیوەندییە واتاییەکان دەپارێزن و لە چوارچێوەی زمانەوانیدا لە واتا و پەیوەندییە واتاییەکان دەکۆڵنەوە)). (دارا حمید، ٢٠١٠،ل٦٥)

پەیوەندیی واتایی نێوان وشەکان ئەو پەیوەندییەیە کە وشەیەك لەگەڵ وشەکانی تری زماندا لەڕووی واتاوە بەیەك دەبەستێتەوە، هەروەها بە پەیوەندیی شوێنی ئاماژەی بۆ دەکرێت، واتا هەر وشەیەك کە لە زماندا بەکاردێت، لەڕووی واتاوە دوو جۆرە پەیوەندی لەگەڵ وشەکانی تردا دروست دەکات، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- پەیوەندیی نێوان وشە و شت (تەن): ئەم جۆرە پەیوەندییە دەکەوێتە دەرەوەی زمان.

٢- پەیوەندیی نێوان وشە و وشەکانی تری زمان: ئەم جۆرە پەیوەندییەش دوور و نزیکی وشەکە نیشان دەدات، لەگەڵ وشەکانی تردا لە ناوەوەی زماندا. (تالیب حوسێن، ٢٠١١،ل٥٩)

مەبەست لە پەیوەندیی واتایی بریتییە لەو پەیوەندییەی لەنێوان دانە زمانییەکاندا هەیە لە ئاستی ستوونی (پارادیگماتیك) و لە ئاستی ئاسۆیی (سینتاگماتیك)، کە

لەسەر بنەمای واتاکانیان پەیدا دەبێت، ئەمیش پەیوەستە بەدنیای ڕاستی و ڕاستەقینەی دەرەوەی زمان، یاخود بەڕێککەوتنێکی کۆمەڵایەتی، چونکە ئاشکرایە، کە چەمکی پەیوەندیی واتایی ئاڵۆزە، وەك هەر دیاردەیەکی تر لە جیهاندا، بوونی پەیوەندیی واتایی لێکدانەوەی جیاواز هەڵدەگرێت، ئایا مەبەستمان لە پەیوەندیی نێوان هێما زمانییەکانە؟ یاخود پەیوەندیی نێوان واتای هێماکانە؟ یاخود لەنێوان ئەو شتانەی کە هێماکان دەیاننوێنن؟

پەیوەندییە واتاییەکان لەسەر بنەمای واتا و چەمکەکانیان، کە ئەویش پەیوەستە بە شتێك لە دەرەوەی زمان کە هێما زمانییەکان دەینوێنن، یاخود پەیوەستە بە ڕێککەوتنێکی کۆمەڵایەتییەوە، بۆنموونە کاتێك باس لە پەیوەندیی نێوان وشەکانی (سارد، گەرم) یاخود (باش، خراپ) دەکەین، باسی پەیوەندیی نێوان ئەو دوو هێما زمانییە دەکەین لەسەر بنەمای ئەو واتایانەی کە دەیگەیەنن، دژ واتای یەکترن، ئەم واتایەش پەیوەستە بە دنیای دەرەوەی زمان، چونکە ساردی و گەرمی یاخود باشی و خراپی لە دنیای دەرەوەدا دژی یەکترن، بە هەمان شێوەش کاتێك باس لە پەیوەندیی نێوان هاو واتاکان دەکەین، کە دوو هێما لە فۆرمدا جیاوازن، بەڵام واتایان یەکە یاخود لەیەکەوە نزیکن، چونکە ئەو شتەی لە دنیای دەرەوە دەیگەیەنن یەك شتە یاخود لەیەکەوە نزیکن وەك (پاك، خاوێن).

((هەروەها کاتێك هێمایەك دوو واتا یان زیاتر بگەیەنێت، لەسەر بنەمای ئەو واتایانەی دەیگەیەنێت دەڵێین هاوبێژە یان فرەواتایە، لە هەمان کاتدا چەند شتێکی جیاوازیش لە دنیای دەرەوە دەگەیەنێت، بەڵام هەندێك پەیوەندیی هاوڕێیەتی و واتای هەندێك هێمای زمانی وەك (دێو، شەیتان، هێزی خێر......) پەیوەست نین بە دنیای دەرەوە، بەڵکو پەیوەستن بەڕێککەوتنی کۆمەڵایەتییەوە.)) (فەرهاد تۆفیق حەسەن،٢٠١٠،ل ٣٠-٣١)

کەواتە پەیوەندیی واتایی پەیوەندیی نێوان وشەکانی زمانە لەگەڵ یەکتریدا، کە ئەو پەیوەندییە بە جۆرێکە وشەیەك لەگەڵ وشەکانی تردا لەسەر بنەمای ڕێککەوتن دێت لەگەڵ یەکتریدا، بۆنموونە ناتوانرێ بوترێت:

* دەفتەرەکە شکا.

چونکە شکان بۆ ماددەیەکی ڕەق بەکاردێت و لەگەڵ دەفتەر پێویستە وشەی دڕان بەکاربێت، ئەمەش پەیوەندیی نێوان وشەکانە لە ڕستەدا.

**٢ پەیوەندیی واتایی:**

پەیوەندیی نێوان هێما زمانییەکانە، لەسەر بنەمای واتاکانیان، پەیوەستە بەو شتەی لە دەرەوەی زمان دەیگەیەنن یاخود بە ڕێککەوتنێکی کۆمەڵایەتییەوە.

((یاخود بریتییە لەو پەیوەندییە واتاییانەی لەنێوان وشەکاندا دەبینرێت لە دروستەی ژمارەیەکی بێ کۆتا لە ڕستەی واتاداردا.)) (فەرهاد تۆفیق حەسەن،٢٠١٠،ل٣١)

پەیوەندییە واتاییەکان بریتین لە پەیوەندی و پێکەوە هاتنی کەرەستەکانی زمان بەشێوەیەکی ئاسایی یان بەناچاری، بەمەبەستی زیاتر ڕوونکردنەوەی واتای وشە و بەلوتکە گەیاندنی کردەقسەییەکان و ئەنجامدانی تەواوی کردەی گەیاندن.

((بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە پەیوەندییە واتاییەکان تەنها لەنێوان وشەکانی زماندا هەبن، بەڵکو ئەو دیاردەیە لە ڕستە و سەرووی ڕستەشدا هەیە، چونکە زۆربەی ئەو زمانەوانانەی لە پەیوەندییە واتاییەکانیان کۆڵیوەتەوە گرنگیان بە واتای ڕستە داوە و پەیوەندیی واتایی نێوان مەبەستی ڕستەکە و واتای وشەکانی ڕستەکەیان ڕوون کردۆتەوە)). (دارا حمید،٢٠١٠،ل٦٥)

**٣- جۆرەکانی پەیوەندییە واتاییەکان:**

بەشێوەیەکی گشتی هەر لە سەردەمی سۆسێرەوە دوو جۆر پەیوەندیی واتایی لەنێوان یەکەکانی زماندا دیاریکراوە، کە (پەیوەندیی ئاسۆیی syntagmatic ) و (پەیوەندیی ستوونی paradigmatic)ن.

١- پەیوەندیی ئاسۆیی یان هاونشینی (syntagmatic) :

بریتییە لەو پەیوەندییانەی کە لەسەر ئاستێکی ئاسۆیی لەنێوان دانەکانی زماندا هەن، ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان بەشەکانی پێکهاتەیەك یاخود گرێیەکدا هەن، بریتین لەپەیوەندیی سینتاگماتیکی، چونکە ئەو جۆرە پەیوەندییە ڕەهەندی ئاسۆیی زمان لە فۆنیمێك یاخود وشەیەك لەگەڵ وشەیەکی تر لە ڕستەدا دەردەخات. تراسك

لەسەر ئاستی ڕستەسازی پەیوەندیی سینتاگماتیکی لەنێوان (بکەر و کردار)دا دەبینێت، بۆنموونە ڕستەیەکی وەك (ئاسۆ ماسییەکی گرت و برژاندی و خواردی)دا، کەرەستەکان لە پەیوەندییەکی لۆژیکی و ڕێزمانیدان بەتێکدانی ڕیزبەندییەکە پەیوەندییەکان تێکدەچێت. (فەرهاد تۆفیق حەسەن،٢٠١٠،ل٣٣)

((یان پەیوەندیی ئاسۆیی بریتییە لە پەیوەندیی سینتاکسی نێوان ئارگۆمێنتەکان بەپێی گونجان و دەرکەوتنیان لەگەڵ یەکتریدا لە قاڵبی فرێز و ڕستەدا. بەمەش زۆرجار نرخ و بەهای ئەو ئارگۆمێنتانە لەڕێی پەیوەندییەوە لەگەڵ ئارگۆمێنتەکانی تری فرێز و ڕستە، چ لە پێشەوە یان لە دوایەوە بێت بەدەست دێت.)) (دارا حمید ،٢٠١٣،ل٤٨)

((لەم پەیوەندییەدا دەبێت ئاگاداری کاری (تێپەڕ و تێنەپەڕ)بین، چونکە کاری تێپەڕ پێویستی بە سێ کەرەستە هەیە کە بریتین لە (بکەر و بەرکارو کردار)، هەروەها تێنەپەڕ پێویستی بە دوو کەرەستە هەیە کە بریتین لە (بکەر و کردار)، واتە لە پەیوەندیی ئاسۆییدا ئیشمان لەسەر بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و کرداری ڕستەکە هەیە، هەر بۆیە ئەم پەیوەندییە دەچێتە حاڵەتی سینتاکسەوە)). (نەریمان عبدللە خۆشناو ،٢٠١٤،ل١٥١)

**پەیوەندیی ئاسۆیی دوو جۆرە:**

یەکەم / هاوڕێیەتی. دووەم /هەمبەری :

یەکەم / هاوڕێیەتی:

بریتییە لە هاتنی یەکە لێکسیکییەکان بەیەکەوە، ئەمیش دووجۆرە:

**أ- پەیوەندیی ئاسۆیی ئاسایی:**

بریتییە لەو پەیوەندییە ئاسۆییانەی لەنێوان پێکهاتە و فرێزەکانی ڕستەیەکدا هەیە، پەیوەندیی سینتاکسی ئاسایی نێوان وشەکانی ڕستەیە لەسەر بنەمای ڕێککەوتن و یەکدی تەواوکردن دامەزراوە.

**ب- پەیوەندیی ئاسۆیی هاوڕێیەتی بە بەرد بوو/چەسپیو:**

ئەو پەیوەندییە ئاسۆییانەن، کە بەزۆری لەنێوان دوو فرێز یاخود دوو وشەدا هەن، ئەمەش لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنان و زۆر بەیەکەوە هاتنی ئەو دووانە و

ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی لەسەر نیشانە واتاییەکانیان. وەك:

سەگ____وەڕین          دەنگ
سەگ
گورگ____لووراندن       دەنگ
گورگ
کوڕ____قۆز             جوانی
نێر
کچ____جوان             جوانی
مێ

**دووەم / هەمبەری :**

بریتییە لە بەیەکەوە نەهاتن و نەگونجانی دوو وشە لە فرێزێکدا یاخود دوو فرێز لە ڕستەیەکدا ، ئەمیش دوو چەشنی هەیە:

**١- هەمبەری سینتاکسی:** هەڵنەکردنی سینتاکسی- سیمانتیکی بەستنەوەی لێکسیمەکانی ناو ڕستەیە لەگەڵ یەکتردا.

وەك/ * ئازاد بەرد دەخوات.

ئەم ڕستەیە، ڕێزمان دروستە بەڵام واتا ناڕاستە.

**٢-هەمبەری فرێزی:**

ئەمیش لەسەر دوو بنەمایە :

أ- ((بنەما دنیای ڕاستەقینەی دەرەوەی زمان ، بۆنموونە لەبەر ئەوەی ئێمە لە دنیای دەرەوەدا مانگای سەوزمان نییە، بۆیە سەوز و مانگا بەیەکەوە نایەن، یاخود لەبەر ئەوەی لە دنیادا ماست و شیر تەنها سپی هەیە، ناڵێین شیری سپی یان ماستی سپی.

ب- لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی، لەبەر ئەوەی بە گوێرەی کۆمەڵەکان ڕێککەوتنی جیاجیا هەیە لەسەر هەندێك نیشانەی واتایی کەرەستە و وشەکان، بۆیە ناتوانین هەندێك وشە هەن بەیەکەوە کۆیان بکەینەوە، ئەگەر کۆشمان

کردنەوە ئاخێوەرانی زمانەکە هەست دەکەن تێکەڵییەکمان کردووە، بۆنموونە لە زمانی کوردیدا ڕێککەوتن هەیە لەسەر ئەوەی ئاوەڵناوی (قۆز) بەرامبەر بە(کوڕ) و ئاوەڵناوی (جوان) بەرامبەر بە (کچ) بەکار بهێنرێت ، هەر بۆیە (* کوڕی جوان) و (*کچی قۆز) بە یەکەوە نایەن)). (فەرهاد تۆفیق حەسەن،٢٠١٠،ل٣٣-٣٤)

**٢- پەیوەندیی ستوونی یان جێنشینی( paradigmatic):-**

((بریتییە لە پەیوەندیی نێوان وشەیەکی ڕستە، لەگەڵ وشەیەکی تری زمانەکە، کە بتوانن جێی یەکتر بگرنەوە، واتە بتوانرێت وشەیەکی ڕستەیەك بگۆڕرێت بە وشەیەکی تری زمانەکە لە دەرەوەی ڕستەکە، بەڵام لە هەمان ژینگەی زمانی بێ ئەوەی کار لە پێکهاتەی ڕێزمانیی ڕستەکە بکات.)) (دارا حمید،٢٠١٠،ل٦٧)

((پەیوەندیی ستوونی بەو پەیوەندییە دەوترێت، کە بەشێوەیەکی ستوونی کاردەکات، ئەویش بریتییە لە دیاریکردنی فەرهەنگی نێوان وشەکان لەهەمان شوێنی وشەی نێو ڕستەکە.

یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی پەیوەندیی ستوونی ئەوەیە، کە بەشە ئاخاوتنەکانی زمان دیاریدەکات، بە واتایەکی تر پۆلە زمانییەکان دیاری دەکات، کە بریتین لە: (ناو، جێناو، ئاوەڵناو،.....) (نەریمان خۆشناو،٢٠١٤،ل١٥٢).

هەروەك لەم ڕستەیە دەیخەینە ڕوو:

کارزان نانی خوارد.

بەناز میوەی کڕی.

ئەحمەد وانەی خوێند.

شیلان چێشتی لێنا.

((ئەو پەیوەندییانەن لەسەر ئاستی ستوونی لەنێوان دانە زمانییەکاندا، لە ئاستی فۆنیم و مۆرفیم و وشە و فرێزدا لە هەمان ژینگەدا هەن. ڕەهەندی ستوونیی زمان لە بونیادگەری سۆسێردا ئەو پەیوەندییە لەجیاتییە کە یەکەیەکی زمانەوانی لەگەڵ یەکەیەکی دیی زمانەوانی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا هەیەتی.

ئەم پەیوەندییانەش لەسەر ئاستی فۆنیم، وەك (ساڵ ، داڵ ، زاڵ ،کاڵ ، خاڵ،.....)، لەسەر ئاستی بەشەکانی ئاخاوتن، وەك (ناوەکان ، ئاوەڵناوەکان ، جێناوەکان،....)، و لەسەر ئاستی ئەرك و فرێزەکانی ڕستە ، وەك (بکەرەکان ، بەرکارەکان ، کردارەکان،...)، لەسەر ئاستی واتاش (هاوواتا، دژواتا، گرتنەوە،....).)) (فەرهاد تۆفیق حسن،٢٠١٠،ل٣٥)

((هەردوو پەیوەندیی ستوونی و ئاسۆیی دەتوانرێت لەسەر یەك ڕستە جێبەجێ بکرێت، بەڵام هەریەکەیان بە ئاڕاستەی خۆی. )) (نەریمان خۆشناو،٢٠١٤،ل١٥٢)

کەواتە دەتوانین بڵێین پەیوەندیی ئاسۆیی سەر بە ئاستی سینتاکسە و لەو بوارەدا کاردەکات و پەیوەندیی دانەدانەی وشەکانی نێو ڕستە بەیەکەوە گرێ دەدات، بەڵام ئاستی ستوونی سەر بە ئاستی واتایە و بە ئاڕاستەی وشەسازی کاردەکات.

**٤- دیاردەکانی ناو پەیوەندییە واتاییەکان:**

((هەبوونی پەیوەندی لەنێوان وشەکانی زماندا، هۆیەکە لە هۆیەکانی گۆڕانی واتا و پێشکەوتنی وشە، کە دیاردەیەکی سروشتی و ئاساییە لە هەمو زمانێکدا و هیچ ئاستەنگ و بەربەستێك ناتوانێت ڕێ لە ڕوودانی بگرێت، چونکە وشە وەك گیانلەبەر لە بوون و زاوزێ و پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەدایە و جۆرەها گۆڕان بەسەر ڕواڵەت و ناوەڕۆکیدا دێت بەپێی پێویست و توانای، بۆیە نابێت سەرپێیی و ڕووتی سەیری ڕواڵەتە دیار و واتا باو و ناسراوەکەی بکەین، چونکە وشە لق و پۆپی لە دەیەها وشە و ڕستە و ئیدیۆمدا بڵاو دەکاتەوە بە گوێرەی فراوانی بەکارهێنانی.)) (دارا حمید،٢٠١٠،ل٧٨).

((دیاردەی واتایی ئەو دیاردانەن، کە لە ناو پەیوەندییە ستوونی و ئاسۆییەکاندا سەر هەڵدەدەن، دیاردە واتاییەکان یەکێکن لەو دیاردانەی هەر لەکۆنەوە لەلایەن زمانەوانەکانەوە گرنگی پێدراوە، چ لەلای ئەوروپییەکان بێت یان لای عەرەبەکان، لەناو زمانەوانە کوردەکانیش گرنگی پێدراوە، زمانەوانەکان زاراوەی جیایان بۆ داناوە، هەندێکیان بە کێشەی واتایی ناوی دەبەن، هەندێکی تر بە پەیوەندیی واتایی و هەندێکیشیان بە دیاردەی واتایی )). (فەرهاد تۆفیق حەسەن،٢٠١٠،ل٣٧)

گۆڕانی واتای وشە و توانستی بەکارهێنانی لە شوێنی جیاواز و گەیاندنی مەبەستی جۆراوجۆردا، زۆرجار دەبێتە هۆی پەیدابوونی دیاردەکانی (هاوواتایی، دژواتایی، هاوبێژی، فرەواتا، لێڵی، هایپۆنیم، بوارە واتاییەکان.) لەزماندا. (دارا حمید،٢٠١٠،ل٧٨)

پەیوەندیی واتایی لەسەر ئاستی هەرسێ پەیوەندییەکە سەر هەڵدەدەن، واتە پەیوەندیی ئاسۆیی و ستوونی و کێڵگەی واتایی.

**أ-لەسەر ئاستی پەیوەندیی ستوونی زمانەوانەکان ئەم دیاردانەیان باسکردووە:**

**١-هاوواتا:**

بریتییە لەوەی کە دوو وشە/دوو یەکەی زمانی لە هەموو ژینگەیەك، یاخود لە ژینگەیەکی دیاریکراودا، بەیەك واتا بێت. (فەرهاد تۆفیق حەسەن،٢٠١٠،ل٣٧)

((دیاردەی هاوواتایی بەیەکێك لە پەیوەندییە هەرە گرنگەکانی نێوان وشەکانی زمان دادەنرێت، وشەی هاوواتا بەو وشانە دەوترێت کە یەك مانا دەبەخشن یان مانایان لێك نزیکە، بەڵام لە خوێندنەوە و نووسیندا جیاوازن.)) (داراحمید،٢٠١٠،ل٧٩)

وەك/کەنیشك، کچ، کیژ، دوێت

مەت، پوور، پلك، میمك. (غازی علی خورشید،٢٠١١،ل٨٣)

**٢-دژواتایی:**

یەکێکە لە پەیوەندییە واتاییەکانی نێوان وشەکان، لە واتاسازیی وشەدا بەو وشانە دەوترێت کە لە مانادا بەرامبەر بە یەك دژ وەستاون، یان بریتییە لە دوو وشەی جیاواز، کە دوو واتای جیاوازی دژ بە یەکیان هەیە، کەواتە دژواتا وەك دیاردەیەکی دوو لایی پەیوەندیی نێوان دوو شت، یان دوو کەس نیشان دەدات، کە بیری دژایەتی و بەرەنگارییان بەرامبەر یەکتر تێدایە. (تالیب حوسێن، ٢٠١١،ل٨٨)

وەك/ کوڕ × کچ

جوان× ناشرین

سارد × گەرم

**٣- داپۆشین (هایپۆنیم):**

ڕەنگدانەوەی تایبەتییەکی مێشکە توانای پۆلکردن یان دابڕینە: ڕەنگ وشەیەکی گشتییە باڵ بەسەر- سپی و ڕەش و سەوز و زەرد و سوور و شیندا دەکێشێ. هەروەها گوڵ ئەندامانی پۆلە گشتییەکەی بریتین لە گوڵە باخ، مێخەك، گوڵاڵەسوورە، نەسرین.....(محمد معروف فتاح،١٩٩٠،ل١٦٣)

کەواتە هایپۆنیم وشەیەك کۆمەڵە وشەیەکی تر لەژێر سایەی خۆیدا کۆدەکاتەوە، مەرج نییە هەمو وشەکانی زمان بەو شێوەیە وشەیەك بیانگرێتەوە بە وشە گشتییەکە دەڵێن داپۆشین و وشە تایبەتییەکانیش هایپۆنیم.

**٤- لێڵی:**

لە فەرهەنگدا زۆرجار وشەکانی زمان بۆ چەند مەبەستێکی جیاواز بەکاردێن، جیاوازی بەخشینی واتای هەر کەرەستەیەکیش-وشە یان ڕستە- بێت، دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و تێکەڵبوونی ئەو واتایە لای گوێگر، یان خوێنەر. بە واتایەکی تر هەر کەرەستەیەك لە دوو واتا یان زیاتر بگەیەنێت، ئەوا ئەو کەرەستەیە تەمومژاوییە. ئەمەش لەئەنجامی هەندێ دیاردەی زمانی لە وشەکاندا ڕوودەدەن و دەبنە هۆی تەمومژیی واتایی (فەرهەنگی) وەك لە دیاردەکانی هاوبێژی و فرە واتا دەبینرێن.

**٥- هاوبێژی:**

هەندێ جار دوو وشەی واتا جیاواز یەك فۆرم وەردەگرێت، ئەمەش سێ جۆری هەیە:

**١- هاودەنگ:** ئەو وشانەن کە لە وتندا لەیەکتر دەچن، بەڵام جیاواز دەنووسرێن (لە کوردیدا نییە).

**٢- هاوپیت:** ئەو وشانەن کە لە نووسیندا وەك یەکن، بەڵام جیاواز دەوترێن. وەك:

هەمانە____توورەکەی لە پیست دروستکراو

____شتێکمان هەیە

**٣-هاوبێژیی تەواو:** ئەو وشانەن کە لە نووسین و وتندا وەك یەکن. وەك:

ئاش___ جێی هاڕین

___ چێشت

**٦-فرە واتا:**

هاتنی دانەیەکی فەرهەنگی بە زنجیرەیەك واتای جیاوازەوە. وەك:

زمان: ئەندامێکی لەش

زمان لغە

بەرپێی خۆی نابینێت: کەسێك چاوی باش نەبینێت.

کەسێکی نەشارەزا و نەزان.

کەسێکی لەخۆبایی بوو. (دارا حمید،٢٠١٠،ل١٢٨-١٢٩)

**ب-لەسەر ئاستی پەیوەندیی ئاسۆیی ئەم دیاردانەی**[*]

١-هاوڕێیەتی:

أ-ئاسایی ب-بەبەرد بوو/چەسپیو.

٢-هەمبەری:

أ-سینتاکسی ب-فرێزی

---

[*] لە پەیوەندیی ئاسۆییدا دیاردەکانی هاوڕێیەتی و هەمبەری بەوردی لە لاپەڕەی( ) باسمان کردووە.

## بەشی دووەم
## دیاردەی واتایی ئاسۆیی و ستوونی لە شیعرەکانی شاعیر (لەتیف هەڵمەت)دا

**١/٢-دیاردەی واتایی لە ئاستی ستوونیدا:**

**یەکەم: دژیەك:**

من هیچم نەدی
کورسییەکی بێ قاچ نەبێ
کچێکی لەسەر درێژ بووبوو
نازانم کچەکە ڕووت بوو
یا پۆشتە (دیوانی لەتیف هەڵمەت، ٢٠٠٦: ٤٧٣)

لێرەدا شاعیر زۆر بەوردی وشەکانی بەکارهێناوە، وشەی (ڕووت × پۆشتە) دیاردەیەکە لە پەیوەندییە واتاییەکانی وشەکانی زمان کە ئەویش دیاردەی دژ یەکە.

٢-من لەتیف هەڵمەتم
خەو بە جەنگی ئاشتییەوە دەبینم
لە هەڵە جوانەکانمدا
بەختی کچان دەخوێنمەوە (ل:١٢)

هەروەها وشەکانی (جەنگ و ئاشتی) و (هەڵە و جوان) دوو دیاردەی دژیەکن.

٣-کە خۆشەویستی لەدایك بوو
ڕق هاتە کایەوە
کە خۆر کەوتە گڕوگاڵ
تاریکی ڕێی لێ گرت
کە ڕاستی پێی گرت
درۆ چەقۆی لێ تیژ کرد (ل:٦٥)

شاعیر زۆر بەجوانی وشەکانی (خۆشەویستی، ڕق) و (خۆر، تاریکی) و (ڕاستی، درۆ)ی بەکار هێناوە کە دوو دیاردەی دژیەکن.

٤- کە ڕۆژ خۆی ڕووت دەکاتەوە
لە چەمەکاندا مەلە دەکات
تاریکایی لە شووشەیەکدا کۆدەکەمەوە
هەندێ وشەی نوێی پێ دەنووسم (ل:٧١)

هەردوو وشەی (ڕۆژ ، تاریکایی) لە واتادا دژیەکن.

**دووەم: لێڵی:**

٥- ئەی گوڵ لێرەدا مەڕوێ مەڕوێ
بۆ..بۆ..بۆ..؟
با پریشکی بارووتی خێڵایەتی
پاکیزەییت نەسمێ..
ئەی با لێرە پیاسە مەکە
بۆ؟
با لە شەڕی حیزبایەتیدا
بە دیل نەگیرێی.. (ل:٣٨)

شاعیر زۆر بەجوانی مەبەستەکانی لە چوارچێوەی پەیوەندیی واتاییدا دەربڕیوە کە هۆکاری جوانی شیعرن، لێرەدا هەردوو وشەی (گوڵ، با) واتایان لێڵە و چونکە زیاتر لە واتایەکیان هەیە کە ئەمانەن:

گوڵ_____ گوڵ/ڕووەك
_____ کچی جوان وەك گوڵ
با_____ با
_____ مرۆڤێکی بێ تاوان

کەواتە هەردوو وشەی (گوڵ و با) واتایان لێڵە، فرە واتان چونکە زیاتر لە واتایەکیان هەیە واتاکانیش لەیەك نزیکن.

٦- زەنگی هەور لێدەدات
به زەوی بڵێن
فەرشە گوڵ گوڵینەکەی ڕاخات
میوانی دێ (ل:٢٣٦)

وشەکانی (زەنگ، فەرش ، میوان) واتایان لێڵە، فرە واتان چونکە زیاتر لە واتایەکیان هەیە واتاکانیش لەیەك نزیکن.

زەنگ_____ زەنگی ئاگادار کردنەوە
_____ دەنگی بەرز
فەرش_____ فەرش بۆ ڕاخستن و دانیشتن لەسەری زۆر جار ڕەنگاوڕەنگە
_____ ڕەنگین بوونی زەوی بە گوڵ و گوڵزار لە وەرزی بەهاردا
میوان_____ میوان کە سەردانی مرۆڤ دەکات و کەسێکی خۆشەویستە
_____ وەرزی بەهار کە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی و پێشوازی لێ دەکرێت

**چوارەم: هاوبێژ:**

٧- هەور
ژان گرتی
شەو تا بەیانی
ناڵاندی و ناڵاندی
بۆ بەرە بەیانی لافاوی بوو (ل: ٢٥٧)

شاعیر لەم شیعرەدا زیاتر لە مەبەستێکی هەیە، هەردوو وشەی (هەور و لافاو) واتایان لێڵە، هاوبێژن چونکە زیاتر لە واتایەکیان هەیە واتاکانیش لەیەك دوورن.

هەور_____ هەور لە ئاسمان
_____ ژنێك کە منداڵی ببێ
لافاو_____ لافاو کە دوای بارانێکی زۆر ڕوودەدات و زیانی هەیە

ــــــــ دوای لەدایك بوونێکی ناڕەحەت منداڵێکی خراپی لێ دەرچێت

٨- بایەك بازی دایە ئەو باخەوە
ڕەنگە گوڵ
یا میوە بدزێ
یا دەشێ
لەوێ چاوەڕوانی کچێك
بکات (ل:٢٣٩)

وشەی ( با ) واتای لێڵە، چونکە تەنها مەبەستی شاعیر با ناگرێتەوە، بۆیە هاوبێژە چونکە زیاتر لە واتایەکی هەیە واتاکانیش لە یەك دوورن.

با ــــــــ با/ڕەشە با
ــــــــ کەسێکی خراپ

٩- ئەی گوڵ
بە چ زمانێك
لەگەڵتدا بدوێم
بە چ زمانێك
بتلاوێنمەوە
ئەی گوڵ؟ (ل:٢٥٨)

هەروەها وشەی ( گوڵ ) واتای لێڵە، هاوبێژە چونکە زیاتر لە واتایەکی هەیە واتاکانیش لە یەك دوورن.

گوڵ ــــــ گوڵ وەك ڕووەکێك
ــــــ کچێك/خۆشەویستەکەی
ــــــ منداڵێك کە پێویستی بەلاواندنەوە هەیە

**پێنجەم: داپۆشین (هایپۆنیم):**

هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد داپۆشین وشەیەکی گشتییە و باڵ دەکێشێ بەسەر وشەیەکی تایبەتیدا کە پێی دەوترێت هایپۆنیم.

١٠- من جوگرافیای زەوی دەگۆڕم
چەند کیشوەرێکی نوێ و
چەند دەریایەکی تازە و
چەند ئۆکیانووسێکی دی و
چەند زنجیرە شاخێکی تر
دروست دەکەم (ل:٢٣٠)

شاعیر زۆر بەجوانی لەم دەقە شیعرییەدا دیاردەی داپۆشینی بەکارهێناوە کە ئەمیش چەند هایپۆنیمێک لەخۆ دەگرێت، (جوگرافیا) وشە گشتییەکەیە و باڵ دەکێشێ بەسەر وشە تایبەتییەکانیدا کە ئەوانیش (کیشوەر، دەریا، ئۆکیانووس، زنجیرەشاخ)ن.

جوگرافیا (داپۆشین)
(کیشوەر ، دەریا، ئۆکیانووس ، زنجیرەشاخ)     (هایپۆنیمن)

١١- دروست کردنی قوتابخانەیەك
زۆری تێدەچێ..
هەزاران تەن ئاسن
هەزاران تەن چیمەنتۆ و گەچ و لم و چەو
هەزاران تەن کەرەستەی دی
هتد.
جگە لە بەڕێوەبەر و
مامۆستا و
سەدان ڕیحلە و
دەیان تەختە ڕەشە و
هەزاران قاڵب دەباشیر و
شتی دی (ل:٢٦٨)

بینای قوتابخانە وشە گشتییەکەیە و وشەکانی (چیمەنتۆ و گەچ و لم و چەو بەڕێوەبەر، مامۆستا، ڕیحلە، تەختە ڕەشە، دەباشیر) دەگرێتەوە. واتە بینای قوتابخانە (داپۆشینە) و (چیمەنتۆ و گەچ و لم و چەو بەڕێوەبەر، مامۆستا، ڕیحلە، تەختە ڕەشە، دەباشیر) (هایپۆنیمن).

١٢- کاتەکانم
به ناخی هەفتەدا هەڵدەواسم
هەفتەکانم
به ناخی مانگدا هەڵدەواسم
مانگەکانم
به ناخی ساڵدا هەڵدەواسم
ساڵەکانم
به ناخی تەمەندا هەڵدەواسم (ل:٢٨٧)

(کات) وشە گشتییەکەیە و داپۆشینە وشەکانی (هەفتە، مانگ، ساڵ) دەگرێتەوە و هایپۆنیمن.

**دووەم: دیاردەی واتایی لە ئاستی پەیوەندیی ئاسۆیی:**

**یەکەم/هاوڕێیەتی:** ئەم پەیوەندییانە دەگرێتەوە:

**١- ئاسایی:**

١٣- منداڵێك حەزی لە وێنەکێشان بوو
وێنەی هەتاوێکی کێشا
پۆلیسێك حەزی لەوێنەکێشان بوو
وێنەی زیندانێکی کێشا
ڕاوچییەك حەزی لەوێنەکێشان بوو
وێنەی تاپڕێکی کێشا
کۆترێك حەزی لەوێنەکێشان بوو
وێنەی ئاسمانێکی کێشا (ل:٢٣٥)

لێرەدا پەیوەندیی نێوان وشەکانی(منداڵ و هەتاو) وەپەیوەندیی (پۆلیس و زیندان) و پەیوەندیی (ڕاوچی و تاپڕ) و پەیوەندیی (کۆتر و ئاسمان) پەیوەندیی نێوان هەریەك لەم وشانە بەشێوەیەکە لەسەر بنەمای ڕێککەوتن و یەکتری تەواوکردنە، بەم پەیوەندییەش دەوترێت هاوڕێیەتی واتە هاوڕێیەتی و پەیوەندی لەنێوان وشەکاندا هەیە.

**٢- پەیوەندیی ئاسۆیی ناچاری/بەبەردبوو/چەسپیو:**

١٤- بەهار گوڵەکانی خۆی
پاشەکەوت کرد
بۆ ساڵێکی دی (ل:٤٦٧)

پەیوەندیی نێوان (بەهار و گوڵ) پەیوەندییەکی بەبەرد بووە، کە دەڵێین بەهار ڕاستەوخۆ گوڵ و سەوزایی دەکەوێتە بیرمان ، وەهەرکاتێك ناوی (پایز) بهێنرێت بیرمان بۆ (گەڵاوەرین و زەرد بوونی گەڵای دار) دەچێت، کەواتە پەیوەندیی نێوان ئەم وشانە بەناچارییە و بەندە بەڕێککەوتنی کۆمەڵەوە.

١٥- دڵم هەڵدەدەمە
خۆڵەمێشی ئۆقیانووسێکەوە
دەشێ
نەهەنگێك
عاشقی بێ (ل:٤٥٨)

بەهەمان شێوە (نەهەنگ) لە (ئۆقیانۆس)دا دەژی بۆیە پەیوەندییەکە ناچارییە، چونکە نەهەنگ لە ئۆقیانۆسدا دەژی و بەم پەیوەندییەش دەوترێت ناچاری.

**دووەم: هەمبەری:** ئەم پەیوەندییانە دەگرێتەوە:

**١- هەمبەری فرێزی:**

١٦- مافی مرۆڤ/ هێستری ئاوس/ کەڵەشێری مێینە/
مریشکی نێر/ هێلکەی شەمشەمە کوێرە

سوورێنەی هێلکە/زەردێنەی خوێن
جووتێ پێڵاوی تاکە و تاك/ مافی مرۆڤ (ل:٤٤)

لێرەدا هەریەك لە وشەکانی (هێستری ئاوس، کەڵەشێری مێینە، مریشکی نێر، هێلکەی شەمشەمەکوێرە، سوورێنەی هێلکە، زەردێنەی خوێن) هەمبەری فرێزین، کە لە ئەنجامی نەگونجانی واتای ئەو وشانەوە دروست بووە کە خراونەتە پاڵ یەك، دیارە مەبەستی شاعیر لێرەدا ئەوەیە لەم وڵاتەدا شتێک نییە بە ناوی مافی مرۆڤ.

١٧- چاڵی بەرز/ چیای قووڵ
پێڵاوی سەری کەچەڵ/ شەبقەی پێی ماندوو
دەمانچەی ئاشتی/کۆتری شەڕ/بەردی نەرم/تەمی ڕەق (ل:٢١٤)

وشەکان لەم فرێزانەدا پێکەوە ناگونجێن و بەپێچەوانەوە بەکارهاتوون (چاڵی بەرز، چیای قووڵ پێڵاوی سەری کەچەڵ، شەبقەی پێی ماندوو، دەمانچەی ئاشتی، کۆتری شەڕ، بەردی نەرم، تەمی ڕەق) بۆیە بوونەتە هەمبەری فرێزی.

**٢- هەمبەری سینتاکسی:**

١٨- سەدەیەکی سەیرە
مار دەفڕێ
بولبول دەوەڕێ
گوڵ هاژە هاژ دەکا
ئاو پێدەکەنێ
دارستان گڤەگڤ دەکات
با میوە دەگرێ
سەگ شیعر دەنووسێ
قیر وەك بەفر سپییە (ل:١٨_١٩)

ئەم دێڕە شیعرانە کە هەر نیوەدێڕێك لە ڕستەیەك پێکدێت کە واتاکانیان تەنها بۆ شیعر دەست دەدەن و مەبەستێکی تری لە پشتەوەیە، بۆ ئاخاوتنی ئاسایی ناگونجێن (مار دەفڕێ ، بولبول دەوەڕێ، گوڵ هاژە هاژ دەکا، ئاو پێدەکەنێ،

دارستان گڤەگڤ دەکات، با میوە دەگرێ، سەگ شیعر دەنووسێ، قیر وەك بەفر سپییە) ئەم دێڕە شیعرانە کە هەریەکێکیان ڕستەیەکی تەواون هەمبەری سینتاکسین، نەگونجانی واتای سیمانتیکی کەرەستەکانی ناو ڕستەکانە.

١٩- جارێکیان ڕێم کەوتە وڵاتێك/ پشیلە قسەی دەکرد
مرۆڤ دەوەڕی/ دار دەیمیاواند/ سەگ دەیحیلاند (ل: ١٠٠)

(پشیلە قسەی دەکرد، مرۆڤ دەوەڕی، دار دەیمیاواند، سەگ دەیحیلاند) هەمبەری سینتاکسین کەرەستەکانی ناو ڕستەکان لەهەر نیوە دێڕێکدا لەڕووی واتاوە ناگونجێن.

**ئەنجام**

١- پەیوەندییە واتاییەکان پەیوەندی و پێکەوە هاتنی کەرەستەکانی زمانە کە لەکاتی ئاخاوتندا قسەکەر ڕەچاوی دەکات، بە هەمان شێوە لەزمانی ئەدەب و شیعریشدا ڕەنگ دەداتەوە و جوانی بە دەقەکە دەبەخشێت، پەیوەندیی واتایی دوو جۆرە: ئاسۆیی و ستوونی.

٢- پەیوەندیی ئاسۆیی پەیوەندیی وشەکانی نێو ڕستەیە لەگەڵ یەکتریدا لەسەر بنەمای ڕێککەوتن و یەکتری تەواوکردن دامەزراوە، پەیوەندیی ئاسۆیی دوو جۆرە (هاوڕێیەتی، هەمبەری) ئەم پەیوەندییەش لە شیعرەکانی شاعیر (لەتیف هەڵمەت) دا دەبینرێت هەر دوو جۆری لە دێڕە شیعرەکاندا خستومانەتە ڕوو.

٣- پەیوەندیی ستوونی پەیوەندیی وشەکانی نێو ڕستەیە لەگەڵ وشەی تری زمانەکە لە دەرەوەی ئەو ڕستەیە کە بتوانن جێی یەکتری بگرنەوە بەمەرجێك کار لە پێکهاتەی ڕێزمانیی ئەو ڕستەیە نەکات، لە پەیوەندیی ستوونیدا ئەم دیاردانە بەرچاو دەکەوێت (هاوواتا، دژواتا، لێڵی، فرەواتا، هاوبێژ، هایپۆنیم) ئەم دیاردانەش لە شیعردا بە زۆری بەرچاو دەکەوێت و سەرجەمیان لە دێڕە شیعرەکاندا ئاماژەمان پێکردووە.

٤- سەرجەم ئەم دیاردانە لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا بە ڕوونی دەبینرێن و ئاماژەمان بۆ کردوون.

## سەرچاوەکان

نامەی ئەکادیمی/

١- فەرهاد تۆفیق حسن، ٢٠١٠، پەیوەندییە واتاییەکان و هەندێك دیاردەی واتایی لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر.

کتێب/

٢- دارا حمید، ٢٠١٠، واتاسازی، چاپەمەنی ژیر، سلێمانی، چاپی یەکەم.

٣- دارا حمید، ٢٠١٤، هەندێ لایەن لە تیۆرییەکانی زمان، چاپخانەی گەنج، چاپی یەکەم.

٤- تالیب حوسێن، ٢٠١١، واتاسازی (چەند بابەتێکە لێکدانەوەی واتای وشە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، هەولێر.

٥- غازی علی خورشید، ٢٠١١، زمانی فەرمی بۆ کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی.

٦- محمد معروف فتاح، ١٩٩٠، زمانەوانی، هەولێر.

٧- محمد معروف فتاح، ٢٠١١، زمانەوانی، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی سێیەم، هەولێر.

٨- نەریمان عبدالله خۆشناو، ٢٠١٤، ڕستەسازی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی دووەم، هەولێر.

٩- لەتیف هەڵمەت، ٢٠٠٦، دیوانی لەتیف هەڵمەت، بەرگی دوەم، چاپخانەی پەیف، سلێمانی، چاپی دووەم.

**ملخص البحث**

العلامة المعنوية الأفقية والعمودية في شعر لطيف هلمەت

هذا البحث بعنوان (العلامة المعنوية الأفقية والعمودية في شعر لطيف هلمەت) اذ حدث فيه العلاقات المعنوية الأفقية والعمودية في المفردات التي وردت في أشعار الشاعر المذكور.

**أهمية البحث وأسباب اختياره:**

العلاقات المعنوية موضوع يندرج تحت علم الدلالة، ومن وظائف هذا العلم دراسة علاقات المفردات و وظيفتها في المعنى وانتاج عملية التكلم، أو استعمال مفردات اللغة التي يتناسب بعضها مع بعض، وتكرارها في عداد لانهاية لها في الجمل، وهذه الظاهرة تتجلى بصورة واضحة فى اللغة و الادب، وهذا هو السبب الرئيس في اختيار عنوان البحث الذي لم يطرق لها من قبل.

**منهج البحث وآلياته:**

أما المنهج الذي اتبعه في كتابة هذا البحث هو المنهج الوصفي، وذلک لأن أشعار قد عبرت عنها بلغة التواصل والتكلم، والآليات التي استفدت منها في بحثي هذا أشعار لطيف هلمت، وأبرز فيه العلاقات المعنوية.

**هيكل البحث:**

أما هيكل البحث فيتكون من مقدمة يليها فصلان. فتحدثت في الفصل الأول عن مفهوم وتعريف العلاقة المعنوية وأنماطها.

أما الفصل الثاني مخصص لظاهرة المعنى على مستويي الأفقى والعمودي في أشعار الشاعر المذكور، وفى الخاتمة أشرت الى مجموعة من النتائج توصلت اليها في بحثي هذا.

## Abstract

### The out line of the research
### Horizontai andverticalmeaning relation in (Latif Halmat) poems

This research is in tatled as(Horizontai andverticalmeaning relation in (Latif Halmat) poems, coming wordstogeter relation in the lines, in both horizontal and vertical level are clearly indicated.

**The importance and reason of selection the research:**

Meaning relations are semantic subjects, that include the relation are semantic subjects, that include the relation of coming of language words together to convey the perfect message and conclude dialogue action. Or harmonizing the language words together and repeationg innumberable in meaningful sentences.

**The materoal and method of the research:**

The research is adhered to descriptive method becauce the language of the poems is written in todays conversation language.

Regarding the research material,the poems of akurdish poet (Latef halmat) are used.

**This research consists of two parts except introduction and conclusion:**

In the first part, the concept, the definition of meaning relation , the types of meaning relation, and noun phenomenon are stated.

In the second part, meaning phenomenon in both vertical and horizontal level in the poems are explained.

# هزر له چیرۆکەکانی (حەسەن جاف) دا
## کۆمەڵە چیرۆکی (دیجلەی تاوان) بەنموونە

**م. ی. تەڵعەت محەمەد عەزیز**
بەشی زمانی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە- ئاکرێ
زانکۆی دهۆک

**پ. د. سەلیم رەشید ساڵح**
بەشی زمانی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە
زانکۆی سەلاحەددین

**پوختە**

لێکۆڵینەوەکە بەناونیشانی (هزر له چیرۆکەکانی حەسەن جاف دا، کۆمەڵە چیرۆکی دیجلەی تاوان بەنموونە) دا وەك بەشێکی گرنگی پێکهاتەی دەقەکان، بەشدارییەکی فراوانی هەیە لە دروستبوونی دەقەکاندا، کە لێرەدا هەوڵمانداوە بە رێبازێکی شیکاری لایەنی هزری له چیرۆکەکان شیبکەینەوە و گرنگترین جۆری ئەو هزرانە دەستنیشان بکەین کە لە چیرۆکەکانی چیرۆکنووس ڕەنگی داوەتەوە و بوونەتە هەوێنی سەرەکی چیرۆکەکانی.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دوو بەش پێکدێت:

**بەشی یەکەم:** لەم بەشەدا ئەم بابەتانە باسکراوە (هزر وەك تێڕوانینێکی تیۆری، چەمکی هزر، هزر لە دەقە جیاوازەکاندا، هزر لە چیرۆکی کوردیدا).

**بەشی دووەم:** لەم بەشەدا بۆ زیاتر ناساندنی هزر لە چیرۆکی کوردیدا، کۆمەڵە چیرۆکی (دیجلەی تاوان)ی (حەسەن جاف)مان وەك نموونە وەرگرتووە، کە لەم بەشەدا ئەم بابەتانە باسکراوە ( هزر لای حەسەن جاف، شیکردنەوەی چیرۆکەکانی حەسەن جاف لە ڕووی هزرەوە، هزری سیاسی، هزری نیشتیمانی (نەتەوەیی)، هزری ئەفسانەیی، هزری ڕەمزی).

لە کۆتاییدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە نووسەر لەم کۆمەڵە چیرۆکەدا توانیویەتی بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە مامەڵە لەگەڵ هزری جۆراوجۆر بکات، هەروەها هزری سیاسی بەشێکی زۆربەی چیرۆکەکانی داگیرکردووە.

**وشە کلیلییەکان**: هزر، چیرۆک، حەسەن جاف، دیجلەی تاوان

**پێشەکی**

هەر دەقێك یان بابەتێك کە دەنووسرێت یان لە دایك دەبێت، لە بنچینەدا دەرهاویشتەی هزرێکە، یان بەواتایەکی تر بناغەی دەستپێکیان لە هزرەوە دەست پێدەکات، لە نێو ژانرەکانی ئەدەبیشدا، هەر ژانرەو شێوازێك یان خاوەنی هزرێکی تایبەت بەخۆیەتی، کەواتە نووسەرێك خاوەنی هزرێکی یان شێوازێکی بیرکردنەوەی تایبەت بەخۆیەتی، بەم هۆیەشەوە هزر دەبێتە خاڵی بەیەکەوە بەستنی نووسەر و دەقەکە.

هزری کوردی بەگشتی بە چەندین قۆناغ و بارودۆخی جیاواز تێپەڕیوە. چیرۆکنووسان بەپێی ژیان و بارودۆخی سەردەمەکانی خۆیان لە چیرۆکەکانیاندا گوزارشتیان لە هزری خۆیان کردووە، بابەت و ژیانی خۆیان و خەڵکانی ئەو سەردەمەیان کردووە بە هەوێنی چیرۆکەکانیان، بۆیە دەبینین لە چیرۆکی کوردیدا بەپێی سەردەمەکان هزری جۆراوجۆر و تازە بوونەتە کەرەستەی چیرۆکەکان. سەرەتا هزرەکان بەشێوەی سادە بوون و زیاتر ڕەنگدانەوەی هەندێ لایەنی کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگا بوون و بەشێوەی سادە هزرەکان گوزارشتیان لێ دەکرا، دواتر قۆناغ بە قۆناغ هزرەکان گۆڕانکارییان بەسەر داهاتووە، هزری تازە و بەدارِشتنێکی تازەوە هاتۆتە ناو چیرۆکی کوردییەوە.

چیرۆکنووس هزرەکانی سەردەمی خۆی کردۆتە هەوێنی سەرەکیی چیرۆکەکانی، بەشێوەیەکی هونەری وا مامەڵەی لەگەڵ کردوون کە سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، لە ڕێگەی چیرۆکەکانیەوە ئەو پەیامە کە لە هزری ئەودا پەنگی خواردۆتەوە دەری ببرێت و بیگەیێنێت بەخوێنەر، هەندێك جار هزرەکانی تێکەڵ کردووە لە چیرۆکەکانی بەشێوەیەك کە جۆرێك لە تێکەڵاوی دروست بکات و خوێنەر بەلایەکی تر ڕابکێشێت، هەریەك لەم هزرانە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بارودۆخی ئەو سەردەمەی نەتەوەی کورد یان ژیانی تایبەتی نووسەر یان ژیانی کەسانێکی دەوروبەری نووسەر بێت، ئەمەش جۆر و بیرکردنەوە و تێڕوانینی چیرۆکنووس نیشان دەدات.

سنووری لێکۆڵینه‌وه‌که شیکردنه‌وه‌ی لایه‌نی هزری و جۆره‌کانیه‌تی له چوارچێوه‌ی کۆمه‌ڵه چیرۆکی (دیجله‌ی تاوان)ی "حه‌سه‌ن جاف دا" که ئه‌م کۆمه‌ڵه چیرۆکه ده‌که‌ینه سنووری لێکۆڵینه‌وه‌که‌مان.

ئامانجی لێکۆڵینه‌وه‌که سه‌ره‌تا خستنه‌ڕووی پێناسه و چه‌مکی هزر و ڕه‌نگدانه‌وه‌ی هزر و جۆره‌کانیه‌تی لای چیرۆکنووس، دواتر ده‌ستنیشانکردنی جۆره‌کانی هزر و ئه‌و لایه‌نه هزرییه‌ی، که به‌سه‌ر چیرۆکه‌کاندا زاڵه، ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه هیچ گیروگرفتێکی نه‌هاته پێش، که شایه‌نی ئه‌وه بێت لێره باسی بکه‌ین.

له لێکۆڵینه‌وه‌که‌ماندا میتۆدی وه‌سفی شیکاری به‌کارهاتووه" که له به‌شی یه‌که‌مدا زیاتر میتۆدی وه‌سفی به‌کارهاتووه، به‌ڵام له به‌شی دووه‌مدا زیاتر میتۆدی شیکاری به‌کارهێناوه.

ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه له دوو به‌ش پێکدێت:

**به‌شی یه‌که‌م:** له‌م به‌شه‌دا ئه‌م بابه‌تانه باسکراوه (هزر وه‌ك تێڕوانینێکی تیۆری، چه‌مکی هزر، هزر له ده‌قه جیاوازه‌کاندا، هزر له چیرۆکی کوردیدا).

**به‌شی دووه‌م:** له‌م به‌شه‌دا بۆ زیاتر ناساندنی هزر له چیرۆکی کوردیدا، کۆمه‌ڵه چیرۆکی (دیجله‌ی تاوان)ی (حه‌سه‌ن جاف)مان وه‌ك نموونه وه‌رگرتووه، که له‌م به‌شه‌دا ئه‌م بابه‌تانه باسکراوه ( هزر لای حه‌سه‌ن جاف، شیکردنه‌وه‌ی چیرۆکه‌کانی حه‌سه‌ن جاف له ڕووی هزره‌وه، هزری سیاسی، هزری نیشتیمانی (نه‌ته‌وه‌یی)، هزری ئه‌فسانه‌یی، هزری ڕه‌مزی).

له کۆتاییدا ئه‌و ئه‌نجامانه‌ی که له‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه‌دا پێی گه‌یشتووین، به چه‌ند خاڵێك خراوه‌ته ڕوو.

# بەشی یەکەم
# هزر وەک تێڕوانینێکی تیۆری

## ١-١ چەمکی هزر :

هزر یەکێکە لەو چەمکە فراوانەی کە بە شێوەی جیاواز لێکدانەوەی بۆ کراوە، ئەمەش بۆ ئالۆزی و ناڕوونیی ئەم چەمکە دەگەڕێتەوە، کە بەشێوەیەکی فراوان لەنێو بوارە جیاوازەکاندا بەکارهاتووە و لێکدانەوەی بۆکراوە. سەرەتا دەربارەی ئەم چەمکە لە زمانی ئینگلیزیدا، بەرامبەر وشەی هزر وشەی (Thought) بەکار هاتووە (لێژنەی ئەدەبی کۆڕی زانیاری کورد، ٢٠٠٦:١٦٨)، کە پەیوەندیی بە هەر زانست و بابەتێك هەیە، یان زۆرجار دەگوترێت بناغەی هەر زانست و کارێکە. سەرەڕای ئەمە چەندین لێکۆڵەر و فەیلەسوف پێناسەی هزریان کردووە وەکو (( ئەو چالاکیە گیانییەیە، یان ناماددییە کە لە پێکهاتەی ماددی (مێشك) دەکەوێتەوە و تایبەتمەندی و توانای مرۆڤ لەچاو بوونەوەر و زیندەوەرەکانی تر دەردەخات، بەوەدا کە پرۆسەیەکە لە بنەماکانی لۆژیك پشت بەستووە، واتە چالاکییەکی ڕێکوپێك و تەواوە، بێ ئەوەی هەستی پێ بکرێت)) (حمید عزیز، ٢٠٠٩:٣٠)، واتا بەپێی ئەم پێناسەیە بێت هزر لایەنێکە لەو لایەنە سەرەکییانەی کە تایبەتە بە چالاکیی مێشك و هۆکارێکی سەرەکی جیاکردنەوەی تایبەتمەندی و کار و کردەوەکانی مرۆڤە لەگەڵ بوونەوەر و زیندەوەرەکانی تر. هەندێکی تر هزر دەبەستنەوە بە زمان، بەوەی کە (زمان ئەو کەرەستەیە کە هزر کاری تێدا دەکات، هزریش ئەو لایەنەیە کە کەرەستە زمانییەکان لە خۆ دەگرێت و کۆیان دەکاتەوە، بەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە پەیوەندیی نێوان زمان و هزر، پەیوەندییەکی دوو لایەنەیە. وەك دوو ڕووی یەك دراون) (محمد داود، ٢٠٠٩:٣٣)، پەیوەندییەکی دوو لایەنە و نەبڕاوە لەنێوان (زمان و هزر)دا بوونی هەیە، لە ڕوانگەیەکی ترەوە هزر (بیرکردنەوەیە لە شتێکدا، یان شتێك کە چەند جارێك دووبارە بکرێتەوە) (احمد بن فارس، ٢٠٠٨:٣٢٨)، واتە هزر بریتییە لەکردەی دووبارەکردنەوەی بیرکردنەوە لەسەر بابەتێك یان دیاردەیەك.....هتد، هەروەها غەزالی بەم شێوەیە باسی چەمکی هزر دەکات و دەڵێ: ((هزر واتە هێنان و بردنی دوو زانیاری (مەعریفە) لە عەقڵدا بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە زانیاری (مەعریفەی) سێیەم بێتە ئەنجام و دروست بوون)) (ابو

حامد محمد، ٢٠٠٦:١٨٠١)، واتە هزر کرداری ئاڵوگۆڕی و لێکدانی دوو بیر یان دوو بۆچوون یان دوو زانیاری ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە بتوانرێت بۆچوونی سێیەم یان زانیارییەکی جیاواز بێنێتە کایەوە، هەندێکی تر بیر دەبەستنەوە بەبیرکردنەوەی مرۆڤی بەرامبەر و دەوروبەرەکەی، ((بیر زاخاو و ناوەڕۆکی بیرکردنەوەی مرۆڤە بەرامبەر دەوروبەرەکەی، واتا کۆمەڵێك بیر و بۆچوونیەتی کە ڕۆژانە بەرامبەر بە جیهانی دەرەوەی خۆی دەریدەبڕێ، بەو دەربڕینە (بوون)ی خۆی لە ئاستی شتەکان و کەسەکانی تر دەستنیشان دەکات)) (فوئاد عبدالرحمان، ٢٠٠٩:٩)، واتە بەپێی ئەم بۆچوونە بێت، بیر پێکدێت لە کۆمەڵێك بۆچوون و تێڕوانینی جیاواز لەلایەن مرۆڤەکان کە بەرامبەر بەو دیاردە و بارودۆخ و کەرەستانەی کە لە دەوروبەری خۆیدا بوونیان هەیە دەریدەبڕێت، لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین سەرجەم ئەو پێناسانەی کە بۆ چەمکی (هزر) کراوە، لە ڕوانگە و تێڕوانینی جیاوازەوە کراوە، کە هەریەکە بەشێوەیەك گوزارشتی لەم چەمکە کردووە، بەڵام هەموویان لەوە یەکدەگرنەوە کە هزر دەربڕینی کۆمەڵێك دید و تێڕوانینی جیاوازە لەلایەن مرۆڤەکان، کە بەرامبەر بەو دیاردە و بابەتانەی لە دەوروبەریەتی.

**١-٢هزر لە ژانرە جیاوازەکاندا :**

ئەگەر سەیری ژانرەکانی ئەدەب بکەین دەبینین هەر یەکەو بەپێی تایبەتمەندی و سنووری خۆی گوزارشت لە بابەتەکان دەکەن. لە ڕووی هزرەوەش هەر یەکەو شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەم لایەنە جیاوازە، ئەگەر سەیری وتار بکەین وەك ژانرێکی ئەدەبی ئەوا دەبینین هزرەکان بەشێوەیەکی جیاواز بەکاردێن بە بەراورد لەگەڵ ژانرەکانی تر، شێوازی بەکارهێنانی هزر لە وتاردا بەشێوەیەکی فراوان ڕۆڵێکی گرنگی هەیە، چونکە چەند هزرەکە بەهێز و سەرنجراکێش بێت، ئەوا وتارەکە زیاتر پێشوازی لێ دەکرێت و دەخوێندرێتەوە و بەنێو خەڵکیدا بڵاودەبێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بەپێی بەرنامەیەك هزرەکانی بخرێتەڕوو (( هەر وتارێك پێویستە (سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی) تێدا هەبێت، نووسەر لەڕێگەی بیرەکانی خۆی بەپێی داڕشتنێکی هونەری بخاتەڕوو، یاخود لە باسێکی سەربەخۆدا کە لە چەند

پەرەگرافێکی پێکهاتوو بیرێکی دیاریکراوی خۆیدا دەخاتەڕوو، هەروەها هەڵگری ناونیشانێك بێت گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکە بکات)) (ئاریانا ئیراهیم، ٢٠١١:٢٨٦)؛ واتە داڕشتنی هزر لە وتاردا و ئەو ناونیشانەی کە بۆی دەستنیشان دەکرێت دەبێت پەیوەندییەکی دوو لایەنە لە نێوانیاندا هەبێت، چونکە ئەگەر ئەم پەیوەندییە بوونی نەبێت بەشێوەیەکی هەڕەمەکی وتارەکە بنووسرێت، ئەوا خوێنەر تووشی ڕاڕایی دەکات و لە ناوەڕۆکی وتارەکە ناگات و وای لێدەکات بێزاربێت. لەگەڵ هزرەکەدا دەبێت ڕەچاوی زمان و چینەکانی کۆمەڵگا بکرێت لە داڕشتنی وتارەکەدا، چونکە ئەگەر هزری وتارەکە چەند بەهێزبێت، بەڵام زمانەکەی لە ئاستی چینەکانی کۆمەڵگا نەبێت، ئەوا لەلایەن خەڵك بەگشتی پێشوازی لێ ناکرێت، بەڵکو لەلایەن چینێکی کەمی کۆمەڵگا دەخوێندرێتەوە، هەروەها مەزراندنی هزر لە وتاردا زۆر جار بەپێی بابەت و بیرۆکەی نووسەر و بارودۆخی ناو کۆمەڵگا جیاواز دەبێت، کە ئەمەش وتاری جیاوازی لێ دەکەوێتەوە، ئامانج لە مەزراندنی هزر لە وتاردا زیاتر دەرخستنی بابەتە شاراوەکانی ناو کۆمەڵگایە و نیشاندانی بە خەڵك و جەماوەرە، کە نووسەر بەشێوازێکی ئەدەبی و زمانێکی گشتی دەنووسێت بۆ ئەوەی خەڵك بەگشتی بخوێنێتەوە و توانای تێگەیشتنی هەبێت، چونکە دەبێت لە وتاردا ((زمانێکی سادە و ساکار بێت تیایدا وشە و دەستەواژەی ڕووت و ئاسان بەکاربهێنێت، کە زۆرترین چین و توێژەکانی کۆمەڵ بتوانن بە ئاسانی لێی تێبگەن، کە خۆی لە زێدەڕۆیی بپارێزێت و مەبەستەکە خێرا بە دەستەوە بدات)) (هیمداد حسێن، ٢٠٠٢:٩٨). بەم هۆیەشەوە هزرەکان بە شێوەیەکی بەرچاو دەخرێتە بەردەم خوێنەران کە خۆیان لە بابەتی جیاواز دەبینێتەوە وەك (وەرزشی، ئاینی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەلسەفی، .... هتد)، داڕشتنی هزر لە هەریەك لەم بابەتانە، جیاواز دەبێت.

سەبارەت بە ڕەنگدانەوە و مامەڵەی هزر لە شیعردا، ئەگەر سەیربکەین دەبینین کە لە شیعردا هزر بەشێوەیەکی جیاواز مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، کە جیاوازە لە وتار، لەم ڕوانگەیەشەوە هەریەکە و بەشێوەی جیاواز پێناسەی هزریان کردووە لە چوارچێوەی شیعردا بە بۆچوونی هەندێکیان ((هزر یان بیرۆکە بە بنیات و ڕەگەزی سەرەکی شیعر دادەنرێت لە پاڵ بنیات و ڕەگەزەکانی دی وەك : شێواز، داڕشتن،

سۆز، زمان، ئەندێشە، مۆسیقای دەرەکی (کێش و سەروا) و مۆسیقای ناوەکی (ڕێکخستن و هەماهەنگی دەنگ و بڕگە و وشەکان)))(سالار عزیز،٢٠١٤:١٦) .

کەواتە هزر بە یەکێك لە ڕەگەزە هەرە سەرەکییەکانی شیعر دادەنرێت و مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، هەروەها لە پاڵ ڕەگەزەکانی تر نابێت فەرامۆش بکرێت و پشتگوێ بخرێت، بەڵکو دەبێت بە وردی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، بەو پێیەی کە هۆنراوەش زاخاوی هەڵقوڵاوی مێشکی نووسەر و شاعیرانە، کە لە ئەنجامی لێکدانەوە و وردبوونەوەیەتی بەرامبەر بە دیاردەیەك یان ڕووداوێك یان بابەتێك کە زۆر کاریگەری لەسەر هەبووە.

**١-٢ هزر لە چیرۆکی کوردیدا :**

ئەگەر سەیری ژانرەکانی ئەدەب بکەین دەبینین هەر یەکەو بەپێی تایبەتمەندی و سنووری خۆی گوزارشت لە بابەتەکان دەکەن. لە ڕووی هزرەوەش هەریەکەو شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەم لایەنە جیاوازە.

هەروەها بەکارهێنان و مامەڵەکردن لەگەڵ هزردا لە بواری چیرۆکدا کارێکە پێویستی بە ئەزموونێکی سەرکەوتوو هەیە بۆ ئەوەی چیرۆکنووس ئەو بابەتەی کە لە مێشکیدایە، بتوانێت بە هزر و تێڕوانینێکی سەرکەوتوو دابڕێژێت، بە هزرێك بتوانێت سەرنجی نووسەر بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، هەروەها کاریگەری بخاتە سەری، ئەم هزرەش دەبێت بەشێوەیەکی بتەو ڕێك بخرێت و داڕشتنی بۆ بکرێت، کە ئەم داڕشتنەش لە لایەن کەسێکەوە ئەنجام دەدرێت و هەڵدەستێت بە لێکدانی بەشەکانی چیرۆك و چەندین ڕووداوی جۆراوجۆر لە ڕێگەی ئەم هزرەوە دروست دەکات، بەڵام دەبێت پەیوەندییەك لەنێوان بەشەکان هەبێت، چونکە چیرۆك ((چەند یەکەیەکە و لە چەند بڕگەیەك پێکدێت و هەر بڕگەیەکیش تەواوکەری بەشەکانی ترە و بە هەموویان لە ڕێگەی چۆنیەتی لێکدانیان بینا هونەرییەکەی پێکدێت و ئەو قاڵبە هونەرییە ڕێکخراوە دروست دەکات، کە لە ئەنجامی پێوەندی بە ئۆرگانەکانی نێوان بەشەکان و پێوەندییە بەناو یەکدا چووەکانی نێوان بنەما هونەرییەکان بەپێی یاساکانی ناوەوە دروست دەبێت)) (پەرێز سابیر، ٢٠٠٥:٦٥)، کەواتە دەبێت نووسەر ئاگاداری

دارشتنی هزرەکەی بێت لەکاتی نووسین و ڕێکخستنی ڕووداوەکان و بەشەکانی چیرۆك، چونکە پەیوەندییەکی تەواوکاری لە نێوانیاندا بوونی هەیە، بۆیە هزر لە چیرۆکدا مامەڵەیەکی تایبەتی دەوێت و نووسەر زیاتر و بەشێوەیەکی فراوانتر لە شیعر دەتوانێت مامەڵەی لەگەڵ بکات و جۆراو جۆری هزر لەناو دەقەکاندا بەکار بهێنێت، هەروەها زۆر جار چیرۆکنووس ئەو هزرەی کە دەیەوێت لە چیرۆکەکە باس بکات، لە ڕێگەی ڕەنگدانەوە لە ژیانی پاڵەوانێك، بە تایبەتی پاڵەوانی سەرەکی، بەشێکی زۆر لە مەبەست و هزرەکەی لەوێوە دەخاتەڕوو، ((چیرۆکنووس دەتوانێت بەشێك لە فیکری خۆی لەڕێی قارەمانە سەرەکییەکەیەوە دەرببڕێت، هەروەها دەتوانێت ئەوەی بیەوێت لە ڕێی کارەکتەرەکەیەوە بیڵێت کە پانتاییەکی کەمی لە چیرۆکەکەدا داگیرکردووە)) (حەمە سەعید، ٢٠٠٥:٦٦)، کەواتە دەتوانین بڵێین کە کەرەستەی دەستی چیرۆکنووس بۆ ئەوە هزرەکانیان لە ڕێگەی ئەو ڕووداوانەی کە لە چیرۆکەکەدا بەسەریان دێت بخەنەڕوو و نیشانی خوێنەری بدەن و بۆ خوێنەر مەبەستەکەیان بخەنەڕوو، بەڵام بە شێوازێکی هونەری و بە زمانێکی ئەدەبییانە، کە ڕەنگە ئەمە زۆرجار خوێنەر بەرەو ئەو ئاراستەیە ببات کە وا لێکداتەوە ئەو هزرە هی خودی پاڵەوانەکەیە، بەڵام لەڕاستیدا هی نووسەرەکەیە، کە ڕەنگە نووسەر خۆی بەشدار نەبێت لە پاڵەوانی ناو چیرۆکەکە.

ئەگەر سەیری چیرۆکی کوردی بکەین، دەبینین بەچەندین بارودۆخ و قۆناغی جیاواز و درێژدا تێپەڕیوە. ئەمەش بەهۆی ئەو ڕووداو و بارودۆخەوە بوو کە تاك و کۆمەڵگای کوردی تیایدا ژیاوە، ((چیرۆکی کوردیش بە هۆی سەرچاوەی ئەو ژیانە دوور و درێژەی ڕووداوە جۆربەجۆرەکانی نەتەوەی کورد وەك داستانە مێژوویی و دڵدارییەکان لەلایەك و بەهۆی کارتێکرد و هەنگاو هەڵگرتن و لاساییکردنەوەی ئەدەبی جیهانی و دراوسێیەکانی لەلایەکی تر، شێوازێکی تری بە خۆوە گرتووە و چۆتە ناو چوارچێوە و قاڵبی هونەر و پەخشان شێوازی گێڕانەوەی وەرگرتووە)) (سەلیم ڕەشید ساڵح، ٢٠١٢:١٣) واتە چیرۆکی کوردی لە پاڵ ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی کە لە ناوچەکەدا ڕوویدەدا، لەگەڵ کاریگەری و لاساییکردنەوەی ئەدەبیاتی نەتەوەکانی دراوسێ، هۆکارێك بوون بۆ سەرهەڵدان و وەرگرتنی شێوازی

هونەری و بەرەو پێش چوونی چیرۆکی کوردی، لە ڕووی هزرەوەش ئەگەر سەیری چیرۆکی کوردی بکەین، دەبینین کە لە سەرەتاوە تا کو قۆناغی ئێستا، زیاتر ڕەنگدانەوەی ژیان و بارودۆخ و گوزەرانی ناو کۆمەڵگای کوردییە لە سەرجەم بوار و لایەنەکاندا وەك (سیاسی، کۆمەڵایەتی، کشتوکاڵی، ئاینی، ڕۆشنبیری،......هتد)، واتە زیاتر ئەو هزرانە باو بوون کە ڕەنگدانەوەی ژیانی واقیعی ناو کۆمەڵگای کوردی بوون، چونکە ((چیرۆکی کوردی لەگەڵ سەرهەڵدانیدا ڕێبازی ڕیالیزمی هەڵبژاردووە)) (حەمە سەعید،٢٠٠٥:٢٨)، واتە سەرەتا چیرۆکی کوردی بەو بابەتە واقیعییانە دەستی پێکردووە کە لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا هەبوونە و چیرۆکەکان بوونەتە ئاوێنەی ئەو ژیان و بارودۆخەی خەڵکەکە، چونکە ((ئەدەب ئاوێنەی ژیانە)) (عەزیز گەردی، ١٩٧٨:٧ )، هەروەها چیرۆکی کوردی لە سەرەتاوە زیاتر هزری کۆمەڵایەتی و ئاینی بە خۆوە گرتبۆوە، دواتر بەهۆی گۆڕانی بارودۆخەکە زیاتر هزری (سیاسی) بڵاوبۆوە بەڵام لە قۆناغەکانی دواتر هزری جۆراوجۆر لە ناو چیرۆکی کوردیدا بڵاوبۆوە.

## بەشی دووەم

### ٢-١ هزر لە چیرۆکەکانی (حەسەن جاف) دا:

حەسەن جاف یەکێکە لە چیرۆکنووسە ناسراوەکانی ناو ئەدەبیاتی کوردی. نووسەر بە چەندین کۆمەڵە چیرۆك و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، توانیویەتی گەشە بە بواری ئەدەبی کوردی بەگشتی و چیرۆکی کوردی بەتایبەتی بدات، دیارترین کۆمەڵە چیرۆکەی کە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا کاری لەسەر دەکەین بەناوی (دیجلەی تاوان)ە، ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە چەندین کورتەچیرۆك پێکهاتووە کە بریتین لە (دیجلەی تاوان، پاشای شارەکەمان، ڕێی هات و نەهات، دوو وێنە و دوو دەنگ، ئەسپی سپی، پاسای شارێك، شوان، جەنابی بەڕێوەبەری گشتی، دیمەنێکی تەلەفزیۆنی، زمانی پیرۆز، ئازادی، هاوین، ژیان، پارە، میوانە ناوەختەکان، چپەکانی مەجیدیە، کۆمیدیای سەهۆڵ)، کە هەندێکیان زۆرکورتن و هەندێکی تریان کورتە چیرۆکی ئاسایین. نووسەر لەم کۆمەڵە چیرۆکە بەپێی توانا و بەهرە و ئەزموونی

چیرۆکنووسی تێڕوانینی خۆی دەربارەی بارودۆخ و ژیان و گوزەرانی سەردەمێك لە سەردەمەکانی ژیانی خۆی و چەند هاوڕێیەکی دەخاتەڕوو، کە باس لە چۆنیەتی ژیانی خەڵك و دەسەڵات و حکومەتی ئەو سەردەمە دەکات لە چۆنیەتی ئازاردانی کوردەکان و بەکەم سەیرکردنیان و پشتگوێخستنیان، نووسەر بەهۆی بەکارهێنانی هزری جۆراوجۆری و داڕشتنێکی ئەدەبی، لەم ڕووەوە چەندین چیرۆکی هونەری و سەرنجڕاکێش و جۆراوجۆری بەرهەم هێناوە و نووسیویەتی، کە هەریەکەو گوزارشت لە چەندین دیمەن و وێنەی ژیانی سەردەمی خۆی نیشان دەدات، لە چیرۆکەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکەدا هزرەکانی (سیاسی، کۆمەڵایەتی ، نیشتمانی)، بەکارهێناوە، ئەمەش بۆ فراوانی هزری نووسەر و توانا و زاڵبوونیەتی بەسەر ڕووداوەکان دەگەڕێتەوە، بەم هۆیەشەوە کە هزری جیاواز لەناو چیرۆکەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەها هزری سیاسی لەم کۆمەڵە چیرۆکەدا باڵی بەسەر زۆربەی چیرۆکەکان کێشاوە، ئەو لایەنەی ئێمە لێرەدا کاری لەسەر دەکەین، ئەوەیە کە شیکردنەوەی چیرۆکەکانە لە ڕووی بەکارهێنانی هزری جیاواز لای چیرۆکنووس، هەروەها ڕەنگدانەوەی بارودۆخ و ژیان و گوزەرانی ئەو سەردەمە لەنێو چیرۆکەکاندا.

### ٢-٢ شیکردنەوەی چیرۆکەکان لە ڕووی هزرەوە .

#### ٢-٢-١ هزری سیاسی:

هزری سیاسی یەکێکە لەو لایەنەی بەشێوەیەکی فراوان لەنێو ئەدەبیات بە گشتی و چیرۆك بە تایبەتی ڕەنگی داوەتەوە، کە ئەمەش بەپێی سەردەم و قۆناغە جیاوازەکانی میللەتەکان بووە، میللەتی کوردیش وەکو نەتەوەیەك کە بە چەندین قۆناغی جیاواز تێپەڕیوە، ئەم قۆناغانەش لەنێو بەرهەمی نووسەرەکان ڕەنگی داوەتەوە، هزری سیاسی وەك لایەنەکی گرنگ لەناو ئەدەبیاتدا ڕەنگی داوەتەوە و بووە بە بەشێك لە ئەدەبیاتدا ((خاڵی بەیەکگەیشتن و پەیوەندیی ناوخۆیی نێوان سیاسەت و ئەدەب هەمان بابەتە کە لەنێوان مرۆڤ و ژیانە، هەردووکیان لە بنەڕەتدا وەکو دوو دیاردە لە کۆمەڵەوە هەڵدەقوڵێن، بۆیە نابێت ئەدەب و سیاسەت وەکو دوو مەسەلە و دوو جیهانی یان دوو لایەنی جیاواز و لێك دابڕاو سەیر بکرێت)) (عوسمان

دەشتی، ٤٤:٢٠٠٣)، واتە پەیوەندیی نێوان ئەدەب و سیاسەت پەیوەندییەکی دوو لایەنەیە، کە بەشێوەیەك تێکەڵی یەك بوونە، کە دابڕانیان ئاسان نییە. نووسەر لە چیرۆکەکانیدا بەشێوەیەکی بەرچاو گرنگی بەم لایەنە داوە و لە چیرۆکەکانیدا بەشێوەی جیاواز باسی کردووە، بۆ نموونە لە چیرۆکی (دیجلەی تاوان)دا دەڵێ: ((بۆ نازانی کورد لەو شوێنانە دانامەزرێنن مەگەر یەکێ (واسیتە)یەکی زۆر گەورە و دەستڕۆیشتووی هەبێ .. ئاخر نەگبەت تۆ کێت هەیە.)) (دیجلەی تاوان، ل١٢)، لێرەدا ئاماژە بە دیاردەیەك دەکات کە لە سەردەمی ڕژێم باو بووە بەهۆی فەرامۆشکردنی نەتەوەی کورد و گرنگیدان بە نەتەوەکانی تر، کەسانی کوردیان لە دام و دەزگاکاندا دانەدەمەزراند و پشتگوێیان دەخست، ئینجا ئەگەر کەسێك یان بەرپرسێك واسیتەیەکی بۆ بکردبایە، ئەمەش لە ڕێگای خستنەڕووی بارودۆخی هاوڕێیەکی لە شاری (کەرکوك) کە دەرچووی زانکۆ بووە دەیەوێ دابمەزرێت، یان لە چیرۆکی (دیمەنێکی تەلەڤزیۆنی) دەڵێ: ((لەناو ئازارەکانی گەلەکەی چاوی کردەوە.. کۆمەڵێك سەرباز بەسەرییەوە وەستابوون و لوولەی کلاشینکۆفیان تێ کردبوو، یەکێکیشیان بە نووکە پۆستاڵ تێوەی ئەژەن)) (دیجلەی تاوان، ل٤٨). لێرەدا ئاماژە بۆ بارودۆخی سیاسی ئەو سەردەمە دەکات کە چۆن بەرامبەر بە نەتەوەی کورد خراپ بوون و سزای تاکی کوردیان داوە، کە هەر کەسێك بە ویستی خۆیان گومانیان لێ بکردبایە، ئەوا شتێکیان بۆ دروست دەکرد و لە هەر کاتێك بوایە، هێرشیان دەکردە سەر ماڵەکەی و سزا و ئەشکەنجەیان دەدا، هەروەها لە چیرۆکی (میوانە ناوەختەکان)دا دەڵێ: ((هێشتا ڕۆژ نەگەیشتبووە ناوەندی ئاسمان کە دەوری گەڕەك گیرا و بە ناو کۆڵان و سەربانەکاندا بڵاوبوونەوە، خەڵکەکە لە ترسا هەر کەسەو دەرگای خۆی داخست و نەیدەوێرا سەر بکێشێتە دەرەوە)) (دیجلەی تاوان، ل٦٠). لێرەدا چیرۆکنووس ئاماژە بە حاڵەتێکی زۆر ناخۆش دەکات کە کاتێك سەربازەکانی ڕژێم چۆن لە هەموو کات و ساتێکدا بێ ئەوەی خەڵکەکە ئاگادار بێت، هێرشیان دەکردە سەر ماڵ و منداڵ و خەڵکەکە، کە بێ ئەوەی کەس بتوانێت لە بەرامبەریان بوەستێت تەنانەت زۆرجار لەکاتی بەیانییەکی زوو هێرشیان دەکردە سەر خەڵکەکە، هەروەها لە چیرۆکی ( ڕێی هات و نەهات) دا دەڵێ: ((لەبەر ئەوەی چەند جارێك لەمەوبەر،

تەنانەت ڕۆژێك پێش ئەوەی بتگرین لەغمت داناوە و بوویتە هۆی شەهیدبوون و بریندارپوونی چەندەها سەرباز.. تاکو سوپای نەبەز و نەخەوتوومان توانییان دەستی تاوانت ببڕن و لەکاتی ئەنجامدانی ئیشە چەپەڵەکانتدا و پێش ئەوەی تاوانێکی دیکە دژ بەگەل و نیشتیمان بکەی بتگرن)) (دیجلەی تاوان، ل ٢٨)، لێرەدا بەهۆی ئەوەی، کە سەربازەکانی ئەوکاتی ڕژێم هەمیشە هۆکارێك و تاوانێکیان دەدا پاڵ کەسەکان بۆ ئەوەی بە بیانوویەك بیگرن و سزای بدەن، لێرەشدا بە بیانووی دانانی لەغم، هەوڵیانداوە بیگرن و سزای بدەن، ئەمەش وەك هۆکارێك بەکاریان دەهێنا بۆ شاردنەوەی سزاکان و چەواشەکاریی خەڵك، هەروەها لە چیرۆکی (دوو وێنە و دوو دەنگ)دا دەڵێ: (( سەربازەکان هەناسەیان لە خۆیان بڕیوە و چاویان بڕیوەتە ڕێگاکەی بەرامبەریان و پەنجەشیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیانە.... هەتا کابرا و بزنەکان نزیك دەبوونەوە و ترپەی دڵیان زیادی ئەکرد و ڕەنگیان زەرد هەڵئەگەڕا.... ئەفسەرەکەش هەرچاوی نابوو بەکونەکەوە، بەڵام ئەمجارەیان دەستێکی بەرزکردەوە و لە پڕ دەستی داگرت و...... بوو بە دەستڕێژ)) (دیجلەی تاوان، ل ٣٤)، لێرەدا دیمەنێکی ناخۆشی سەردەمی ڕژێم نیشان دەدات، کە سەربازەکانی لە هەموو شوێنێك بڵاوکرابوونەوە تەنانەت لە شوێنی لەوەڕاندنی بزن و مەڕەکانیش، کە هەرکاتێك بیانەوێت دەبنە ڕێگر لە خەڵك و بەئارەزووی خۆیان خەڵك ئەزیەت دەدەن، تەنانەت زۆرجار هەر بێ هیچ هۆکارێك دەستڕێژی گوللـەیان لە خەڵك دەکرد، بۆیە هیچ شوێنێکی ئارامیان نەهێشتبۆوە، کە بتوانی بەئازادی بسووڕێیتەوە، هەروەها لە چیرۆکی (چپەکانی مەجیدیە) دا دەڵێ:

((- ئەمڕۆ کچەکەمیان لە مەکتەب وەرنەگرت.

- بۆ؟

_ ئەڵێن جێگە نییە!

- چۆن.. خۆ نووسراوی وەزیری پەروەردە هەیە ئەڵێ ئەبێ هەموو منداڵێ لە مەکتەب وەرگیرێ

- هەموو منداڵێ...؟ بەڵام منداڵی کورد نەء؟!

- بەسەری تۆ ئەگەر منداڵ دەرنەکەن، لەو شۆریجەیە ئەبێ ئەمساڵ دوو مەکتەب بکەنەوە.

- بەخوا جوانە.. قوتابخانە کوردییەکان دائەخەن و منداڵی کورد دەرئەکەن، هەر بۆ ئەوەی خوێندنی کوردی نەمێنێ..)) (دیجلەی تاوان، ل٦١)، لێرەدا لە ڕێگەی دایەلۆگێکەوە باس لە کێشەیەکی سیاسیی ئەو سەردەمە دەکات، کە بەرامبەر نەتەوەی کورد ئەنجامدەدرا، ئەویش بێ بەشکردنی منداڵانی کوردە لە خوێندن، کە لە شارە کوردنشینەکان بەتایبەتی ( کەرکوك) ئەم جۆرە کارانە لەلایەن ڕژێمەوە بەرامبەر بە کورد ئەنجامدەدرا، بەم هۆیەشەوە دەیانویست تاکی کوردی نەخوێندەوار بێت و بێبەش بێت لە گەیشتن بە زانست و زانیاری، لە پاڵ ئەمەشدا نەتەوەی کورد لاواز بکەن و هەمیشە لە گەشەکردن بوەستێت و نەتوانن پەرە بە توانا و زانستی خۆیان بدەن.

**٢-٢-٢ هزری نیشتیمانی و نەتەوەیی:**

هزری نەتەوایەتی یەکێکی ترە لەو لایەنەی کە لە نێو بەرهەمی نووسەران ڕەنگیداوەتەوە، ئەم هزرەش لە ئەنجامی کۆمەڵێك لایەن، کە پەیوەندییان بە ژیانی کۆمەڵگا و کەسەکانەوە هەیە سەر هەڵدەدات وەك لایەنی (ئاینی، کلتووری، زمان،.....هتد)، هزری نەتەوایەتی ((ئەو هەستە بزوێنەرە سروشتییەی ناخی مێشك و دەروونی مرۆڤە، بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە و ڕاژەی گشتی و خۆبەستنەوە بەڕەوشتە، بەرز و نەریتە پیرۆزەکانی ناو کۆمەڵ لەکاردایە و خاوەنی خەسڵەتە گرینگەکانی ژیانی مرۆڤە)) (عبدالله ئاگرین، ١٩٩٩:٤٢). واتە هزری نەتەوایەتی، لە ئەنجامی تێڕوانینی مێشکی مرۆڤە لە بەرامبەر چەندین کار و چالاکی جۆراوجۆر بەرامبەر بە نەتەوەکەی بۆ ئەوەی ببێتە هۆی گەشەسەندن و پێشکەوتنی نەتەوەکەی. ئەگەر سەیری ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بکەین دەبینین کە نووسەر لە چەندین شوێن ئاماژەی بە هزری نەتەوەیی کردووە، وەك هاندان و بەرەو پێشچوونی ئەم هزرە لەناو تاکی کوردی و زیاتر ئاگاداربوونیان لە کێشەکانی تایبەت بە نەتەوەکەی. بۆنموونە لە چیرۆکی (یاسای شارێك) ئاماژە بەوە دەکات کە چۆن هەوڵیان داوە شارە کوردییەکان

بشێوێنن و مۆرکی کوردایەتی لێ بسڕنەوە و هەوڵی دەرکردنی خەڵکەکەی دەدەن وەك دەڵێ: (( لەبەر ئەوەی زۆر بڵێیت و هەر خەریکی سکاڵایت و هاتوویتە شوێنێك جێی تۆ نییە و مافی ئەوەت نییە بێیتە ناوی، ئەمەش دەرچوون و لادانە لە یاسا بۆیە (شت) فەرمانی کوشتنی دەرکرد)) (دیجلەی تاوان، ل٤٢). لێرەدا نووسەر وەك تاکێکی کورد چۆن بەهۆی هەستی نەتەوایەتییەکەیەوە تاکی کورد هۆشیار دەکاتەوە لەوەی کە لە سەردەمی کۆندا چۆن هەوڵی داگیرکردنی شوێنە کوردنشینەکان دراوە و تەنانەت وایان لە کوردەکان کردووە کە قەدەغە بێت بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، هەروەها لە چیڕۆکی ( زمانی پیرۆز) دا دەڵێ: (( برایان هەمووتان ئەزانن کە شۆڕشەکەمان توانی بۆ یەکەمجار لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی بکا و دان بە مافی هەموو نەتەوەکاندا بنێ و ڕێگەی خوێندن و پەخش و ڕۆژنامەیان بۆ خۆش بکا و بە زمانی خۆشیان، هەروەها قوتابخانە بکاتەوە تا کەمە نەتەوایەتییەکان بە زمانی خۆیان بخوێنن)) (دیجلەی تاوان، ل٥١)، لێرەدا ئەوە دەردەخات کە دوای چەندین هەوڵ و کۆشش و شۆڕشی یەك لەدوای یەك و لە پێناو ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانی، توانییان ئەو مافە بەدەست بهێنن کە قوتابخانە بەزمانی خۆیان بکەنەوە و بتوانن بەزمانی خۆیان بنووسن و بخوێنن، کە ئەمەش هەنگاوێکی گرنگە بۆ پێشکەوتنی نەتەوە و زیاتر ناساندنی نەتەوە.

**٢-٣ ئەفسانە وەك کەرەستەیەك بۆ دەربڕینی هزر:**

ئەفسانە یەکێکە لەو بەشانەی فۆلکلۆر کە زۆرجار نووسەران تێکەڵ بە ژانرە ئەدەبییەکان دەکەن، کە لەڕێگەی دەربڕینی خەیاڵی و گێڕانەوەی کۆن و خەیاڵی کە لە واقیعدا دوورە. بەرهەمەکانیان دەوڵەمەند دەکەن، (( ئەفسانە ئەو ڕووداوانە باس دەکات کە لە سەردەمێکی زۆر کۆندا ڕوویانداوە )) (سەردار ئەحمەد حسن،٢٠٠٤:٢٦٥)، واتە ئەفسانە گێڕانەوەی ئەو دیاردە و ڕووداوانەیە کە لە کۆندا ڕوویانداوە، بەڵام بە شێوازێکی هونەری ، هەروەها لە هەندێك شوێندا ئەفسانە وەك چیڕۆکێکی بێ خاوەن ناونراوە، (( ئەفسانە ئەو چیڕۆکەیە دانەرەکەی دیار نییە و لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا دەگێڕدرێتەوە و کەسێتی ئەفسانەیی بەهۆی ئامێر و کەرەستەی ئەفسانەیی

له کات و شوێنی ئەفسانەییدا کاری ئەفسانەیی دەکەن)) (مەولود ئیبراهیم، ٢٠٢٠، ٦٣)، واته لێرەدا ئەفسانه ئەو چیرۆکەیە، که هەر یەك له تاکێکی کۆمەڵگا خۆی بەخاوەنی دەزانێت. لەم کۆمەڵە چیرۆکەدا نووسەر به شێوەی جیاواز پەنای بۆ بەکارهێنانی هزری ئەفسانه بردووه، که ئەمەش زیاتر بۆ توانا و لێهاتوویی نووسەر دەگەڕێتەوە که هەوڵی داوه له ڕێگەی بەکارهێنانی هزری جیاواز و سوود وەرگرتن له بەشەکانی فۆلکلۆر چیرۆکەکانی دەوڵەمەند بکات، نووسەر له چیرۆکی (پاشای شارێك) که سەراپای چیرۆکەکە گێڕانەوەیەکی ئەفسانەییه و به هزرێکی ئەفسانەیی داڕشتنی بۆ کراوه، بۆ نموونه دەڵێ: ((ئەگێڕنەوە .. ئەڵێن .... شارێك هەبوو هەمیشه .. تاریك بوو .. ئاسمانی ئەو شاره بێ هەتاو و مانگ و ئەستێره بوو..)) (دیجلەی تاوان، ل ١٨)، که لێرەدا وەکو گێڕانەوەیەکی ئەفسانەیی باس له شارێك دەکات که له خەیاڵی خۆی دروستی کردووه و له واقیعدا بوونی نییه، که ئاسمانەکەی بێ مانگ و ئەستێره و هەتاوه، یان له شوێنێکی تردا له ڕێگەی دیالۆگەوه باس له چۆنیەتی بڕیارەکانی پاشا دەکات بەرامبەر به خەڵکەکە، ئەگەر به گوێی فەرمانەکانی نەکەن وەك دەڵێ:

ـ گازی لێ ئەگرن... ها ... کەواته بڕیارم دا دانەکانیان هەڵکێشن .

ـ هی هەموو کەس قوربان؟

ـ هەموو کەس... ژن و پیاو... گەوره و بچووك

ـ فەرمانی جەنابتانه و لەسەر سەره (دیجلەی تاوان، ل١٩ )

لێرەدا نووسەر لەڕێگەی دیالۆگێکەوه باس له سزای ئەو خەڵکه دەکات که کاتێك پاشا داواکارییەکی بۆیان هەیه، ئەوانیش جێبەجێی ناکەن بەهۆی دەست کورتی و هەژاری، هەروەها له شوێنێکی تردا ئاماژه بۆ دێوانەیەك دەکات چۆن له کەللەی سەری دەدرێت: ((پاشا یەکسەر فەرمانی دا که لەسەری دێوانه بدرێ و کەللە سەرەکەی بەسەر دارێکەوه له دەروازەی شار هەڵبواسرێت، تاکو ببێت به عیبرەت بۆ خەڵکی شارەکه)) (دیجلەی تاوان، ل٢١). لێرەدا ئاماژه بۆ ئەوه دەکات که کاتێك خەڵکەکە له ترسی پاشا ناوێرن بچن بۆ لای پاشا و قسەی بۆ بکەن و باسی کێشەی خۆیانی بۆ بکەن، بۆیه دێوانەیەك دەچێته لای پاشا و ئەو باسی کێشەکانی خەڵکەکەی بۆ دەکات، بەڵام پاشا پێی وایه که دوژمنەکانی ئەو بیرۆکەیان بۆ خەڵکی

شارەکە دارشتووە، بۆیە بڕیار دەدات کە لە سەری دێوانە بدرێت و کەللە سەرەکەی هەڵبواسرێت و بۆ ئەوەی هەموو خەڵك ببینێت و ببینێت بە پەند بۆ هەموو خەڵکەکە، بەڵام لە ڕاستیدا پاشا بە هەڵە لە مەبەستی دێوانە گەیشتبوو، هەروەها لە شوێنێکی تردا هەر لە هەمان چیرۆکدا باس لەوە دەکات کە چۆن خەڵکەکە شارەکەیان جێ هێشتووە و دواتر کە گەڕانەوە چییان کرد، وەك دەڵێ: ((دەمەو ئێوارەیەك بوو دەنگ و هاوار و غەڵبە غەڵب پەیدابوو ... خەڵك سەرلەنوێ بە لێشاو هاتنەوە ... هەریەکەو دارێ یان پاچێ ... یان چەقۆیێکی بەدەستەوە بوو و بەرەو کۆشك ئەهاتن ... یاساوڵەکانیش ڕایان دەکرد ... هەر چەندە لە کۆشك نزیك دەبوونەوە یاساوڵ و پیاوەکانی پاشا خۆیان ئەدۆزییەوە و ڕایان ئەکرد و تێکەڵ بە خەڵکەکە دەبوون... کە دەنگەکان بە تەواوی نزیك بوونەوە خەڵکەکە گەیشتنە ناو کۆشك.... پاشا خەریکی فەرمان ئیمزاکردن بوو خەوی بە شار و جادەیەکەوە ئەبینی کە بە قەرەج تەنرابێ .... جل و بەرگی جوانیان لەبەر دابێ، ژنانیش زەرد و سوور و ڕازاوە پێشوازی لێ دەکەن و چەپڵەی بۆ لێدەدەن)) (دیجلەی تاوان، ل٢٢ــ٢٣). لێرەدا ئاماژە بۆ کات و شێوازی گەڕانەوەی خەڵکەکە دەکات دوای ئەوەی کە شاریان بە جێ هێشتبوو لەبەر هەژاری و فەرمانەکانی پاشا، دواتر کە گەڕانەوە هەریەك دارێك یان چەقۆیەك یان شتێکی بە دەستەوە بوو ڕووەو کۆشکی پاشا دەهاتن، کە پاشا زیاتر خەوی بەوە دەبینی کە بەیانی پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکرێت لە لایەن ئەو قەرەجانەی کە خۆی هێنابووی بۆ شار، بەڵام خەونەکەی پێچەوانە بوویەوە و خەڵکی پێشووتری شارەکە هێرشیان بۆ کۆشك هێنا و خەونی پاشایان لەناوبرد، ئەو چیرۆکە کە بە شێوەیەکی ئەفسانەیی گێڕدراوەتەوە و باس لە پەیوەندیی نێوان پاشا و خەڵکی شارێك و چۆنیەتی گوزەرانی خەڵکەکە دەکات .

**٢-٤ ڕەمز وەك کەرەستەیەك بۆ دەربڕینی هزر :**

ڕەمز یەکێکە لەو بابەتانەی کە زۆر لە نووسەران لە بەرهەمەکانیاندا پەنای بۆ دەبەن و بەکاری دەهێنن، کە ئەمەش بۆ زیاتر تەمومژیی واتا و شاردنەوەی بابەتەکە دەخرێتە ڕوو ((ڕەمز بە واتا گشتییەکەی بریتییە لەوەی کە جێگەی شتێکی

تر بگرێتەوە لە ڕووی واتاوە)) (سەردار ئەحمەد حەسەن، ٢٠٠٤:٤٨٣)، هەروەها ڕەمز وەك هونەرێکی ئەدەبی خۆی لە چەندین شێوە و جۆری جیاواز دەبینییەوە وەك (ڕەمزی ئاینی، مێژوویی، ئەفسانەیی، کەلتووری،..... هتد)، کە ئەمانە هەریەکەو گوزارشت لە بابەتێکی جیاواز دەکات، ئەگەر سەیری ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بکەین دەبینین کە چیرۆکنووس لە چەندین چیرۆکدا پەنای بردۆتە بەر دەربڕین و هزری ڕەمزی، کە ئەمەش دیارە بۆ بارودۆخ و سەردەمی ئەو کات دەگەڕێتەوە، کە نە دەتوانرا شتەکان بە ڕوون و ئاشکرا دەربیبڕن، بۆیە پەنایان دەبردە بەر دەربڕینی ڕەمزی و تەمومژی، بۆ نموونە لە چیرۆکی (میوانە ناوەختەکان) دەڵێ: ((شەو بوو، کۆمەڵێك گورگی هار بەرگی مرۆڤیان پۆشیبوو... بێدەنگ لە زیلێك دێنە خوارەوە، پەیژەیێکی فافۆن ڕادەگرن، دەیکەنەوە، درێژتر و بەرزتر دەبێ، لە باڵای دیوارەکە بەرزتر بە سەریا سەر دەکەون و دەگەنە سەر دیوارەکە...)) (دیجلەی تاوان، ل٥٩)، لێرەدا (گورگ) وەکو ڕەمزێك بۆ کۆمەڵە سەربازێکی دڕندەی ئەو سەردەمە بەکارهاتووە کە چۆن لە شەودا هەڵدەکوتنە سەر ماڵی خەڵك و بەسەر دیوار و خانووەکان دەکەون، کە نووسەر بە ناوی (گورگی هار ) ناوی بردوون .

**ئەنجام**

١- هزر وەك لایەنێکی فەلسەفی، بە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی دەقی ئەدەبی بەگشتی دادەنرێت، بەڵام بەکارهێنان و سنووری هزرەکە بەپێی جیاوازیی دەقەکان، جیاواز دەبێت، چونکە هەر دەقێك یان ژانرێکی ئەدەبی شێوازێکی تایبەتی بۆ داڕشتنی هزرەکە هەیە.

٢- نووسەر لەم کۆمەڵە چیرۆکەدا زیاتر هزرەکانی بوونێکی واقیعییانەیان پێوە دیارە، ئەو ڕووداو و بابەتانە بوونە، کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا ڕوویانداوە و کاری تێکردوون، بوونەتە هەوێنێك بۆ چیرۆکەکانی.

٣- حەسەن جاف لە نێو چیرۆکەکانیدا بەهۆی بارودۆخی ئەو سەردەمە و ژیانی ئەو دەوروبەرەی کە تیایدا ژیاوە، وایکردووە کە هزری جۆراوجۆر لە چیرۆکەکانیدا ڕەنگ بداتەوە وەك (هزری سیاسی، هزری نەتەوەیی)، هەروەها لەپاڵ ئەمەشدا سوودی لە ڕەمز و ئەفسانە وەرگرتووە وەکو کەرەستەیەك بۆ دەربڕینی هزرەکان.

٤- لەنێو جۆرەکانی هزردا، زیاتر هزری (سیاسی) باڵی بەسەر بەشێکی زۆری چیرۆکەکانی کێشاوە، ئەمەش بێگومان بۆ بارودۆخی ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە، کە لەو سەردەمەدا ئەم لایەنە کاریگەریی زۆری بەسەر نووسەرەکەوە بەجێهێشتبێت.

## سەرچاوەکان

### یەکەم/ کوردییەکان

### أ- کتێبەکان:


١- ئاریانا ئیبراهیم، شێوازە ئەدەبییەکانی رۆژنامەی خەبات (٢٠٠٣-٢٠٠٦) چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر،٢٠١١.

٢- پەرێز سابیر، بنیاتی هونەری چیرۆکی کوردی لە سەرەتاوە تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، دەزگای پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

٣- حسن جاف ، دیجلەی تاوان (کورتە چیرۆك)، چاپی دووەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٠.

٤- حەمە سەعید، هزر و شێواز لە چیرۆکی کوردیدا، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٥.

٥- حمید عزیز، لۆجیکی ئەرستۆ، چاپی یەکەم، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٩ .

٦- سالار عزیز، هزری فەلسەفی لە شیعری مەلای جزیری دا، چاپی یەکەم، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٤.

٧- سەردار ئەحمەد حسن، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٨- سەلیم ڕەشید ساڵح، شێواز لەکورتە چیرۆکی نوێی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.

٩- عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.

١٠-عوسمان دەشتی، هێمن لە بارەی ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی شیعرەکانی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی،٢٠٠٣.

١١-فوئاد عبدالرحمان، بیر-ئاواز-زمان، دەزگای چاپ و پەخشی حمدی، سلێمانی، ٢٠٠٩.

١٢-لێژنەی ئەدەب کۆڕی زانیاری کوردی، زاراوەی ئەدەبی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٣-مەولوود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمریدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی تەهران، تەهران، ٢٠٢٠.

١٤-هیمداد حسێن، ڕۆژنامە نووسی کوردی سەردەمی کۆماری دێموکراتی کوردستان، ؟ ، سلێمانی، ٢٠٠٢.

**ب- نامە ئەکادیمییەکان:**

١٥-عبدالله ئاگرین، کاریگەریی بیری نەتەوەیی لە گەشەسەندنی کورتە چیرۆکی کوردیی کوردستانی عێراقدا ١٩٦١_١٩٧٠، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٩.

**دووەم/ عەرەبییەکان**

١٦-احمد ابن فارس، معجم مقياس اللغة، تحقيق: ابراهيم شمس الدين، الطبعة الثانية، دارالكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٨.

١٧- ابي حامد محمد بن محمد الغزالي، احياء علوم الدين، الطبعة الأولى، دار ابن عزم، بيروت، ٢٠٠٦.

١٨-د. محمد محمد داود، جدلية اللغة والفكر، دار غريب للطباعة والنشر والتوزيع، ٢٠٠٩.

## الملخص

### الفكر في قصص حسن الجاف

### المجموعة القصصية (دجلة الجريمة) انموذجا

هذا البحث بعنوان **( الفكر في قصص حسن الجاف المجموعة القصصية (دجلة الجريمة) انموذجا )**، إذ أن الفكر كجزء مهم من مكونات النص، له مشاركة واسعة في تكوين النصوص، فقد حاولنا هنا من خلال المنهج التحليلي تحليل الجانب الفكري في القصص وتحديد اهم أنواع تلك الافكار التي انعكست في قصص القاص، والتي اصبحت المغزى الرئيسي لقصصه.

يتكون اطار هذا البحث من مبحثين، اذ تم التطرق في المبحث الأول الى هذه الموضوعات ( الفكر كنظرة نظرية، مفهوم الفكر، الفكر في النصوص المختلفة، الفكر في القصة الكوردية ). أما المبحث الثاني خصص للمزيد من التعريف بالفكر في القصة الكوردية، تناولنا المجموعة القصصية ( الدجلة المذنبة ) لحسن الجاف انموذجا، ففي هذا المبحث تم استعراض هذه الموضوعات ( الفكر عند حسن الجاف، تحليل قصص حسن الجاف من حيث الفكر، الفكر السياسي، الفكر الوطني ( القومي )، الفكر الملحمي، الفكر الرمزي).

توصلنا في النهاية الى النتيجة التي مفادها أن الكاتب في هذه المجموعة القصصية أستطاع ان يتعامل مع الافكار المتنوعة بشكل متفوق، كذلك احتل الفكر السياسي الجزء الاكبر من قصصه.

## Abstract

**(Theme in stories written by Hassan Jaff, the collection of stories titled The Tigris of Crime (Dijlai Tawan) as a case study)**

This paper is titled (theme in stories written by Hassan Jaff, the collection of stories titled The Tigris of Crime (Dijlai Tawan) as a case study). Theme, as an important part in the components of a text, has an important and serious role in creating any text. Here, I tried to analyze theme of the stories applying analytical method and write down the most important types of these themes which are reflected in his stories and become a core material for his stories.

This paper consists of two parts. The first part consists of (theme as a theoretical point of view, theme as a term, theme in different texts, theme in Kurdish stories). In the second part, to better introduce theme in Kurdish stories, I select the collection stories of The Tigris Crime (Dijlai Tawan) by Hassan Jaff as a case study. This part is dedicated to discuss (theme for Hassan Jaff, thematically analyzation of stories of Hassan Jaff, political them, patriotic theme, mythical theme, symbolic theme).

I come conclusion that the writer being successful in dealing with various types of themes and that political theme has occupied vast area in wors.

# ئەركێن زمانی
# د سترانێن كەنالێ (پێلستانك) دا

**م.هـ. ژيمان سەبری نعمەت**
كولیژا زمانان، زانكۆیا دهۆك

**م.هـ. عسمەت مەحموود محەمەد**
كولیژا زمانان، زانكۆیا دهۆك

**پێشەكی:**

ستران، ئێكە ژ ئالاڤێن گرنگێن كارتێكرنێ ل رەفتار و كەسایەتیا پاشەرۆژێ یا زارۆكی دكەت. ئێک ژ پێكهاتەیێن هەری گرنگێن سترانا زارۆكان، زمانە. لسەر بنەمایێ چەوانییا بكارئینانا زمانی د سترانێدا، ئەركێن وی زمانی د پرۆسێسا گەهاندنێدا دهێنە گوهۆرین. ئانكو، تا رادەیەكێ باش، چەوانییا بكارئینانا زمانی د تێكستێ سترانێدا، شێوێ كاریگەرییا سترانێ لسەر زارۆكێ دەستنیشان دكەت. ئێک ژ تیۆرییێن گرنگ و سەرەكی د دەستنیشانكرن و شرۆڤەكرنا كاریگەرییا پێكهاتەیا زمانی لسەر وەرگری، تیۆرییا (ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێ دا) یە، ئەوا ژ لایێ (رۆمان یاكوبسون)ی ڤە هاتیە پێشڤەبرن. د ڤێ ڤەكۆلینێدا، ٣١ سترانێن زارۆكا یێن كەنالێ پێلستانک هاتینە هەلبژارتن و تیۆرییا ناڤبری، پشتی ب تێروتەسەلی هاتیە شرۆڤەكرن، لسەر تێكستێن سترانێن هەلبژارتی هاتیە پراكتیككرن، داكو ب رێبازەكا سالۆخكاری، ئاماری و شرۆڤەكاری، كاریگەرییا سترانێن هەلبژارتی، ب رێكا دەستنیشانكرنا ئەركێن زمانێ وان سترانان، لسەر زارۆكێ وەرگرێ وان سترانان، بهێنە دەستنیشانكرن و شرۆڤەكرن. ئارمانجا سەرەكی ژ ڤێ ڤەكۆلینێ، ئەنجامدانا هەلسەنگاندنەكا زانستییانەیا میناكەكا سترانێن زارۆكانە و جۆرێ كاریگەرییا وان سترانان لسەر زارۆكییە، داكو سترانا زارۆكا بشێت ب شێوەیەكێ پەروەردەیی یێ ساخلەم و ئەرێنی رۆلێ خۆ د ئاڤاكرنا زارۆكیدا بگێریت.

### ١ -تیۆرییا ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا:

زمان ئێكە ژ سیستەمێن سەرەكی یێن پەیوەندیكرنێ، نە بتنێ د ناڤبەرا مرۆڤاندا، بەلكو دناڤبەرا بوونەوەرا ب گشتیدا. زمانێ مرۆڤان ئەوێ بۆ پەیوەندیكرنێ دهێتە بكارئینان، شێوە و دەربرینێن بێ سنوور هەنە، كو ئەڤ دەربرینە دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا كاریگەرییێ لسەر هەڤدوو ب ریكا بجهئینانا ئەركێن جودا ژلایێ زمانیڤە. ئانكو "زمان نە بتنێ سیستەمەكێ نیشانایە، بەلكو سیستەمەكە كاریگەرییێ ل رەفتارێن وەرگری دكەت"(Setiawati Darmojuwono, 2016, p.130). لدۆر ڤێ یەكێ ژی، چەند تیۆرییەک هەنە كو دەسنیشانا شێوە و جۆرێن كاریگەرییا پەیامێ ل سەر وەرگری دكەن. ئێک ژ وان تیۆرییێن تێروتەسەل یێن گرێدای ئەركێ زمانی د كریارا گەهاندنێدا، تیۆرییا (رۆمان یاكوبسون) یە. ئەڤ تیۆرییە ل ناڤەراستێن سەدێ بیستێ هاتیە پێشڤەبرن، كو "دەستپێكا ڤێ وێ ب شێوێ ڤەكۆلینەكێ د كۆنفرانسەكیدا ل سالا ١٩٥٦ێ لژێر ناڤێ (میتازمان وەكو ئاریشەكا زمانڤانی) هاتە پێشكێشكرن، پاشی ل سالا ١٩٧٦ێ هاتە بەلاڤكرن. د دەمەكیدا كو پارچەكا مەزنا پەرتووكا یاكوبسونی، (زمانڤانی و شعرییەت)، دووبارەكرنا ناڤەرۆكا ڤەكۆلینا وی یا سالا ١٩٥٦ێ بوو"( Lauri Linask, 2018, P.520). ئانكو ئەڤ تیۆرییە نە بتنێ د ئێک قۆناغدا هاتیە دانان و پێشڤەبرن، بەلكو یاكوبسونی بتنێ ب ڤەكۆلینەكێ لدۆر ئاریشێن زمانی دەستپێكریە، ئەوژی ئاریشێن میتازمانی، ئەڤەژی بتنێ ئێكە ژ ئەركێن زمانی، نەكو تیۆری هەمییە. ئەڤ تیۆرییا یاكوبسونی دشیاندایە د هەمی پرۆسێسێن زمانی یێن پەیوەندیكرنێدا بهێتە لبەرچاڤ وەرگرتن. ب رێكا ڤێ تیۆرییێ، دشیاندایە ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا تاراددەیەكێ باش بهێنە دەستنیشانكرن و شرۆڤەكرن.

### ١-١-تیۆرییا ئەركێن زمانی یا (رۆمان یاكوبسون)ی:

یاكوبسون تیۆرییا خۆ ل سەر دوو قۆناغان دابەش دكەت. قۆناغا ئێكێ دەستنیشانكرنا جەمسەرێن هەر كریارەكا پەیوەندیكرنا زمانییە، قۆناغا دووێ ژی دەستنیشانكرنا ئەركێن زمانینە د وێ پرۆسێسا گەهاندنێدا. یاكوبسون د وێ باوەرێدایە كو هەر پرۆسێسەكا پەیوەندیكرنا زمانی پێدڤییە شەش جەمسەر هەبن، ئەوژی:

فرێكەر، پەیام، وەرگر، رێرەو، كەنال و كۆد. د پرۆسێسا گەهاندنێدا "فرێكەر پەیامێ بۆ وەرگری فرێدكەت. داكو پەیام یا چالاك بیت، پێدڤییە رێرەوەك هەبیت و ئاماژێ ب هندەك تشتان بدەت و وەرگری شیانێن تێگەهشتا وی رێرەوی هەبن، ئەوژی بڕێكا بكارئینانا كۆدەكێ ب تمامی یان تا رادەیەكی هەڤپشك دناڤبەرا فرێكەر و وەرگرێن پەیامێ (كۆدكەر و كۆدڤەكەرێن پەیامێ) دا. ل دویماهیێ ژی، پێدڤییە ئالاڤەكێ پەیوەندیكرنێ، ئانكو كەنالەكێ فیزیكی و پەیوەندییەكا دەرۆنی د ناڤبەرا فرێكەری و وەرگریدا هەبن داكو بچنە د پرۆسێسا پەیوەندیكرنێدا و تێدا بمینن"(Roman Jakobson, 1987, p. 66). ئەڤ هەمی فاكتەر یانژی جەمسەرێن پەیوەندیكرنێ دشیاندایە ب ڤی رەنگێ بهێنە رێكخستن:

رێرەو

فرێكەر ــــــــ پەیام ــــــــ وەرگر

كەنال

كۆد

ئەڤ شەش لایەنێن پەیوەندیكرنێ سەرەكینە و بێی ئێک ژ وان پەیوەندیكرن دروست نابیت. ب گۆتنەكا دی، ئەگەر فرێكەر نەبیت؛ كی دێ پەیامێ هنێریت؟ ئەگەر پەیام نەبیت؛ دێ فرێكەر چ هنێریت و دێ وەرگر چ وەرگریت؟ و ئەگەر وەرگر نەبیت؛ دێ كی پەیامێ وەرگریت؟ ئەگەر رێرەو نەبیت؛ بابەتێ پەیامی دێ چ بیت؟ چونكو گەهاندنا ڤالا نابیتە گەهاندن. و ئەگەر كەنالەک نەبیت؛ چەوا پەیام دێ ژ فرێكەری بۆ وەرگری هیتە ڤەگوهازتن؟ و ئەگەر كۆدەكێ هەڤپشک یان زمانەكێ هەڤپشک دناڤبەرا فرێكەری و وەرگریدا نەبیت؛ دێ چەوا تێگەهشتن دروستبیت؟ یاكوبسون ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنا ل سەر بنەمایێ ڤان شەش جەمسەران دەستنیشان دكەت، كو ب دیتنا وی هەر جەمسەرەكێ د كریارا پەیوەندیكرنێدا جەخت لسەر دهێتەكرن؛ زمان ئەركەكێ جودا دگێریت. ئەو ئەركە ژی: هەلچوون، تێگەهاندن، بۆڤەگەری، ئاگەهداركرن، میتازمان و شعرییەت. یاكوبسون د وێ باوەرێدایە كو دەمێ جەخت ل سەر فرێكەری دهێتە كرن، زمان ئەركێ هەلچوونێ دگێریت. هەروەسا دەمێ جەخت ل سەر وەرگری دهێتەكرن، زمان ئەركێ

تێگەهاندنێ دگێریت. دەمێ جەخت ل سەر رێرەوی دهێتەكرن، زمان ئەركێ بۆڤەگەری دگێریت. و دەمێ جەخت ل سەر پەیامێ ب خۆ دهێتە كرن، زمان ئەركێ شعرییەتێ دگێریت. هەروەكو ب ڤی رەنگێ ل خوارێ دیار دبیت:

بۆڤەگەری

هەلچوون ـــــــــــــ شعرییەت ـــــــــــــ تێگەهاندن

ئاگەهداركرن

میتازمان

ب ئاوایەكێ گشتی، تیۆرییا یاكوبسونی ژ شەش جەمسەران و هەروەسا ژ شەش ئەركان پێكدهێت. هەر جەمسەرەک گرێدای ئەركەكییە، هەروەكی دڤی هێلكارییێدا دیار دبیت:

رێرەو (بۆڤەگەری)

فرێكەر (هەلچوون) ـــــــــ پەیام (شعرییەت) ـــــــــ وەرگر (تێگەهاندن)

كەنال (ئاگەهداركرن)

كۆد (میتازمان)

سەرەڕای جوداكرنا ڤان هەر شەش ئەركان و جودا باسكرنا وان ژلایێ یاكوبسونی ڤە، سرۆشتێ وان نەیێ تاكانەیە. ئانكو هەر ئەركەک ب ئاوایەكێ ڤەقەتیای ژ ئەركێن دی رۆلێ خۆ ناگێریت، بەلكو وەكو رێكخستۆكەک، زمان د پەیامێدا ئەركێن خۆ دگێریت. هەروەسا "سەرەڕای جوداكرنا هەر شەش لایەنێن پەیوەندیكرنێ، گەلەكا ب زەحمەتە پەیامەكا زمانی بهێتە دیتن كو بتنێ ئێك ئەرك تێدا هەبیت. واتە، د كریارا گەهاندنێدا، ئەركەكێ دەستنیشانكری قورخكارییێ ناكەت، هەر پەیامەكێ رێكخستنەكا پەیكی هەیە و دبیت ئەركەك ژ ئەركەكێ دی پتر دیاربییت"(Roman Jakobson, 1987, p. 66).

بكارئینانا زاراڤێ (رێكخستنەكا پەیكی یا ئەركان) ژبەر وێ یەكێیە كو "پەیوەندییا د ناڤبەرا ڤان ئەركادا ژ ئەركا ب خۆ گرنگترە. ب گۆتنەكا دی، گرنگی د وێ یەكێدایە كا چەوا ئەڤ هەمی ئەركە پێكڤە هاتینە بنیاتنان و چەوا د پێكهاتەیەكێ

دەستنیشانكریدا دگەل ئێك كاردكەن"(Lauri Linask, 2018, P.520). ئانكو لڤێرێ وەكو بنیاتێ ئەركی یێ زمانی هاتیە باسكرن كو ئەڤ بنیاتە ژی ژ كۆمەكا ئەركان پێكدهێت و وان ئەركان پەیوەندی ل گەل ئێک هەنە و ئێدی وەكو رێكخستۆكەكا ئەركی د زمانیدا دیاردبیت و كاریگەرییێن تێكهەل ل سەر وەرگری دكەن. لێ لڤێرێ یاكوبسون باس ل زاراڤێ (ئەركێ زال) دكەت، كو لسەرێ ئەڤێ رێكخستۆكێ دهێت و ژ هەر ئەركەكێ دی بلندترە. لێ ئەڤە وێ واتایێ ناگەهینیت كو ئەركێن دی لاوازن و كاریگەرییا خۆ د پەیامێدا ل سەر وەرگری نینە. یاكوبسون دڤی بواریدا دیاردكەت كو "ب ئاوایەكێ گشتی، پەیام پتر پشتبەستنێ ل سەر ئەركەكێ زال دكەت"( Roman Jakobson, 1987, p. 66)، ب وی تێگەهی كو د "پێكهاتەیێ پەیامێدا، ئەڤ ئەركە یان لاوەكی و نەسەربخۆنە، یانژی رۆلێ رێكخستن و بنیاتنانا گشتی یا پەیامێ دگێرن، كو دبێژنە تەوەرێ دووێ ئەركێ زال"(Lauri Linask, 2018, P.520). ئەڤە وێ واتایێ دگەهینیت كو ئەركەك پتر ژ ئەركێن دی ناسنامەیا خۆ ل سەر پەیامێ دسەپینیت. هەروەسا دبیتە كەرستەیەكێ سەرەكی د وێ پەیامێدا و وەكو سەركێشەک بۆ ئەركێن دی دهێتە هژمارتن.

لدۆر ڤان شەش ئەركێن ژ لایێ یاكوبسونی ڤە هاتینە باسكرن، رەخنەگرێن ئەدەبی و ب تایبەتی ژی یێن فۆرمالیستی شرۆڤەكرن و بۆچوونێن خۆ هەنە، ژبلی شرۆڤەكرنێن یاكوبسونی ب خۆ، كو وەكو خودانێ تیۆرییێ داینە ئەڤان ئەركان. بۆچوون و شرۆڤەكرنێن لدۆر ڤان شەش  ئەركان دشیاندایە بڤی رەنگێ ل خوارێ بهێنە باسكرن.

**١-١-١- ئەركێ هەلچوونێ:**

وەكو بەری نووكە هاتیە باسكرن، دەمێ جەخت ل سەر فرێكەری دهێتەكرن، زمان ئەركێ هەلچوونێ دگێریت. لدۆر ڤێ چەندێ یاكوبسون د وێ باوەرێدایە كو "ئەركێ هەلچوونێ یان یێ دەربرینێ جەختێ لسەر فرێكەری دكەت، كو هەلچوونێن فرێكەری بەرامبەر بابەتێ پەیامێ دیاردكەت. ئانكو دەربرینێ ژ هەلچوونا دكەت، ئەڤجا ئەڤ هەلچوونە راستەقینە بن یانژی دەستكرد"( Roman

(Jakobson, 1987, p. 66). ئانکو لڤێرێ مەبەستا فرێکەری ژ وێ پەیامێ دبیتە دیارکرنا هەلویستێ خۆ بەرامبەر بابەتی، یانژی نیشاندانا هەلچوونێن خۆ، ئەڤ هەلچوونە ژی چ نەرێنی بن یان ئەرێنی. فرێکەر خۆ دکەتە دناڤ پەیامێدا و هەلچوونێن خۆ یێن تایبەت تێکەلی پەیامێ دکەت و دڤێ پرۆسێسا پەیوەندیکرنێدا ئەوان هەلچوونێن خۆ دگەهینیتە وەرگری. یاکوبسون دڤی بواریدا دیاردکەت کو "ئەرکێ هەلچوونێ ب ئاوایەکێ سەرەکی پشتبەستنێ لسەر خۆسەپاندنا فرێکەری دکەت، کو د ئاستێن دەنگی، رێزمانی و لێکسیکیدا، تا رادەیەکی چێژەکێ ددەتە زمانێ بکارهاتی. لێ دشیاندا نینە ئەڤی جۆرێ بکارئینانا زمانی لسەر بنەمایێ وان پێزانینێن ڤەدگوهێزیت شرۆڤەبکەین و گرنگیا وی دیاربکەین."(Roman Jakobson, 1987, p. 67). ئانکو لڤێرێ دەمێ هەلچوون دهێنە دیارکرن، رێژا پێزانینێن کو ئەو پەیامە هەلدگریت بەرەڤ کێمبوونێ ڤە دچیت. هەروەسا ئەگەر ل سەر بنەمایێ چەنداتیا گەهاندنا پێزانینا بۆ وەرگری ئەوێ پەیاما هەلچوون لسەر زال شرۆڤەبکەین، دێ پەیام، پەیامەکا لاوازبیت. لێ، هەروەکو یاکوبسونی ئاماژەپێدای، نەیا گونجایە ل سەر بنەمایێ پێزانینێن دهێنە فرێکرن ئەڤ پەیامە بهێنە هەلسەنگاندن. هەر دڤی بواریدا یاکوبسون دیاردکەت کو "ئەڤ ئەرکە نەوەکو گۆتارێن سۆزینە، بەلکو کۆدکرنەکا زمانڤانی یا دەستنیشانکرییا پەیامێیە د بنیاتەکێ دەستنیشانکریدا"(Lauri Linask, 2018, P.522). دبیت مەبەستا یاکوبسونی ژ جوداکرنا گۆتارا هەلچوونێ و گۆتارا سۆزی، جوداکرنا گۆتارا ئەدەبی ژ گۆتارەکا نەئەدەبی بیت، چونکو پەیاما ئەدەبی پتریا جارا پەیامەکا سۆزدارییە، لێ ئەو پەیاما هەلچوون تێدا زال، نەمەرجە پەیامەکا سۆزدای بیت، ئانکو نەمەرجە پەیامەکا وەسا بیت کو ئاستێ سۆزدارییێ تێدا یێ بلندبیت. پەیاما هەلچوون تێدا زال چەند تایبەتمەندییەک هەنە، ئێک ژ وان تایبەتمەندییا (دروستکرنا هەلچوونا و سەپاندنا وان هەلچوونا د رێرەویدا. هەروەسا، ژ لایێ چەوانیا زمانی ڤە، ئاوازە رۆلێ خۆ دگێریت. ئانکو فرێکەر ب ئاوایەکێ سەلیقەدار و ب رستێن خودان ئاوازێن دەستنیشانکری، هەلچوونێن خۆ ل وێ پەیامێ زێدەدکەت. دیسان بکارئینانا زمانەکێ هەڤتەریبی و هەڤگونجان دناڤ پێکهاتەیێن وێدا بۆ وێ یەکێ کو فرێکەر هەلچوونێن خۆ ب رێکا وان هەڤگونجانا د پەیامێدا زێدەبکەت)( Angela C. Tribus,

2017, p.12). هەلبەت لڤێرێ دیاردبیت كو هەلچوون ب رێكا چەوانییا پێشكێشكرنا پەیامێ ژی، ئانكو ئاوازا وێ، هەروەسا ژلایەكێ دی ڤە ژ هەڤگونجانا پێكهاتەیێن وێ دیاردبیت. ئەڤا بۆری رێكێن دەستنیشانكرنا هەلچوونێنە دناڤ پەیامێدا، ئانكو ب ڤان رێكا (هەڤگونجان، هەڤتەریبی و خۆسەپاندن) دیاردبیت كو هەلچوونا د پەیامێدا هەی. سەرەرای ڤێ چەندێ، نیشانێن سەرەكی یێن پەیاما هەلچوون تێدا، بكارئینانا جهناڤێن كەسێ ئێكێنە ژلایێ فرێكەری ڤە. ئانكو دەمێ د پەیامەكێدا جهناڤێن كەسێ ئێكێ ب مشەیی بهێتە دیتن، ئەڤجا ئەڤ جهناڤە چ تاک بن یان كۆم، وێ یەكێ دیاردكەت كو فرێكەر باس ل هەلچوونێن خۆ دكەت و خۆ دناڤ پەیامێدا دسەپینیت و بزاڤێ دكەت پەیام لدۆر وی و هەلویستێن وی بەرامبەر بابەتێ پەیامێ بیت. لێ هندەک جاران ئاریشەیەک دڤێ یەكێدا دروستدبیت، ئەوژی دەمێ جهناڤێن كەسێ ئێكێ یێن كۆم (ئەم و مە) دهێنە بكارئینان، كو "جاران دبنە ئەگەرێ پەیداكرنا ئالۆزییان د دەستنیشانكرنا ئەركێ زمانیدا. چونكو جاران دەمێ ئاخڤتنكەر ئەڤان جهناڤان بكاردئینیت، مەبەستا وی ئاخڤتنكەر و وەرگرن"( Angela C. Tribus,2017, pp. 21-22) ئانكو (ئەز و تو –من و تە). لڤێرێ دیارنابیت كا مەبەستا وی ئاخڤتنكەرە یان وەرگرە یانژی هەردووونە، چونكو هەردوو جەمسەرێن فرێكەر و وەرگر د پەیامێدا ئامادەنە و د چركەیا رویدانا كریارا پەیوەندیكرنێدا، دەمێ جهناڤێ كەسێ ئێكێ یێ كۆم بهێتە بكارئینان، دبیت جاران مەبەست پێ فرێكەر و وەرگر هەردوو بن. لێ دەستنیشانكرنا وێ یەكێ كا مەبەست پێ جەمسەرێ فرێكەرییە یا یێ وەرگری، یانژی هەردووونە، دبیت ب رێكا رێرەوێ زمانی بهێتە دەستنیشانكرن.

**١-١-٢- ئەركێ تێگەهاندنێ:**

یاكوبسون د تیۆرییا خۆدا ب رێزبەندییا دووێ باس ل ئەركێ تێگەهاندنی دكەت. ب وی تێگەهی كو "ئەركێ تێگەهاندنێ، ئەو ئەركێ زمانییە ئەوێ جەختێ ل سەر وەرگری دكەت و كاریگەرییێ ل رەفتارێن وی دكەت و بزاڤێ دكەت وی لدۆر هندەک تێگەهان رازی بكەت. كو ب شێوەیەكێ گشتی، ئەڤ ئەركە ل سەر بنەمایێ كارتێكرنا پەیامێ لسەر رەفتارێن وەرگری دهێتە هەلسەنگاندن"( Angela C.

(Tribus,2017, p. 12). لڤێرێ دیاردبیت دەمێ جەخت ل سەر وەرگری دهێتەکرن، مەبەست پێ بکارئینانا جهناڤێن کەسێ دووێ نە، ئەڤجا چ تاک بن یان کۆم. ئانکو فرێکەر بزاڤێ دکەت وەرگری لدۆر هندەک تێگەهان رازی بکەت، کاریگەرییێ ل رەفتارێن وی بکەت و بزاڤێ بکەت کو هندەک تێگەهان بگەهینیتێ و ئەوژی تێبگەهیت و ل سەر بنەماییێ وێ تێگەهشتنێ کاریگەری ل رەفتارێن وی بین.

سەرەڕای هەبوونا کەسێ دووێ وەکو بەلگەیەک بۆ هەبوونا ئەرکێ تێگەهاندنێ، یاکوبسون د وێ باوەرێدایە کو هەبوونا ئەرکێ تێگەهاندنێ د پەیامێدا "ب رێکا بکارئینانا فۆرمێن گازیکرن و فەرمانێ دیاردبیت"( Roman Jakobson, 1987, p. 67). لڤێرێ مەرج نینە د فۆرمێن گازیکرن و فەرمانێدا کەسێ دووێ بهێتە بکارئینان، کو جاران ناڤێ وەرگری دهێتە گۆتن یان باسکرن، ئانکو ئاماژە ب ناڤێ وەرگری دهێتەدان.

هندەک رەخنەگر د وێ باوەرێدانە کو نەمەرجە بتنێ د فۆرمێن گازیکرن و فەرمانێدا، ئەرکێ تێگەهاندنێ د پەیامێدا دیاربیت. بەلکو ئەو کۆمەکا فۆرمێن دی دیاردکەن، وەکو هندەک بکارئینانێن زمانی یێن کو ئەرکی تێگەهاندنێ تیدا هەیە. لدۆر ڤێ یەکی (رۆن کوان) ب ڤی رەنگی باس ل فۆرم و پێکهاتە و نموونەیێن ئەرکی تێگەهاندنێ دکەت:(Ron Cowan, 2008, p. 114)

| فۆرمێن دەستپێکی | پێکهاتە | نموونە |
|---|---|---|
| فۆرمێ سەرەکی | چاوگ + بەرجەستەنەبوونا بکەری (نەدیاربوونا بکەری). | بێدەنگ بە! |
| فۆرمێ سەرەکی (نەرێ) | چاوگ + بەرجەستەنەبوونا بکەری ل گەل بکارئینانا ئامرازێ نەرێکرنێ. | دەست نەکە وی تشتی! |
| جەختکرن (دوپاتکرن) | دەربرینێ ژ هەستێ نەچاربوونێ دکەت. | هەردەمێ تە تشتەک زانی، پەیوەندییێ ب مە بکە. |
| داخوازیا ب رێزگرتن | فۆرمێ داخوازییێ + داخوازی | دێ شێیی دەرگەهی گری! |

| گازیکرن | ژ ناڤێ کەسێ دووێ دەستپێدکەت یان ب دویماهی دهێت، کو کومایەک دکەڤیتە دناڤبەرا وی ناڤی و رستێدا. | ئازاد، دەرگەهی بگرە. |
| --- | --- | --- |
| پێدڤیاتی | پێدڤیە + تمامەتیا رستێ | پێدڤیە تو ڤێ فۆرمێ پربکەی. |
| داهاتیێ داخوازی | ب (کا + دا) دەستپێدکەت، ناڤەرۆکا وێ رستێ کریارەکە کو پێدڤیە ژ لایێ ئاخفتنکەری و وەرگریڤە بهێتە ئەنجامدان، یانژی وەکو فەرمانەکێ یان داخوازیەکێیە بۆ وەرگری. | کا دا تێشتێ بخۆین. کا دا سەحکەینێ کا تە چ ئینایە. |

ئەڤ ئەرکە گەلەک گرێدای پەروەردەکرن و فێرکرنێ و گۆرانکاریا کەسایەتیا وەرگرییە، کو دبیت د پرۆسێسا پەروەردەکرنێدا، و ب تایبەتی ژی پەروەردەکرنا زارۆکان، پەیامێن ب ڤی رەنگی ب مشەیی بهێنەدیتن.

**١-١-٣- ئەرکێ بۆڤەگەری:**

گەلەک زاراڤ بۆ ڤی ئەرکی هاتینە بکارئینان، کو یاکوبسون ب خۆ د تیۆریا خۆ دا پتر ژ ناڤکرنەکێ بکارئینایە. یاکوبسون ژبلی ئەرکێ بۆڤەگەریێ ( Referential Function) ب (ئەرکێ دەلالی، ئەرکێ زانینێ، ئەرکێ هزری و ئەرکێ ناساندنێ) ژی ناڤکریە. هەروەسا ژبلی یاکوبسونی، (کارل بویلەر) ژی، ئەرکێ نوینەراتیکرنێ (Representation Function) بکارئینایە(Lauri Linask, 2018, P.522). بۆڤەگەری "ئەو پەیامە بۆ هەلگرتنا پێزانینێن ئاشکرا هاتیە پێکئینان، ئانکو ئەو پەیامن ئەوێن بۆ تشتەکێ دەرڤەی زمانی ڤەدگەرن"(Marcel Danesi (Ed.), 2013, pp. 375-376). لدۆر تێگەهێ ڤی ئەرکی، یاکوبسون دبێژیت: "ئەرکێ بۆڤەگەریێ، ئەوێ برێکا جەختکرنێ لسەر رێرەوی دیاردبیت، د زۆربەیا پەیاماندا پتر ژ ئەرکێن دی دهێتە دیتن. لێ ئەرکێن دی ژی گرنگیا خۆ هەیە و دگەل ئەرکێ بۆڤەگەریێ وەکو

دەستەیەك رۆلێ خۆ دگێرن"(Roman Jakobson, 1987, p. 66). ئانکو د هەر پەیامەکێدا دەمێ ئەرکێن زمانی تێدا دهێنە دەستنیشانکرن، ئەرکێ بۆڤەگەریێ پتر تێدا دهێتە دیتن.

هندەک زانا د وێ باوەرێدانە کو "لێڤەگەری، ئەرکێ ئێکانە یێ زمانییە. کو جاران دەمێ ئەرکەکێ دی د زمانیدا دهێتە تێبینیکرن، وەکو لادان یان نامۆیی دهێتە دیتن و نابیت گرنگییەکا تایبەت پێ بهێتە دان"( Krystyna Pomorska and Stephen Rudy (Eds.), 1985, p. 144)). هەلبەت ئەڤە بریارەکا توندە لسەر پەیامێ، چونکو د پەیامێدا ئەرکێن دی ژی هەنە و نابیت دەمێ زمان ئەرکەکێ دی ژدەرڤەی ئەرکێ بۆڤەگەری دگێریت وەکو لادان و دیاردەیەکا نامویی بهێتە هژمارتن. ئانکو "سەرەڕای هندێ کو پتریا جاران ئەرکێ لێڤەگەرییێ دگەل زمانییە، پێدڤیە ئەرکێن دی ژی د هەر دەستەیەکا پەیکی یا دەستنیشانکریدا لبەرچاڤ بهێنە وەرگرتن، خۆ ئەگەر ئەرکێ لێڤەگەریێ ب ئاوایەکێ ئاشکرا تێدا یێ زال بیت"(Lauri Linask, 2018, P.522). ئەڤ زاراڤێ دەستەیا پەیکی یان رێکخستنا قۆچەکی ژ لایێ یاکوبسونی ڤە هاتیە دانان. کو یاکوبسون د وێ باوەرێدایە کو کۆمەکا ئەرکان رۆلێ خۆ د زمانێ پەیامێدا دگێڕن و پێکڤە کاردکەن و هەمیا پەیوەندی ل گەل ئێک هەیە، لێ ئەرکەک ژ وانا پتر ژ ئەرکێن دی رۆلێ خۆ دگێریت و وەکو کەرستێ زال دهێتە باسکرن( Roman Jakobson, 1987, p. 66).

ئەو پەیامێن ئەرکێ بۆڤەگەریێ تێدا زال، گەلەک تایبەتمەندی هەنە. بۆ نموونە، ئەرکێ بۆڤەگەریێ رەهەندێن زانینێ بخۆڤەدگریت، کو باس ل هندەک تشت و تێگەهێن ل دەرڤەی زمانی دکەت و دبیتە ئەگەرێ هندێ کو وەرگری ڤەبگەرینیت بۆ وان تشت و تێگەهان. ژ لایەکێ دی ڤە، فرەشێوەیی پێڤە دیارە، ئانکو نەچارچۆڤەکریە بتنێ د زمانیدا، بەلکو رووبەرێ وێ گەلەکێ فراوان و فرەرەهەندە. دیسان ئەرکێ بۆڤەگەریێ زانینا رێرەوی ئاڤادکەت، ئانکو ئەڤ ئەرکە کارلێکێ ل گەل زانینا رێرەوی دکەت و ئەڤ کارلێکە دبیتە ئەگەرێ هندێ کو ئاڤاکرن د وێ زانینێدا دروستببیت. هەرووەسا سەرەڕای ئاڤاکرنا ئەڤێ زانینێ، ب کارێ بەرجەستەکرنا

زانینێ رادبیت و جڤاكی وەكو كۆم لدۆر ئەڤێ زانینا رێرەوی هشیار دكەت( Angela C. Tribus, 2017, pp. 8-9).

ب ئاوایەكێ گشتی چونكو زمان وەكو سیستەمەک، ژ پەیوەندیێن دوالیستی پێكدهێت، ئەوژی وەكو نیشانكار و نیشانكری، پتریا جاران ئەو نیشانكریە ل دەرڤەی زمانینە، ژبەر هندێ ژی ئەركێ بۆڤەگەریێ پتر د سیستەمێ زمانیدا دهێتە دیتن، چونكو وەكو سیستەمەكێ نیشانان، ئاماژێ ب هندەک نیشانكریيا ددەت كو پتریا وان ل دەرڤەی زمانینە. لێ د پرۆسێسا گەهاندنێدا زمان نەبتنێ ڤی ئەركی دگێریت، بەلكو كۆمەكا ئەركێن دی و نابیت بتنێ جەخت لسەر ئەركێ بۆڤەگەریێ بهێتەكرن دەمێ ڤەكۆلین لدۆر ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا دهێتە ئەنجامدان.

**١-١-٤- ئەركێ ئاگەهداركرنێ:**

یاكوبسون د وێ باوەرێدایە كو دەمێ جەخت لسەر كەنالی دهێتەكرن، یانژی لسەر وێ پەیوەندییا فیزیكی ئەوا دناڤبەرا فرێكەر و وەرگریدا كو ب رێكا وێ پەیوەندیێ یان وی كەنالی پەیام دگەهیتێ، زمان ئەركێ ئاگەهداركرنێ د وێ پەیامێدا دگێریت(Roman Jakobson, 1987, pp. 68-69). واتە "ئەركێ ئاگەهداركرنێ گرنگیێ ب وێ پەیوەندیێ ددەت ئەوا دناڤبەرا ئاخڤتنكەری و وەرگریدا"( Angela C. Tribus, 2017, p.16). جەختكرن لسەر كەنالی گەلەک مەبەست پێ هەنە، ئانكو ئەو ئەركێ ئاگەهداركرنێ ژ كۆمەكا مەبەستان پێكدهێت. مەبەستا سەرەكی ژ جەختكرنێ لسەر كەنالی "دامەزراندن، بەردەوامیدان، پشكنین، پەسەندكرن و راوەستاندنا پەیوەندیێ یە دناڤبەرا فرێكەر و وەرگریدا، كو جەختكرن ل سەر ئەڤی ئەركی، جەختكرنە ل سەر كەنالێ پەیوەندیێ دناڤبەرا فرێكەر و وەرگریدا. ئەڤ ئەركە ب رێكا كۆمەكا دەربرینێن كەلتووری و نەكەلتووری كو دبێژنێ ئاخڤتنێن بچویک (Small Talk) دیاردبیت، وەكو فۆرمێن سلاڤكرنێ و دەستپێكرنا دانوستاندنێ"( Angela C. Tribus, 2017, p.16). ژبەركو دەمێ جەخت لسەر كەنالی دهێتەكرن بۆ ئەركێ ئاگەهداركرنێ، لاوازی دبوارێ ڤەگوهازتنا زانینێ ژ فرێكەری بۆ وەرگریدا دروستدبیت. ژبەر ڤێ چەندێ ژی گەلەک جارا ئەڤ ئاخڤتنێن بچویک ب گرنگی ناهێنە وەرگرتن و وەكو

هندەک فۆرمێن ڤالا ژ زانینێ و بتنێ بۆ دەستپێکرنا کریارا پەیوەندیکرنێ دهێنە تەماشەکرن. لێ "هەبوون و نەبوونا ڤان دەربڕینا کاریگەرییەکا مەزن ل سەر سرۆشتێ پەیوەندییا دناڤبەرا فرێکەر و وەرگریدا هەیە. ئەڤ ئاخڤتنێن بچویک ب تایبەتی ل دەستپێکا دانوستاندنێ رۆلەکێ گرنگ دگێڕن، ب تایبەت وەکو دروستکرن و پاراستنا سەقایێ هەڤپشک و پەیوەندیێن پۆزەتیڤ د ناڤبەرا ئاخڤتنکەر و وەرگریدا، ئانکو دروستکرنا یەکبوونەکێ دناڤبەرا واندا"(Angela C. Tribus, 2017, p.16). ب گۆتنەکا دی، سەرەڕای هندێ کو دەمێ جەخت لسەر کەنالی دهێتەکرن، لایەنێ ڤەگوهازتنا زانینێ د وێ پرۆسێسا گەهاندنێدا کێمدبیت. لێ ئەرکێ ئاگەهدارکرنێ ئاستێ تێگەهشتنا وەرگری بۆ پەیامێ بهێزتر لێدکەت.

د هندەک شێوەیێن بکارئینانا زمانیدا دەمێ جەخت لسەر کەنالی دهێتەکرن و ئەوان ئاخڤتنێن بچویک وەکو دەستپێکەک بۆ ئەنجامدانا پرۆسێسا پەیوەندیکرنێ دهێنە بکارئینان، جاران دهێتە تێبینیکرن کو ئەڤ ئاخڤتنێن بچویک ئەرکەکێ بۆڤەگەریێ ژی دگێڕن. ئانکو پێزانین دهێتە پێکگوهارتن دناڤبەرا هەردوو جەمسەرێن پەیوەندیکرنێدا. لێ "د راستیدا ئەو پێزانینێن ب رێکا ئەڤی ئەرکی دهێنە ڤەگوهازتن هەر بۆ جەختکرنێیە ل سەر کەنالێ د ناڤبەرا فرێکەری و وەرگریدا نەکو بو ڤەگوهازتنا پێزانینان"(Angela C. Tribus, 2017, p. 17). ئانکو د شیاندایە بهێتە گۆتن کو ئەڤ پێزانینێن ب رێکا جەختکرنێ لسەر کەنالی دهێنە ڤەگوهازتن هەر بۆ هندێنە کو پشکنینەک بۆ وی کەنالێ پەیوەندیێ بهێتەکرن کا ئایا یێ ئەکتیڤە یان نە، بەری کو پرۆسێسا پەیوەندیکرنێ دەستپێبکەت.

یاکوبسون د وێ باوەرێدایە کو ئەڤ ئەرکە د زمانێ بالندێ ئاخڤتنکەر ژیدا وەکو بالندێ تۆتی (Parrot) هەیە. کو ب دیتنا وی "بزاڤێن دەستپێکرن و بەردەوامیدانا پەیوەندیکرنێ تایبەتمەندییەکا سەرەکیا بالندێ ئاخڤتنکەرە. لەورا ئاگەهدارکرن ئەرکێ ئێکانەیێ هەڤشکە دناڤبەرا زمانێ ڤان جۆرێن بالندا و یێ مرۆڤاندا"( Roman Jakobson, 1987, p. 69). ب گۆتنەکا دی ئەڤ بالندێن ئاخڤتنکەر بەردەوام بزاڤا ئاڤاکرنا کەنالەکی ل گەل یێ دی دکەن، ئەوژی ب رێکا دەرکرنا هندەک دەنگا یان یەکەیێن دەنگی بۆ هندێ ئەڤ کەنالە بهێتە ئاڤاکرن نەکو بۆ هندێ داکو ئەڤ کەنالە بۆ

ڤەگەهازتنا زانینێ بهێتە بکارئینان. هەروەسا یاکوبسون جەختێ لسەر وێ چەندێ دکەت کو نەبتنێ ئەڤ ئەرکە د زمانێ بالندێ ئاخڤتنکەردا هەیە، بەلکو ب زمانێ زارۆکان ژی ڤە گرێددەت، ب وی تێگەهی کو ئەرکێ ئاگەهدارکرنێ "ئێکەم ئەرکە د زمانێ زارۆکاندا، چونکو زارۆک بزاڤێ دکەن ب رێکا ئاگەهدارکرنێ کەنالەکێ پەیوەندیێ دروستبکەن و بزاڤێ بکەن لسەر بنەمایێ پێکگوهارتنا پێزانینا پەیوەندیێ ل گەل یێن دی بکەن"(Roman Jakobson, 1987, p. 69). هەلبەت باسکرنا ڤان هەردوو نموونا، ئانکو بالندێن ئاخڤتنکەر و زارۆک ب هەڤرا ژلایێ رۆمان یاکوبسونی ڤە، وێ چەندێ ددەتە دیارکرن کو زارۆک ژی وەکو بالندێن ئاخڤتنکەر هێشتا بنیاتێ زانینێ لدەف پەیدانەبوویە کو بزاڤێ بکەت پێکگوهارتنێ پێبکەت، بەلکو بتنێ بزاڤێ دکەن کەنالی دروستبکەت، هەروەکو بالندێن ئاخڤتنکەر.

**١-١-٥- ئەرکێ میتازمانی:**

ئەرکێ میتازمانی د چارچۆڤێ وی سیستەمێ زمانیدایە ئەوێ د پرۆسێسا پەیوەندیکرنێدا دهێتە بکارئینان. ب گۆتنەکا دی "ئەڤ ئەرکە گرنگیێ ب زمانی ب خۆ ددەت، کو دبێژنێ جەختکرن ل سەر کۆدی، کو جەختکرنە ل سەر پێکهاتا سیمانتیکی و رێزمانیا زمانی بۆ هندێ کو شاش تێگەهشتن لدەف وەرگری دروست نەبیت و زمان ب ئاوایەکێ ئاشکرا بهێتە بکارئینان"(Angela C. Tribus, 2017, p.19). ئانکو وەکو پشتڕاستبوونەکێیە ژلایێ فرێکەری ڤە کو ئەو کۆدێ د ڤێ پرۆسێسا گەهاندنێدا بکارئینای لدەف وەرگری رۆن و ئاشکرایە و وەرگر لسەر راهاتیە و چ مژداری تێدا نینن. دشیاندایە بێژین "ئەرکێ میتازمانی پشکنینا وێ یەکێیە کا ئایا فرێکەر و وەرگر دهەڤ دگەهن یان نە؟ بابەت یان مەبەستا وان یەک تشتە یان نە؟"(Lauri Linask, 2018, P.524).

هندەک ڤەکۆلەرێن دی لسەر بنەمایێ گرنگیێ پێناسەیا ئەڤی ئەرکی دکەن، ب دیتنا وان، (ئەرکی میتازمانی د کریارا پەیوەندیکرنێدا گرنگییەکا مەزن هەیە، کو ل دەمێ تێنەگەهشتنا وەرگری ژ ئەگەرێ نەزەلالیا وان دەربرینێن فرێکەر بکاردئینیت، فرێکەر پەنایێ دبەتە بەر هندەک تەکنیکا بۆ پتر رۆنکرنا دەربرینێن خۆ، ژ وان

تەكنیكان ژی، بكارئینانا هەڤواتایا، پێشكێشكرنا پێناسەیان، دووبارە دارێژتنا دەربڕینێن خۆ و بكارئینانا نموونا)(Angela C. Tribus, 2017, p.21). ئانكو ب رێكا بكارئینانا ئەڤان تەكنیكێن بۆری، دشیاندایە ئەركێ میتازمانی د پەیامێدا بهێتە دەستنیشانكرن. لڤێرێ دیاردبیت كو ئەركێ میتازمانی هندەک دەربڕینن بۆ رۆن و ئاشكراكرنا هندەک دەربڕینێن دی ژلایێ فرێكەری ڤە هاتینە بكارئینان. ئانكو ئەڤ دەربڕینێن میتازمانی بۆ زمانی ب خۆ ئاراستەكرینە، نەكو بۆ دەرڤەی زمانی. لدۆر ڤێ چەندێ، یاكوبسون د وێ باوەڕێدایە كو "هەمی دەربڕینێن هەڤواتاییێن پێزانینان لدۆر كۆدێن لیكسیكی یێن زمانی هەلدگرن، ئەركێ میتازمانی دگێڕن. د هەر پرۆسێسەكا فێربوونا زمانیدا، ب تایبەت فێربوونا زمانێ دایكێ ژ لایێ زارۆكان ڤە، ب ئاوایەكێ فراوان ئەركێ میتازمانی تێدا دهێتە بكارئینان"(Roman Jakobson, 1987, p. 69). ئانكو یاكوبسون جەختێ لسەر وێ چەندێ دكەت كو ئەركێ میتازمانی د پرۆسێسا فێركرنا زارۆكیدا بۆ زمانی گەلەک ئەكتیڤە، چونكو دەربڕینێن جودا بۆ یەک تێگەهـ دهێنە بكارئینان، واتە شێوەیێن جودایێن بكارئینانا زمانی و بكارئینانا دەربڕینێن هەڤواتا دبنە ئەگەرێ هندێ كو زارۆک پتر زمانێ دایكێ وەربگریت و ئەڤ زمانە لدەف وی بهێزتر لێبهێت.

یاكوبسون چوار پەیوەندییا د چارچۆڤێ میتازمانیدا دەستنیشان دكەت، ئەوژی ب ڤی رەنگێ ل خوارێ(Angela C. Tribus, 2017, p.21):

١- ئاراستەكرنا پەیامێ بو پەیامێ، ب گشتی ب رێكا فۆرمێن وەرگرتییێن راستەوخۆ و ئاخڤتنێن راپۆرتی. بۆ نموونە ، (وی چ گۆت؟ من های ژێ نەبوو. ئەوی گۆت بۆ لایێ چەپێ بزڤڕە). لڤێرێ پەیام هەر بۆ وێ پەیامێ هاتیە بكارئینان ئەوا بەری هینگێ هاتیە بكارئینان، كو ژبەر هەبوونا هندەک مژداریا د وان دەربڕیناندا، وەرگر ب دروستی و ب زەلالی تێنەگەهشتیە. لەورا پەیامەكا دی یا هاتیە بكارئینان بۆ هندێ ئەو پەیاما بەری هینگێ هاتیە بكارئینان، پێ رۆنببیت.

٢- ئاراستەكرنا كۆدا بۆ كۆدا، بۆ نموونە (باژێرێ نیویۆرک ئەو جهە ئەوێ ئەو ناڤە لسەر). لڤێرێ ناڤێ باژێری جارەكێ هاتیە بكارئینان و هندەک كۆد یێن ئاراستەكرین هەر بۆ ئەوی كۆدێ ئەوێ بەری هینگێ هاتیە بكارئینان، كو ناڤێ

باژێرێ نیویۆركە. ئانكو لڤێرێ كۆدێن بكارهاتی هاتینە ئاراستەكرن بۆ وان كۆدێن بەری هینگێ هاتینە بكارئینان.

٣- ئاراستەكرنا كۆدی بۆ پەیامێ، بۆ نموونە (كودیک تێشكا هرچێیە). لڤێرێ كودیک وەكو كۆدەک بۆ ناڤێ قۆناغا ژیێ گیانەوەرەكیە، كو بۆ پەیامەكێ یانژی تێگەهەكی هاتیە ئاراستەكرن، كو ئەوژی تێشكا هرچێیە. ئانكو ناڤكرنەک بۆ تێگەهەكی هاتیە ئاراستەكرن.

٤- ئاراستەكرنا پەیامێ بۆ كۆدی، بۆ نموونە (تێشكا هرچێ كودیكە). ئەڤەژی بەروڤاژی نموونا بەری نووكەیە، ئەوژی هەر د چارچۆڤێ پەیوەندیێن میتازمانیدایە، كو بەری هینگێ پەیامەک هاتیە بكارئینان، پاشی بۆ كۆدەكی هاتیە ئاراستەكرن داكو ئەو پەیامە پتر بهێتە رۆنكرن.

وەكو دەرئەنجام ئەڤ ئەركە ب رێكا جەختكرنێ لسەر كۆدی ب خۆ یان وی زمانێ بكارهاتی د پرۆسێسا پەیوەندیكرنێدا، نە بتنێ بكارئینانەكا زمانییا بێ گرنگییە، بەلكو گرنگییەكا مەزن هەیە و گرنگییا وێ ژی رۆن و ئاشكرا كرنە و پشكنینا چالاكیا وان كۆدێن زمانییە ئەوێن هاتینە بكارئینان دناڤبەرا ئاخڤتنكەری و وەرگریدا، كو ئەڤە دبیتە مەرجەكێ سەركەفتنا پرۆسێسا پەیوەندیكرنێ. هەروەسا د پرۆسێسا فێركرنا زمانێ دەیكێ ژی دا وەكو هاتیە باسكرن گرنگییەكا گەلەک مەزن هەیە، ئانكو دشیاندایە بێژین هندەک شێوەیێن بكارئینانا زمانی پتر ژ هندەک شێوەیێن دی پشتبەستنێ لسەر ئەڤی ئەركی دكەن بۆ هندێ ئارمانجێن خۆ پێ بجە بینن هەروەكو ئارمانجا فێركرنا زمانێ دەیكێ.

**١-١-٦- ئەركێ شعرییەتێ:**

گەلەک جاران ب ئەركێ جوانكاریێ دهێتە ناڤكرن( Angela C. Tribus, 2017, p. 25). ب دیتنا یاكوبسونی "جەختكرن لسەر پەیامێ ب خۆ و بۆ بەرژەوەندییا وێ ب خۆ، دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا ئەركێ شعرییەتێ د زمانی دا"( Roman Jakobson, 1987, p. 69). ئانكو دەمێ د پرۆسێسا پەیوەندیكرنێدا جەخت لسەر جوانكارییا پێكهاتەیێ زمانی دهێتە كرن ب رێكا بكارئینانا هندەک ئامێرێن جوانكاریێ كو دبنە ئەگەرێ دروستكرنا زمانەكێ ئەدەبی و ب پلە ئێک بۆ مەبەستێن جوانكاریێ دهێنە بكارئینان.

ئانكو دشياندایە بهێتەگۆتن ئەركێ شعرییەتێ "سەرەدەرییێ ل گەل وی زمانی دكەت ئەوێ جەختێ ل سەر جوانیا زمانی ب خۆ دكەت و دەولەمەندی و هەڤگونجانا دەنگی و پێكهاتەیی د پەیامیدا پەیدادكەت و بەرهەمی دكەتە هۆنەرەكێ دەنگی و شعرییەتا زمانی پەیدادكەت"(Angela C. Tribus, 2017, p.25).

هندەک ڤەکۆلەر د وێ باوەرێدانە کو ئارمانجا سەرەکی یا یاکوبسونی ژ پیشڤەبرنا تیۆرییا ئەرکێن زمانی د کریارا گەهاندنێدا، ئەرکێ شعرییەتێ بوویە. د ڤی بواریدا (لۆری لیناسک) دبێژیت: "یاکوبسون ژ هەمی ئەرکان پتر نێزیکی ئەرکێ شعرییەتێ بوو و رهێن سەرەکی یێن گرێدانا وی ب بنیاتێ زمانڤانی ڤە، ئەڤ ئەرکە بوو"(Lauri Linask, 2018, P.527). ئانکو یاکوبسون ژبەر ئەرکێ شعرییەتێ چوویە د بوارێ ڤەکۆلینێن زمانڤانیدا و هەر د ڤی چارچۆڤێ ڤەکۆلینێن زمانڤانیدا، ئەڤ تیۆرییا یا ئەرکێن زمانی د کریارا گەهاندنێدا پێشڤەبریە.

یاکوبسون د وێ باوەرێدایە کو ئەگەر پرۆسێسا گەهاندنێ ب رێکا بەرهەمەکێ ئەدەبی بیت و پێکهاتەیێ زمانی پێکهاتەیەکێ جوانکاری بیت و بتنێ بۆ خۆ کارکەت نەکو بۆ تشتەکێ دەرڤەی خۆ، لێ هندەک ئەرکێن دی ژی هەر د وێ پێکهاتەیێ جوانکارییێ زمانیدا هەنە ژ بلی ئەرکێ شعرییەتێ. لدۆر ڤێ چەندێ یاکوبسون د وێ باوەرێدایە کو "ئەرکێ شعرییەتێ نە ئەرکێ ئێکانەیێ بەرهەمێن ئەدەبییە، بەلکو بتنێ ئەرکەکێ زالە. لێ د جۆرێن دی یێن پەیامێ دا، شعرییەت دبیتە ئەرکەکێ لاوەکی، کو پتریا جاران ب رۆلێ خەملاندنێ رادبیت. ئەڤ ئەرکە، ب رێکا بەرجەستەکرنا نیشانان، دابرانا د ناڤبەرا نیشان و تشتاندا کویرتر لێدکەت. لەورا دەمێ ئەم سەرەدەرییێ دگەل ئەرکێ شعرییەتێ دکەین، نابیت بتنێ گرنگییێ ب هۆزانێ بدەین "(Roman Jakobson, 1987, pp. 69-70).

وەکو دیارە یاکوبسون د رێکخستنا هەر شەش ئەرکێن باسکری یێن پەیامێدا، زاراڤێ دەستەیا پەیکی یانژی رێکخستنا قۆچەکی یا ئەرکان بکارئینایە و باس ل پەیوەندییێ دناڤبەرا ئەرکاندا دکەت( Krystyna Pomorska and Stephen Rudy (Eds.), 1985, p. 145). ئەڤە وێ واتایێ دگەهینیت کو نابیت ئەرکەک ژ وان شەش ئەرکان د پەیامێدا بهێتە پشتگوهکرن. ئانکو "زالبوونا ئەرکێ شعرییەتێ د پەیامێدا وێ چەندێ

ناگەهینیت کو ئەرکێن دی پەراوێزکرینە و پێدڤییە بهێنە پشتگوهکرن، بەلکو بەروڤاژی، دبیت ئەرکەک یان چەند ئەرکەک ب هندەک شێوەیان دیاربن ل گەل گرنگییەکا پتر یان کێمتر ژ ئەرکێ شعرییەتێ وەکو ئەرکێ زال"( Krystyna Pomorska and Stephen Rudy (Eds.), 1985, p. 145). لڤێرێ دیاردبیت سەرەڕای هندێ کو د وێ پرۆسێسا گەهاندنێدا ئەوا جەخت لسەر پەیامێ هاتیەکرن و تێدا ئەرکی شعرییەتێ زال، دبیت هندەک ئەرکێن دی هەبن کو ژ ئەرکێ شعرییەتێ ب خۆ گرنگتر بن. ئانکو ئارمانج ژ وێ پەیامێ هندەک ئەرکێن دی بن. لێ ب رێکا بکارئینانەکا جوانکاری و زمانی فرێکەر بزاڤێ بکەت ئەرکەکی ژ ئەرکێن دی بجهبینیت.

یاکوبسون د وێ باوەرێدایە کو شعرییەت، نە بتنێ د هۆزانێدا هەیە، هەروەسا نە بتنێ شعرییەت، د هۆزانێدا هەیە. ب گۆتنەکا دی، دشیاندایە شعرییەت وەکو ئەرکەک د شێوێن دی یێن بکارئینانا زمانیدا هەبن نەکو بتنێ د شێوێ هۆزانکیدا. هەروەسا د شێوێ هۆزانکی یێ بکارئینانا زمانیدا، ژبلی شعرییەتێ، دبیت ئەرکێن دی ژی ب گرنگی دیاربن. لدۆر ڤێ یەکی یاکوبسون وەکو مەرجەکێ ڤەکۆلینێن زمانڤانی دیار دکەت کو "دەمێ زمانڤان ڤەکۆلینێ ل ئەرکێ شعرییەتێ دکەت، نابیت بتنێ خۆ ب هۆزانێ ڤە گرێبدەت. هەروەسا دەمێ زمانڤان ڤەکۆلینێ ل هۆزانێ دکەت، نابیت خۆ سنۆرداری ئەرکێ شعرییەتێ بتنێ بکەت"( Roman Jakobson, 1987, p. 70). ئەڤە وێ یەکێ دگەهینیت کو ئەڤ ئەرکە دانەبراینە ژ یەک، نە مەرجێن ڤەبرێن هەر شێوەیەکێ بکارئینانا زمانینە د کریارا پەیوەندیکرنێدا. یاکوبسون لدۆر ڤێ یەکێ هندەک نموونا بکاردئینیت و دبێژیت "ژ تایبەتمەندیێن جۆرێن جودایێن هۆزانێ ئەوە کو هەر جۆرەکی رێکخستنەکا جودایا ئەرکان تێدایە، دگەل زالبوونا ئەرکێ شعرییەتێ. هۆزانا داستانی جەختێ لسەر کەسێ سێیێ دکەت و ب ئاوایەکێ بهێز ئەرکێ لێڤەگەریێ دگێریت. لێ لیریك جەختێ لسەر کەسێ ئێکێ دکەت و پتر گرێدای ئەرکێ هەلچوونێیە. هەروەسا ئەو هۆزانا جەختێ لسەر کەسێ دووێ دکەت، گرنگیێ ددەتە لاڤەکاری و هیڤیکرنێ، یانژی پێشکێشکرنا شیرەت و راسپاردان"(Roman Jakobson, 1987, p. 70). ئانکو سەرەڕای هندێ کو د ڤان هەرسێ جۆرێن هۆزانیدا ئەرکێ شعرییەتێ زالە، هندەک ئەرکێن دیێن گرنگ دگێرن،

هەروەكو بۆڤەگەری د داستانێدا و هەلچوون د لیریكێدا و تێگەهاندن د وی جۆرێ هۆزانێدا ئەوێ جەختێ لسەر كەسێ دووێ دكەت.

**١-٣- ژێدەرێن سەرەكیێن تیۆرییا یاكوبسونی:**

دشیاندا نینە وێ یەكێ بسەلمینین كو تیۆرییا ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا ژ لایێ رۆمان یاكوبسونی ڤە ب تێروتەسەلی هاتیە دانان، بەلكو دشێین بێژین كو یاكوبسونی مفا ژ گەلەک ژێدەرێن بەری خۆ وەرگرتیە و ئەڤ تیۆرییە پێشڤەبریە. ئانكو ئەڤ تیۆرییە ژ پیشڤەبرنا یاكوبسونی یە نەكو ژ دانانا وی. لدۆر ڤێ یەكێ، (كۆری لیناسک) وێ چەندێ رۆندكەت كو ئەڤ تیۆرییا پەیوەندیكرنێ ژ مۆدێلا پەیوەندیكرنێ یا (كارل بویلەر Karl Buhler) ی، ئەوا د پەرتووكا وی (تیۆرییا زمانی)دا ل سالا **١٩٣٤**ێ بەلاڤبووی، وەرگرتیە. هەروەسا ڤێ تیۆرییێ پەیوەندی ب مۆدێلا (شانون و ویڤەر)ی ڤە هەیە، ئەوا ل سالا **١٩٤٩**ێ هاتیە پێشكێشكرن( Lauri Linask, 2018, P.519). ژبلی ڤان هەردوو ژێدەرێن تیۆرییا ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا، یاكوبسونی مفا ژ گەلەک ژێدەرێن دی ژی وەرگرتیە، كو د ڤی باسیدا دێ ئاماژە پێ هێتەدان. ئانكو "دشێین بێژین تیۆرییا یاكوبسونی، نە تیۆرییەكا رەسەنە، بەلكو لێكدانەكا ژیارانە یا كۆمەكا هزرایە ژ ژێدەرێن جوداێن بلیمەتانە"( Derek George Littlewood, 1990, p. 51). لڤێرێ دشیاندایە بێژین جوداهیا یاكوبسونی ل گەل ئەڤان ژێدەرێن مفا ژێ وەرگرتی، یاكوبسونی ژلایێ ناڤكرنێڤە و هەروەسا ژلایێ رێكخستنێڤە گۆرانكاری تێدا ئەنجامدابنە و پێشڤەبریە، ل گەل زێدەكرنا ئەركێ شعرییەتێ،كو مەرەما سەرەكی یا یاكوبسونی ژ ڤێ تیۆرییێ، دبیت باسكرن ل ڤی ئەركێ بیت، ب تایبەتی د وان پەیاماندا كو وەكو تێكستێن ئەدەبی دهێنە هژمارتن. ژێدەرێن سەرەكی یێن رۆمان یاكوبسونی پشتبەستن لسەر كری بۆ پێشڤەبرنا تیۆرییا ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا، ئەڤێن ل خوارێنە:

**١-٣-١- كارل بويلەر:**

مۆدێلا (كارل بويلەر)ی، ئەوا د بوارێ پرۆسێسا پەیوەندیكرنێ و هەروەسا ئەركێن زمانی د وێ پرۆسێسێدا، كاریگەریەكا مەزن لسەر رۆمان یاكوبسونی كریە. د ڤی بواریدا رۆمان یاكوبسون ب خۆ دانپێدانێ ب ڤێ چەندێ دكەت و وەكو مۆدێلا دەستپێكی یا ئەركێن زمانی د گەهاندنێدا بناڤدكەت. لدۆر ڤێ یەكێ یاكوبسون دبێژیت: "مۆدێلا دەستپێكی یا ئەركێن زمانی ب شێوەیەكێ سەرەكی ژ لایێ بویلەری ڤە هاتیە خۆیاكرن"(Roman Jakobson, 1987, pp. 68). سیستەمێ بویلەری یێ گەهاندنێ "ب مۆدێلا ئۆرگانون Organon Model دهێتە ناڤكرن، كو سێ پێكهاتەیێن سەرەكی ب خۆڤە دگریت، ئەوژی فرێكەر، وەرگر و ئەو تشتێ دبیتە بابەتێ گۆتارێ"(Angela C. Tribus, 2017, p.3). لێ ئەڤ مۆدێلە د دوو قۆناغاندا هاتیە پێشڤەبرن، ئەوژی ب ڤی رەنگێ ل خوارێ:




**هێلكاریێن پەیوەندیكرنێ یێن كارل بویلەری**

هێلكاریا A، هێلكاریا دەستپێكێ یا مۆدێلا بویلەری یە كو "د وی هێلكاریێدا وێنەكرنا رەسەن یا هەرسێ پێكهاتێن سەرەكیێن كریارا گەهاندنێ دیاردبیت"( Angela C. Tribus, 2017, p.3). ئانكو لڤێرێ بتنێ باس ل پێكهاتەیێن گەهاندنێ دكەت، نەكو ئەركێن زمانی د وێ پەیوەندیكرنێدا. لێ بویلەری د هێلكاریا خۆ یا دووێ دا پێشڤەبرن د مۆدێلا گەهاندنێدا ئەنجامدان، كو ئەڤ گۆرانكارییە د هێلكاریا B دا

دیاردبن. د هێلكاریێ B دا، بویلەری "گۆڕانكاری لسەر هێلكاریێ A ئەنجامداینە. كو نە بتنێ جەخت لسەر جەمسەرێن گەهاندنێ كریە، بەلكو لسەر ئەركێن هەر جەمسەرەكی ژی. ئەوژی دەربڕینا هەلچوونێن فرێكەری، ئاراستەكرن بەرەڤ وەرگری و ڤەگەڕاندن یان ژی نوینەراتیكرنا تشتەكی یان كاودانەكی"( Angela C. Tribus, 2017, p.3). ئەڤ هەرسێ جەمسەرێن سەرەكی ل گەل ئەركێن زمانی د جەختكرنا لسەر هەر جەمسەرەكی دا بنگەهێن تیۆرییا یاكوبسونی یا ئەركین زمانی د كریارا گەهاندنێدانە. كو دەربرین ژلایێ ناڤكرنێ ڤە هاتیە گوهارتن و یاكوبسونی كریە هەلچوون، هەروەیا ئاراستەكرن بەرەف وەرگری یانژی ناڤكرن، كریە تێگەهاندن و نوینەراتیكرن ژی كریە بۆڤەگەری.

یاكوبسون ب خۆ شرۆڤەكرنەكی بۆ مۆدێلا بویلەری ئەنجام ددەت، ب تایبەتی ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا لسەر بنەمایێ تیۆرییا ناڤبری. یاكوبسون لدۆر ڤێ یەكێ دبێژیت: تیۆرییا بویلەری "یا چارچۆڤەكری بوو د سێ ئەركاندا، ئەوژی ئەركێن هەلچوون، تێگەهاندن و لێڤەگەری، ب وی تێگەهی كو جەختكرن لسەر كەسێ ئێكێ، واتە هەلچوون، و لسەر كەسێ دووێ واتە تێگەهاندن، و لسەر كەسێ سێیێ واتە كەسەك یان تشتەك كو باس لێ دهێتەكرن"( Roman Jakobson, 1987, pp. 68). ئەڤەژی بەلگەیەكێ ڤەبرە بۆ كاریگەرییا یاكوبسونی ب بویلەری، كو ئەو ب خۆ ڤێ دانپێدانێ دكەت.

بویلەر لسەر بنەمایێ پەیوەندییان، ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا شرۆڤەدكەت، كو ب دیتنا وی "مەبەست ژ ئەركێ نوینەراتیێ، ئەو پەیوەندییە ئەوا دناڤبەرا نیشانێن زمانی و وان تێگەهێن ئەو زمانە نوینەراتیێ دكەت (ئانكو ئەو تشتێن زمان سالۆخ ددەت). هەروەسا مەبەست ژ ئەركێ دەربرینێ، ئەو پەیوەندینە ئەوێن دناڤبەرا نیشانێن زمانی و ئاخڤتنكەریدا، چونكو ئەو زمانە هاتیە بكارئینان داكو دەربرینێ ژ وان تشتا بكەت ئەوێن گرێدای ئاخڤتنكەری، لێ مەبەست ژ ئەركێ بانگەوازیێ، ئەو پەیوەندینە ئەوێن د ناڤبەرا نیشانێن زمانی و وەرگریدا كو ئارمانج پێ كارتێكرنە ل هەست و رەفتارێن وەرگری"(Setiawati Darmojuwono, 2016, p.129.). ئەڤ شرۆڤەكرنا ئەركێن زمانی لسەر بنەمایێ پەیوەندیێ دناڤبەرا هەرسێ جەمسەرێن

كریارا گەهاندنێ ئەوێن بویلەری باسكرین، دبیت وەكو لادانا هندەک پێكهاتەیا بیت و ئاماژەنەدان بیت بۆ پەیوەندییا ئەڤان هەمی ئەركان ل گەل ئێک. ب گۆتنەكا دی، دەمێ ئەم دبێژین ئەركێ دەربرینێ پەیوەندییا نیشانێن زمانی و ئاخڤتنكەری یە، ئەم وەرگری ددەینە لایەكی. و دەمێ ئەم دبێژین ئەركێ تێگەهاندنێ پەیوەندییا نیشانێن زمانی و وەرگری یە، ئەم ئاخڤتنكەری ددەینە لایەكێ دی، ئانكو دادبرین. هەروەسا دەمی ئەم دبێژین ئەركێ بۆڤەگەریێ پەیوەندییا نیشانێن زمانی دگەل تێگەهی یە، ئەم وەرگری ژ ڤێ پرۆسێسێ لاددەین. ئانكو دشێین بێژین، تا راددەیەكی، لسەر بنەمایێ پەیوەندییا ئەڤان پێكهاتەیان دشیاندایە شرۆڤەكرنا ئەركێن زمانی بكەین، لێ ئەم نەشێین دابرانێ ژ پێكهاتەیەكی ژ ڤان هەرسێ پێكهاتەیێن سەرەكی یێن كریارا گەهاندنێ بكەین.

سەرەڕای وەرگرتنا هەرسێ پێكهاتە و ئەركێن سەرەكی یێن زمانی د كریارا پەیوەندیكرنێدا ژ بویلەری، یاكوبسونی د هندەک بوارێن دی ژی دا مفا ژ بویلەری وەرگرتییە. ئێک ژوان كاریگەریێن بویلەری لسەر یاكوبسونی، زالبوونا ئەركی نوینەراتیێ (هەلچوونێ ب ناڤكرنا یاكوبسونی) د زمانیدا د پرۆسێسێن پەیوەندیكرنێن زمانیدا. ئەڤ بۆچوونا یاكوبسونی لدۆر ڤێ یەكی، دووبارەكرنا بۆچوونا بویلەری یە، لێ ب هندەک زاراڤێن دی. لدۆر ڤێ یەكی، بویلەر د وێ باوەریێ دایە كو "نوینەراتی ئەركێ هەری زالە د زمانیدا، ئەڤە و سەرەڕای هندێ كو د هەر ئاخڤتنەكێدا دشیاندایە هەمی ئەركێن زمانی بهێنە دیتن وەكو فۆرمەكێ زمانڤانی"( Per Durst-Andersen, 2008, 2, p. 7). ئانكو بویلەری نە بتنێ ئاماژە ب ئەركێ نوینەراتیێ دایە، بەلكو چوویە د ناڤ هندەک هویركاریێن دی یێن گرێدای ئەڤی ئەركی، ئەو ژی زالبوونا ئەڤی ئەركی د زمانی دا و دیاربوونا وی پتر ژ ئەركێن دی.

**١-٣-٢- شانون و ویڤەر:**

مۆدێلا (شانون و ویڤەری) ئێكە ژ مۆدێلێن پەیوەندیكرنێ یێن كو تارادەیەكێ باش یاكوبسونی پشتبەستن لسەر كری بۆ پێشڤەبرنا تیۆرییا خۆ یا ئەركێن زمانی د كریارا گەهاندنێدا. هندەک ڤەكۆلەر مۆدێلا شانون و ویڤەری ب ڕەسەنترین مۆدێل دیاردكەن. لدۆر ڤێ یەكێ، هندەک زانا د وێ باوەریێ دانە كو لدۆر پەیوەندیكرنا

ئاسایی، داییگراما شانون و ویڤەری ب "دایكا دایگرامێن پەیوەندیكرنێ دهێتە ناڤكرن"(Nan Wang and Bocong Li, p. 14). لڤێرێ دیارە کو بەری وی گەلەک مۆدێلێن دی یێن پەیوەندیكرنێ ژ لایێ گەلەک زانایانڤە هاتینە دانان، ئێک ژ وان، مۆدێلا بویلەری کو ل سالا (١٩٣٤) بوو، لێ ئەڤ مۆدێلە ل سالا ١٩٤٨ێ بەلاڤبوویە. ئانكو دبیت جهێ تێبینیێ بیت دەمی ئەم ب دایكا مۆدێلێن گەهاندنێ بدەینە دیاركرن. مۆدێلا شانون و ویڤەری ئەوا بناڤێ (تیۆرییا بیركاریا پەیوەندیكرنێ) ل گۆڤارا تەكنیكی یا بناڤێ بێل سیستەم The Bell System بەلاڤبوویە( C. E. SHANNON, 1948,pp. 379–423). ئەڤ بابەتە بلەز د بوارێن دی یێن زانستیدا بەلاڤبوو نەكو بتنێ د بوارێ تەكنیكیدا، بەلكو د بوارێن زانستێن سۆسیۆلۆجی و مرۆڤایەتی ژی دا"( Petra Zia Sluková,2017, p. 10). ئانكو د شیاندایە بێژین ئەڤ مۆدێلە پتر بوارێن تەكنیكی و بیركاری ب خۆڤەدگرت، نەكو بتنێ بوارێ زمانی. چونكو تەكنۆلۆجیا ب ئاوایەكێ گەلەک بەرفرەهـ بۆ پرۆسێسا گەهاندنێ هاتیە و دهێتە بكارئینان. ئەڤێ مۆدێلێ ناڤكرنەكا بتنێ نینە، بەلكو دوو ناڤكرنێن سەرەكی هەنە کو "گەلەک زانایان پێ خۆشبوو ئەڤ مۆدێلە ب ناڤێ (تیۆرییا پێزانینان) بهێتە ناڤكرن، لێ شانونی زاراڤێ (تیۆرییا پەیوەندیكرنێ) پێ باشتربوو"(Petra Zia Sluková,2017, p. 10.). ئانكو شانون و ویڤەری ڤیایە ئەڤ تیۆرییە د هەمی بوارێن پەیوەندیكرنیدا بهێتە بكارئینان، نەكو بتنێ دبوارێ بیركارییێدا، لێ زانایێن دی پێ باشتربوو بتنێ د بوارێ پیزانیناندا، ئانكو د بوارێ تەكنیكیدا، بهێتە بكارئینان.

شانونی د هێلكاریا خۆدا نە بتنێ ئەو پەیوەندییا مرۆڤ و سیستەمێن زمانی یێن کو ژ لایێ مرۆڤیڤە دهێنە بكارئینان وەكو بنگەهـ بۆ تیۆرییا خۆ دانایینە، بەلكو ئامێرێن تەكنۆلۆجی ژی د ناڤ تیۆرییا وی دا هەنە. ب گشتی "هێلكارییا شانۆن و ویڤەری ژ ڤان جەمسەران پێكدهێت: ژێدەرێ پێزانینان کو پەیامێ بەرهەمدئینیت، فرێكەرەك کو پەیامێ كۆددكەت و فرێدكەت، كەنالەك یانژی هەڤبەندەك کو پەیام ب رێكا وی دهێتە ڤەگوهازتن، كۆدڤەكەرەك کو كۆدێن پەیامێ ڤەدكەت، و پاشی وێستگەها دویماهیێ، کو وی وەرگرێ بخۆڤە دگریت ئەوێ مەبەستە کو پەیام بگەهیتێ. بۆ لبەرچاڤوەرگرتنا ئاریشەن کو د شیاندایە بكەڤنە بەرامبەر ڤەگوهازتنا پەیامێ ب

شێوەیەكێ هویر، خودانێن ڤێ هێلكارییێ ئاماژێ ب ژێدەرێ هەنگامێ Noise Source ددەن كو وەكو خشخشەك كارتێكرنێ ل پەیامێ دكەت"( Rachel Sheal Preethi Mony, pp. 14-15). ئەڤ تیۆرییە ب رێكا ڤێ هێلكارییا ل خوارێ پتر دیار دبیت:




هێلكاریا شانون و ویڤەری

جوداهیەكا مۆدێلا شانون و ویڤەری ل گەل مۆدێلا بویلەری، ئاماژەدانە ب ژێدەرێ پێزانینان. هەروەسا دوو جوداهیێن دی یێن ڤێ مۆدێلێ ل گەل مۆدێلا بویلەری، كو یاكوبسونی ژی د تیۆرییا خۆ دا مفا ژێ وەرگرتیە، باسكرن ل كۆدێ هەڤپشک، هەروەسا ل كەنالی بخۆ. ئانكو شانون د ڤێ هێلكارییا خۆدا وێ یەكێ دكەتە مەرجەک كو پێدڤییە رێكەفتن لسەر كۆدێن دەستنیشانكری ژ لایێ فرێكری و وەرگری ڤە هەبیت دا كو كریارا پەیوەندیكرنێ دروستبیت. هەروەسا پێدڤییە ئاماژە ب كەنالی و وان ژێدەرێن كەنالی تێكددەن بهێتەدان، كو یاكوبسونی ئەڤ هەردوو زێدەكرنێن شانون و ویڤەری كرین ل گەل پێكهاتێ گشتی یێ هێلكاریا بویلەری د تیۆرییا خۆدا بكارئینایینە.

### ١-٣-٣- ژێدەرێن دی:

ژ بلی ڤان هەردوو ژێدەرێن سەرەكی یێن بۆری، ئەوێن یاكوبسونی پشتبەستن لسەر كری بۆ پێشڤەبرنا تیۆرییا خۆ، یاكوبسونی زاراڤێ ئەركین زمانی ل گەل هەردوو ئەركێن دی یێن ئاگەهداركرن و میتازمانی ژ هندەک ژێدەرێن بەری خۆ وەرگرتینە و ب ئاوایەكی ئەكتیڤ د تیۆرییا خۆ دا بكارئینایینە. یاكوبسونی زاراڤێ ئەركێن زمانی "ژ نڤێسیێن تنیانۆڤی یێن سالا ١٩٢٨ێ وەرگرتییە. تنیانۆڤ د وێ باوەرێ دابوو كو ئەركێ هەر پێكهاتەیەكێ گەهاندنێ، پەیوەندییا وییە دگەل پێكهاتەیێن دی و هەروەسا دگەل پرەنسیپێن پێكئینەرێن پرۆسێسا پەیوەندیكرنێ ب گشتی"( Lauri

Linask, 2018, P.519). ئانکو جەختکرن لسەر ئەرکێن زمانی و گرنگیدان ب ئەڤی زاراڤی بەری یاکوبسونی هەبوویە و یاکوبسونی بتنێ پتر گرنگی ب ڤێ یەکێ دایە د تیۆرییەکا تێروتەسەلتردا.

هەروەکو هاتیە باسکرن کو یاکوبسونی هەرسێ ئەرکێن (هەلچوون، تێگەهاندن و بۆڤەگەریێ) ژ بویلەری وەرگرتینە، لێ ئەرکێ ئاگەهدارکرنێ و یێ میتازمانی ژی نە ژ داهێنانا یاکوبسونی نە، بەلکو ژ هندەک ژێدەرێن دی یێن بەری خۆ وەرگرتینە. بۆ نموونە، یاکوبسونی ئەرکێ ئاگەهدارکرنێ ژ (مالینۆوسکی) وەرگرتییە، کو ئەڤ "جەختکرنا لسەر کەنالی ژ لایێ مالینۆوسکی ڤە ب ئەرکێ ئاگەهدارکرنێ هاتیە ناڤکرن و مەبەست پێ دیارکرنا هەڤگوهارتنێن زمانی یێن بێی ناڤەرۆکێن گرنگن و وەکو دەربرینێن نەریتینە و ئارمانج پێ درێژەپێدانا پەیوەندیکرنێ یە"(Roman Jakobson, 1987, pp. 68). ژلایەکێ دی ڤە، ئەرکێ میتازمانی ژی بەری یاکوبسونی هاتیە باسکرن، کو ئەڤ ئەرکە یاکوبسونی ژ (ئەلفرێد تارسکی) وەرگرتیە، ئەوژی دەمێ تارسکی جوداهیێ دناڤبەرا میتازمان و زمانێ تشتاندا دکەت، ب وی تێگەهی کو "میتازمان یێ ئاراستەکریە بۆ زمانی ب خۆ و سالۆخدانا وی دکەت، و زمانێ تشتان، زمانەکێ سرۆشتییە و د پەیوەندیکرنێن ئاساییدا دهێتە بکارئینان"(Marcel Danesi (Ed.), 2013, p. 464). ئانکو نە بتنێ زاراڤ، بەلکو تێگەهێ میتازمانی ب خۆ نە ژ داهێنانا یاکوبسونی یە.

## ٢- ئەركێن سترانێن كەنالێ پێلستانک لدویڤ تیۆرییا یاکوبسونی:

وەکو لایەنێ پراکتیکی یێ ڤێ ڤەکۆلینێ، ٣١ سترانێن زارۆکان ب رێکا مالپەرێ فەرمیی کەنالێ پیلستانک https://www.youtube.com/user/pelistanktv هاتنە هەلبژارتن و لسەر بنەمایێ تیۆرییا ئەرکێن زمانی د کریارا گەهاندنێدا ئامارەک بۆ هاتە ئەنجامدان، دگەل دیارکرنا رێژەیێن بکارهاتنا پێکهاتەیێن زمانی یێن گرێدای ئەرکێن جودا د سترانێن هەلبژارتیدا، ئەوژی ب ڤی رەنگی:

| ژ | ناڤێ سترانێ | ھەلچوون | | | تێگەھاندن | | بۆڤەگەری | | | ئاگەھداری | مێتازمان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١ت | ١ک | ھەلچوون | ٢ت | ٢ک | ٣ت | ٣ک | ناڤ | | |
| 1 | ئێكی شەش | ١٥ | ٢٧ | ٠ | ٠ | ١٢ | ٠ | ٠ | ٣٢ | | ٦ |
| 2 | چوو وەرزێ زڤستانێ | ٠ | ٢ | ٠ | ٠ | ١ | ٠ | ١ | ٥٢ | | ٧ |
| 3 | خالخالوک | ١٦ | ٣ | ٠ | ٠ | ١١ | ٠ | ٠ | ١٤ | | |
| 4 | پشێ | ١٦ | ٠ | ٠ | ١٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٤ | | |
| 5 | قد قد مریشکێ | ٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤ | ٠ | | | ٢٦ |
| 6 | بەرخ | ٣٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤٠ | | |
| 7 | لڤلڤۆکم | ٣٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٨ | ٠ | ٠ | 16 | | |
| 8 | بیبی لایێ لایێ | ٧ | ١٦ | ٠ | ٣٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٣٣ | | |
| 9 | ئەز دیمامە | ٦ | ١٤ | ٤٢ | ٠ | ٦ | ٠ | ٦ | ٣٦ | | |
| 10 | وەق وەق | ٥ | ٢ | ٠ | ٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٥ | | |
| 11 | بەیبین | ١٤ | ٠ | ٠ | ٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤٨ | | |
| 12 | وەلاتێ مە کوردستانە | ٠ | ١٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤٨ | | |
| 13 | گوند | ٠ | ٠ | ١٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٢ | ٤٨ | | |
| 14 | سۆزێ ددەم خودایی | ٢٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٣٠ | | |
| 15 | ئەم زارۆکێن ھەولێرێینە | ٠ | ٣٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٥٤ | | |

| 16 | پێلستانکا شرینە | ٠ | ٨ | ١٨ | ٨ | ٠ | ٠ | ٠ | 32 | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 17 | باران | ٠ | ١٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤٣ | | |
| 18 | ئەز تیڤی مە | ٢٩ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٩ | ٠ | ٠ | | | |
| 19 | یاریکا من | ٢٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٤ | | |
| 20 | کچا کوردا | ٣٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٤٠ | | |
| 21 | وەلاتێ من | ٢٨ | ٢٢ | ٠ | ٢٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٧٦ | | |
| 22 | دایێ | ٢٤ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٦ | | ٧٨ | | |
| 23 | پولیس | ٢٢ | ٤ | ٠ | | | | | | | |
| 24 | نوژدار | ١٧ | ٢ | ٠ | ٨ | ٠ | ٠ | ٠ | ٧ | | |
| 25 | دهوکا من | ٢٢٠ | ١٨ | ١٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | | | |
| 26 | بیکا من | ٢٤ | ١ | ٠ | ١٢ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٦ | | |
| 27 | چیچێ | ٠ | ٢ | ٠ | ١٦ | ٠ | ٠ | ٢ | ٣٦ | | |
| 28 | زارۆکەکا شرینم | ٤٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ١٥ | ٠ | ٠ | ٢٢ | | |
| 29 | ئەم زارۆکین | ٠ | ١٧ | ٣٦ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٢٤ | | |
| 30 | کوردستان | ٠ | ٤٥ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٩٩ | | |
| 31 | دەنگێ دستاری | ٠ | ٢ | ٠ | ٠ | ٦ | ١ | ٠ | ٣٤ | | |
| سەرجەم | سەرجەمێ تایبەت | 645 | 247 | 122 | 121 | 78 | 11 | 21 | 1031 | 0 | 39 |
| | سەرجەمێ گشتی | 1014 | | | 199 | | 1063 | | | | |
| ڕێژە | ڕێژا تایبەت | 27.8% | 10.6% | 5.2% | 5.2% | 3.3% | 0.4% | 0.9% | 44.5% | 0% | 1.6% |
| | ڕێژا گشتی | 43.8% | | | 8.59% | | 45.9٪ | | | 0% | 1.6% |

هەروەكو دیار ئەركێ بوڤەگەریێ ب رێژەیەكا هەری زور د ڤان (٣١) سترانێن كەنالێ پێلستانک یێن هەلبژارتیدا دیارە، كو ب رێژا (٤٥,٩%) ژ سەرجەمێ گشتی یێ ئەركان دهێت. هەروەكو بەری نووكە هاتیە باسكرن كو هەر دەربرینەكا زمانی ئەركێ بوڤەگەریێ ژ ئەركەكێ دی زالترە و ئەڤ ئەركە ئەركێ سەرەكیێ هەر بكارئینانەكا زمانییە. ئانكو بلندبوونا رێژا ئەركێ بوڤەگەریێ دیاردەیەكا ئاساییە و پێدڤی جەخت لسەر كرنێ نینە. ئانكو نەدیاردەكا هەژی هندێیە كو ڤولین و شروڤەكرن بو بهێنەكرن و ڤەكولین لسەر بهێنە كرن. ژ ڤێ رێژا هاتیە باسكرن یا ئەركێ بوڤەگەریێ بتنێ (٠,٤%) كەسێ سیێ تاک هاتیە بكارئینان و (٠,٩%) كەسێ سیێ كو، لێ ئەڤ رێژا بلند بو بكارئینانا ناڤان نەكو جهناڤان ڤەدگەریت ئەوژی كو (١٠٣١) ناڤ ب رێژەیا (٤٤,٥%) هاتینە بكارئینان. ئانكو بلندبوونا ڤێ رێژێ ژ ئەگەرێ زیدەبوونا بكارئینانا ناڤایە دناڤ ڤان سترانێن هەلبژارتیدا كو ئەڤەژی دیاردەیەكا ئاساییە هەروەكو بەری نووكە هاتیە باسكرن.

ئێک ژ دیاردێن هەژی جەخت لسەركرنێ و شروڤەكرنێ د ڤێ ئامارێدا، بلندبوونا رێژا ئەركێ هەلچوونێیە د تێكستێن ڤان سترانێن هەلبژارتیدا. كو ژ سەرجەمێ گشتیێ دیاربوونا ئەركێن زمانی ، (٨،٤٣%) ئەركێ هەلچوونێیە كو ژ ڤێ رێژێ (٢٧,٨%) بكارئینانا جهناڤێ كەسێ ئێكێ یێ تاكە و (١٠,٦%) بكارئینانا كەسێ ئێكێ كۆیە و (٥,٢%) بكارئینانا دەربرینێن دیاركرنا هەلچوونانە. هەلبەت ئەركێ هەلچوونێ پتر بو وان پەیامێن ئاراستەكری بو تێگەهشتیان دیاردبیت نەكو بو زارۆكان كو دیاركرنا هەلچوونان پەیاما سترانێن بو زارۆكا هاتینە ئاراستەكرن لاددەت و زارۆكی فێری شیانان ناكەت و د بوارێن جودادا تێگەهاندنێ لدەف پەیدا ناكەت، بتنێ دەربرینێ ژ هندەک هەست و هەلچوون و كاودانا دكەن، ئەڤەژی هەلبەت ئەركەكە گرێدای پەیامێن تێگەهشتیان ئاراستەكری. ل بەرامبەر ڤێ یەكێ دیاردەیەكا دی یا گرنگ ژ ڤێ ئامارێ بو مە دیاردبیت، ئەوژی نزمبوونا رێژا ئەركێ تێگەهندنێ یە د ڤان سترانێن هەلبژارتیدا، كو ژ سەرجەمێ گشتیێ وان ئەركان، ئەركێ تێگەهاندنێ بتنێ رێژا (٨,٥٩%) بخوڤە دگریت كو ژ ڤێ رێژێ (٥,٢%) ب رێكا بكارئینانا جهناڤێ كەسێ دووێ تاک دروستبوویە و (٣,٣%) ب رێكا بكارئینانا

جهناڤێ کەسێ دووێ کو. نزمبوونا ئەڤێ رێژێ وێ چەندێ دیاردکەت کو ئەڤ سترانێن هەلبژارتی زارۆکی فێری شیانان ناکەت و د بوارێن جودادا تێگەهاندنێ لدەف پەیدا ناکەت. ژ بو هندێ ئەڤ سترانێن زارۆکا ئەرکەکێ پوزەتیڤ لدەف زارۆکی بگێڕن، پێدڤیە ئەڤ رێژە گەلەک بلندتربا و ل بەرامبەر پێدڤیە رێژا هەلچوونێ کێمتربا.

هەروەسا ئەرکێ میتازمانی ژی دیاردبیت کو بتنێ (١,٦%) ژ سەرجەمێ گشتییە، ئەڤەژی وی چەندێ ددەتە دیارکرن کو ئەڤ سترانێن هەلبژارتی زارۆکی فیری زمانان ناکەت و ب تایبەت ژی زمانێ دەیکێ کو ئیک ئەرکێن سەرەکییێن ئەرکێ میتازمانییە. دیاردەیەکا دی یا هەژی باسکرنێ ئەوە کو ئەرکێ ئاگەهداریکرنی د ڤان سترانان‌دا ناهێتە دیتن و چ فۆرمێن ئاگەهدارکرنێ تێدا نەهاتینە بکارئینان، ئانکو ئەڤ ئەرکە ئێکەم ئەرکە د زمانێ زارۆکاندا، چونکو زارۆک بزاڤێ دکەن ب رێکا ئاگەهدارکرنێ کەنالەکێ پەیوەندیێ دروستبکەن و بزاڤێ بکەن لسەر بنەمایێ پێکگوهارتنا پێزانینا پەیوەندیێ ل گەل یێن دی بکەن، لێ ئەڤ چەندە د ڤان سترانێن هەلبژارتیدا ناهێتە دیتن و زارۆکی فێری ئاخڤتن و دروستکرنا پەیوەندیێن زمانی ناکەت.

خالەکا دی یا هەژی باسکرنی ئەوە کو ئەگەر ئەم ئەرکێ بوڤەگەریێ د سەرجەمێ گشتی یێ ئەرکاندا وەکو ئەرکەکێ ئاسایی یێ زمانی نەهژمێرین ئەڤ رێژەیە گەلەک دهێنە گوهارتن. ب گوتنەکا دی دهێتەگوتن کو ئەرکێ بوڤەگەریێ ئەرکەکێ ئاسابییە و بکارئینانا ناڤا دیاردەیەکا زالە د هەمی دەربرینێن زمانیدا، ژبەر ڤێ یەکێ ئەگەر ئەم ئەڤی ئەرکی لبەر چاڤ نەوەرگرین و بتنێ گرنگیێ ب ئەرکێن دی بدەین، ئەڤ رێژەیە گەلەک دهێنە گوهارتن، کو ژ سەرجەمێ گشتی یێ بکارئینانا ناڤ و جهناڤ و دەربرینێن دیارکرنا ئەرکێن جودایێن زمانی، ل جهێ (٢٣١٥) دێ بیتە (١٢٥٨) ناڤ و جهناڤ و دربرینێن دیارکرنا ئەرکا، ئەڤە ژی رێژەیێن دیاربوونا ئەرکێ هەلچوونێ و ئەرکێ تێگەهاندنی گەلەک دهێنە گوهارتن، کو رێژا ئەرکێ هەلچوونێ دبیت (٨٠,٨%) و لبەرامبەر رێژا ئەرکێ تێگەهاندنێ دبیتە (١٥، ٨%). ئەڤە وێ چەندێ ددەتە دیارکرن کو جوداهییەکا هەری مەزن دناڤبەرا ئەرکی

هەلچوونی و ئەركێ تێگەهاندنێدا هەیە كو ئەركێ تێگەهاندنێ گەلەک لاوازە د ڤان سترانانداو ئەركێ هەلچوونی گەلەک بلند و زالە.

ل دویماهیێ پێدڤیە وەكو راسپارد بدەینە دیاركرن كو ئەڤ سترانێن هەلبژارتی پەیامەكا لدویڤ تەمەنێ زارۆكان و یا پێدڤی بو وی تەمەنی ناهنێریت و ئەركەكی گونجای ل گەل وی تەمەنی ناگێڕیت بەلكو كارتێكرنا ئاڤان سترانا لسەر زارۆكی یا نیگەتیڤە و پێدڤیە ئەركێ تێگەهاندنێ بلندتربا داكو شیابا لدوڤ قوناغا ژیێ زارۆكی ئەركەكی لدەف بگێڕیت.

**ئەنجام**

١- تیۆرییا یاكوبسونی یا ئەركێن زمانی نە تیۆرییەكا رەسەنە، بەلكو كومكرنا چەند تیۆرییەكێن بەری وییە.

٢- ئەركێ بوڤەگەریێ ب رێژەیەكا هەری زۆر و زێدەتر ژ هەمی ئەركێن دیتر د سترانێن هەلبژارتیدا دهێتە دیتن، زێدەبوونا رێژا ئەڤی ئەركی د هەر پەیامەكا زمانیدا تشتەكێ ئاسابییە.

٣- ئەركی هەلچوونێ كو دبیتە ئەگەرێ پەیداكرنا هەلچوونان لدەف زارۆكی، ب رێژەیەكا زۆر دهێتە دیتن، ئەڤەژی دیاردەیەكا نیگەتیڤە و كارتێكرنەكا نەرێنی لسەر زارۆكی دكەت، كو ل جهێ هندێ وی فێربكەت، هەلچوونان لدەف پەیدادكەت.

٤- ئەركێ تێگەهاندنێ ب رێژەیەكا كێمتر ژ ئەركێ هەلچوونێ دهێتە دیتن، پێدڤیە لدویڤ تەمەنێ زارۆكی ئەڤ ئەركە زۆرتر بهێتە دیتن و زارۆكی فێری تێگەهاندنێ بكەت.

٥- ئەركێ میتازمانی كو ئەركێن هەری گرنگە و پێدڤیە ب رێژەیەكا زۆر د سترانێن زارۆكاندا بهێتە دیتن، چونكو ب رێكا ڤی ئەركی زارۆک فێردبیت، فێری زمانان دبیت و ب تایبەت ژی زمانی دایكێ، لێ د سترانێن هەلبژارتیدا ب رێژەیەكا گەلەک كێم دهێتە دیتن كو (١,٦%) دیاردبیت ئەڤەژی رێژەیەكا زۆرا كێمە.

٦- ئەركێ ئاگەهداریكرنی كناهێتە دیتن و دبیتە ئەركێ ئێكێ د زمانێ زارۆكیدا، كو ب رێكا ڤی ئەركی بزاڤێ دكەت پەیوەندییا دروست بكەت بو هندێ ل گەل دەوروبەری باخڤیت، لێ ئەڤەژی ناهێتە دیتن و زارۆكی فێری ڤێ چەندێ ناكەت.

**ژێدەر و پەراوێز:**

(1) Angela C. Tribus, The Communicative Functions of Language: An Exploration of Roman Jakobson's Theory in TESOL, M.A. Thesis, SIT Graduate Institute, Brattleboro, Vermont, USA, 2017.

(2)C. E. SHANNON, A Mathematical Theory of Communication, The Bell System Technical Journal, Vol. 27, July, 1948.

(3)Derek George Littlewood, The signification of speech and writing in the work of Charles Dickens, PhD. Thesis, The Open University, UK, 1990.

(4)Krystyna Pomorska and Stephen Rudy (Eds.), Verbal Art, Verbal Sign, Verbal Time, University of Minnesota Press, Minneapolis, USA, 1985.

(5)Lauri Linask, Differentiation of language functions during language acquisition based on Roman Jakobson's communication model, Sign Systems Studies Journal, Vol. 46, No. 4, University of Tartu Press, Tartu, Estonia, 2018.

(6)Marcel Danesi (Ed.), Encyclopedia of Media and Communication, University of Toronto Press, Canada, 2013.

(7)Nan Wang and Bocong Li, A Model of Deceitful Information Communication: Some Views on Theory and Practice of Semantic Information, Proceedings Journal, Multidisciplinary Digital Publishing Institute (MDPI), Vol. 3, No. 1, Gothenburg, Sweden.

(8)Petra Zia Sluková, Studies of Information and Knowledge Management in the European Context, University Modul, No. 5, Reg. No: CZ.1.07/2.2.00/07.0284, Business Academy and HPS Valašské Meziříčí,July, 2017.

(9)Per Durst-Andersen, Linguistics as Semiotics. Saussure and Bühler Revisited, Signs- International Journal of Semiotics, vol. 2, Denmark, 2008, 2.

(10)Rachel Sheal Preethi Mony, An Exploratory Study of Docents as a Channel for Institutional Messages at Free-Choice Conservation Education Settings, PhD. Thesis, Ohio State University, 2007, USA.

(11)Roman Jakobson, Language in Literature, Ed. K. Pomorska & S. Rudy, The Jakobson Trust,
USA, 1987.

(12)Ron Cowan, The Teacher's Grammar of English: A Course book and Reference Guide, Cambridge University Press, 2008.

(13)Setiawati Darmojuwono, Language, culture, and social cognition, Wacana Journal, Vol.17,
No.1, Faculty of Humanities, University of Indonesia, Indonesia, 2016.

## ملخص البحث

## وظائف اللغة في اغاني قناة بيلستانک

هذه الدراسة محاولة لبيان وظائف اللغة في نصوص اغاني الاطفال في قناة بيلستانك، و الهدف من هذه الدراسة بيان وظائف اللغة والنسبة المئوية في ٣١ اغنية مختارة وبيان تأثيرها على الاطفال، كذلك بيان مدى امكانية هذه الاغاني و تأثيرها على الاطفال حسب عمرهم وهل استطاعت هذه الاغاني ان تقوم بدورها الصحيح و استطاعت ان تعلم الاطفال و تخلق عند الاطفال الاستيعاب وتؤثر فيهم وهل ان هذا التأثير لها دور سلبي او ايجابي عليهم.

في البداية قامت هذه الدراسة ببيان نظريات وظائف اللغة، وبعد ذلك تطرق البحث الى وظائف اللغة وتناول هذه الوظائف في الاغاني المختارة وبين نسبتها المئوية في (جدول او مخطط) و في الختام دراسة وتحليل المخطط وكيفية بيان وظائف اللغة حسب عمر الطفل.



## Abstract

### The unctions of language in the songs of Pelistank TV

This study (The unctions of language in the songs of Pelistank TV), is an attempt to find out the functions of the language in the texts of Children songs of Pelistank TV. This study aims to discover the percentages of different functions of 31 chosen songs in order to uncover the effects of these songs on children. The study also strives to exposethe suitability of the chosen songs with the childhood age in order to know to how extend these songs have a conative function and to determine wheather the chosen songs have negative or positive functions on children.

# گۆڤاری "K21" وەک سەرچاوەی مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردیی نهێنی و ئاشکرای شاری هەولێر

**پ.د. ئازاد عوبێد ساڵح**
بەشی مێژوو- کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەڵاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

ڕۆژنامەوانی وەك بەشێکی ڕووناکبیری، بایەخ و کاریگەری و دەورێکی زۆری لە کۆمەڵگەدا هەیە، بە تایبەتی کە وەك یەکێك لە دەسەڵاتەکان (چوارەم) حیسابی بۆ دەکرێت، ئەمەش سەر بۆ ئەوە دەکێشێتەوە، کە لە تۆمارکردنی ڕووداوەکاندا، سەرچاوەی ڕاستەوخۆ و زیندوو و شایەتحاڵی سەرەکی بێت. ئەمەش وا دەکات لە نووسینی مێژوودا بەسەرچاوەی سەرەکی دابندرێت و پشتی پێ ببەسترێت. بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوە بین ئەو ڕۆژنامەیە چ ڕۆژنامەیەکە و سەر بە چ لایەن یان گرووپێکە..! لەم ڕووەوە هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ توێژینەوە بە کارێکی پێویست زانرا، بەتایبەتیش بۆ گۆڤارێکی بە ڕوومەتی وەك "k21"، کە پڕاوپڕی بەڵگەنامە و بابەت و کەرەستەی خاوی نووسینی مێژوون.

لەم توێژینەوەیەدا بە تەنیا ئەو لایەنەی ڕووناکبیری کاری لەسەر کراوە، کە تایبەتە بۆ گۆڤارو ڕۆژنامە و بڵاوکراوانەی لە سەردەمی جیاجیا، بە ئاشکراو نهێنی، لە قەڵەمڕەوی شاری هەولێر دەرچوون و دەقەکانیان لە "k21"دا بڵاوکراونەتەوە.

ئەم توێژینەوەیە ناساندنی گۆڤاری "k21"و ژمارە و بەڕێوەبەرانی و چۆنیەتی دەرچوونی و ڕۆڵی و هەندێ سەرنج و تێبینی سەبارەت بە گۆڤارەکە، پاشان گۆڤارو ڕۆژنامە ئاشکراکان و بەدواشیدا گۆڤارو ڕۆژنامە نهێنییەکان و ئەنجام و پاشکۆ، دەگرێتەخۆ.

گرفتەکانی ئەم توێژینەوەیە خۆی لە بەردەست نەبوونی هەندێ لە دەقی رەسەنی گۆڤارو رۆژنامە و بڵاوکراوەکان یان خراپ و بە کەموکورتی کۆپییەکانیان کە بڵاوکراونەتەوە، دەبینێتەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی نەناسینەوەی ناو و نازناوی خواستەنی نووسەری هەندێ لە بڵاوکراوەکان، ئەوە هیچ کە گۆڤارو رۆژنامە و بڵاوکراوە نهێنییەکان، نە دەستەی نووسەرانیان دیارە نە وتار و بابەتەکانیان ناوی نووسەرەکانیان بە سەرەوەیە، ئەگەر هەشبێت ناوی خوازراوە، وەك سیمایەکی رۆژنامەوانیی نهێنی و شاخ و پێشمەرگە.

**- گۆڤاری (کوردستانی سەدەی بیست و یەکەم ــ k21):**

دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامە کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە، ئەگەر دەوڵەت یان حزبی یان پارەدارێکی لە پشت نەبێت، بۆیە رۆژنامەوانیی ئەهلی لە مێژووی رۆژنامەوانیی کوردی زۆر کەم و پڕ دەردەسەری و سەرئێشە بووە، کە سەرباری سانسۆری دەوڵەت، کەمتەرخەمی و نەدانی ئابوونەی بەشداران، داد و فیغانێکی زۆری نێو لاپەڕەی ئەو چەشنە رۆژنامانەیە. لەم ڕووەوە دەرکردنی گۆڤارێکی وەك "k21" بە تاقی تەنیا لەلایەن رۆژنامەنووسی بەتوانا و بە ئەزموون و پشوو درێژ "مومتاز حەیدەری"[1]، کارێکی هەروا ئاسان نەبووە، بەڵام ئەو بە پێداگرییەکی شێلگیرانە لەسەر دەرکردنی بە تەنیا مکووڕ بووە، وێڕای وەك خۆی گوتەنی: "لێدانی چەندین دەرگای بێ وەڵام"، ئەوا ئەو هەر پێداگر بووە، تا ئەوەی ژمارە (١)ی لە بەهاری ٢٠٠٨ بە قەوارەی (٤٤٠) لاپەڕە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەربکات، وەك: "گۆڤارێکی کلتووری ـ زانستی- مێژوویی- بەڵگەنامەیی- نەتەوەیی- وەرزیی ئازاد"، بە خودانی دەرکردن زیلان حەیدەری و سەرنووسەری مومتاز حەیدەری. ماوەیەکی کورت رائیدە ئەحمەد بایز، سکرتێری نووسین بووە. (مومتاز حەیدەری، ئەم گۆڤارە، بۆ لەدایك بوو..؟! ، k21، ژ (٢١)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤ ، ل٣).

سەبارەت بە ناوەکەشی هەر لەو وتارەدا حەیدەری نووسیویە، لە سەروبەندی وەرگرتنی مۆڵەتی گۆڤارەکە بەڕێوەبەری گشتیی راگەیاندن (هەڵگورد جوندیانی) پێشنیاری کردووە، کە ناوەکەی بکرێتە k21 چونکە لەسەر زار خۆشترە، ئیدی ئەوە بوو

گۆڤارەکە تا ژمارە (٢١)ی کانوونی دووەمی ٢٠١٤، بەردەوام بوو بە قەوارەی جیا جیا نزیکەی (**٩٤٣٠**) **لاپەڕەی** دەوڵەمەندی پڕ زانیاریی جۆراوجۆری رووناکبیری کە بە هەق بووەتە تۆمار و سەرچاوەیەکی زۆر بایەخدار بۆ نووسینی مێژووی هاوچەرخی کورد. (مومتاز حەیدەری، بۆ مانتان گرتووە ...؟ تا کەی مان دەگرن..؟!،k21، ژ (٢١)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٣).

وێڕای ئەوەی ئەو گۆڤارە بۆ خوێنەران و توێژەران و مێژوونووسان، کەرەستەیەکی زۆری لە بەڵگەنامەی مێژوویی گرنگ لەخۆ گرتووە، کە هەروەك بۆتانی ئاماژەی پێکردووە، بایەخی ئەو گۆڤارە بۆ نەوەکانی داهاتووش درێژەی دەبێت، چونکە بەشێکی یادگای مێژوویی کوردی بۆ پاراستووین، بەمەش حەیدەری پێشەنگییەکی بۆ خۆی تۆمار کردووە. (k21، ژ (٢١)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٣). ئەم گۆڤارە دانسقە و ناوازە، بەڕاستی پەیامێکی نەتەوەیی و پێشکەوتنخوازانەی بەڕوونی پێوە دیارە، ئەلبوومێکی دەوڵەمەندی وێنەی مێژوویی دەگمەنە.

**- سەرنج و تێبینی سەبارەت بە گۆڤاری k21:**

وەك هەر کارێك، دیارە بێ سەرنج و تێبینی نابێت، گۆڤاری k21 لەم لایەنە بەدەر نییە. لەڕووی نەخشەسازییەوە، گۆڤارێکی زۆر پڕوچڕ و مانشێتە، بەتایبەتی بەرگەکانی، تەنانەت ئەوەی بە عەرەبی پێی دەڵێن پاژنە (کعب)ەکەیشی دروشم و مانشێتی تێدا نووسراوە، کە پێم وابێت ئەمە بۆ خوێنەر بە تایبەتی خوێنەری ئەمڕۆ، ماندووکەرە و چاو و مێشك پێیەوە خەریك دەبن. چونکە بێگومان هونەری نەخشەسازی ئەم سەردەمە جیاوازیی زۆری لەگەڵ رابردوودا هەیە و هەموو خوێنەرێك ئامادە نییە، ئەوەندە خۆی بەو مانشێتانەوە خەریك بکات. سەبارەت بە قەوارەی گۆڤارەکەش بەڕاستی ئەمەش زۆر بە زەحمەت لە جێی خۆیدا نییە،بۆ نموونە لە ژمارە (٧)، حەوت سەد لاپەڕەیە. ڕاستە بابەتێکی زۆری لە خۆ گرتووە، بەڵام وێڕای خەرجییەکی زۆر، ئەوا بە زەحمەت هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکرێت و دیسان خوێنەر بێزار دەکات، ناچاری دەکات زوو داینێ بەهۆی قورسی و کێشی، وێڕای ئەمە دەکرا بە قەبارەیەکی گونجاو و یەك بارست و گێڕانەوەی خەرجیش پتر

بەردەوامی بە دەرچوونی بدرابوایە. لەگەڵ ئەمانەش رەنگە هەندێ بابەت و وێنەی زۆر دووبارە و زۆر پێویست نەبووبن بۆ بڵاوکردنەوەیان بۆ جارێکی دیکە، وەك لە پێشتریش گوتمان ناوەڕۆکەکانی زۆر سیخناخ بوونە، واتە نەخشەسازییەکەی ناوەڕۆکی دیسان گرفتی زۆر بۆ خوێنەر دروست دەکات و ماندووی دەکات. تەنانەت ژمارە هەیە پێرستی نییە، یاخود جێگۆڕکێ بە پێڕست کراوە[٢]. لەگەڵ ئەمانەش زۆریی روونکردنەوە و بەدواداچوونی سەرنووسەر بۆ هەندێ بابەت و بەکارهێنانی هەندێ دەستەواژە و بڕگە و نووسین کە لە شوێنی خۆیان نەبن. دڵنیام ئەگەر بە تەنیا گۆڤارەکە بەڵگەنامەیی بوایە و بە نەخشەیەکی گونجاو ڕێك بخرابوایە، لەبەرئەوەی سەرنووسەر خودان گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی بەڵگەنامە و ئەرشیڤە و خەڵکیش یارمەتی دەدا، کارەکە زۆرتر لە شوێنی خۆی دەبوو.

**- ڕۆژنامە و گۆڤارە نهێنییەکان لە گۆڤاری K21 دا:**

**١ ـ یەکێتی تێکۆشین:**

زمانحاڵی کۆمەڵەی کۆمۆنیستی عێراقی، لقی کورد، ژمارە (١)ی لە ساڵی ١٩٤٤ و ژمارە (٢)ی ١٩٤٤ و ژمارە (٣)ی لە ١٩٤٥ لە هەولێر لە گەڕەکی عارەبان لە ماڵی حەیدەر ئەفەندی حەیدەری، وەك یەکەمین رۆژنامەی سیاسیی نهێنی هەولێر دەرچووە. نافیع یونس[٣] و ساڵح حەیدەری[٤]، دەوریان لە دەرکردنیدا بینیوە. لەسەر لۆگۆی نووسراوە: "مردن بۆ فاشیست، ژیان بۆ نیشتمانی سەربەست"، لە ژێرەوەشی لەلای راست ئەمە نووسراوە: "تێکۆشین بۆ بەهێزکردنی جەبهەی وەتەنی بۆ ئازادی و سەربەستی کورد"، لەلای چەپیش نووسراوە: "وریابە ئەی میللەت لە دەسائسی ئیستیعمارو کۆنەپەرستی"، دیارە بابەتەکانی سیاسین. تەنیا دوو ژمارە لە K21 بڵاوکراونەتەوە[٥].

ژمارە (٢)، ١٩٤٤:"وریابە ئەی میللەت" لە سەرەتادا پرسیارێکی پڕ واتا دەکات، کە بۆچی تائێستا ئەو هەموو خەبات و تەقەلایە و تێکۆشان و خوێنڕشتنەی کورد کەچی بێ بەرە؟ ئەوەش بۆ دواکەوتوویی و کۆمەڵەی خێڵەکی کوردی دەباتەوە و لە پاڵیشیدا دەستوەردانی بێگانە لە کوردستان و دابەشکردنی کوردستان و دامەزراندنی

دەوڵەتی عێراق و چەوسانەوەی کورد لەژێر ستەمی دەمارگیریی نەتەوەیی عەرەب، بۆ ئیستیعمار لە ڕێی کۆنەپەرست و دەرەبەگ ئامانجەکانیان بە دەست بێنن، بۆیە داوای وریابوون لە میللەت دەکات، لە خەباتی هەردوولا بگەنە ئازادی و مافی چارەنووس. لە وتارێکی درێژ بە ناوی "کوردو ئۆکتۆبەر"دا، وێنەی ستالین و لینین بڵاوکراوەتەوە و نووسیوویە: حوکمی سۆڤیەت دونیای ڕووناك کردووەتەوە، دوای ئەوەی لە ڕۆژگاری تزار (قەیسەر)، ژیانی میللەتانی روسیا لەژێر ستەم و چەوسانەوە و دواکەوتوویی دابون، بەهۆی بڵاوبوونەوەی بیری مارکسیەت و پەرەسەندنی، کوردیش لەوێ ئەم ڕووناکییەی بەرکەوت و تەبایی و ئاشتی جێی ناکۆکییەکانی گرتووەتەوە و ژن و پیاو یەکسانن. وتارێکی دیکە بە ناوی "یەکێتی تێکۆشین بۆ ئازادی نیشتمانمان"، تێیدا باس لە دەوری کۆمۆنیستانی کورد دەکات بۆ ئەوەی پرسی کورد لە عێراق بایەخی پتری پێبدەن، لە هەمان کاتدا چاوپۆشی لە کوردانی باکوور و ڕۆژهەڵاتیش ناکات، بۆ ئەوەی دونیا لە زوڵم لێکراویی کورد ئاگادار بکەنەوە و مافی خۆی وەربگرێت، بەڵام لە سەرەتا بۆ سەربەستی عێراق خەبات دەکەن، لەمەشدا عەرەبە کۆمۆنیستەکانیش پشتگیری دەکەن، هەردوولا لە کێشەی میللەت دەگەیشتن، داوای یەکڕیزی لە گەلی کورد دەکەن "دەنگوباس"ی شارەکانی کوردستان لەسەر لاپەڕەکانی یەکێتی تێکۆشین بڵاوکراوەتەوە، سەرەتا لە هەولێر باسی ڕەشبگیر لەناو شاری هەولێر دەکات لەلایەن فەرمانڕەوای ئۆردوویی هەولێر خەڵك گیراوە، دواتر بەردراون. هەروەها باس لە خراپیی شەقامەکان و قیرتاو نەکردنیان و پیسی شارەکە دەکات و ڕەخنە لە سەرۆکی شارەوانی دەگرێت کە تێکۆشین بۆ ئەو کارە دەست نادات، داوا دەکات حکومەت کەسێکی ڕۆشنبیر بۆ ئەم کارە هەڵبژێرێت. لە سلێمانیش ڕەخنە لە موتەسەریف مەعرووف جیاووك (١٨٨٥- ١٩٥٨) دەگرێت و فرۆشتنی وەزیفە و مەسەلەی تەموین کە بواری دزی و گەندەڵی تێدایە. لە پێنجوێنیش، لە بارودۆخی خراپی جووتیار و کرێکاران دەدوێت کە ٩٥% ی خەڵك پێکدەهێنن. (k21، ژ (١٥) ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٤٧٣-٤٨٥).

ژمارە (٣) ی یەکێتی تێکۆشین وێڕای زانیارییەکانی سەر ژمارەی پێشوو لەم ژمارەیەدا نرخی لەسەر دانراوە و نووسراوە "نرخی ژمارە (٥٠) فلسە". لەم ژمارەیەدا بەم

سەرناوە دەست پێدەکات: "بۆ خوێندەوارانی خۆشەویست"، مژدەی یەکگرتنی کۆمەڵەی برای سوڤیستان"لەگەڵ یەکێتی تێکۆشین" ڕادەگەیەنێت، دیارە ئەمەش هەنگاوێکی گرنگە لەسەر بنەمای یەکڕیزی. لە وتارێکی درێژدا بە ئیمزای یەکێتی تێکۆشین" بەناوی "دەشتی قەراج پێویستە دووبارە بگەڕێتە [وە] هەولێر! و دابەش بکرێتە سەر فەلاحەکان"، تێیدا باس لە بڕیارێکی حکومەت بۆ دابەشکردنی زەوی بەسەر جووتیاران دەکات، کە دیارە کارێکی باشە و دروشمی ڕێکخراوەی (یەکێتی تێکۆشین)یش بووە، بەڵام ئەو کارە لە دەشتی قەراج پێچەوانەی ئەو بڕیارەی بووە، پاشان باس لە هەڵکەوتە و بایەخی ئەو دەشتە دەکات، هەندێك کاری (تسویە)ی تێدا کرا، بەڵام بۆ ئاغا و دەرەبەگەکان و ئەویش لەسەر قسەی جووتیاران کە ئەو زەوییانە بابەلباب لەژێر دەستی ئاغایاندا بووە، بەمەش ڕەوایەتی بە (تسویە) کرانی لەسەریان درا و کرمانج (جووتیار)ەکان بێ ماف مانەوە، دیارە ئەمەش لەژێر ئەشکەنجە و تۆقاندن و هەڕەشە و ترسی ئاغاکان بووە. وێڕای ئەمە ئەوەی ماوە (تسویە) نەکراوە، حکومەت پێوە بووە ناوچەکە بخاتە سەر ناحیەی (شەرقات) بۆ دەرەبەگێکی عەرەب کە سەرۆك عەشیرەتی شەمەر (صفوك) بووە، بۆیە ڕۆژنامەکە زیانەکانی ئەو کارەی دیاریکردووە بۆ جووتیارەکان و ئاژەڵەکانیان و شاری هەولێر و بەڵگەی خراپی ئەو کارە بە نموونەی دوو عەشیرەت دەهێنێتەوە، کە بووەتە هۆی دەربەدەربوونی خەڵکی چەند گوندێك، بۆیە داوای جێبەجێنەکردنی ئەو کارەیان کردووە، چونکە دەبێتە هۆی ئاژاوە و ناکۆکی و شەڕ، تەنانەت ئاغاکانی دزەیی خۆیان ئامادە کردووە، کە بە زەبری هێز زەوییەکانیان وەربگرنەوە. لەمەشدا جووتیارەکانیش پشتگیرییان دەکەن، تەنانەت هۆزەکانی کوردیش پشتگیرییان دەکەن لەڕووی نەتەوەیی و هاوخوێنی، هەندێ عەشیرەتی بچووکی عەرەبیش پشتگیری لێ دەکەن، کە سەرەنجام دەبێتە کێشەی نێوان کورد و عەرەب و گەورەتر دەبێت، بۆیە بۆ ئەوەی کارەکە تەشەنە نەکات حکومەت ئەم بڕیارە بگۆڕێت، دەشتی قەراج هەر سەر بە هەولێر بێت و دوای (تسویە) کردنی زەوییەکان بەسەر خەڵکی ناوچەکە دابەش بکرێت، ئەوانەی وەری دەگرن مافی فرۆشتنیان نەبێت، حکومەتیش یارمەتی خەڵکەکە بدات بەمەبەستی پێشخستنی کشتوکاڵ بە ڕاکێشانی پرۆژەی ئاو بۆ

شوێنەکە، رەچاوی جووتیارەکان بکرێت نەك ئاغاکان. لێرەدا هەوڵی بەعەرەبکردن دەردەکەوێت، بەمەش دەوری دیاری رۆژنامەوانی بەڕوونی دەردەکەوێت، کە رۆژنامە چۆن رووداوێکی مێژوویی بایەخداری لە ناوچەکە تۆمار کردووە، کە هیچ نەبێت ، بۆ ئێمە نەزانراو بوو. (یەکێتی تێکۆشین، ژمارە (٣)، ساڵی (١)، ل١-٥؛k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٤٨٦-٤٩١).

بابەتێکی دیکە (سەیرە لە کۆیێ)، تێیدا لە بارودۆخی ئەم شارە دەدوێت هەر لە نەخۆشخانە کە بێ دەرمان و بێ خزمەتگوزارییە. قوتابخانەکانیش، ئەویش دووچاری بەرێوەبەرێکی خراپ بووە. لە هەمووی گرنگتر رێگای هاتوچۆی کۆیە کە کێشەیەکە هەوڵی چاککرانی نەدراوە و بە بیانووی جۆراوجۆر پشتگوێ خراوە. (k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٥٠٣-٥١١).

ئەم بابەتانە دیارە زۆربەی هەرە زۆریان راستن، وەك مێژووی ئەو رۆژگارە زانیاریی گرنگن، بەتایبەتی هەندێ لە کێشەکان تا هەنووکەیش بەردەوامییان هەیە هەر بۆ نموونە وەك رێگای هەولێر-کۆیە . لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە رۆژنامە چۆن رووداوێکی مێژوویی بایەخداری لە ناوچەکە تۆمار کردووە، کە پێشتر هەر هیچ نەبێت بۆ ئێمە نەزانراو بوون.

**٢ ـ کادیر:**

گۆڤارێکی رۆشنبیریی خولی بووە، مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دەری کردووە. ژمارە (١)ی لە تەمووزی ١٩٦٨ و ژمارە (٥) ی ئەو خولە لە ئابی ١٩٦٩، لە چاپخانەی خەبات چاپ بووە بە (٨، ٩، ١٢، ٨، ١٧) لاپەڕە و بە زمانی عەرەبی بووە. (k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٥٥٤-٥٩٨).

ئەم گۆڤارە بە مەبەستی وشیارکردنەوەی ئەندامانی پارتی و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری پارتایەتی، هەروەکو لە "ئامانجەکانمان"دا روونی کردووەتەوە، بۆ ئامادەکردن و پێگەیاندنی کادیری پارتی و بۆ قووڵکردنەوەی وشیاریی سیاسی و تیۆری و لێکدانەوەی بەرنامە و پەیڕەوی پارتی. هەر لەو ژمارەیەدا سەبارەت بە کادیر وتارێکی بە ناوی بنەما گشتییەکانی کادیر دەخاتەڕوو، هەر لە بایەخی کادیر لە ژیانی

ناوخۆیی پارتایەتی و چۆنیەتی هەڵبژاردنی کادیر و سیفەتەکانی کادیر و پێوانەی پێشکەوتنی کادیر و بایەخی تایبەتمەندییەتی لە ئاڕاستەکردنی کادیر و پەیوەندیی کادیر بە ئەندامان. لە بابەتێکی دیکەدا لێکدانەوەی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان و بابەتێکی دیکەش فەرهەنگی سیاسی بۆ ڕاڤەکردنی زاراوە سیاسییەکانی وەك ناوەندییەتی دیموکراتی، شۆڕشگێڕییەتی، لیبرالیەت. (k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٥٤٦-٥٥٣).

لە ژمارە (٢)دا "واتاکانی کادیری سەرکەوتوو" وتارێکی ڕۆژنامەی خەباتە جارێکی دیکە لێرە بڵاوکراوەتەوە. لێکدانەوەی بەرنامە، تێدا باس لە حوکمی خۆڕێبەری (ئۆتۆنۆمی) خەبات لە پێناو حوکمی زاتی چییە؟ بەیانی ٢٩ی حوزەیران، جارێکی دیکە لەبارەی کادیرەوە، کە بایەخێکی زۆری پێداوە بەم شێوەیە: کادیر لە کوێ دەست پێدەکات، کادیر و سامان، ڕۆشنبیریی کادیر، کادیرو پیشە، کادیرو ئیمتیازات، کادیرو دادپەروەری، کادیرو بەرژەوەندییەکان، باشترین کادیر کێیە؟. فەرهەنگی سیاسی چەند زاراوەیەکی سیاسی وەك شۆڕش، ئیستیعمار، شۆڤینیەت، لێکدراوەتەوە. (k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل ٥٥٤، ٥٦١).

ژمارە (٣): ناوەندییەتی دیموکراتییەت، وەك سەروتار ئەو چەمکەی بە وردی لێکداوەتەوە، نزیکەی چوار لاپەڕەی گۆڤارەکەی گرتووەتەوە. جارێکی دیکە لە بارەی کادیرەوە، دیسان لێکدانەوەی بەندەکانی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستانە. فەرهەنگی سیاسیش: فاشییەت، ئومەمییەت، نازییەت و کۆسمۆپۆلیتی گرتووەتەخۆ. (k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی، ٢٠١٢، ل٥٦٢-٥٧٣).

ژمارە (٤): کادیر لە ڕاییکردنی ئەرکی پارتایەتی نیشتمانی بەردەوامە، دیسان لەبارەی کادیرەوە، لێکدانەوەی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان، فەرهەنگی سیاسی ئەم زاراوانەی لەخۆ گرتووە: ئەنارشیزییەت، فابییەت، ئینتهازییەت (هەلپەرستی). جیا لە ژمارەکانی پێشوو بابەتێکی بە ناوی "هەندێ بەڵگەنامەی سیاسی و مێژوویی سەبارەت بە دۆزی کورد"، تێیدا دەقەکانی پەیماننامەی سیڤەری لەبارەی دۆزی کورد و دامەزراندنی قەوارەیەك بۆ کورد و ڕاگەیاندنی جەژنی لەدایکبوون لە ٢٤ ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ لەخۆ گرتووە. (k21، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٥٧٤-٥٨١).

ژمارە (٥): ژمارەیەکی تایبەتە بەبۆنەی بیرەوەری دامەزراندنی پارتی، ئەم بابەتانەی لەخۆ گرتووە، دەوری پارتی دیموکراتی کوردستانمان لە ڕابەرایەتی کردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی پێشکەوتنخوازی کوردی و پاراستنی لە هەر جۆرە لادانێك، لەبارەی ڕێکخستنەوە، باس لە پێداویستییەکانی پارتی دەکات لە کادیر. کادیر وەڵامی پرسیاری خوێنەران دەداتەوە، هەندێ بەڵگەنامەی سیاسی و مێژوویی سەبارت بە دۆزی کورد -ڕاپۆرتی لیژنەی ڕاپرسی نێودەوڵەتی بۆ کێشەی مووسڵ سەبارت بە داخوازییە نیشتمانییەکانی کورد لە عێراق، دەقی کۆمەڵێك بڕیاری ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بۆ مانگەکانی نیسان و ئایارو حوزەیرانی **١٩٢٥**، بەڵێنی ڕەسمی عێراق بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بە کوردی عێراق، وەك هەموو ژمارەکان فەرهەنگی سیاسی، تێدا باسی: کودەتا، شۆڕش بە هەموو جۆرەکانی: بورجوازی، کۆمەڵایەتی، سۆسیالیستی، رۆشنبیری، کردووە. (k21 ، ژ (١٥)، ناوەڕاستی ٢٠١٢، ل٥٨٢-٥٩٨).

دیارە کادیر بە نهێنی و لە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش دەرکراوە و بەو پێیەی ئەو ناوچانەی سەرکردایەتی سەر بە هەولێر بوونە، بۆیە بە بەشێك لە رۆژنامەوانیی هەولێر دادەنرێت[٦].

### ٣ ـ دەنگی پێشمەرگە:

لە ژمارە (١٤)ی ئەیاری **١٩٦٨** تا ژمارە (٢٤)ی تشرینی دووەمی **١٩٦٩** لە گۆڤاری k21 بڵاوکراوەتەوە، واتە (١١)، ژمارە لەسەری نووسراوە "لیژنەی ئاڕاستە و پەخشی شۆڕشی کوردستان دەری دەکات". (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٩٦-٢٨١).

ژمارە (١٤) لە ئەیاری ١٩٦٨ بە (١٢) لاپەڕە دەرچووە: وتاری یەکەمی ئەم ژمارەیە بەناوی دیسان ٢٩ ی حوزەیران، دیارە مەبەست ئەو بەیاننامەیە، کە لە ساڵی ١٩٦٦ حوکمەتی عێراق بۆ دانان بە حوکمی لامەرکەزی و دانی مافەکانی داناوە. "ماف ئەپچڕین" چوار دێڕە شیعرە لە شیعری سەعید ناکام (١٩١٧-٢٠١٠) دەچێت. "مافەکانی مرۆڤ"، سڵاو لە یەکی ئایاری پیرۆز، "کارەساتەکەی هەولێر-میری بۆ ئەم

گۆبەندەی گێرا؟" ئەو رووداوە تۆماری رووداوێکی گرنگە لە مێژووی شۆڕشی کوردستان لە هەولێر ئەویش کوژرانی شێخ حەنەشی شێخی عەشیرەتی تەیی لە رۆژی ١٣/ ٤/ ١٩٦٨، لە ئەنجامدا حکومەت زنجیرەیەك پەلاماری بۆ ناوچەکە کردووە و پێشمەرگەش بەرگری کردووە بە فەرماندەی فارس باوە ئامیر بەتالیۆنی ناوداری دەشتی هەولێر. (دەنگی پێشمەرگە، ژ (١٤)، ئایاری ١٩٦٨، ل١-٣، ١٠).

پیلانە گڵاوەکانی دوژمن و ناپاك، ملی خۆیان ئەگرێتەوە "دەمەتەقێی باپیر و پیرۆت"، ناوی کەسی بەسەرەوە نییە، بەڵام شیعری هەژاری موکریانییە (١٩٢٠–١٩٩١)[٧]، پێشمەرگە پێناسەیە، پەندی پێشینان، چەپیك و جاشەکان- کێ جاشە و چەند جۆرە جاش هەیە؟"، "چیرۆکی ژمارە-هاوچەك لە برای هاوپشت دڵسۆزترە"، لە چیرۆکی ناکام دەچێت." کاروانی شەهیدان" ناسنامەی دوو شەهید تۆمارکراوە. "گۆشەی خلافان"، لەسەر شێوەی گۆڤارەکانی ناو شار ئەو گۆشەیەش بۆ پێشمەرگەکان داندراوە، کە وشەی تێك هەڵکێشی تێدایە. لاپەڕەکانی دیکەش پاشماوەی وتارەکانی پێشووە. (k21، ژ(٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٩٩-١٠٧).

ژمارە (١٥)، ئەیلوولی ١٩٨٦ بە (١٢) لاپەڕە دەرچووە: سەروتاری بەناوی "شۆڕشی ٧ ساڵەمان" بیرەوەری شۆڕشی ئەیلول، "جەژنی ئازادی" شیعر، "وتاری مەکتەبی سیاسی" لە ئاهەنگی (٢٣) ساڵەی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان د. مەحموود عەلی عوسمان خوێندوویەتەوە، "لە یادی شۆڕشی ئەیلولی خوێناویدا"، "تیتل و بیبل" شیعری هەژاری موکریانی، "پێشمەرگەم بۆ کوردستان" شیعری مەلا گچکە، "گۆشەی شەهیدان" تەرخانکراوە بۆ شەهیدێکی ناوداری کوردستان "مەحموود کاوانی (١٩٢٦-١٩٦٢)، ٨ ی ئەیلوولی رۆژی بەربەرەکانی نەخوێندەواری"، "چیرۆکی ژمارە -پەشیمانی سەرەمەرگ"، چیرۆکی سەعید ناکام"، "گۆشەی خلافان". (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل١٠٨-١١٩).

دەنگی پێشمەرگە، ژمارە (١٦)، تشرینی دووەمی ١٩٦٨، بە (٢٠) لاپەڕە دەرچووە: سەروتار بەناوی "رێگای هێنانەدیی ئامانجەکانی شۆڕشەکەمان"، "چیای کورد رەقە" شیعر، "وتاری سەرۆك بارزانی-کە لە بیرەوەری هەڵگیرسانی شۆڕش، کاك ئیدریس بارزانی خوێندیەوە"، "وتاری مەکتەبی سیاسی لە کۆبوونەوەی ١١ ی

ئەیلوولی-١٩٦٨ دا "خوێندراوەتەوە، وتارێکی درێژە، "یادی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی نەمر"(١٨٨١ -١٩٥٦)، "دەنگو باس" ئەو هەواڵانەی تایبەتن بە کورد لە وڵاتانی ئینگلتەرە، فەرەنسا و هەروەها لە بەغداش هەواڵی کودەتای ناو حکومەتی نووسیوە. "تۆڵە ئاوا ئەسێنرێت" وا دیارە چیرۆکێکە، کاروانی شەهیدان ئەمجارەش ژیاننامەی دوو شەهید لەخۆ دەگرێت، "دەستخۆش کاکی پێشمەرگە" کە باس لە چالاکییەکانی پێشمەرگە دەکات"، "فورسان فورسان ئەخوا!؟"، "ریپۆرتاج یادی حەوتەمینساڵی شۆڕش "کە بەو بۆنەوە لەسەر پردی گەڵاڵە ئاهەنگێك بۆ ئەو یادە رێکخراوە، "چیرۆکی ژمارە -گوڵاڵە و بەکر" لە نووسینی سەعید ناکام، (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل ١٢٠-١٣٩).

ژمارە (١٧)، کانوونی دووەمی **١٩٦٩** بە (١٢) لاپەڕە دەرچووە: سەروتاری ئەم ژمارە "پیلانی دوژمنی کەوتەڕوو"، "کوڕە کاژاوم" شیعری سەعید ناکام،"شۆڕش لە دەرەوە" باس لەو هەوڵ و تەقەلایانە دەکات لە دەرەوە بۆ ناساندنی شۆڕشی کوردستان، "سەنگی کوردستان لە تەرازووی گەلانا"، باس لە وتاری رۆژنامەنووسێکی فەڕەنسی بەناوی "مسیۆ ئەریك رۆلۆ" لە رۆژنامەی لۆموند دەکات، کە بە رێگای عێراقەوە هاتووەتە کوردستان، چاوی بە ناوچەکانی شۆڕش و مەلا مستەفا بارزانی کەوتووە، "حەرەس قەومییە خوێنڕێژەکانی **١٩٦٣** خەڵات کران"، "کاروانی شەهیدان"، "قوڕ بەسەر کەر، نەعلەت لە جاش، "ژمارەیەك چالاکی پێشمەرگە لەخۆگرتووە، "نازانم پێبکەنین یا پیش بخۆینەوە"، چیرۆکی ژمارە– "هەڵخەلەتاو" لە نووسینی سەعید ناکام، "پاوانا شێران" شیعری "سەبری بۆتانی"(**١٩٢٥- ١٩٩٨**) . (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل ١٤٠-١٥١).

ژمارە (١٨) مارتی **١٩٦٩** بە (١٨) لاپەڕە دەرچووە و لەسەری نووسراوە "چاپخانەی خەبات"، لەم ژمارەیەدا: سەروتاری بە ناوی "بەعسی یەمین و کێشەی کوردستان"، "کوردستان هی کورد"، شیعری سەعید ناکام، "لێرەو لەوێ" هەندێ هەواڵی پەیوەست بە کورد لە دەرەوەی کوردستان، "خزمەتی کۆمەڵایەتی لە کوردستانی رزگارکراودا"، کە باس لە ڕەوشی تەندروستی و خوێندن و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵك کراوە، "کاروانی شەهیدان"، "ئامۆژگاری بۆ

پێشمەرگەکانمان"، "چلەی خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی بارزانی" (**١٨٩٦- ١٩٦٩**)، "مەبەست"شیعری مەجید شێخ مەحمود-ناوپردان، "شین و شادی" شیعری سەبری بۆتانی-زاخۆ **١٩٦٣**، "پێشینان وتوویانە"، "چیرۆکی ژمارە-"یەك لە چلان" "وەزعی ئێستای کوردستان" ئەوەش ژمارەیەکی زۆر لە چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی تۆمار کردووە، "گەڕانەوە بۆ ڕیزی شۆڕش" ناوی ئەوانەی تێدایە کە هاتوونەوە ناو شۆڕش جا چ چەکداری کوردی حکومەت بن یان سەرباز لە سوپای عێراق. (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل١٥٢-١٦٧).

ژمارە (١٩)، نیسانی **١٩٦٩** بە (١٦) لاپەڕە، لە چاپخانەی خەبات دەرچووە. لەم ژمارەیەدا: سەروتار بە ناوی "لەنێوان دوو نەورۆزدا"، "لافاوی خوێنی" شیعری سەعید ناکام، "نامەی لیژنەی پشتگیری شۆڕشی کورد لە فەڕەنسا"، لیژنەکە لە کۆمەڵێك کەسایەتی بیانی لە وڵاتی جۆراوجۆر پێکهاتووە، "کێشەی کورد لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی جیهاندا"، "وەزعی ئێستای کوردستان"، کارو چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانە، "چیرۆکی ژمارە -دایکی پێشمەرگە". لە نووسینی سەعید ناکام، "هەنگاوەکانی شۆڕش لە ڕێبازی چەسپاندن و پێشکەوتنا"، باس لە تەندروستی و خوێندن کراوە. "کوتکی کاوە" شیعری هەژار، "ئولا ژ دەردان بەهێزترە" شیعری سەبری بۆتانی، "قوتابخانەی کادیرایەتی پارتی" باس لە ئاهەنگی دەرچوونی دەورەی یەکەمی قوتابخانەی کادیران دەکات لە **٢٠/ ٣/ ١٩٦٩**. (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل١٦٨-١٨٣).

دەنگی پێشمەرگە، ژمارە (٢٠)، مایس **١٩٦٩**، بە (١٨) لاپەڕە لە چاپخانەی خەبات دەرچووە. لەم ژمارەیەدا سەروتاری بەناوی "نابووتی رژێمیان بە هەڕەشە چار ناکرێت"، "بۆمبای ناپاڵم"، شیعری سەعید ناکام، تێکشکاندنی هێرشەکانی دوژمن لە **٢١/ ٣/ ١٩٦٩** تا **٥/١٥/ ١٩٦٩**، "گۆشەی کاروانی شەهیدان"، "مەسئەلەی کورد لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی دنیادا"، "یەکی ئایار"، کۆتایی هاتن بە جەنگی جیهانی دووەم"، "کیل براکن لە کوردستان" ئەندامی ئەنجومەنی لۆردات و سەرنووسەری رۆژنامەی (ئیڤنینگ ستانداری ئینگلیزی) لە نیسانی **١٩٦٩** هاتووەتە کوردستان. "ئامۆژگاری بۆ پێشمەرگەکان"، "چیرۆکی ژمارە -زیانمان شەهیدێك بوو!" نووسینی

سەعید ناکام، "شۆڕشی کوردستان لە پێشکەوتندایە"، لێرەدا باس لە ئاهەنگی دەرچوونی دەورەی دووەمی بێ تەل و پێشکەوتنی شۆڕش لە رووی کۆمەڵایەتی و تەندروستی و زانیارییەوە دەکات. "جووتێك برووسکە". (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٢٠٢٢٠١).

دەنگی پێشمەرگە، ژمارە (٢١)، حوزەیرانی **١٩٦٩**، بە (٢٠) لاپەڕە لە چاپخانەی خەبات دەرچووە، لەم ژمارەیەدا: سەروتار "لە حوزەیراندا" باس لەو کارەساتانەی بەسەر کورددا هاتووە لەم مانگەدا، "کێشەی کورد لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی عالەمیدا"، "ئامۆژگاری بۆ برا پێشمەرگەکانمان"، "کاروانی شەهیدان"، "ئەخباری کوردستان دێتەوە کۆڕی خەبات"، مەبەست دەرکردنەوەی ئەو بڵاوکراوەیەیە کە زیاتر تایبەتە بە چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە بە کوردی و عەرەبی، "بۆیە ئەخوێنم".. شیعری شێخ رەئووف شێخ عارف قەرەداغی، "چیرۆکی ژمارە -تارمایی گۆڕستان" نووسینی سەعید ناکام، "تێکشکاندنی هێزەکانی دوژمن لە **١٩٦٩/٥/١٦** تا **١٠/٦/ ١٩٦٩**". (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل ٢٠٢-٢٢١).

دەنگی پێشمەرگە، ژمارە (٢٢)، تەمووزی **١٩٦٩** بە (١٢) لاپەڕە لە چاپخانەی خەبات دەرچووە لەم ژمارەیەدا: سەروتار "شۆڕشی تەمووزی پیرۆز و کودەتاکەی (١٧)ی تەمووز"، "کێشەی کورد لە چاپەمەنییەکانی جیهاندا"، "کۆنگرەی هەشتەمینی پارتی"، "کاروانی شەهیدان"، "دەربارەی وەزعی عەسکەری لە کوردستاندا"، پیرۆزبایی بە بۆنەی دەرچوونەوەی، "دەنگوباسی کوردستان"، کە تایبەت بوو بە وەزعی عەسکەری کوردستان، "ئامۆژگاری بۆ برا پێشمەرگەکان"، "شۆڕشی کوردستان لە پێشکەوتندایە"، باس لە خزمەتگوزاری تەندروستی، دەورەی یەکەمی مامۆستایان، ئاهەنگی دەرچوونی دەورەی دووەمی کادیران لە **١٨/ ٧/ ١٩٦٩** دەکات. "بەعسیەکان درۆ کاوێژ ئەکەنەوە"، "لەگەڵ گیانی پاکی کاك عەزیز ئەتروشیدا"، وتارێکی یادەوەری درێژە بۆ ئەو شەهیدە دیارەی شۆڕش نووسراوە. "سەرکەوتنێکی عیلمی بێ هاوتا" باس لە هەواڵی چوونە سەر مانگ دەکات لەلایەن هەردوو کەسی ئەمریکی بە ناوەکانی ئولدرن و ئارمسترۆنگ لە **٢٠/ ٧/ ١٩٦٩**، "ئامۆژگاری" شیعری سەبری بۆتانی، "پێشمەرگەی کۆڵنەدەرم". (k21، ژ (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٢٢٢-٢٣٣).

دەنگی پێشمەرگە، ژمارە (٢٣)، ئەیلوولی ١٩٦٩، بە (٢٠) لاپەڕە لە چاپخانەی خەبات دەرچووە. لەم ژمارەیەدا: "بیرەوەری (١٦)ی ئاب ئەبێ چاکترین هاندەرمان بێت لە خەباتی سەختماندا"، "کێشەی کورد لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوە نیشتمانییەکانی عێراقدا"، "لەبڕشتەکانی شۆڕش-ئاهەنگی دەرچوونی یەکەم دەورەی مامۆستایان"، "یادە پڕ لە ناسۆرەکانی ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوول"، "گۆشەی کاروانی شەهیدان"، "ئامۆژگاری بۆ برا پێشمەرگەکان"، "چیرۆکی ژمارە -با کوردانە بمرین!"، چیرۆکێکی شانۆگەرییە "باری سوپایی لە کوردستانا"، باس لە دۆخی سوپایی عێراق لە کوردستاندا دەکات، "شڤان"، شیعری سەبری بۆتانی، "سڵاو لە یانزەی ئەیلوول" شیعری سەعید ناکامە، "کێشەی کورد لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی جیهانا"، "خەباتی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا"، باسی بەشداری کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا دەکات، کە وتاری لە کۆنگرەی ئاشتیخوازانی جیهاندا خوێندووەتەوە. (k21، ژ(٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٢٣٤-٢٥٣).

دەنگی پێشمەرگە، ژمارە (٢٤)، تشرینی دووەمی ١٩٦٩، بە (٢٨) لاپەڕە لە چاپخانەی خەبات دەرچووە. لەم ژمارەیەدا سەروتار "بە شەڕی کوردستان بەعسیەکان گۆڕ بۆ خۆیان هەڵئەکەنن"، "کێشەی کورد لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی جیهاندا"، "هەیئەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرهەمی تێکۆشانی گەلانە"، "کاروانی شەهیدان"، "وەزیری دەرەوەی ئایسلەندا لە ئەنجوومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر کورد ئەکاتەوە"، "هەندێك لەو بڕیارانەی چوارەم کۆنگرەی ساڵانەی خوێندکارانی کورد لە ئەمریکا داویانە"، "ئامۆژگاری بۆ برا پێشمەرگەکان"، "شۆڕشی کوردستان لە پێشکەوتندایە"، باس لە دەورەکانی مامۆستایانی کوردستان کە لەو ساڵەدا کراونەتەوە دەکات، هەروەها باس لە کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچە رزگارکراوەکانی شۆڕش و بواری تەندروستی لە دوو مانگی ئاب و ئەیلوولدا دەکات، کە (٥٢٤٨٦) نەخۆش سەردانی نەخۆشخانەکانی شۆڕشیان کردووە. "کۆنگرەی ١٣ هەمی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا"، ئەو کوشتارە دڕندانەی کە لە (داکا) و (صوریا) کرا، کە دوو گوندی کوردستانن، (داکا) لەسەر زێی خازر لە قەزای شێخان لە ڕۆژی ١٨ ی ئابی ١٩٦٩ ئاگریان تێبەردا و (٦٧) کەس

له ژن و منداڵ و یەك پیرەمێردی نۆهەد ساڵە بوون، گوندی (صوریا)ش کە زۆربەی مەسیحین لە گوندی فیشخابوور لە قەزای زاخۆ لە رۆژی ١٦ ی ئەیلوولی ١٩٦٩ هەموو خەڵکی گوندیان کۆکردووەتەوە بە گوللە هەموویان کوشتوون، ژمارەیان (٣٤) کەس بووە. "بۆچی ئەبێ جاش بچێ بەگژ پێشمەرگەی کورددا؟، "چیرۆکی ژمارە - (پاك لە پاك)"، نووسینی سەعید ئاکام، "کورتە دەنگوباس" هەواڵی جۆراوجۆری دنیا و عێراق، "قەلەنی گران" شیعری سەبری بۆتانی. (k21، ژمارە (٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل٢٥٤-٢٨٣).

ئاڵای شۆڕش: رێکخراوێکی سیاسی بووە، لە ناوەڕاستی هاوینی ١٩٨٥ لە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان-یەکێتی نیشتمانی کوردستان جیابوونەوە، ئەندامە دیارەکانیان ئەمانە بوون: مەلا بەختیار، موحسین عەلی ئەکبەر، مەحموود عەبدولڕەحمان عەبدولقادر ناسراو بە شێخ عەلی، حاجی مەمۆو پشکۆ نەجمەددین بوو، تا بەهاری ١٩٩٢ بەردەوام بوون، دواتر لەگەڵ حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان تێکەڵ بوونەوە و دواتریش هەندێکیان چوونەوە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان. (ئەسەسەرد، ٢٠١٦، ل٤٥-٤٦). ئەم رێکخراوە چەند بڵاوکراوەیەکی دەرکردووە لەوانە ئاڵای شۆڕش،... هتد. کۆمیتەی هەولێریش ئەم گۆڤارەیان دەرکردووە.

**٤ ـ ئاسۆی کرێکار- ١٩٨٩:**

رۆژنامەیەکە کۆمیتەی رێکخستنی شارەکان سەر بە ئاڵای شۆڕش دەری کردووە، ژمارە (١)ی لە ئابی ١٩٨٩ بە تیراژی (١٥٠) دانە و ژمارە (٢) لە ئەیلوولی ١٩٨٩ و ژمارە (٣)ی لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩٨٩، ئەو ژمارەی دوایی بەر لە بڵاوکردنەوەی بە بەستراوی کەوتووەتە دەست دائیرەی ئەمنی هەولێر. (حەسەن، چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لە خەباتی هەرە سەختی ئاڵای شۆڕشدا- ئاسۆی کرێکار، k21، ژمارە (١٥)، خولی دووەم، ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٢، ل٤٢٩ ـ ٤٣٤).

ئەم رۆژنامەیە لە هەلومەرجێکی سیاسی و سەربازیی زۆر سەخت دەرچووە، لەدوای ئەنفالەکان و لەسەر بنەمای بیرۆکەی کادیرێکی سەرکردایەتی ئاڵای شۆڕش بەناوی لوقمان محەمەد ئەمین عەلی (کاروان) و قەناعەتی تەواوی ئەندامانی

کۆمیتەی هەولێری ئالأی شۆڕش دەرکراوە. لەبەر ئەوەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان دووچاری شکست هاتووە و ڕەشبینی باڵی بەسەر خەڵکی کوردستاندا کێشابوو، ناوی (ئاسۆی کرێکاری)یان هەڵبژاردووە بۆ رۆژنامەکەیان. ئەمانەی دەوریان لە دەرکردنیدا هەبووە وێڕای لوقمان محەمەد ئەمین، کامەران عەزیز و ئاسۆ حەیدەری، تەواوی ئەندامانی کۆمیتەی رێکخستنی "ئالأی شۆڕش" بەشداربوونە کە ئەمانەن: حەسەن عەبدوڵڵا حەسەن "رابەر بەکر"، حەسەن یاسین "هاوڕێ صادق"، ئەیوب عەبدولکەریم "پشکۆ یان لاوە"، د. شوان محەمەد خدر "گاوان خدر"، خەلیل ئەحمەد نازەنینی، رێبین محەمەد. (حەسەن، چەند لاپەڕەیەکی...، k21، ژمارە (١٥)، خولی دووەم، ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٢،ل ٤٣١-٤٣٢).

سەبارەت بە چاپکردنیشی بە تایپێکی ئاسایی فارسی و رۆنیۆیەکی دەستکردی زۆر سەرەتایی ناویان لێناوە "رۆنیۆ تصنیع ئالأی شۆڕش" کە سێ کەس کاریان لەسەر کردووە: خونچە وسوو سلێمان، زەینەب عەبدوڵڵا حەسەن و حەسەن عەبدوڵڵا حەسەن بەگشتی بابەتەکانی لەبارەی کرێکاران و هەواڵی کرێکاری لە جیهان و بارودۆخی کوردستان لەدوای ئەنفالەکان و شیعرو پەخشان و وتاری سیاسی و رێکخراوەیی و وەستانی شەڕی عێراق-ئێران و تێکدانی هەندێ گەڕەك لە شارەکانی کوردستان و یادی شەهیدان و... هتد. لەبەرئەوەی بەشدارێکی سەرەکی و ڕاستەوخۆی ئەم کارە بابەتێکی رێکوپێکی لەبارەیەوە نووسیوە بۆیە، بەو هەندە وازمان هێنا. (k21، ژ (١٥)، خولی دووەم، ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٢،ل ٤٣١-٤٣٢).

بێگومان ئەمەش لاپەڕەیەکی گەشی مێژووی رۆژنامەوانیی کوردی و نهێنیی چەپ بە تایبەتییە، کە ڕۆڵەکانی شاری هەولێر لە بارودۆخێکی یەکجار سەخت لەو ڕۆژگارەدا بە ئەوپەڕی بڕوا بەخۆ بوون و کۆڵنەدەرانە بەرەنگاری دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری دوژمن بە ئازادی و سەربەخۆیی کورد درێژەیان بە خەبات داوە و هەندێکیان بوونەتە قوربانی و گیانی خۆیان لە پێناو داناوە و هەندێکیشیان ڕاپێچی زیندان کراون.

**ــ رۆژنامە و گۆڤارە ئاشکراکان:**

گۆڤاری k21 وەك زۆربەی بوارەکانی دیکە بایەخی تایبەتی بە لایەنی رۆژنامەوانی داوە، جا چ بڵاوکردنەوەی گۆڤار و رۆژنامە دێرین و دەگمەن و کەم ناسراوەکان یان بە بڵاوکردنەوەی توێژینەوە و وتاری جۆراوجۆر لە بارەی گۆڤار و رۆژنامەکان.

لەم رووەوە گۆڤاریk21 ژمارەیەك گۆڤارو رۆژنامەی لەو چەشنەی شاری هەولێری لەسەر لاپەڕەکانی بە بایەخەوە بڵاوکردووەتەوە، بۆ زیاتر ئاشناکردنیان لێرەدا دەیانخەینەڕوو:

**أ ــ رۆژنامەی هەتاو-١٩٤٨:**

ئەم رۆژنامەیە یەکەمین رۆژنامەی شاری هەولێرە، "ژمارە (١)ی ساڵی (١) لە رۆژی شەمووە، ١١ ی ئەیلوولی ١٩٤٨ بەرانبەر ٨ ی ناوجەژنان ١٣٦٧ ی کۆچی، وەك رۆژنامەیەکی کوردی و ئەدەبی و کۆمەڵییە"، دەرچووە. (هەتاو، ژ (١)، ١١ ی ئەیلوول ١٩٤٨، ل١؛ تاکە ژمارەی (هەتاو)ی ١٩٤٨. (k21، ژ (١٠-١١)، ٢٢/ ٤/ ٢٠١١، ل٤٩٤-٤٩٧).

لە ناوەڕاستی لاپەڕە (١) ناوی رۆژنامەکە لەناو لاکێشەیەك بە خەتێکی فارسی جوان لەلایەن خۆشنووسی ناوداری کورد ئەمین یومنی نووسراوە. لای راستی نووسراوە: خاوەندی ئەمین رواندزی[٨]. بەڕێوەبەری بەرپرس پارێزەر ناجی[٩]، پەیام [ناوونیشان]: هەولێر (أربيل) (هەتاو)، هەرچی بنووسێ و نەنووسرێ نادرێتەوە، واتە (هەرچی بڵاوبکرێتەوە و بڵاونەکرێتەوە نادرێتەوە). لەلای چەپیش: ئابوونەی ساڵانە بۆ ناو شار دینارێك و بۆ دەرەوەش دینارێك و دوو سەدو پەنجا فلسە و ئیعلانات بۆ لاپەڕەی دوایی کرێی بە دوو سەد فلسە، لە ناوەڕاستی نووسراوە: دانەی بە ١٠٠ فلسە و هەفتەی جارێك دەردەچێ. (هەتاو، ژ (١)، ١١ ی ئەیلوول ١٩٤٨، ل١)

لاپەڕە (١): دوو بابەتی تێدایە، سەرەتا (سەروتار) تێدا دەڵێت: ئێمە کوردی دڵپاك، هەر کارێك بکەین دەبێ بە ناوی خوا و پێغەمبەر (د. خ) دەستی بدەینێ... دەمێکە پێویستمان بە رۆژنامەیەك بوو، نەخوازە کە لە پارێزگا (لیوا)کانی عێراقەوە

لانی کەم یەك دوو رۆژنامەیان هەبوو، "کوێرایی بە چاوما دەهات، بۆ چ غەزەتەیێك لە هەولێردا نەبینم؟"... بەمەبەستی دەرخستنی لایەنی باشە و خراپە و پێداویستی کۆمەڵایەتی خەڵك و میللەت و ناتەواوی و کەموکورییەکانی بگەیەنێتە شوێنی خۆی..."، بەڵێ هەر قەومێ جەریدەیێکی نەبێ زبانی نییە. کە بەستەزبان بوو، هاواری نەکرد، دیارە هەر بەش خوراو و نان براو ئەبێ!... رۆژنامەکەمان جیاوازی ناکات... لایەنگیری یەکێتی و یەك ئاینی و برایەتی... داوا دەکەین زیاتر بایەخ بە لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری بدەن... "شیعرو ئەدەبیات بە زگی برسی ناخوێنرێتەوە"،... هەولێر لە تەواوی عێراقدا بە دانەوێڵە ناوی دەرکردووە و بایی سێ ساڵ دانەوێڵەی هەیە، کەچی گرانییە، تکایە ئەم مەتەڵەمان بۆ هەڵبێنن. (هەتاو، ژ (١)، ١١ ی ئەیلوول ١٩٤٨، ل ١).

هەر لەو لاپەڕەیەدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئامانجی رۆژنامەکە، پاکی قەڵەم، دوور لە مەبەستی تایبەتی کەسی، دوور لە سیاسەت، لەبەرئەوەی ودمی نووسینی سیاسیمان نییە، وتاری سیاسی بڵاوناکەینەوە، بایەخدان بە ژیان و بەرهەمی شاعیران. (هەتاو، ژ (١)، ١١ ی ئەیلوول ١٩٤٨، ل ١).

لە لاپەڕە دوودا: ئامۆژگاری ئایینی شیعری پیرەمێردە (١٨٦٧ -١٩٥٠) وەك پەندی پێشینان لە ژین بڵاوکراوەتەوە. (بابی لالۆ، ٢٠٠٤، ل٤٥٢-٤٥٣).

لاپەڕە (٢-٣): پەخشانێکی رۆژنامەوانییە بەناوی (ئەحەی جاو) بڵاوکراوەتەوە، کە بەلای بابی لالۆ دەبێ هەر (پیرەمێرد) بێت. هەر لەو لاپەڕەیە شیعرێکی (نالی) بڵاوکراوەتەوە (هەتاو، ژ (١)، ١١ی ئەیلول ١٩٤٨، ل٣؛ بابی لالۆ، ٢٠٠٤، ل ٤٤٠-٤٤١).

هەر لە لاپەڕە (٣)دا وتارێکی پیرەمێرد بەناوی (لە هەولێر کۆنتر) بڵاوکراوەتەوە، لەو وتارەدا پیرەمێرد نووسیویە: "دیارە هەولێر لە هەموو شوێنێك کۆنترە، کەچی من لە هەولێر کۆنترم. بۆ ئەوەی درۆی تیا نەبێ، ئەبێ بڵێم لە هەولێری خوارەوە کۆنترم! بەڵێ کاتێ من ئاموشۆی هەولێرم ئەکرد، تەنها هەولێری ناو قەڵاو ئەم هەولێرەی ئێستە کە سەرا و قشڵە و بازاڕو نادی و باغ و باخچەی تیایە، شانی نەبوو. تەنها لە خوارەوە هاوینان چەند کەپرێکیان لێ ئەبەست، قاوەخانە و میوە فرۆشی لەژێردا

دائەنیشت. ڕێبوار کە لەم لاوە ئەچوون بۆ مووسڵ یا لەولاوە ئەهاتنەوە و ئیشیان بەناو شار و قەڵا نەبوو، لەوێ ئەحەسانەوە".

لەلاپەڕە (٤)دا بەناوی "لاپەڕەیێك لە تەئریخی ئەدەبی کوردیی مەلا مستەفای بێسارانی پایەی لە شیعر و ئەدەبا" لە نووسینی گۆران شیعرەکانی مەولەوی و بێسارانی بە هەورامی و کرمانجی خواروو بڵاو کردووەتەوە و دواتریش باسی کردوون. (هەتاو، ژ (١) ئەیلوول ١٩٤٨، ل٤).

بەلای (بابی لالۆ)ی لێکۆڵەر زۆربەی زۆری بابەتەکانی ڕۆژنامەکە (پیرەمێرد) نووسیویەتی و هەروەها هەر لە هەمان چاپخانەی (ژین)ی پیرەمێرد چاپکراوە و هەر بەتەنیا خۆشی هەواڵی دەرچوونی لە ڕۆژنامەی (ژین) بڵاوکردووەتەوە. (بابی لالۆ، ٢٠٠٤، ل ٤٥١-٤٨٨).

ئەوەی جێی سەرنجە، وەك (بابی لالۆ) دەڵێ، کە پیرەمێرد لە پشت دەرچوونی ئەو ڕۆژنامەیە بووبێت، بۆ چ گلەیی لە گۆران (١٩٠٥-١٩٦٢) دەکات وەك نووسیویە: "... بەڕاستی سەراپا غەزەتەکە جوانە"، بەڵام "گۆران" تەمەڵ و کەم توانە، ئەگینە لەم دەورەدا "گۆران" چ ئیحتیاجێکی بە "بێسارانیە"، چیی لەو کەمترە؟!".

ب ـ **الثقافة (ڕووناکبیری)**:

بڵاوکراوەیەکی فێرگەییە، لیژنەی زمانی عەرەبی لە قوتابخانەی سەرەتایی موزەفەرییەی کوڕان لە هەولێر لە ساڵی خوێندنی ٩٥٧-٩٥٨، ژمارە (١)ی ساڵی (١)ی لە نیسانی ١٩٥٨ بە زمانی عەرەبی دەرچووە. حەننا عەبدولئەحەد ڕوفۆ مامۆستای زمانی عەرەبی ڕێبەری بڵاوکراوەکە بووە و لیژنەی دەرکردنی بڵاوکراوەکە (دە) قوتابی هەر دوو پۆلی پێنجەم و شەشەم بوونە: حەسەن عەبدوڵڵا پۆلی شەشەم پزیشکی پسپۆر (لە لەندەن نیشتەجێیە). زەکەریا سلێمان پۆلی شەشەم ئەندازیاری شارستانی- هەولێر. ڕزگار عەبدولرەحمان پۆلی شەشەم دکتۆر- ئەکادیمی- ئەورووپا. عەهدی عومەر ڕازی پۆلی شەشەم کۆچی دوایی کردووە. فاروق حوسام پۆلی شەشەم کاسب. جەوهەر حەیدەر پۆلی شەشەم عەقیدی خانەنشین. بورهان حوسێن پۆلی شەشەم مامۆستای خانەنشین. کامیران دەباغ پۆلی شەشەم پزیشکی پسپۆر-

ئەوروپا. دلاوەر سابیر پۆلی پێنجەم دکتۆری زانکۆ- ئەوروپا. عەبدوللـەتیف حەسەن پۆلی پێنجەم فیزیایی.

بەرگی گۆڤارەکە بە نەخش و نیگار ڕازاوەتەوە و لە ناو لاکێشەیەك بە لاری وشەی (الثقافة) بە گەورەیی نووسراوە و هەموو بڵاوکراوەکە بە دەست نووسراوە و دیارە بە رۆنیۆ راکێشراوە و دەستخەتەکەشی زۆر جوانە، ئەم دانەیە لەلایەن (هادی ئەحمەد خدر) پێشکەشی گۆڤاری k21 کراوە. لە روونکردنەوەیەکدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەو دانەیە بە خەتی مامۆستای زمانی عەرەبی نووسراوە و رەنگە تاقە دانەش بێت تا ئێستا مابێت. (k21، ژ ٥-٦، ٢٠٠٩، ل ٥٤٢-٥٤٣).

ناوەرۆکی بڵاوکراوەکە، بەم شێوەیە: (آثار العلم وفوائده (شوێنەواری زانست و سوودەکانی): لە نووسینی حەسەن عەبدوڵڵا. بلادي (وڵاتەکەم): نووسینی عەبدوللـەتیف حەسەن. في مدرستي (لە قوتابخانەکەم): لە نووسینی فاروق حوسام. الرفاق والاصدقاء (هاوڕێ و برادەر): لە نووسینی زەکەریا سلێمان. من دفاتر الانشاء طلاب الصف السادس (لە دەفتەرەکانی داڕشتنی قوتابیانی پۆلی شەشەم). المطالعة وفوائدها (خوێندنەوە و سوودەکانی): نووسینی عەهدی عومەر رازی. قصة العدد/الاخلاق الفاضلة (چیرۆکی ژمارە/ ڕەوشتی بەرز): لە هەڵبژاردنی قوتابی پۆلی شەشەم بورهان حوسێن. لا تكونن على الإساءة أقوى منك على الإحسان (وا مەکەن هەر لەسەر خراپە بەهێزتر بن لەچاو چاکە): لە نووسینی دلاوەر سابیر. نصيحتي (ئامۆژگاریم): لە نووسینی رزگار عەبدولرەحمان. أقبل الربيع (بەهار هات): لە نووسینی کامیران دەباغ. اخي (برایەکەم). اخبارنا المدرسية (هەواڵەکانی قوتابخانەمان). للتسلية (بۆ کات بەسەربردن): کۆکردنەوەی قوتابی جەوهەر حەیدەر. (الثقافة، العدد الاول، نيسان ١٩٥٨، ص٢-٩؛ k21، ژ٥-٦، ٢٠٠٩، ص٥٤٤-٥٥١ ).

بەگشتی بڵاوکراوەیەکی رێکوپێکە و نەخشەسازیی جوانی بە دەستی بۆ کراوە و بۆ پۆلی شەشەم، دەبێ بەکارهێنانی ئەو دەستەواژە و شیعرانە، دەستی مامۆستای زمانی عەرەبی ڕێبەری بڵاوکراوەکەی لەپشت بێت، ئەمە وەك چالاکییەکی ڕووناکبیریی ڕۆژنامەوانی کارێکی بە بایەخە بۆ فێرکردنی قوتابییەکان و ڕاهێنانیان

لەسەر نووسین، بۆیە مامۆستا حەننا وەك مامۆستایەکی دڵسۆز و چالاك مایەی دەستخۆشی و پێزانینە.

**ج ـ ژیان (١٩٥٩):**

گۆڤارێکی ویژەیی کۆمەڵایەتی قوتابیانە و ژمارە (١)ی ساڵی (١) یەکێتی قوتابیانی گشتی لە هەولێر دەری کردووە. (ژیان: ژ ١، س ١، ١٩٥٩). وەك لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە بۆ ئەو گۆڤارە کراوە لە کانوونی یەکەمی **١٩٥٩** دەرچووە هەر تەنها ئەو ژمارەی لێ دەرچووە. (حەسەن، "ژیان" کەی دەرچووە؟،K21، ژمارە (٧)، ٢٠١٠، ل١٥٩). ئەم گۆڤارە یەکەم گۆڤاری قوتابیانەیە لە هەولێر و **(٣٣)** لاپەڕەیە و بە چاپێکی جوان و دەرهێنانێکی رێکوپێك لە چاپخانەی (ژین) لە سلێمانی چاپکراوە.

بابەتەکانی ناو گۆڤارەکە بەم جۆرەیە: پێشەکی دەستەی نووسەران، ل**٤-٥**. ژیان سەلاح شێردڵ، ل**٦-٩**. ئەدەبیاتی بێگانە: ئاخافتنی گوڵ و گۆڕ ڤکتۆر هۆگۆ، وەرگێڕانی: نامق عەبدوڵڵا، ل١٠. دەوری قوتابیان لە پاراستنی جمهوریەت سەلاح سەعید، ل ١١ – ١٣. گوڵی من (شیعر) کەمال غەمبار، ل١٤ – ١٥. ڕۆژنامە و گەل عەبدولسەمەد محەمەد ئەمین، ل ١٦ – ١٨. سەربەستی و ئازادی عەبدولوەهاب عەبدولرەحمان، ل ١٩ – ٢٠. میهرەجانی ئاشتی و دۆستایەتی ل ٢١ – ٢٥. ئاشتیمان ئەوێت عەبدوڵرەحمان محەمەد ئەمین، ل ٢٦ – ٢٨. کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە موهیب حەیدەری، ل **٢٩ – ٣٢**. لەم ژمارەیەدا ل**٣٣**. (ژیان، ژ (١)، ١٩٥٩، ل١-٣٣؛ k21، ژ (٧)، ٢٠١٠، ل ١٦١-١٩٢)

ئەوەی جێی سەرنجە دوو بابەت خاوەنیان هەیە و لە پێڕستدا هەن و لە ناوەڕۆك نین کە ئەمانەن: خوێنێکی سوور و گەش عادل موختار و بانگێك بۆ قوتابیانی کۆیە. (ژیان، ژ(١)، ١٩٥٩، ل٣٣). لە پێشەکیدا ئاماژە بەوە کراوە کەوا بە ئامانجی خزمەتکردنی زمان و ئەدەبی کوردی و هێنانە کایەی بزووتنەوەیەکی ئەدەبی لەناو توێژی قوتابیان دەستیان داوەتە دەرکردنی ئەم گۆڤارە. (ژیان، ژ(١)، ١٩٥٩ل٤؛ k21، ژمارە (٧)، ٢٠١٠، ل١٦٣).

بێگومان دەرکردنی گۆڤارێك تایبەت بە قوتابیان کارێکی تا بڵێی دروست و پێویستە بەتایبەتیش بۆ ئەو رۆژگارە و بە زمانی کوردی لە شاری هەولێریش ئەوە هەر

زۆر بەرزترە و هەنگاوێکی زۆر بایەخدارە. ئەوانەی بەشداری گۆڤارەکەیان کردووە، دیارە هەموویان ئەندامی یەکێتی قوتابیانی گشتی لە هەولێر بوونە کە سەر بە حزبی شیوعی عێراق بووە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە مامۆستا کەمال غەمبار لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ غازی حەسەندا دەڵێت، خۆی هەمەکارەی گۆڤارەکە بووە. (k21، ژ (٧)، ٢٠١٠، ل١٥٦). بەڵام لە بەدواداچوونێکی گۆڤاری (k21)دا بە ئیمزای مومتاز حەیدەری و بەناوی "سەرنجێك لەمەڕ.. باسەکەی مامۆستا غازی حەسەن: ژیان کەی دەرچووە؟، ئاماژە بە هەندێ لە ناوەکان دەکات کە جموجوولی رۆشنبیرییان هەبووە، وەك ئەندامی پێشکەوتووی قوتابیان و حزبی شیوعی عێراق و پێی وایە ڕەنگە کوردییەکانیان لاواز بوو بێت، کەمال غەمبار بۆیانی چاك کردبێتەوە". (م. حەیدەری، سەرنجێك لەمەڕ...، k21، ژ(٧)، ٢٠١٠، ل١٦٠). بەڵام لەگەڵ ئەوەش کەمال غەمبار جارێکی دیکە لە ژمارەی دواتری گۆڤاری (k21)دا (روونکردنەوەیەکی پێویست)ی داوە و دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە نووسینەکان هەمووی ئەو نووسیویەتی و بەناوی ئەوانەوە بڵاوی کردوونەتەوە، تەنانەت کەمێك دەستکاری شێوەکەی (فەرهاد عەونی)یشی کردووە. (غەمبار، روونکردنەوەیەکی پێویست، k21، ژ (٨)، ٢٠١٠، ل٢٤٥).

لە کورتە سەرنجێکی م. حەیدەریش ئاماژە بەوە دەکات کە (٨) لاپەڕەی گۆڤارەکە لە کۆمپیوتەر دەرنەچوون. ( k21، ژ(٨)، ٢٠١٠، ل٢٤٥). لەبەرئەوەی غازی حەسەن لەمەڕ گۆڤارەکە دواوە و زانیاریی وردی ساخکردووەتەوە، بۆیە خوێنەر و توێژەران دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ گۆڤاری K21، لەم بارەیەوە. (حەسەن، ژیان کەی دەرچووە؟، k21، ژ (٧)، ٢٠١٠، ل١٥٢-١٦٠).

بڵاوکردنەوەی دەقی گۆڤارەکەش لە هەمان کاتدا کارێکی دروست و لە شوێنی خۆیەتی، لەبەرئەوەی دەگمەنە، ئەمەش سەروەرییەکی گۆڤاری (k21). (ژیان، ژ (١)، س(١)،١٩٥٩، ل ١-٣٣؛ k21، ژ (٧)، ٢٠١٠، ل ١٦١-١٩٢).

**د ــ ریژنە (١٩٧٠-١٩٧١):**

یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە ٢٨/ ٢/ ١٩٦٢ دامەزراوە، بەهۆی بارودۆخی شۆڕشی کوردستان، ئەم رێکخراوەش وەك تەواوی رێکخراوەکانی دیکە بە نهێنی

کاریان کردووە. هەر لەگەڵ بەستنی کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە ١٥/ ٥/ ١٩٦٢ بڕیاری دامەزراندنی لقەکانیشی دا. (حاجی، ١٩٩٨، ل٣-٣٤).

لقی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە هەولێر لە دوای کۆنگرەی یەکەم لە ساڵی ١٩٦٢ دامەزرا و عەلی هەژار[١٠]. سەرۆك بووە و بڕیاری داوە بڵاوکراوەیەك بەناوی (دەنگی مامۆستا) لە شێوەی گۆڤار دەربکەن و بە دەست نووسراوەتەوە و بە ڕۆنیۆ راکێشراوە و بە نهێنی بڵاوکراوەتەوە و چەند ژمارەیەکیان لێ دەرکردووە.

لە دوای ١١ ی ئاداری ١٩٧٠، یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لە ٥ ی ئابی ١٩٧٠ کۆنگرەی سێیەمی بەست، دوای پێکهێنانی مەکتەبی سکرتاریەت لە (٢١) ئەندام، لقەکانیش دامەزران و لقی هەولێر لەمانە پێکهاتووە: ئیسماعیل عومەر سنجاوی سەرۆکی لق. عوسمان حەسەن دزەیی سکرتێر. ئەحمەد گەرۆتەیی ئەندام. لەشکری یابە ئەندام. حەننا شابۆ پەترۆس ئەندام (حاجی، ١٩٩٨، ل٤٧، ٥٣، ٥٦).

لەو بارودۆخە نوێیە، دەرفەت زیاتر رەخسا بۆ بڵاوکردنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامە بە زمانی کوردی. بۆ ئەمەش یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقەکانی لە شارەکانی کوردستان کردەوە، لقی هەولێریش دەستی بە چالاکی کردەوە و یەکێك لە چالاکییەکانی دەرکردنی بڵاوکراوەیەك بووە بە ناوی "رێژنە" وەك بڵاوکراوەیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی و رامیاریی مانگانە، بە دەست نووسراوەتەوە، سەرنووسەری عەلی هەژار، دەستەی نووسەرانیشی ئەمانە بوون: عەزیز شوان (١٩٤١ -٢٠٠٣)، محەمەد مەلا قادر ( ١٩٣٤-٢٠١٩)، مەجید ئاسنگەر (١٩٣٢-٢٠١٢)، کەمال عەبدولقادر، بەشیر حوسێن سەعدی بوونە، و وتارەکانیش ئەوانە و کۆمەڵێك مامۆستای نووسەری دیکە نووسیویانە. "لەشێوەی نامیلکەیەکی بچووك چاپکراوە و بە نهێنی و شاراوەیی لەبەر بار و زرووفی ئەوسای حوکم". (حەمەد، ١٩٩٨، ل١٠٨).

ژمارە (١)ی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٠ و ژمارە (٢)ی لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٠ و ژمارە (٣)یشی لە کانوونی دووەمی ١٩٧١ لەسەر شێوەی مەلزەمە و بە دەستخەت نووسراوە و بە ڕۆنیۆ راکێشراوە. (دەقی هەر سێ ژمارەی رێژنە وەکو خۆی بڵاو دەکرێتەوە، k21، ژ(٧)، ٢٠١٠، ل ١٩٣-٢٣٤).

ئەوەی سەرنجە (رێژنە) لە کەشوهەوای دوای ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ دەرچووە، کەچی دەڵێت "بە نهێنی و شاراوەیی..." بڵاوکراوەتەوە. وا دیارە ژمارەکانیان نەبینیبێت...!

ئەم بڵاوکراوەیەش لاپەڕەیەکە بۆ سەر مێژووی رۆژنامەوانیی کوردی بە گشتی و شاری هەولێر بەتایبەتی، بەبڵاوکردنەوەی لەسەر لاپەڕەکانی، k21، لە فەوتان رزگاری بووە.

**هـ ـ یاخی بوون ـ ١٩٧٣:**

ئەم بڵاوکراوەیە دەستنووس بووە و لە ساڵی **١٩٧٣**، کۆمەڵێك لاوی خوێنگەرم دەریان کردووە و لەسەر بەرگەکەی نووسراوە: "بەرهەمی دەستەی یاخی بوون- هەولێر"، "لیستەی ئەدەبی شۆڕشگێڕی کوردییە"، "بیری نوێ و وتەی نوێ کرداری نوێ"، "ژمارەی یەکەم- مارت/ **١٩٧٣**"، سەرۆك نووسەر دڵشاد کوردۆ، سکرتێری نووسین شێرزاد رەنجەڕۆ، دەستەی نووسەران صبحی کۆیی، شێرزاد مەند". (عوبێد، بڵاوکراوەی دەستنووسی "یاخی بوون"، لە هەولێر ـ ١٩٧٣؛k21، ژ (٧)، ٢٠١٠، ل١٣٧).

لە کەشوهەوای دوای رێککەوتنی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠، جۆرێك لە ئازادی بیروڕا و گەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتی و بیری نوێخوازی لەو رۆژگارەدا لە برەودان بوون، وەك رەنگدانەوەی هەوارێکی نوێ لە مێژووی نەتەوەی کورد. وێڕای ناتوانایی دارایی و نەبوونی پشتگیریی پێویست، ئەو کۆمەڵە لاوە بە پشتبەستن بە ورە و پشت قایمی بە ئامانجە پیرۆزەکانیان پەنایان بردووەتە بەر هونەرەکانی نووسین.

لەم توێژینەوەیە زۆر بەکورتی ئەم بڵاوکراوەیەمان ناساند چونکە توێژینەوەیەکی درێژترمان لەبارەی ئەم بڵاوکراوەیە نووسیوە، لێرە بە پێویست نەزانرا جارێکی دیکە دووبارەی بکەینەوە. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکرێ، هەموو نووسەرەکانی ئەم بڵاوکراوەیە خەڵکی هەولێر بوون، جگە لە حەمید رێبوار کە خەڵکی شاری کەرکوك بوو، بەڵام بەماڵەوە لە هەولێر لە گەڕەکی سێتاقان دەژیان. بێگومان ئەم بڵاوکراوەیەش لاپەڕەیەکی پڕ سەروەریی ئەم شارەیە لەو رۆژگارەدا و دەکەوێتە خانەی مێژووی رووناکبیریی- رۆژنامەوانی کوردی. (عوبێد، بڵاوکراوەی دەستنووسی (یاخی بوون) لە هەولێر-١٩٧٣؛ k21، ژ (٧)، ٢٠١٠، ل١٣٧-١٥٤).

**و ــ رۆشنبیر-١٩٧٣:**

کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی، لە ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا، وەك بەرهەمی رێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دامەزراوە و. لە ١٩ ی حوزەیرانی ١٩٧٠ مۆڵەتیان لە وەزارەتی ناوخۆ وەرگرتووە. ساڵح یوسفی (١٩١٨-١٩٨١) سەرۆکی ئەم کۆمەڵەیە بووە و لە حوزەیرانی ١٩٧١ یەکەم ژمارەی گۆڤارێکی دەوڵەمەندیان بە ناوی (رۆژی کوردستان ـ شمس کردستان). بە ناوەڕۆك و بە شێواز و نەخشەسازییەکی پێشکەوتوو دەرکرد. ئەم کۆمەڵەیە بۆی هەبوو لە شارەکانیش لقی خۆی بکاتەوە. یەکێك لەو لقانە لقی هەولێر بووە، کە لە رۆژی ١٠ ی شوباتی ١٩٧٢ لە هەولێر کۆنگرەی دامەزراندنی یەکەمیان بەستووە و پاشان دەستەی کارگێڕییان هەڵبژاردووە و (١١) کەس دەرچوونە. ئەم لقە گۆڤارێکی بەناوی "رۆشنبیر" وەك پاشکۆی گۆڤاری (رۆژی کوردستان ــ شمس کردستان)، وەك گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی دەرکردووە. رۆشنبیر ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٧٣ لە ناوەڕاستی ئەو ساڵە دەرچووە و دەستەی نووسەرانی ئەمانە بوون: عەبدولرەزاق بێتووشی سەرۆکی نووسین، سکرتێری نووسین ئەحمەد شەریف و دەستەی نووسەران: مومتاز حەیدەری، سامیە شاکر، حازم باجەلان، عەبدولقادر حەمەد ئەمین. لە چاپخانەی راپەڕین لە سلێمانی چاپ بووە. (رۆشنبیر (گۆڤار)، هەولێر، ژ (١)، ١٩٧٣؛ k21، ژ (٥-٦)، ٢٠٠٩، ل١٧٤).

هەرچی ژمارە (٢)ە ئەوە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ ئامادەکراوە و دراوەتە فەرمانگەی سانسۆر لە بەغدا و لە مانگی مارتی ١٩٧٤ لە سانسۆر دەرچووە، بەڵام بەهۆی دەستپێکردنەوەی شەڕی کوردستان نەتوانراوە چاپ بکرێت و لەو ساوە تا ساڵی ٢٠٠٩ واتە دوای (٣٦) ساڵ پاراستنی لای مومتاز حەیدەری ، لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری k21 وەك دیاریی ژمارە دەقی ژمارە (٢) بڵاوکراوەتەوە. لەو ژمارەیەدا سەرۆکی نووسین ئەحمەد شەریف و سکرتێری نووسین مومتاز حەیدەری و دەستەی نووسەران سامیە چاوشلی و یوسف دەرگەڵەیی. جێی ئاماژەیە سانسۆر تەنیا شیعری سەبری بۆتانی کە بۆ مەلا مستەفای بارزانی نووسیوە لابردووە. (k21، ژمارە (٥-٦)، ٢٠٠٩، ل١٧٢-١٩٥).

بێگومان پاراستن و بڵاوکردنەوەی جارێکی دیکەی ئەم گۆڤارە لەسەر لاپەڕەکانی k21، خزمەتێکی دیاری ڕووناکبیریی کوردی و مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی و هەولێرە.

**ی ـ کۆنگرە-١٩٩١:**

یەکێتی نووسەرانی کورد لە ١٠/ ٢/ ١٩٧٠ دامەزراوە و بە چەندین هەوار تێپەڕیوە بەپێی بارودۆخی کوردستان. (شەریف، ٢٠١٩، ل١٠٩-١٢٠).

لەدوای ڕاپەڕین بارودۆخێکی جیاواز هاتە ئاراوە، بۆ ئەوەی نووسەران جارێکی دیکە خۆیان ڕێك بخەنەوە، ئەوە بوو کۆنگرەی ڕاپەڕین لە شاری شەقڵاوە لە ١٥-١٧ ی تشرینی یەکەمی **١٩٩١** بەسترا. (کۆنگرە، ژ(١)، ١٥/ ١٠/ ١٩٩١، ل١).

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو ڕۆژنامەیە کە لە ڕۆژانی بەستنی کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانەوە دەرکراوە و جارێکی دیکە لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری k21 بڵاوکراونەتەوە. (k21، ژ(٨)، ٢٠١٠، ل١٥٦-١٧٣).

ڕۆژنامەی (کۆنگرە)، ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بووە، بە بۆنەی کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانەوە دەرچووە، ژمارە (١)ی لە ڕۆژی سێشەممەی **١٥/ ١٠/ ١٩٩١** لە شەقڵاوە دەرچووە و ژمارە (٢)ی لە ڕۆژی چوارشەممەی **١٦/ ١٠/ ١٩٩١** و ژمارە **(٣)**یشی لە ڕۆژی پێنج شەممەی **١٧/ ١٠/ ١٩٩١** بە **(٤)** لاپەڕە دەرچووە.

دەستەی بەڕێوەبردن: نەژاد عەزیز سورمێ – سەرنووسەر و سەرپەرشتیار. دەستەی نووسەران: ئازاد جوندیانی، مەولود ئیبراهیم، نەوزاد عەلی. دەستەی یاریدەدەر: ڕێکار ئەحمەد، مامۆستا شەوقی، عەبدولڕەحمان مستەفا (پەرێشان، ڕۆژنامەی کۆنگرە یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانەی دوای ڕاپەڕین، k21، ژ (٨)، ٢٠١٠، ل١٦٢).

لەڕووی نەخشەسازی و تایپەوە، زۆر بە سادەیی دەرچووە، دیارە لەبەرئەوەی دەزگای چاپەمەنی و چاپخانە نەبووە، هەر ئەوەندە توانراوە دەربکرێت. لەمەشدا دەوری دیار بۆ نەژاد عەزیز سورمێ وەك سەرنووسەر و سەرپەرشتیار و خاوەن بیرۆکەی دەرکردنی بووە و زۆربەی کارە هونەرییەکانی ڕاپەڕاندووە. لەبەرئەوەی

مەسعوود پەرێشان باسی رۆژنامەکەی کردووە، ئێمە بە کورتی باسی بابەتە سەرەکییەکان دەکەین. (k21، ژ (٨)، ٢٠١٠، ل١٥٦-١٦٢).

لە لاپەڕەی یەکەمی لۆگۆی رۆژنامەکە بە هەردوو رێنووسی ئاسایی و لاتینی نووسراوە، دروشمی یەکێتی نووسەران لەلای چەپ داندراوە. بێگومان ئەو سێ ژمارەیەی ئەم رۆژنامەیە بەڵگەنامەیەکی گرنگی مێژووی یەکێتی نووسەرانی کوردە لە دوای ڕاپەڕین و لەهەمان کاتدا گۆڤاری k21یش بە دووبارە بڵاوکردنەوەی کارێکی بایەخداری بۆ مێژووی رۆژنامەوانیی کوردی و هەولێر کردووە.

**ئەنجام**

رۆژنامەوانی وەك بەشێكی گرنگی رۆشنبیری، دەوری گەورەی لە نووسینی مێژوودا بە گشتی هەیە، وەك بەڵگەی ڕاستەوخۆ.

گۆڤاری k21 وەك گۆڤارێكی بە وەج و دەوڵەمەندی پڕ بەڵگەنامە و زانیاری و بابەتی بەپێز، كە بایەخداره بەلایەنی رۆژنامەوانی و مێژووی رۆژنامەوانیی كوردی بەگشتی، (بە بڵاوكردنەوەی توێژینەوە و وتار و نووسینی بەرووومەت لەو بارەیەوە، بەشێكی ئەو كارانە بەر شاری هەولێر كەوتوون و ژمارەیەك گۆڤار و رۆژنامەی ئاشكرا و نهێنی وەك: هەتاو-١٩٤٨، "االثقافة"- ١٩٥٧-١٩٥٨، ژیان-١٩٥٩، رێژنە-١٩٧٠-١٩٧١، رۆشنبیر-١٩٧٣، یاخی بوون-١٩٧٣، كۆنگرە-١٩٩١، یەكێتیی تێكۆشین-١٩٤٤، "الكادر"-١٩٦٨ ـ ١٩٦٩، دەنگی پێشمەرگە-١٩٦٨-١٩٦٩، ئاسۆی كرێكار-١٩٨٩، كە هەندێكیان بۆ یەكەم جار لە كاروانی رۆژنامەوانیی كوردیدا دەناسرێن، لەو گۆڤارەدا بڵاوكراونەتەوە، ئەمەش لاپەڕەیەكی گەشی مێژووی رۆژنامەوانیی شاری هەولێرە. بەمەش ژمارەیەكی بەرچاوی رۆشنبیر و رۆژنامەوانیی هەولێر بابەتەكانیان لاپەڕەكانی ئەم گۆڤار و رۆژنامانەیان پڕكردووەتەوە.

دیارە ئەو گۆڤار و رۆژنامانە سەر بە كات و شوێن و رەوتی جیاوازن، بەڵام هەر هەموویان لە خزمەت بە زمانی كوردی، جگە لە عەرەبییەكان، لە خزمەت بە خەباتی رزگاریخوازی كوردستان بوونە.

گۆڤار و رۆژنامە ناوبراوەكان رێكخراوەیی، حزبی، سیاسی، پێشمەرگەیی، رووناكبیری، خوێندكاری، ئەدەبی و كرێكارین.

ـ هەندێ لەو گۆڤار و رۆژنامانە دەستنووس یان بە رۆنیۆ راكێشراون.

ـ هەندێكیان نەخشەسازی و لۆگۆیەكانیان زۆر سادە و بە دەست نووسراون.

رۆژنامەوانییە نهێنییەكان بێ ناوی دەستەی نووسەران، بەڵكو رێكخراو و یان كادیرانی حزبەكە بێ ناو كارەكانیان بەڕێوەبردووە.

ـ هەندێكیشیان لە چاپخانەی ئاسایی و بە زیاتر لە ڕەنگێك چاپكراون.

ـ وەك سیمای ئەو رۆژگارە، ژمارەیەك بابەت بەناوی نهێنی و خوازراو نووسراون.

ـ راستە هەندێكیان زۆر سادە و ساكارن، بەڵام زادەی سەردەم و هەواری خۆیانن و بۆ ئەو رۆژگارە بایەخی خۆی هەبووە، "بەندەو تاقە"، وەك لە كوردەواری دەڵێن.

## پەراوێزەکان:

[1]- مومتاز حەیدەری: بنەماڵەی حەیدەری، بنەماڵەیەکی زانست پەروەری بەناوبانگی کوردستان و جیهانی ئیسلامین. مومتاز پێنجەمین کوڕی حەیدەر ئەفەندییە، لە ٨/ ٣/ ١٩٣٨ لە هەولێر لەدایك بووە، لە ناوەڕاستی چلەکان چووەتە بەر خوێندن تا سێی ناوەندی خوێندووە، بەڵام لە ١/ ٥/ ١٩٦١ گیراوە و ئیتر جارێکی دیکە نەیتوانیوە بگەڕێتەوە بۆ خوێندن، بە هۆی گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩-١٩٤٩) و ئەو کەشوهەوایەی ماڵەوەیان کە براکان خەریکی سیاسەت و کتێب خوێندنەوە بوون، ئەویش کەڵکی لەوە وەرگرتووە و خۆی رۆشنبیر کردووە. لەدوای ١٤ ی تەمموزی ١٩٥٨ و ئەو ڕەوشە تازەیەی دروست بوو، لە ١ ی ئایاری ١٩٥٩ رۆژنامەی "ئازادی" حزبی شیوعی عێراق دەری کردووە، مومتاز دەبێتە پەیامنێری ئەو رۆژنامەیە تا داخرانی بەردەوام بووە، دواتر لە چاپخانەی حزبی شیوعی کاری کردووە، دواتر لە رۆژنامەی "رێگای کوردستان"ی هەمان حزب کاری کردووە. لەدوای ١١ ی ئاداری ١٩٧٠، لە رۆژنامەی "هاوکاری" دامەزراوە و پێنج ساڵیش لەوێ کاری کردووە، دواتر لە رۆژنامەی "عێراق" کاری کردووە. لە دوای ڕاپەڕین ماوەیەك لە "کوردستانی نوێ" کاری کردووە، ماوەیەکیش سەرنووسەری گۆڤاری "رۆژنامەڤانی" سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان بووە، بەڵام کاری هەرە دیاری رۆژنامەنووسی حەیدەری دەرکردنی گۆڤاری (K21) بووە، کە هەموو ژیانی ماددی و مەعنەویی خۆی بۆ تەرخان کردووە. بابەتی ئەم توێژینەوەیە، هەروەها گۆڤاری (لەیلا قاسم و لەیلا زانا)ی دەرکردووە. (غەفوور، ئاسۆی یادەوەری، وەکو خۆی، (14 /1-13 k21، /2 /12 2014، ل٦٤٨-٦٥٥).

[2]- رائدە ئەحمەد بایز: لە هەولێر لەدایك بووە ، لە ساڵی ٢٠٠٦ بەکالۆریۆسی لە زمانی کوردی لە کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەددین ــ هەولێر وەرگرتووە. لە ناوەڕاستی ٢٠٠٨ بووە سکرتێری گۆڤاری K21. مامۆستایە لە ناوەندی ئیبن خەلەکانی کوڕان. (شاووشکا (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٣٣)، ٢٠٠٩، لە K21، ژ ٥-٦/ ٢٠٠٩، ل٥٧٧، وەرگیراوە).

[3]- نافیع یونس: لە ١٩٢٥ لە هەولێر لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٤٨ کۆلێژی مافی تەواو کردووە، لە ١٩٤٣- ١٩٤٤ دەستی بە کاری رۆژنامەوانی کردووە، لە رۆژنامەوانی نهێنی (یەکیەتی تێکۆشین، شۆڕش، رزگاری ١٩٤٥-ناوەڕاستی ١٩٤٦)، ئازادی نیوەی دووەمی ١٩٤٦، لە رۆژنامەوانی ئاشکرا ئازادی ١٩٥٩-١٩٦٠، لە ساڵی ١٩٦٣ ئیعدام کراوە. (ساڵح، فەرهەنگی رۆژنامەنووسانی

کۆچکردووی کورد، "ڕۆژنامەڤانی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٣)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠، ل٢١٧؛ صالح حيدري، الأرشيف، K21، ژ ١/ ١٣-٢/ ١٤، ١٢/ ٢/ ٢٠١٢، ص٦٧٧)

[٤]- ساڵح حەیدەری : لە ٩/ ٥/ ١٩٢٢ لە هەولێر لەدایك بووە، ١٩٦٠-١٩٦١ کۆلێژی مافی لە بەغدا تەواو کردووە، سیاسەتمەدارێکی دیاری ناو حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. لە ڕۆژنامەوانی کوردیی نهێنی ڕۆڵی دیاری هەبووە و لەم ڕۆژنامانەدا کاری کردووە:

دەنگی کورد ١٩٤٣، یەکێتی تێکۆشین ١٩٤٤-١٩٤٥، شۆڕش ١٩٤٥، رزگاری ١٩٤٥، ئازادی کوردستان ١٩٥٧، خەباتی کوردستان ١٩٥٦، خەبات ١٩٦٣. لە ڕۆژنامەوانیی ئاشکراش لەمانە کاری کردووە: رزگاری ١٩٥٩، خەبات ١٩٥٩، التآخی ١٩٧١، کادیر ١٩٧١، التآخی ١٩٧٤-١٩٧٦، العراق ١٩٧٦-١٩٨٠، پاشکۆی عێراق. لە ٦ ی ئابی ٢٠٠١ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە. (گۆمەتاڵی، ٢٠١٢، ل٢٩، ٣٤، ١٦٩-٢٠٤).

[٥]- کاتی خۆی جەمال نەبەز هەرسێ ژمارەی بە لێکۆڵینەوە چاپ کرووەتەوە. نەبەز، ١٩٨٨،ل٤.

[٦]- لێرەدا دەبێ دەستخۆشی لە نەوزاد عەلی ئەحمەد بکرێ کە جارێکی دیکە ژمارەکانی لەسەر لاپەڕەکانی (k21) بڵاوکردووەتەوە. (احمد، (إعداد وتقديم)، الأعداد الخمسة الأولى من مجلة الكادر).

[٧]- بۆ شیعرەکان بڕوانە: هەژار، بۆ کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ، ١٩٩٨ ، ل ٩١،٩٧، ٩٩-١٩١،١٠١-١٩٥

[٨]- ئەمین ڕواندزی: محەمەد ئەمین نوری مەلا حەسەن، لە ساڵی ١٨٩٨ لە ڕواندز لە دایك بووە. تاقانە بووە، خوێندنی سەرەتایی لە یەکەم فێرگەی ڕوشدییەی مەلەکی لە ڕواندز خوێندووە و پاشان چووەتە ئامادەیی سەربازی و سەرەنجام لە مەکتەبی جەنگاوەری ئەستەنبۆڵ بە مولازمی دووەم بووەتە ئەفسەر، بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کردووە، دوای هاتنەوەی چووەتە ڕیزی سوپای عێراق و دواتریش چووەتە پاڵ شێخ مەحموود، لە دوای ئەوە گەڕاوەتەوە ڕیزی سوپای عێراق لە مووسڵ و هەڵەبجە و لە ١٩٤١ فەرماندەی فەوجی سوپا بووە لە هەولێر، لە ١٩٤٦ بە پلەی موقەدەم خانەنشین کراوە و ماوەیەکیش بەڕێوەبەری شارەوانی ڕواندز بووە، لە ساڵی ١٩٥٠ لە هەولێر ژیاوە و دواتر ناچار بووە بچێتە بەغدا، لە ٦/ ١١/ ١٩٥٥ بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە و لەوێ نێژراوە. لە مووسڵ ژنی هێناوە و ٣ کچ و ٤ کوڕی هەبووە، بەشداری کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی ئەو سەردەمە بووە، لەبواری ڕۆژنامەوانی لەگەڵ ساڵح زەکی ساحێبقڕان و فائیق کاکە ئەمین سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (بانگی حەق)یان لە ئەشکەوتی (جاسەنە) کردووەو وتاریشی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان بڵاوکردووەتەوە. (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بابی لالۆ، دەستەوارەیێ نان ...، ل٤٤٧-٤٥٠). هەتاو، ژ (١)، ١١ ی ئەیلوول ١٩٤٨، ل١؛ تاکە

ژمارەی (هەتاو)ی ١٩٤٨، بابی لالۆ، دەستەوارەیێ نان ... بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: کەمال ڕەئووف محەمەد (ئاشنا کردن و لێکۆڵینەوە)، پەڕەیەکی ونی ڕۆژنامەنووسیی کوردی- یەکەم ڕۆژنامەی هەولێر، "کاروان" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٤٨)، س (٤)، ئەیلوول ١٩٨٦، ل٧٤-٩٥؛ (بابی لالۆ) کەمال ڕەئووف محەمەد، دەستەوارەیێ نان بۆ مێژوو، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٤٢٧-٤٩٢.

[٩]- پارێزەر ناجی: بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامەکە، هەر ئەوەندەی لێ زانراوە، جووێکی ناسراوی هەولێر بووە. (بابی لالۆ، ٢٠٠٤ ل ٤٥٠).

[١٠]ــ لە ساڵی ١٩٤٣ لە هەولێر لەدایك بووە، خانەی مامۆستایانی تەواوکردووە و بووەتە مامۆستا، خوێندنی لە کۆلیجی یاسا و سیاسەت لە ساڵی ١٩٧٦ تەواو کردووە. سەرنووسەری گۆڤاری "دەنگی مامۆستا" و"ڕێژنە"ی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان لقی هەولێر بووە، لە ١٥ ی حوزەیرانی ١٩٨٢ لە سێدارە دراوە. (فەرید ئەسەسەرد، ٢٠١٦، ل٧٨٩-٧٩٠).


**سەرچاوەکان**

**کتێب:**

**بە زمانی کوردی :**

- ئەسەسەرد، فەرید، (٢٠١٦)، ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەرگی یەکەم، چ٣، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی.
- (بابی لالۆ) کەمال ڕەئووف محەمەد، (٢٠٠٤)، دەستەوارەیێ نان بۆ مێژوو، سلێمانی.
- حاجی، وشیار حەمەد، (١٩٩٨)، یەکێتی مامۆستایانی کوردستان- چەند لایەنێکی مێژووی سەرهەڵدان و تێکۆشان ١٩٦٢-١٩٩٨، یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، هەولێر.
- گۆمەتاڵی، بورهان حاتەم، (٢٠١٢)، ساڵح حەیدەری ١٩٢٢-٢٠٠١ ڕۆڵی سیاسی و ڕووناکبیری، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری K21 زنجیرە (٣)، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
- هەژار، (١٩٩٨)، بۆ کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.
- نەبەز، (د.) جەمال، (١٩٨٨)، گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتیی تێکۆشین (١٩٤٤-١٩٤٥) و ئیدیۆلۆژی هووردە بورژوازی مارکسیستی کورد، ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر، سۆکهۆڵم.

بە زمانی عەرەبی:

- احمد، نوزاد علی (إعداد وتقديم)، الأعداد الخمسة الأولى من مجلة الكادر.

**نامەی دکتۆرا:**

- شەریف، هۆشەنگ سالّح محەمەد، (٢٠١٩)، بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردی لە شاری بەغدا (١٩٥٨-١٩٧٥)دا، نامەی دکتۆرای بڵاو نەکراوە، پێشکەش بە (بەشی مێژووی کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی سەڵاحەددین/ هەولێر) کراوە.

**گۆڤارەکان:**

-k211، ژ٥-٦، ٢٠٠٩، ژمارە (٧)، ٢٠١٠ ، ژ (٨)، ٢٠١٠، ژمارە (١٠-١١)، ٢٢/ ٤/ ٢٠١١ دووەمی ٢٠١٤، ژمارە (١٢)، ٢٠١١، ، ژمارە (١/ ١٣-١/ ١٤)، ١٢/ ٢/ ٢٠١٤. ، ژمارە (١٥) ناوەڕاستی ٢٠١٢ ژمارە (٢٠)، کانوونی ( ١)، بەهاری ٢٠٠٨ ، ژمارە (٢١)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤.
- ڕۆشنبیر (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (١)، ١٩٧٣.
- ژیان: ژ ١، س١، ١٩٥٩.
- شاووشکا (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٣٣)، ٢٠٠٩.
- کۆنگرە، ژ(١)، ١٥/ ١٠/ ١٩٩١ ، ژمارە (١)، ١٥/ ١٠/ ١٩٩١) ، ژ (٣)، ١٧/ ١٠/ ١٩٩٢.
- یەکێتی تێکۆشین، ژمارە (٣)، ساڵی (١)، ١٩٤٤.
- سالّح، ئازاد عوبێد ، بڵاوکراوەی دەستنووسی "یاخی بوون"، لە هەولێر ــ ١٩٧٣.
- سالّح، ئازاد عوبێد، فەرهەنگی ڕۆژنامەنووسانی کۆچکردووی کورد، "ڕۆژنامەڤانی" (گۆڤار)، هەولێر، ژمارە (٣)، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٠.

-الثقافة، العدد الأول، نیسان ١٩٥٨.

## ملخص البحث

## مجلة k21 كمصدر لتاريخ الصحافة السرية والعلنية الكوردية لمدينة اربيل

تتناول هذه الدراسة دور مجلة k21 في تدوين تاريخ الصحافة الكوردية السرية والعلنية لمدينة اربيل وهي جزء مهم من تاريخ الثقافة والصحافة الكورديين.

هذه الدراسة تبحث عن مجموعة من الصحف السرية والعلنية باللغتين الكوردية والعربية ، والتي نشرت نصوصها على صفحات المجلة المذكورة، وقد صدرت جميعها في نفس مركز مدينة اربيل او في حدودها الادارية، مما يشكل بصورة عامة تاريخ الثقافة لهذه المدينة. والصحف هي:١- السرية: ،یەكێتی تێكۆشین ١٩٤٤، الكادر١٩٦٨-١٩٦٩، دەنگی پێشمەرگە ١٩٦٨-١٩٦٩، ئاسۆی كرێكار١٩٨٩.

٢- العلنية: هەتاو ١٩٤٨، الثقافة ١٩٥٧-١٩٥٨، ژیان١٩٥٩، رێژنە ١٩٧٠-١٩٧١، رۆشنبیر١٩٧٣، یاخی بوون ١٩٧٣، كۆنگرە١٩٩١.

لاشك ان جزء كبير من مضمون هذه الصحف ، احداثها ونصوصها تخص تاريخ اربيل وكثير من كتابها من اهالي اربيل ، فتدوينه يشكل أهمية كبيرة لتاريخ المدينة بشكل خاص وتاريخ الكورد بشكل عام.

# Abstract

## "Journal of K21 as a source for the history of the Kurdish secret and public press of Erbil"

This study deals with the role of K21 magazine in the history of the secret and public Kurdish press of Erbil, an important part of the history of Kurdish culture and journalism.

This study is looking for a collection of secret and public newspapers in both Kurdish and Arabic languages, the texts of which have been published on the pages of the aforementioned magazine, all of which were issued in the same city center or in its administrative borders. The newspapers are:

1-The Secretaries: (YeketîTecoshîn 1944), (Al-Kadir 1968-1969), (DengîPeshmarga1968-1969), and (AsoyKrekar 1989).

2-Publics: (Hetaw 1948), (Al-Thaqafa 1957-1958), (Zyan 1959), Rezne 1970-1971), (Roshinbîr 1973), (Yaxîbûn 1973), and(Kongra 1991).

There is no doubt that a large part of the content of these newspapers, the latest and the texts related to the history of Erbil and many of its writers from the people of Erbil, the codification is of great importance to the history of the city in particular and the history of the Kurds in general.

# گەڕەکەکانی شاری هەولێر
# لە سەرژمێرییە فەرمییەکانی
# رۆژگاری پاشایەتیدا
# (١٩٤٧-١٩٥٨)

**د. دڵشاد مەحموود عەبدولرەحمان**
بەشی مێژوو – کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر

**پێشەکی:**

**گرنگیی توێژینەوە:** ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لە ژێر ناونیشانی "**گەڕەکەکانی شاری هەولێر لە سەرژمێرییە فەرمییەکانی رۆژگاری پاشایەتیدا (١٩٤٧-١٩٥٨)**"، هەوڵێکی زانستییە بۆ بەدواداچوون و لێکدانەوەی ئەو هۆکار و فاکتەرە زەق و گەورانەی کاریگەرییان لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شاری هەولێر هەبووە لە ماوەیەکی دیاریکراوی هەستیاردا. هەرچەندە ژمارەیەك توێژینەوەی ئەکادیمی (دکتۆرا و ماستەر)، لەسەر شاری هەولێر نووسراون لەم چەند ساڵەی رابردوودا، بەڵام ئەم ماوە مێژووییەی هەولێر و توێژینەوەی کۆمەڵایەتی لەسەر گەڕەکەکانی هەولێر لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا، بە شێوەیەکی زانستی ئەنجام نەدراوە. گرنگیی ئەم بابەتە لەوەدا خۆ دەنوێنێت، کە شارێکی کەونارا و گرنکیی نێو شارە کوردییەکانی کوردستانی باشووری، لە ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراودا کردووەتە ئامانجی توێژینەوە.

**پێکهاتەی توێژینەوە:** توێژینەوەکە دەروازەیەك و دوو باسی سەرەکی لەخۆ دەگرێت؛ لە دەروازەدا بە پوختی باسی گرنگی و بایەخی مێژووی ئاوەدانیی شاری هەولێر لە سەردەمە مێژووییە جیاوازەکان شەنوکەو کراوە. باسی یەکەمیان تایبەت

کراوە بۆ باسی گەڕەکەکانی قەڵای هەولێر، کە بە شێوەیەکی ورد و زانستییانە هەوڵدراوە زانیارییە فەرمییەکانی حکومەتی عیراقی لە میانەی سەرژمێرییەکانی ساڵانی (١٩٤٧) و (١٩٥٧) سەبارەت بە گەڕەکەکانی سەرقەڵا لەو ماوە مێژووییەدا شی بکرێنەوە و پەنجە لەسەر لایەنە بەهێز و لاوازەکانی باری ئاوەدانیی ئەو گەڕەکانە بکرێت. باسی دووەم تەرخانکراوە بۆ باسی گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵا، کە بە کورتەك ناسراوە. لە میانەیدا، ئاماژە بە هەڵکەوتە و شوێنی جوگرافی هەر گەڕەکێکیان کراوە و داتا و زانیارییەکانی سەرژمێرییە فەرمییەکانی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق (١٩٤٧-١٩٥٧) لەگەڵ واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتیی دانیشتوان و پەرەسەندنە دیمۆگرافییەکان لێکترگرێدراون.

**ڕێبازی توێژینەوە**: توێژەر بۆ گەیشتن بە دەرەنجامێکی باشتر و زانستییانەتر هەردوو ڕێبازی گێڕانەوەی مێژوویی و ڕێبازی ڕاڤەکاری پەیڕەو کردووە لە نووسینی توێژینەوەکەدا. چونکە بابەتە کۆمەڵایەتییەکان پێویستییان بە پاشخانی مێژوویی هەیە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەیان و هەڵوەستە لەسەرکردنیان.

**سەرچاوەکانی توێژینەوە**: بۆ ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە پشت بە چەند سەرچاوەیەکی زانستی و جێی باوەڕ بەستراوە بە زمانە جیاوازەکان. هەر لە بەڵگەنامە و بڵاوکراوە حکومییەکان و کتێب و وتار و توێژینەوەکان.

**دەروازە:**

مێژووی دروستبوونی شاری هەولێر و ئاوەدانی تیایدا، دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی دێرین. بەسەرهات و چیرۆکی ئاوەدانی و نیشتەجێبوون لەم شارەدا، بە هۆی کۆنی و دروستبوونی لە چاخە کۆنەکاندا، هەمەچەشنە و دیوی ڕاستییەکان بە ڕوونی تا ئێستا دەرنەکەوتووە. گرنگترین شوێنەوار و بەڵگەی نیشتەجێبوون و باری ئاوەدانی لەم ناوچەیەدا، گردی (قالینج ئاغا)یە بە دەربڕینی ئەمڕۆی ناوچەکە، کە لە مێژوویەکی زۆر دواتردا ئەم ناوەی لێنراوە. پاشماوەی بیناسازیی چەند خانوویەکی ئایینی و یەکەی نیشتەجێبوون و گۆڕستان، ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ گەشەی ئاوەدانیی قالینج ئاغا لە هەزارەی پێنجەم و چوارەمی پێش زایین (حوسێن، ٢٠١٩، ل١٦). هەر لەبەر ئەوەشە دەوترێت ناوی هەولێر پێش قەڵاکەی کەوتووە (اسماعیل، ١٩٧١، ص٦١). دواتر قەڵای هەولێر لەسەر گردێکی دەستکرددا، بە دووری یەك میل، لە گردی قالینج ئاغا بنیاتنراوە (حجارة، سومر، ١٩٧٠، ص٣١). قەڵاکە بە یەکێك لە شارە دێرینەکانی جیهان هەژمار دەکرێت، کە تا ئێستا زیندووە و لە دێرینیدا ڕۆچووە بەناخی مێژوودا، بە بەردەوامییش ئاوەدان بووە و پارێزگاری لە ناوە کۆنەکەی خۆی کردووە بە گۆڕانێکی کەم (زاخار، ١٩٩٥، ل٤٣).

گرنگی و بایەخی شاری هەولێر لە چاخە کۆنەکاندا کاتێك دەرکەوت، کە بووەتە مەڵبەندی خواوەندەکانی عەشتاری ئاشووری. لەو بەرەنجامەشدا بووەتە خاوەن پێگە و شوێنێکی پیرۆز و خاڵی بەیەکگەیشتنەوەی کاروانە بازرگانییەکان (لسترنج، ١٩٥٤، ص١٢٠؛ باقر و سفر، ١٩٦٦، ص٣). هەر لە قۆناغی مێژووی کۆندا، شارەکە ماوەیەك بووەتە پایتەختی شانشینی حەدیابی ئارامی (سترك، ١٩٣٣، ج١، ص٥٧١). ماوەیەکی زۆریش کەوتووەتە نێو قەڵەمڕەویی ئەو دەسەڵاتدارێتییانەی لە چیاکانی زاگرۆس دروستبوونە، وەك: گووتییەکان و کاشییەکان (باقر، ١٩٥٢، ج١، ص١٢٩-١٣٠)

لەو سەردەمە کۆنەیدا، شاری هەولێر لە ئەنجامی چەند هۆیەکی زانراو، خەڵکی تەنیا لەنێو شووره قایمەکانی شاردا (قەڵا)، نیشتەجێ ببوون و ژیانیان دەگوزەراند. قەڵا ئەو شوێنە ئارام و لەبارە بوو، خەڵکی بەرانبەر بە هەڕەشە و هێرشی دوژمنان وەك شوێن ژیانێکی لەبار، بە مەبەستی بەریگریکردن لەخۆ و خۆپارێزی لە

هێرشی داگیرکاری، لە دێر زەمانەوە تیایدا ژیاون. شاری هەولێر لە ئاکامی سروشتە تایبەتەکەی، بونیاتنانی لەسەر بەرزایی لە نزیك ناوچە شاخاوییەکان، بە درێژایی مێژوو، دەسەڵاتداران زۆرتر وەك بنکەیەکی سەربازی و کارگێڕی مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە (الزرکانی، ٢٠١٣، ص٥٣).

لە قۆناغی مێژووی ئیسلامیدا، شاری هەولێر دەگمەن نەبێت لە سەرچاوەکانی وڵاتناسان و گەڕیدە ئیسلامییەکان ناوی نییە. بە تایبەت لە سێ سەدەی سەرەتای مێژووی ئیسلامی. لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی و سەرەتاکانی سەدەی چوارەم (سەدەکانی نۆیەم و دەیەمی زایینی) ناوی هەولێر (اربل) لە سەرچاوەکاندا هاتووەتەوە بەرباس (ابن خرداذبە، ١٩٧١، ص٦).

شاری هەولێر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بە تایبەت لە سەدەکانی دوانزەیەم و سیانزەیەمی زایینیدا، شارێکی گەشاوە بووە و ڕۆڵێکی ژیاریی دیاری بەخۆوە بینیوە (حسین، ١٩٧٦، ص٢٩؛ حسین، ٢٠٠٦، ص٢٢). لەو ماوەیەدا کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتدارێتیی هۆزی هەزبانیی کوردی (محمود، ١٩٩٠، ص ص٤٠-٩٠). شاری هەولێر لە سەردەمی مەلیك موعەزەم موزەفەرەددین کۆگبەری (١١٩٠-١٢٣٣ز) گەشە و گەورەبوونێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە لەبەر ئەوەش لە لایەن هەندێك توێژەر و مێژوونووس بە سەردەمی زێڕینی شارەکە وەسفکراوە (سترك، ١٩٣٣، ج١، ص٥٧١).

لەو ڕۆژگارەدا، سەرباری قەڵا ئاوەدانیی زیاتر لە بەشی خوار قەڵا پەیدا بووە، کە لە دواتر پێی وتراوە (کورتەك). پاشماوە و شوێنەوارەکانی ئەو گەشە و گەورەبوونەی ئەو سەردەمە تا ئەمڕۆش دەتوانرێت وێنا بکرێت. شارەکە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ناوبراودا گەیشتە لووتکەی ئاوەدانی و پەرەسەندن، بە هۆی بەرقەراربوونی ئاسایش و بە پەرۆشیی فەرمانڕەوا بۆ ژیانی خەڵك (حوسێن، ٢٠١٩، ل٥٤). لە سەردەمێکی دواتردا، جارێکی دیکە باری ئاوەدانیی شارەکە، بە هۆی بێ خزمەتی و شەڕوشۆڕی زۆرەوە، کە بەسەر ناوچەکەدا هاتووە، ڕووەو کزی هەنگاوی هەڵگرتووە (علیاوەیی، ١٩٩٢، ص ص١٠٥-١١٥).

لە قۆناغی مێژووی نوێدا، دوای ئەوەی شاری هەولێر یەکێك لە قەڵا و شارەکانی میرنشینی سۆرانی پێکدەهێنا، لە سەدەی شانزەهەمدا پاش کوژرانی میری

سۆران (عیزەددین شێر) لە لایەن عوسمانییەکانەوە، ساڵی (١٥٣٥) شارەکە کەوتە نێو قەڵەمڕەویی دەوڵەتی عوسمانییەوە (البدلیسي، ٢٠٠١، ص ص٤٥٩-٤٦٠). بەپێی بەڵگەنامەکانی بەردەست، کە مێژووەکەی بۆ ساڵی (١٥٤٢) دەگەڕێتەوە، شاری هەولێر لە دەستپێکی حوکمڕانیی عوسمانیدا بە پێچەوانەی بۆچوونی سەرچاوە مێژووییەکان، ئاوڕی لێدراوەتەوە و لە رووی کارگێڕییەوە وەك ویلایەت مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، کە شاری هەولێر مەڵبەندی ویلایەتەکە بووە و دوو سنجەقیشی: (سنجەقی باجوانلو و سنجەقی هەریر و دوین) هەبووە. ژمارەی نێری دانیشتووانی شارەکە بریتیبووە لە (١٣٧٩) کەس، کە (٩٤٧) کەسیان موسڵمان و (١٧٣) کەسیان مەسیحی و (٢٥٩) کەسیان جوو بوونە. هەر بە گوێرەی ئەو بەڵگەنامەیە، شاری هەولێر لەو رۆژگارەدا لە هەشت گەڕەك پێکهاتووە (مراد، ٢٠١٥، ص ص١٨، ١١٤). پاش تێپەڕینی ماوەیەکی کەم، بە گوێرەی بەڵگەنامەیەك، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٥٤٤)، بارودۆخە کارگێڕییەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەولێر بووەتە سنجەقێك سەر بە ویلایەتی بەغدا و لە دواتریشدا، بەپێی بەڵگەنامەیەکی دیکە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٥٧٩)، هەولێر بووەتە پاشکۆی ویلایەتی شارەزوور، کە مەڵبەندی ویلایەتەکە شاری کەرکووك بووە (بیات، ٢٠٠٧، ص ص٢٩٦-٣٠٠، ٣٠٢، ٣٦٦).

ئەوەی لەو بەڵگەنامانە تێبینی دەکرێت، باری ئاوەدانی هەولێر لە خوار قەڵادا ئاوەدانە و هێشتا شارەکە شادەماری ژیانی تێدا لاواز نەبووە (مراد، ٢٠١٥، ص١١٤). تەنانەت گەڕیدەی ئەڵمانی (لیۆنهارد راووڵف)(LeonhardRauwolf) (١٥٣٥-١٥٩٦)، کە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٥٧٤)دا سەردانی شارەکەی کردووە، بە شارێکی گەورەی وەسف کردووە (راولف، ٢٠٠٨، ص٢٢٧). بەڵام لە سەدەکانی دواتردا، لە سایەی حوکمڕانیی عوسمانیدا، شارەکە بایەخی بە شێوەیەکی بەرچاو لەدەستدا. لەبەر ئەوەش جێی سەرنجی گەڕیدە و بیانییەکانی سەدەکانی حەڤدە و هەژدە و نۆزدەهەم نەبووە و بە شارێکی بچووك وەسفیان کردووە.

شاری هەولێر لە لایەن عوسمانییەکانەوە وەك قەزایەکی بچووکی فەرامۆشکراو مامەڵەیان لە تەکدا کرد. بایەخی پێویستیان، بە بەراوردکردن بە سەردەمە

مێژووییەکانی پێشتر، بە شارەکە نەدا (هروتی، ٢٠٠٨، ص٥٧). دەسەڵاتدارانی عوسمانی ئەوەندەی بە تەنگ کۆکردنەوەی باج و خەراجی ناوچەکە و لێسەندنی خاوە بوون لە دانیشتوان، نیو ئەوەندە لە خەمی پێشخستنی شارەکەدا نەبوونە. تەنانەت باشترین زەوییەکانی هەولێر لە لایەن عوسمانییەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرا و خرانە سەر لیستە دوورودرێژەکەی (موڵکەکانی هەمایۆنی)، کە بەناوی سوڵتانی عوسمانییەوە دەکران (قادر،گۆڤاری کاروان، ١٩٩٠، ص١١٦). شارەکە تا سەدەی نۆزدەهەم، بارێکی ئاواکاری پێشکەوتووی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینیوە کە شیاوی باس بێت.

بەپێی چەند زانیارییەك، باری ئاوەدانیی شاری هەولێر لە سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەسەندنی بەخۆوە بینیوە، (مونشی بەغدادی) کە ساڵی (١٨٢٢) سەردانی هەولێری کردووە، باری ئاوەدانی شارەکە بە بووژاوە وەسف دەکات و پێی وایە ماڵەکانی شاری هەولێر پێنج هەزار ماڵە، ئەوانەی سەر قەڵا هەزار ماڵ و ئەوانەی خوار قەڵاشی بە چوار هەزار ماڵ هەژمار کردووە (البغدادی، ١٩٤٨، ص ص٧٦-٧٩).

ئەم گەشەکردن و پەرەسەندنە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، لە رۆشنایی زانیارییە مێژووییەکانی ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ گەورەتر بەرچاو دەکەوێت. لەم رووەوە، دکتۆر جەبار قادر توێژینەوەیەکی زانستی و جێی بایەخی نووسیوە (قادر، گۆڤاری کاروان، ١٩٩٠). لە کۆتاییەکانی رۆژگاری عوسمانیدا، شاری هەولێر لە دوو بەشی سەرەکی پێکدەهات: قەڵا و خوارەوەی قەڵا، کە ئەمەی دواییان پێی دەوترا(کورتەك) (دەباغ، گۆڤاری هەولێر، ١٩٩٩، ل١٢٦). هەردوو بەشەکە بەسەر یەکەوە بریتیبوون لە حەوت گەڕەکی سەرەکی (حوسێن، ٢٠١٩، ل١٣٥). بەشی قەڵا، کە سێ گەڕەکی لەخۆ دەگرت، ئەمانە بوون: (سەرا، تۆپخانە و تەکیە).دانیشتوانیان بریتیبوون لە ئاغا و خاوەن موڵك و دەوڵەمەند و بازرگانەکان، واتە ئەریستۆکراتەکانی شار. بەشی کورتەك، بە نۆرەی خۆی لە چوار گەڕەك پێکدەهات: (تەعجیل یەهود، تەعجیل ئیسلام، عەرەب، خانەقا)، دانیشتوانیان بە زۆری لە کرێکاران و پیشەوەرەکان و جووتیارەکان پێکدەهات (رسول، ٢٠٠٥، ص٢٦-٢٧).

بە گوێرەی زانیارییەکانی یەکەم ساڵنامەی ویلایەتی مووسڵ، لەناو شاری هەولێردا ساڵی (١٨٩٠)، (١٨٢٢) خانوو هەبووە، کۆی دانیشتوانی شارەکە تەنها لە رەگەزی نێر بریتیبووە لە (٣٧٦٣) کەس (موصل ولایتی سالنامەسی، ١٨٩٠، ص١٤٣). ئەم بارودۆخە پاش تێپەڕینی زیاتر لە بیست و دوو ساڵ گۆڕانێکی گەورەی ئەوتۆی بەخۆوە نەدیوە، بەپێی زانیارییەکانی دوایین ساڵنامەی عوسمانی، لەناو شاری هەولێردا ساڵی (١٩١٢)، (١٨٢٢) خانوو هەبووە، بەڵام پەرەسەندنێکی سروشتی بەسەر ژمارەی دانیشتواندا هاتووە و بووە بە (١٤١٨١) کەس بە تێکڕای نێر و مێ (موصل ولایتی سالنامە رسمیسیدر، ١٩١٢، ص ص١٤٣، ٣٣٠-٣٣١). هۆکاری ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زانیارییەکانی ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ دژیەکی و خەملی نادروستی لەخۆ گرتووە ، لە لایەکی دیکەش ئەو ماوە مێژووییە بەوە دەناسرێتەوە کە ماوەی کزبوونی چالاکییە ئابوورییەکانی ناوچەکەیە لە سایەی حوکمڕانیی دەسەڵاتدارانی عوسمانی وەك دکتۆر جەبار قادر پەنجەی سەرنجی لەسەر داناوە (قادر، کاروان، ١٩٩٠، ص١١٧).

لە چوارچێوەیەکی گشتیدا، رەوتی پەرەسەندن و گەشەکردنی شارە کوردییەکانی کوردستانی باشوور، بە شاری هەولێریشەوە، لە راستیدا سست و لەسەرخۆ بوونە (حوسێن، ٢٠١٩، ل١٣٣). ئەوەش لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری تێکهەڵکێش، لەوانە: نەبوونی سەقامگیریی سیاسی و ئەمنی بووەتە هۆی قووتبوونەوەی لەمپەر لەبەردەم پەرەسەندنی کایەی بازرگانی و دروستبوونی مەڵبەندی گەورەی بازرگانی (حسین، ٢٠٠٦، ص٥١). هەروەها هەڵکەوتەی جوگرافی و شوێنی لە نەخشەی سیاسی و کارگێڕی هۆیەکی دیکە بووە بۆ گەورە نەبوونی شارە کوردییەکان بە شێوەیەکی گشتی، کە شاری هەولێریش شارێکی نزیك لە چەقی ململانێی سیاسی و سەربازییەکان پێکدەهێنێت، چ سەبارەت بە کێشمەکێشی عوسمانی-ئێرانی، یان سەبارەت بە شەڕوشۆڕی نێوخۆیی میرنشینە کوردییەکان بێت (عەبدولقادر، ٢٠٠٨، ل٣١-٣٤؛ حوسێن، ٢٠١٩، ل١٣٦).

گەشەکردن و گەورەبوونی شاری هەولێر و بووژانەوەی ئاوەدانی تیایدا، تا دوای کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە ناوچەکەدا (١٩١٨)، تا رادەیەك،

سروشتییە و وەك هەر شارێکی دیکەی ناوچەکە، ئەو هۆیانەی بوونەتە مایەی گەورەبوون و گەشەکردنی قەبارەی دانیشتوان و بەرفراوانبوونی پانتایی زەوییەکانی شار، هەمان ئەو هۆیانەن کە شوێن پەنجەیان لەسەر گەشەکردنی شارەکانی دیکەدا داناوە. ئەوەی لە رەوتی مێژوویی پەرەسەندن و گەشەکردن و گەورەبوونی شاری هەولێر تێبینی دەکرێت، ئەوەیە کە گەشەکردنی شار و بەرفراوانبوونی پانتایی زەوییەکانی بە چەند شێواز و ئاراستەیەکدا تێپەڕیوە. لە سەرەتادا بە ئاراستەی باشوور و رۆژئاوای قەڵادا گەشەی کردووە و دواتریش گردبوونەوەیەکی زۆر لە نزیك بازاڕەکانی شاردا روویداوە (یوسف، آفاق عربیة، شباط١٩٧٦، ص٢٢). دروستکردنی مزگەوتی موزەفەرییە لە لای باشووری رۆژئاوای شار (یوسف، ١٩٨٢، ص٤٤١) و بنیاتنانی بازاڕی قەیسەری لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم (البرادوستی، ٢٠١٣، ص٧٣) دوو نموونەی زیندوون بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونە.

دوای کۆتاییهاتنی حوکمڕانیی عوسمانی و لە سەردەمی پاشایەتی لە عیراقدا (١٩٢١-١٩٥٨)، شاری هەولێر لە ئاکامی چەند هۆیەکی جیاواز رووەو گەورە بوون و بووژانەوەی ئاوەدانی هەنگاوی هەڵگرت. پێویستە بوترێت پلانی بنەڕەتیی شاری هەولێر لە رووی نیشتەجێبوونەوە لە رۆژگاری پاشایەتی لە عیراقدا، بە هەمان شێوەی رۆژگاری عوسمانی، شارەکە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە: (قەڵا و کورتەك). بەڵام گەشە و پەرەسەندنێکی بەرچاو، بە بەراورد لەگەڵ رۆژگاری عوسمانیدا لێ هاتووەتە ئارا. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا، هەوڵ دەدەین بابەتییانە زانیارییە مێژووییەکانی پەرەسەندنی گەڕەکەکانی شاری هەولێر بخەینەڕوو.

### أ- قەڵای هەولێر:

قەڵای هەولێر گردێکە لە شێوەی هێلکەییدایە، بەرزیی لە ئاست رووی دەریاوە (٤٣٥) مەترە و لە ئاست زەوییەکانی دەوروبەری نزیکەی (٢٥) مەترە (آل مدرس، ٢٠٠٣، ص١٣). رووبەرەکەی بە نزیکەیی سەد و دوو هەزار مەتر دووجایە (الحیدری، ١٩٨٥، ص٦٤). وەك لە لاپەڕەکانی پێشەوەدا باسمان کرد و پەنجەی سەرنجمان خستە سەر، مێژووی بنیاتنانی قەڵا زۆر کۆنە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ

پێش هەزارەی سێیەمی پێش زایین (Ahmad, 2003, P.52). بەڵام ناوهێنانی لە تۆمارە مێخییەکاندا کەوتووەتە دوای ناوی قەڵای کەرکووك (وهبي بك، ٢٠٠٦، ج١، ص٢٤٧). قەڵای هەولێر بە یەکێك لە کۆنترین شارەکانی جیهان هەژمار کراوە، کە بەردەوام ژیانی تێدا بووبێت و لە بەرانبەر هەموو کۆسپ و بەرزونزمییەکانی ڕۆژگارە جیاوازەکان خۆڕاگر بووبێت (مکای، ١٩٦١، ص١٣٧).

قەڵای هەولێر لە ناوەڕاستی دەشتاییەکی فراواندا هەڵکەوتووە، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی گەورە و بچووکەوە. لە تێڕوانینێکی مێژووییدا، روون دەبێتەوە بە سێ قۆناغی جیا تێپەڕیوە: قۆناغی یەکەم قەڵا هەموو شاری پێکهێناوە، قۆناغی دووەم قەڵا بەشێکی گەورەی شار بووە و لە قۆناغی سێیەمیشدا بەشە بچووکەکەی شاری پێکهێناوە (الحيدری، ١٩٨٥، ص٦٢).

لە ماوەی دیاریکراوی لێکۆڵینەوەکەماندا، هەر وەك ڕۆژگاری پێشووی، قەڵای هەولێر لە سێ گەڕەکی سەرەکی پێکهاتووە: (سەرای، تۆپخانە و تەکیە). سەرەتا خاوەنی یەك دەروازەی سەرەکی بووە (دەرگەی گەورە) لە رووکاری باشووری قەڵا. بەڵام لە کۆتایی ڕۆژگاری عوسمانیدا دەروازەی دووەمیشیان لە ڕۆژهەڵات بۆ دروستکردووە، بەناوی دەرگەی گچکە یان (قولە). لە ڕۆژگاری پاشایەتی لە عیراقدا، دەروازەی سێیەمیان بە ناوی (ئەحمەدی)، لە رووکاری باکوور بۆ دروستکردووە (جاوشلی، ١٩٨٧، ل١١؛ عەبدوڵڵا، ٢٠٠٩، بەرگی شەشەم، ل٢٤٥٧).

هەر لەنێو گەڕەکە سەرەکییەکانی قەڵادا چەند گەڕەکێکی بچووك و لاوەکی هەبوون، کە لە لایەن دانیشتوانی قەڵاوە لەپای ناسینەوەدا داهێنرابوون و ناوی جیاجیایان لێنرابوو. وەك گەڕەکەکانی: گەڕەکی (اغا کوجاسی) کە زۆرینەی دانیشتوانی لە ئاغاکانی هەولێر بوونە بۆیە وای پێ وتراوە. ئەم گەڕەکە لەنێو گەڕەکی سەرەکی سەرایدا بووە. گەڕەکە لاوەکییەکانی تۆپخانە بریتیبوون لە: گەڕەکی (حرام کوجاسی) کە ماڵی قائیمقام و خانەی میوانداری تێدا بووە لەبەر ئەوە ئەم ناوەی لێنراوە. گەڕەکی (کلیسە کوجاسی) بە هۆی بوونی کەنیشتەی جووەکان ئەم ناوەی لێنراوە. گەڕەکی (حبیب نجار) بە هۆی بوونی گۆڕی کەسایەتییەکی ئەو گەڕەکە لەو شوێنە بەو ناوە نێوزەد کراوە. گەڕەکە لاوەکییەکانی تەکیە بریتیبوون لە: گەڕەکەکانی

(خرابا کوجاسی، داربورغ کوجاسی، امام کوجاسی، جامع کوجاسی، یدی قزلر کوجاسی) هەبوونە (صالح، ٢٠٠٤، ص ١٠-١١؛ قادر، ٢٠٠٨، ل٢٧).

دانیشتوانی قەڵا لە رووی نەژاد و نەتەوەییەوە هەمەچەشن بوون: (کورد، تورکمان، جوو، کلدان)، لە رووی ئایین و ئایینزاشەوە بە هەمان شێوە: (موسڵمانی سوننی، جوو (مووسەوی)، (مەسیحی) هەر یەکەیان شوێنی پەرستش و عیبادەتیان هەبووە بێ ئەوەی کێشەی گەورەیان لەگەڵ یەکدا هەبووبێت. بنەماڵە بەناوبانگەکانی قەڵا بریتیبوون لەمانە: گەڕەکی سەرا: (حاجی رەشید ئاغا، شێخ جەمیل ئەفەندی، فەتاح چاوڕەش، حاجی پیرداود ئاغای دزەیی، عەلی پاشای دۆغرەمەچی، خەلیفە فاتیمەخان، شێخۆ ئاغای عەبدوڵڵا ئاغا، یونس ئاغای سەعید ئاغا، مستەفا عوزێری و.. هتد). گەڕەکی تۆپخانە: (داوود ئاغای قەساب، عەبدولوەهاب ئاغای حیکمەت ئاغا، وەهاب حاجی ئەحمەد ئاغا، عەلی ئەفەندی، ساسانی ساڵح ئاغا، سەلیم کارەسوول، مەجید ئاغا، حاجی عوسمان حاجی ئەلیاس و..هتد). گەڕەکی تەکیە: (عەبدولڕەزاق ئاغا پیرداود ئاغا، موسا سەمەد، محەمەد مستەفا سەفار، توخمە سەعۆ، حاجی عوسمان نەجاڕ، حاجی نادر حاجی کەریم، مەلا یاسین ئەلیاس ئەفەندی و.. هتد) (بێخاڵی، گۆڤاری هەولێر، ١٩٩٩، ل ١٣٠-١٣٢؛ قادر، ٢٠١٣، ل٣١٢-٣١٣).

گەڕەکەکانی قەڵای هەولێر وەك هەر شارێکی دیکەی قۆناغی ئیسلامی، لە شەقامێکی بەرین و درێژ و خاوەن لق و پۆپی زۆر، کە بە کۆڵانی تەسك و پێچاوپێچ هەندێك جاریش داخراو دەناسرێتەوە، پێکهاتوون (السعدی، ٢٠١٣، ص١٨٠). سەبارەت بە شێوازی بیناسازی و خانووەکانیشی لەسەر شێوازی کۆنی رۆژهەڵاتییە، واتە هەبوونی حەوشەیەك لە ناوەڕاستی خانووەکە و چوار دەوری بە ژوور گیراوە. زۆربەی ئەو ژوورانەشی کە دەڕواننە سەر کۆڵان و شەقامەکان یان بێ پەنجەرەن یان خاوەن پەنجەرەی بچووکن، ئەوەش لەپێناو پاراستنی حورمەتی دانیشتوانی خانووەکە. باری ئاوەدانی و باڵەخانەکانی لە نێوان دۆخێکی مامناوەندی و خراپدا بوون (الحیدری، ١٩٨٥، ص ص٩٩-١٠٠).

### ١- گەڕەکی سەرای:

لەبەر ئەوەی سەرای حکومەتی تێدا بوو، بۆیە بەو ناوە نێوزەد کراوە (شارەوانی هەولێر، ١٩٨٥، ل١٢٨). هەروەها بە گەڕەکی ئاغاکانیش ناودەبردرێت، چونکە ئاغاکانی شار لەم گەڕەکە نیشتەجێببوون. کۆنترین گەڕەکەکانی قەڵا پێکدەهێنێت لە رووی مێژووییەوە، بە هەمان شێوەش گەورەترین پانتایی زەوی لەنێو گەڕەکەکانی قەڵای بەرکەوتووە، کەوتووەتە بەشی رۆژهەڵاتی قەڵا (السعدی، ٢٠١٣، ص١٧٩). ژمارەی ماڵەکانی ئەم گەڕەکە بەپێی خەمڵی ساڵی (١٩٢٢)، بریتیبووە لە (١٧٦) ماڵ (جامباز و بەرزنجی، ٢٠٠٦، ل٦٣-٨٨). بەڵام سەرچاوە فەرمییەکان بە تێپەڕینی ماوەیەکی کورت بەسەر ئەم خەمڵاندنە زانیارییەکی جیاوازتریان تۆمار کردووە، بەپێی تۆمارەکانی بەڕیوەبەرایەتی خانووبەرەی هەولێر ساڵی (١٩٢٩)، لە گەڕەکی سەرای هەولێر (٣٢٨) ماڵ هەبووە (عەبدولقادر، ٢٠١٢، ل٢٦). ئەم جیاوازییە لە ماوەی چەند ساڵێکدا شتێکی نەگونجاوە، لە کاتێکدا ئەوە بزاندرێت کە لە ماوەی نێوان تۆمارکردنی ئەو دوو زانیارییە رووداوێکی گەورەی کۆمەڵایەتی و قەیرانی نیشتەجێبوون لە شاری هەولێر رووی نەدابێت. بۆیە ئەم جیاوازییە، بە پلە یەك، بۆ وردنەبوونی ئەو خەمڵاندنانە دەگەڕێنینەوە کە لە کۆتایی رۆژگاری عوسمانی و دەستپێکی سەردەمی پاشایەتی ئەنجامدراون. لە پلە دوو، بۆ خۆشاردنەوەی دانیشتوان دەگەڕێتەوە لە هەر خەمڵ و سەرژمێرییەك کە ئەنجام دەدرا (جاوشلی، ١٩٨٧، ل١٢-١٣). هۆکاری ئەوەش ئەوەبوو کە لە رۆژگاری پێشوودا، لە سایەی خەمڵ و حیساب و کیتابدا، کاربەدەستانی عوسمانی زوڵم و ستەمێکی زۆریان دەرهەق بە دانیشتوان (رەعیەت) کردبوو، بۆیە دانیشتوان لە ترسا، خۆیان لە هەر خەمڵ و سەرژمێری و هەژمارکردنێك دەدزییەوە.

سەرباری خانووەکانی دانیشتوانی گەڕەکی سەرای، لەنێو ئەم گەڕەکەدا چەند تەلار و باڵەخانە و شوێنی عیبادەت و باخچە و گەرماو و گۆڕەپان هەبووە. زۆرینەی دامەزراوەکانی حکومەت لەم گەڕەکەدا بوون (جاوشلی، ١٩٨٧، ل١٥؛ قادر، ٢٠١٣، ل٣١٢).

**٢- گەڕەکی تۆپخانە:**

بە هۆی دانانی تۆپی عوسمانی و تەقەمەنی لەسەر لێواری قەڵا بەرانبەر بە ڕێگای مووسڵ ناوی ئەم گەڕەکە بەم شێوەیە ڕۆیشتووە (شارەوانی هەولێر، ١٩٨٥، ل١٢٨). ژمارەی ماڵەکانی ئەم گەڕەکە بەپێی خەمڵی ساڵی (١٩٢٢)، بریتیبووە لە (١٣٢) ماڵ (جامباز و بەرزنجی، ٢٠٠٦، ل١٤٠-١٦٢). بەپێی تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتی خانووبەرەی هەولێر ساڵی (١٩٢٩)، گەڕەکی تۆپخانە بووەتە (١٦٠) ماڵ (عەبدولقادر، ٢٠١٢، ل٢٧).

**٣- گەڕەکی تەکیە:**

لەبەر بوونی تەکیە و مەزاری شێخ ئیبراهیم (ئیبراهیم بابا) لەم گەڕەکە ناوی ئەم گەڕەکە بەم شێوەیە ناسراوە (قادر، ٢٠٠٨، ل٢٦). ژمارەی ماڵەکانی ئەم گەڕەکە بەپێی خەمڵی ساڵی (١٩٢٢)، بریتیبووە لە (٢١٢) ماڵ (جامباز و بەرزنجی، ٢٠٠٦، ل٩٤-١٣٢). بەپێی تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتی خانووبەرەی هەولێر ساڵی (١٩٢٩)، گەڕەکی تەکیە بووەتە (٢٥٢) ماڵ (عەبدولقادر، ٢٠١٢، ل٢٧).

لە ئەنجامی کۆکردنەوەی ژمارەی ئەو ماڵانەی لە گەڕەکەکانی سەر قەڵا ژیاون و نیشتەجێبوون، کە لە سەرەوەدا هاتووە، لە ماوەی بیست ساڵی پێش ئەنجامدانی یەکەم سەرژمێریی فەرمیی ڕاستەقینە لە عیراق لە ساڵی (١٩٤٧)دا، بۆمان دەردەکەوێت کە (٧٤٠) ماڵ لە گەڕەکەکانی سەرقەڵا نیشتەجێبوونە. ئەگەر تێکڕای ناوەندی ئەندامانی هەر خێزانێك بە پێنج ئەندام وەربگیرێت ئەوا ژمارەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی سەر قەڵا لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەم بریتیبووە لە (٣٧٠٠) کەس. خۆ ئەگەر تێکڕای ناوەندی ئەندامانی هەر خێزانێك بە شەش ئەندام وەربگیرێت و حسێب بۆ شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی و چەشنی تێڕوانینی کۆمەڵگەی ئەو ڕۆژگارە بکرێت، ئەوا ژمارەکە دەبێتە (٤٤٤٠) کەس. ئەم ژمارەی دواییان لە ڕاستییەوە نزیکترە بە بەراوردکردن لەگەڵ ئەنجامی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا. هەرچەندە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، سەرنج و تێبینیی زۆری لەبارەوە تۆمارکراوە (قادر، ٢٠١٩، ل٢٩-٤٩)، بەڵام وێنایەکی نزیك لە ڕاستییەوە دەداتە دەست.

لە سەرژمێریی فەرمیی ساڵی (١٩٤٧)دا گەڕەکەکانی قەڵا بە سێ گەڕەکی جیا تۆمار کراون. سەبارەتیش بە باری ئاوەدانی و چۆنیەتی شوێنی نیشتەجێبوون لە گەڕەکەکانی سەر قەڵا، سەرژمێریی ناوبراو زانیاریی وردی تۆمار کردووە. بەپێی ئەم سەرژمێرییە ژمارەی خانووەکانی قەڵا بریتیبووە لە (٥٤٦) خانوو، کە (٤٣٢٠) کەس ژیانیان تێدا گوزەراندووە. ئەوەش پەرەسەندنێکی نوێیە سەبارەت بە ئاوەدانیی گەڕەکەکانی قەڵا لە ڕووی چەندێتییەوە بە بەراورد بە زانیارییە تۆمارکراوەکانی ساڵی (١٩٢٩)ی بەڕێوەبەرایەتی خانووبەرەی هەولێر. بڕوانە خشتەی ژمارە (١).

**خشتەی ژمارە (١)**

**پۆلێنکردنی گەڕەکەکانی قەڵا بەپێی چەشنی خانووەکان و چڕی دانیشتوان لە ساڵی (١٩٤٧)دا**

| ز | ناوی گەڕەك | ژمارەی دانیشتوان | کۆشك و خانووی یەك خێزانی | | زیاتر لە یەك خێزان لە خانوویەکدا | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژ. خێزان | ژ. کەس | ژ. خانوو | ژ. خێزان | ژ. کەس |
| ١ | سەرای | ١٥٩٦ | ١٦٢ | ١٠٢٤ | ٤٣ | ١٣١ | ٥٥٧ |
| ٢ | تەکیە | ١٥٦٣ | ١٤٨ | ٨٨٠ | ٢٣ | ١٤٧ | ٦٦١ |
| ٣ | تۆپخانە | ١١٦١ | ١٣٢ | ٧٢٤ | ٣٨ | ٩٧ | ٤٢١ |
| کۆی گشتی | | ٤٣٢٠ | ٤٤٢ | ٢٦٢٨ | ١٠٤ | ٣٧٥ | ١٦٣٩ |

**سەرچاوە: (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤)**

ئەوەی لە خشتەی سەرەوەدا جێی تێبینییە، ئەوەیە کە ژمارەی ئەو خێزانانەی بە تەنها لە کۆشك و خانوودا ژیان دەگوزەرێنن زۆر زیاترن لەو خێزانانەی کە لەگەڵ خێزانێکی دیکە و دووان لە یەك خانوودا نیشتەجێن. بەم پێودانە دەبینین لە (٥٤٦)ی کۆی گشتیی خانووەکانی قەڵا، (٤٤٢) خانوویان لەوانەن کە خێزان بە تەنها و بە شێوەیەکی سەربەخۆ تیایدا دەژین، کە ژمارەی دانیشتوانیان گەیشتووەتە (٢٦٢٨)

کەس، یان بەرانبەر بە (٥.٩) کەس بۆ هەر خانوویەك. ژمارەی دانیشتوانی ئەو خانووانەی کە زیاتر لە یەك خێزان تیایدا دەژین، وەك لە خشتەکەدا روونکراوەتەوە، بریتییە لە (١٦٣٩) کەس، لە کۆی (١٠٤) خانوو. ئەمەش بە واتای (١٥.٧) کەس بۆ هەر خانوویەك دێت. بە گشتیش تێکڕای چڕیی دانیشتوان بۆ خانووەکانی قەڵا خۆیداوە لە (٧.٨) کەس بۆ هەر خانوویەك.

لە خشتەی ژمارە (١)دا ئەوەش بە روونی دەردەکەوێت کە گەڕەکی (سەرای) پێشەنگی گەڕەکەکانی گرتووە لەڕووی بوونی خانووی یەك خێزانی و پاش ئەویش لە پلەی دووەمدا گەڕەکی (تەکیە) دێت ئینجا گەڕەکی (تۆپخانە) بە پلەی سێیەم. هەرچیش سەبارەت بە کۆبوونەوەی ڕێژەی زۆرتری ئەو گەڕەکانە بێت کە لە خانوویەکدا زیاتر لە یەك خێزان ژیانی تێدا دەگوزەرێنن، گەڕەکی (تۆپخانە) بە پلە یەك دێت، دوای ئەویش گەڕەکی (سەرای) و گەڕەکی (تەکیە) بە پلەی دووەم و سێیەم دێن.

هەر لە سەرژمێرییەکانی ساڵی (١٩٤٧)دا ئەوەشمان بۆ روون دەبێتەوە، کە (١٣) دامەزراوەی حکومی لەسەر قەڵا هەبوونە و هەموویان لە گەڕەکی سەرای کۆبوونەتەوە. ئەوەش لە کاتێکدایە کە ئەو گەڕەکە هیچ دامەزراوەیەکی ئەهلی و ئایینی تێدا نەبووە. لە بەرانبەردا گەڕەکی تەکیە (٣) دامەزراوەی ئەهلی و (١٧) دامەزراوەی ئایینی تێدا هەبووە. گەڕەکی تۆپخانەش هیچ دامەزراوەیەکی ئەهلی تێدا نەبووە. بەڵام (١٦) دامەزراوەی ئایینی لێبووە. سەبارەت بە قوتابخانە لە گەڕەکەکانی سەر قەڵا، سەرژمێرییەکانی ساڵی (١٩٤٧) ئەم زانیارییانەی تۆمار کردووە: گەڕەکی سەرای (١) قوتابخانە، گەڕەکی تەکیە (٢) قوتابخانە، لە گەڕەکی تۆپخانەش هیچ قوتابخانەیەك تۆمار نەکراوە (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤). لە دووەم سەرژمێریی فەرمی ساڵی (١٩٥٧)دا، هیچ گۆڕانێك بەسەر ژمارەی گەڕەکەکانی قەڵادا نەهاتووە.

**خشتەی ژمارە (٢)**

**ژمارەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی قەڵا لە نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا.**

| ز | گەڕەك | ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی ١٩٤٧ | ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی ١٩٥٧ | جیاوازیی زۆر وکەمی (+ ، -) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | سەرای | ١٥٩٦ | ٢٦١٩ | + ١٠٣١ |
| ٢ | تەکیە | ١٥٦٣ | ١٤٠١ | - ١٥٩ |
| ٣ | تۆپخانە | ١١٦١ | ١١٠٨ | - ٥٣ |
| کۆی گشتی | | ٤٣٢٠ | ٥١٢٨ | + ٨١٩ |

**سەرچاوە: (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤؛ المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي الموصل وأربيل، ص٢١٧)**

لە خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت گۆڕانکارییەکی گەورەی ئەوتۆ لە ژمارەی دانیشتوان و چڕی دانیشتوانی گەڕەکەکانی قەڵا لە ماوەی نێوان دوو سەرژمێرییە فەرمییەکەدا (١٩٤٧-١٩٥٧) نەهاتووەتە ئارا. تەنیا ئەوە نەبێت کە پەرەسەندنێکی بەرچاو بە بەراورد بە گەڕەکەکانی دیکە لە گەڕەکی سەرای هاتووەتە ئارا. وەك دەردەکەوێت گەڕەکی سەرای بە لۆجیکی پەرەسەندنی کۆمەڵگەکان بە شێوەیەکی سروشتی پەرەی سەندووە. کەچی گەڕەکەکانی دیکە پێچەوانەی لۆجیك و سروشتی گەشەکردن، لە پاشەکشێدا بوونە و ژمارەی دانیشتوانیان کەمی کردووە لە بری ئەوەی زیاد بکات. هۆی ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دانیشتوانی گەڕەکەکانی سەر قەڵا، بە تایبەت چینە دەسترۆیشتوو و دەوڵەمەندەکانیان، لە ساڵی (١٩٣٥) بەدواوە، وەك سەرچاوەیەکی ئاگادار پەنجەی سەرنجی لەسەر داناوە، لە قەڵا هاتوونەتە خوار و لە گەڕەکە نوێیەکانی خوار قەڵا نیشتەجێ بوونە (جاوشلی، ١٩٨٧، ل١٢)، کە ئەو گەڕەکە نوێیانە و لەگەڵ پێگەی ئابووری و کۆمەڵایەتییان گونجاوتر بووە. ئەو ڕۆژگارە خەڵکی وەك دیاردەیەکی مۆدێرن لە پشت شوورە و لە قەڵاکان دوورکەوتوونەتەوە.

**ب- گەڕەکەکانی بەشی کورتەك:**

ئەم بەشەی شاری هەولێر بە وردی نازاندرێت لە چ سەردەم و مێژوویەکدا بنیاتنراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە چەندین سەرچاوەی مێژوویی و لە میانەی نووسین و یادداشتنامەی گەڕیدە بیانییەکانەوە ئاماژەی پێدراوە. بەپێی هەندێك سەرچاوە مێژووی دروستبوونی ئاوەدانی لە خوارەوەی قەڵا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست و بە تایبەتی سەردەمی زێڕینی شارەکە (سترك، ۱۹۳۳، ج۱، ص۵۷۱؛ اسماعیل، ۱۹۷۱، ص۱۷٦). لە بەڵگەنامە عوسمانییەکانی سەدەی شانزەهەمیشدا، گەڕەکەکانی خوار قەڵا ئاوەدان بووە (مراد، ۲۰۱۵، ص۱۱٤). کەچی دواتر هەندێك لە گەڕیدەکان، کە لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا سەردانی شارەکەیان کردووە، ئاماژەیان بۆ بوونی ئاوەدانی لە خوار قەڵا نەکردووە. ئەوەش پێدەچێت لەبەر ئەوە بووبێت کە ئەو شارە وەك زۆربەی شارەکانی دیکەی ناوچەکە زۆرجار دووچاری قەیرانی سەربازی و ئابووری هاتبێت و کەوتبێتە بەر شاڵاوی لەشکری ئێرانی (سەفەوی و ئەفشاری)، لەو بەرەنجامەشدا زۆرێك کاولکاری هاتبێتە ئارا و ئاوەدانی لەو بەشەی شاردا نەمابێت (هروتی، ۲۰۱۲، ص ص۱۱-۸۷)، یان زۆر کز و کەم بایەخ بووبێت و شیاوی سەرنجی گەڕیدەکان نەبووبێت.

ئەم بەشەی شار لەبەر گرنگیی پێگە ئابوورییەکەی و لەخۆگرتنی بازاڕ، لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە فراوانتر و چڕی دانیشتوانی بە بەراورد بە قەڵا زۆرتر بووە. قەڵا کاریگەری لەسەر شێوە و ئاراستەی هەڵکەوتنی گەڕەکەکانی بەشی کورتەك داناوە، بە شێوەی بازنەیی و لە رووی باشوور و رۆژهەڵاتییەوە ئەو گەڕەکانە دروستبوونە (آل مدرس، ۲۰۰۳، ص٤٧)، ئەوەش بە هۆی شێوەی نیمچە بازنەیی قەڵا و دوور و نزیکی لە دەروازەی سەرەکیی قەڵاوە، کە دەیڕوانیە بەشی باشوور. لەبەر ئەوە ئەو گەڕەکانەی لە خوار قەڵا دروستبوونە بە شێوە بازنەیی فراوانبوونە و چڕی نیشتەجێبوونیش لە رووکاری باشووری خوار قەڵا کۆبۆتەوە. هەڵکەوتنی گەڕەکەکانی بەشی کورتەك و شێوازی دروستکردنی خانووەکانیان، جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ چەشنی بنیاتنانی خانووەکانی قەڵادا نییە. هەر بەو شێوازە کۆنەی خانوو دروستکردن: خشتی سوور (کەرپووچ) و قوڕ و

گەچی تێدا بەکارهێنراوە. هەندێك لە خانووە نوێیەکانی ماوە لێکۆڵینەوەکە نەبێت کە چیمەنتۆیان لەجیاتی قوڕ بەکارهێناوە (الحیدری، ١٩٨٥، ص١٠٥). بە هەمان دەستووریش وەك زۆربەی شارە کۆنەکانی ناوچەکە، لەپای بەهێزبوونی لایەنی بەرگری، خانووەکان لەپاڵ یەکدا هەڵچنراون و خاوەنی کۆڵانی پێچاوپێچ و تەنگەبەرن (آل مدرس، ٢٠٠٣، ص٥١). بە گوزارشتێکی دیکە خانووەکانی بەشی کورتەك لەسەر چەشنی وێکچوو بە شێوازی بیناسازیی عەبباسی دروستکراون، کە لە شێوەی قەڵایەکی پارێزراو دێنە بەرچاو، زۆربەشیان ژوورەکانیان تاریك و خاوەن پەنجەرەی بچووکن تاوەکو لە رووداوی دزی بەدوور بن (الحسني، ١٩٢٥، ص١٥٢).

بە گوێرەی سەرچاوەیەکی جوگرافیی تایبەتمەند، یەکەمین گەڕەك کە لە خوارەوەی قەڵا دانیشتوانی هەولێر دروستیان کردبێت و تیایدا نیشتەجێ بووبن بریتیبووە لە گەڕەکی خانەقا (الجنابی، ١٩٨٧، ص٧٥). زۆربەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان و نووسینەکانی دیکە لەم بارەوە پشتیان بەو سەرچاوەیە بەستووە (قادر، ٢٠٠٨، ص٢٧؛ عەبدولقادر، ٢٠١٢، ص٢٧). بەڵگەی توێژەرە جوگرافییەکە رەنگە ئەوە بێت کە کاتی خۆی مەلیك موعەزەم موزەفەرەددین کۆگبەری (١١٩٠-١٢٣٣ز) لە شاری هەولێر چوار خانەقای دروستکردووە، پەیدابوونی ئاوەدانیش لە گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵا هاوکات بووە لەگەڵ ئەم رووداوە، بۆیە بە هۆی لێك نزیکی ناوی گەڕەکەکە لەو کارەی ناوبراو و لێکترگرێدانی رووداوەکان. لە کاتێکدا هەندێك توێژەری دیکە پێیانوایە کە یەکەم گەڕەك کە لە خوارەوەی قەڵا دروستکرابێت بریتییە لە گەڕەکی عارەبان (عەرەب). هەروەها هەندێك توێژەری دیکە پێیانوایە گەڕەکی تەعجیل یەکەم گەڕەك بێت کە لە خوارەوەی قەڵا ئاوەدانی لێ پەیدا بووبێت، بە تایبەت کە لە بنەڕەتدا دانیشتوانی ئەو گەڕەکە بریتیبوونە لە جووەکانی شار، ئەو جووانەی لە سەبیی بابلی راپێچی ئەم شارە کرابوون و مێژووی نیشتەجێبوونیان لە شارەکە بۆ مێژوویەکی دێرین دەگەڕێتەوە (آل مدرس، ٢٠٠٣، ص٤٧).

ئێمە وای نابینین کە یەکەم گەڕەك لە خوار قەڵا دروستکرابێت گەڕەکی تەعجیل بێت، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی جووەکان کەمینەیەکی بچووك بوونە لەنێو کۆمەڵگەی ناوچەکە لەو رۆژگارەدا، لە لایەکی دیکەش هۆی خۆپارێزیی بەهێزیان

نەبووە بەرانبەر بەو شاڵاوە داگیرکارییانەی کراونەتە سەر شارەکە بە درێژایی سەردەمە مێژووییە جیاوازەکان. لە لایەکی دیکەش ئەمە لەگەڵ لۆجیکی چالاکییە ئابوورییەکانی جووەکان پێچەوانەیە، چونکە ئەوان خەریکی کاری بازرگانی و پشەوەری بوون لەناو شاری هەولێردا، بازرگانیکردنیش پەیوەستە بە سەقامگیری و بوونی ئاسایش کە ئەو رۆژگارە شوورەی قەڵاکان ئەمەیان لە ئەستۆ گرتبوو. راستە جووەکانی عیراقیش بە شێوەیەکی گشتی، بە تایبەت لە شارەکاندا، هەر لە شێوەی کۆمەڵگەی باوی خۆیان بە شێوەی (گیتۆ) ژیاون، کە لە وڵاتی عیراقدا بە گەڕەك ناسراوە، بەڵام رێی تێناچێت کەنیشتەیان (سیناگۆگ) لەسەر قەڵا بووبێت و خۆیان لە دووری شوێنی پەرستیشیان ژیانیان گوزەراندبێت. لە سەرووی هەموو ئەوانەشەوە، هیچ گەڕیدەیەك یان سەرچاوەیەکی مێژوویی ئەم بابەتەی پشتڕاست نەکردۆتەوە. تەنانەت ئینسایکلۆپیدیای تایبەتی جووەکان بەناوی (جودااییکا) بە وردی باسی بارودۆخی جووەکانی شاری هەولێری کردووە لە کۆنەوە تا ساڵی (١٩٥٠) و چەند یادداشتی گەڕیدە جووەکانی سەدەی شانزەهەم تا نۆزدەهەمی بەکار هێناوە، بەڵام ئاماژەی بەم بابەتە نەکردووە (Ashtor, 2007, Vol. 10, P.24-25).

هەرچۆنێك بێت، باری ئاوەدانی لە ناوچەکانی خوارەوەی قەڵادا، لە رۆژگاری پاشایەتیدا، ساڵ دوای ساڵ لە برەودا بووە، ئەوەش لە ئاکامی چەند هۆیەکی زانراو، لەوانە: زێدەبوونی سروشتییانەی ژمارەی دانیشتوانی قەڵا و نەبوونی رووبەر و پانتایی گەڕەکەکانی قەڵا بۆ لەخۆگرتنی ژمارەی زیاتر. دابینبوونی ئەمن و ئاسایش لە ناوچەکە، ئەوەش کاریگەریی کۆمەڵایەتی دیاری بەدوای خۆیدا هێنا و خەڵکی هاندا بۆ بێ پەروا لە گەڕەکەکانی خوار قەڵا خانوو دروست بکەن. گۆڕانە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکان و کاریگەرییان بەسەر کۆمەڵگەی شاری هەولێر لە ئاکامی گۆڕانی ژێرخانی ئابووری. ئەوەش بە نۆرەی خۆی رۆڵی هەبوو لە گۆڕانی تێڕوانینی دانیشتوان بۆ چەمکی بیناسازی. نەبوونی یاخود کەمیی خزمەتگوزارییەکان لە گەڕەکەکانی سەر قەڵا هۆیەکی دیکە بوو بۆ ئەوەی دانیشتوان روو لە گەڕەکەکانی بەشی کورتەك بکەن. هەروەها زۆربوونی رێژەی کۆچکردنی ناوخۆیی لە لایەن هۆزەکانی دەوروبەری شارەوە بەمەبەستی نیشتەجێبوون لە ناو شاردا هۆیەکی دیکە

پێکدەهێنێت لە بووژانەوەی گەڕەکەکانی بەشی خوارەوەی قەڵا (الحيدري، ١٩٨٥، ص ص٧٦-٧٨؛ قادر، ٢٠١٣، ل٣١٤).

گەڕەکەکانی کورتەك، لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا. لەم گەڕەکە سەرەکییانە پێکدەهات:

**١- گەڕەکی خانەقا:**

مێژووی ئەم گەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەتابگەکان (**١١٢٨-١٢٣٣ز**). ناوەکەشی بۆ مزگەوتی خانەقا دەگەڕێتەوە کە دەکەوێتە رۆژئاوای گەڕەکەکە (شارەوانی هەولێر، ١٩٨٥، ل١٢٩؛ عەبدولقادر، ٢٠١٢، ل٢٧). گەڕەکی خانەقا دەکەوێتە بەشی باشووری رۆژهەڵاتی قەڵا. لە دیارترین بنەماڵە و ناسراوانی ئەم گەڕەکە بریتیبوون لەمانە: جامبازەکان، زێڕنگەرەکان، قەسابەکان، سەوزەچی (قادر، ٢٠١٣، ل٣١٤).

**٢- گەڕەکی عارەبان:**

ئەم گەڕەکە دەکەوێتە بەری رۆژئاوای قەڵاوە. سنووری گەڕەکەکە لە پشت باڵەخانەی کۆنی موتەسەڕیفیەت (واتە باڵەخانەی قائیمقامیەتی هەولێر، کە دەکەوێتە بەرانبەر باڵەخانەی پارێزگا) دەستی پێدەکرد، درێژ دەبۆوە بۆ بازاڕی گەورە. وەکو دیکەش لە نزیك مزگەوتی شێخی چۆلی دەستی پێدەکرد تا سنووری گەڕەکی تەعجیل (بێخاڵی، ١٩٩١، ب١، ل٤٦). ئەم گەڕەکە لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری هەولێرە و ناوەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەگەڵ دروستبوونی گەڕەکەکەدا ژمارەیەك بنەماڵەی عەرەب تیایدا نیشتەجێ بوونە، کە بە کاری نانەواییەوە خەریك بوونە (بابان، ١٩٨٩، ج١، ص١٩؛ رسول، ٢٠٠٥، ص٢٥). زۆرینەی ئەو عەرەبانەی لە گەڕەکەکەدا نیشتەجێبوونە لە یەك کۆڵانی دیاریکراو گیرساونەتەوە، بۆیە کۆڵانەکەش ناوی نەژادی ئەوانی هەڵگرتووە (کۆڵانی عارەبان) (شارەوانی هەولێر، ١٩٨٥، ل١٣٠). هەر لەم گەڕەکەدا، چەند ماڵە مەسیحییەك نیشتەجێبوونە و کڵێسایەکیشیان لە گەڕەکەکەدا هەبووە بەناوی کڵێسای (قلب الاقدس) (شەقڵاوەیی، ٢٠٠٩، ب٦، ل٢٣٥٦). لە کۆتاییەکانی رۆژگاری عوسمانییەوە تا ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکە، شوێنی گەڕەکی سەرای گرتۆتەوە لە گرتنەخۆی دامەزراوە فەرمییەکانی حکومەت، وەك: (سەرای و ماڵی موتەسەڕیف و قشڵە و پۆلیسخانە و بەندیخانە) (الجنابي، ١٩٨٧، ص٧٠).

**٣- گەڕەکی تەعجیل:**

ئەم گەڕەکە دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژئاوای قەڵاوە، بە تەنیشت گەڕەکی عارەبانەوە بوو، لە بنەڕەتدا دانیشتوانی لە جووەکان پێکدەهات، بەڵام لە ڕۆژگاری دواتردا، بەشێك لە موسڵمانەکانیش لەپاڵ ئەم گەڕەکە نیشتەجێبوون، بۆیە بوو بە دوو بەشەوە. لەنێو دانیشتوان و دامەزراوەکانی حکومەتدا لەپای ناسینەوە، ناوی گەڕەکی (تەعجیل یەهود و تەعجیل ئیسلام) داکەوتووە. هەر لەبەر ئەوەش لە نووسراوە فەرمییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتیدا بەو بەشەی کە جووەکانی تێدا نیشتەجێببوون وتراوە تەعجیل یەهود، کە زۆربەی دانیشتوانی ئەم بەشەی گەڕەکەکە خەریکی کاری بازرگانی و زێڕنگەری و چنین بوونە. هەروەها ئەو بەشەی موسڵمانەکانی تێدا نیشتەجێببوون وتراوە (تەعجیل ئیسلام). ئەم بەشەی دواییان دەکەوتە بەشی ڕۆژهەڵاتی بەشەکەی دیکەیان. درێژ دەبۆوە تا دەگەیشتە پشت باڵەخانەی بانکی ڕەشیدی ئەمڕۆ یان باڵەخانەی کۆنی فەرمانگەی کارەبا (رسول، ٢٠٠٥، ص٢٥-٢٦). ناوی گەڕەکەکە بۆ ناوی کەسایەتییەکی ئایینی دەگەڕێتەوە بەناوی (ئیمام تەعجیل)، کە تا ئێستا مەزاری ئەو کەسایەتییە بوونی لە گەڕەکەکەدا ماوە (قادر، ٢٠١٣، ل٣١٦). قەبارەی نیشتەجێبوون لەم گەڕەکەدا، بەپێی خەمڵی ساڵی (١٩٢٩)، بەم شێوەیە بووە: تەعجیل یەهود (١٥٤) ماڵ، تەعجیل ئیسلام (١٧٢) ماڵ (عەبدولقادر، ٢٠١٢، ل٢٨).

**٤- گەڕەکی سەعدووناوە:**

ئەم گەڕەکە لە گەڕەکە نوێیەکانی شاری هەولێر بووە، سنوورەکەی لە تەنیشت گەڕەکی تەعجیلەوە درێژ دەبۆوە بۆ وێستگەی کۆنی شەمەندەفەر، زۆربەی دانیشتوانی ئەم گەڕەکە بە هۆی نزیکی شوێنەکەیان لە بەست و باخچەی گلکەند بە پیشەی کوورەچێتییەوە خەریکبوونە. ناوەکەشی بۆ کەسایەتییەك بەناوی (سەعدوون) دەگەڕێتەوە، کە ئەم گەڕەکەی ئاوەدانکردۆتەوە، یان بۆ بوونی مەزاری پیاوچاکێك لە گەڕەکەکە دەگەڕێتەوە بە ناوی (سەعدوون) (حەسەن، ٢٠٠٩، ب٦، ل٢٦٥٥). قەبارەی نیشتەجێبوون لەم گەڕەکەدا، بەپێی خەمڵی ساڵی (١٩٢٩)، بریتیبووە لە (٨٤) ماڵ (عەبدولقادر، ٢٠١٢، ل٢٨). ئەوەش مێژووی پەیدابوونی ئەم گەڕەکە روون دەکاتەوە، کە خاوەن مێژوویەکی نوێیە.

ئەم گەڕەکە لە سەرژمێرییە فەرمییەکەی ساڵی (١٩٤٧)دا ناوی نییە و وەك گەڕەکێك مامەڵەی لەگەڵدا نەکراوە. لە شوێنی ئەو بەرپرسانی فەرمانگەی ئامار، ناوی کەرتێکی نیشتەجێبوونی دیکەیان بەناوی (سەربازگەی سوپا و پۆلیس) نووسیوە و داتا و زانیارییەکانیش پەیوەندی بە گەڕەکی سەعدووناوەوە نییە. لە دووەم سەرژمێریی فەرمیدا، ساڵی (١٩٥٧)، سەعدووناوە وەك گەڕەکێکی سەربەخۆی شار حسێبی بۆ کراوە و زانیارییان لەسەر کۆکردۆتەوە.

**٥- گەڕەکی مستەوفی:**

یەکەم گەڕەکە لە بەشی باکووری قەڵاوە دروست ببێت. مێژووی پەیدابوونیشی نوێیە، دەگەڕیتەوە بۆ ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم (آل مدرس، ٢٠٠٣، ص٤٧)، بەڵام وا دەردەکەوێت دەسەڵاتدارانی شار تا ساڵی (١٩٣٩) حسێبی شوێنێکی ئاوەدانیان بۆ نەکردبێت، بەوپێیە تا ئەو ساڵە خاوەن موختاری تایبەتی خۆی نەبووە، لەو ساڵەدا بەپێی تۆمارەکانی تاپۆی هەولێر (محەمەد حاجی جەرجیس) کراوەتە موختاری ئەم گەڕەکە (قادر، ٢٠١٣، ل٣١٧).

**٦- گەڕەکی سەیداوە:**

نوێترین گەڕەکەکانی شاری هەولێرە لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا، کەوتۆتە بەشی باشووری رۆژهەڵاتی قەڵاوە. مێژووی پەیدابوونی ئاوەدانی تیایدا دەگەڕێتەوە بۆ چلەکانی سەدەی بیستەم. ناوی گەڕەکەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەسایەتییەك بەناوی (سەید عەبدولقادر سەید عەزیزی هەرەجەیی)، کە لە کۆتایی چلەکانی سەدەی بیستەم لەم گەڕەکە ژیاوە و خەڵکیش لەبەر بەرەکەت و گەورەیی ئەم سەیدە لە دەوری کۆبوونەتەوە. خاوەن موڵکەکان بە نرخێکی هەرزان زەوی خۆیان فرۆشتووە بە مەبەستی ئاوەدانکردنەوەی ئەم گەڕەکە (شارەوانی هەولێر، ١٩٨٥، ل١٣٤). ئەم گەڕەکە لە سەرژمێرییە فەرمییەکەی ساڵی (١٩٤٧)دا ناوی نییە، چونکە لە سەرەتای دروستبوونیدا بووە، بۆیە وەك گەڕەکێك مامەڵەی لەگەڵدا نەکراوە. لە دووەم سەرژمێریی فەرمیدا، ساڵی (١٩٥٧)، وەك گەڕەکێکی سەربەخۆی شار حسێبی بۆ کراوە و زانیارییان لەسەر کۆکردۆتەوە.

ئاوەدانی لە بەشی گەڕەکەکانی خوار قەڵا، وەك لە سەرژمێریی فەرمی ساڵی (١٩٤٧)دا تۆمار کراوە، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژگاری پێشتردا، گەشەکردنێکی دیاری بەخۆوە بینیوە. سەرباری بووژانەوەی زیاتری گەڕەکە کۆنەکانی وەك: (خانەقا و عارەبان و تەعجیل) و پەیدابوونی ڕێژەیەکی گەورەی یەکەی نیشتەجێبوون تیایاندا، گەڕەکی نوێش لە دەوروبەری گەڕەکە کۆنەکان پەیدا بووە لە نموونەی گەڕەکی (مستەوفی). بە گوێرەی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی گەڕەکەکانی شاری هەولێر بریتییە لە هەشت گەڕەك، کە گەڕەکی تەعجیل کراوە بە دوو بەشی جیاوە: (تەعجیل یەهود و تەعجیل ئیسلام).

بە وردبوونەوە لە زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە کاربەدەستانی ئەو ڕۆژگارەی عیراق مامەڵەیەکی ئایینیان لەگەڵ گەڕەکەکاندا کردووە. گردبوونەوە و پێکهاتە ئایینییەکانی گەڕەکی تەعجیلیان وەك بنەما و بنەڕەتێك وەرگرتووە بۆ کۆکردنەوە و تۆمارکردنی زانیارییەکانی سەرژمێرییەکە. بە واتایەکی دیکە، سەرژمێرییەکە دانیشتوانی بەپێی ئایین پۆلێن کردووە. هەر لەبەر ئەوەش ناوی گەڕەکی تەعجیلیان بۆ پێکهاتە ئایینییەکەیان گەڕاندووەتەوە و دابەشکردووە (عبدالرحمن، ٢٠١٢، ل٤٤).

وەك لە خشتەی ژمارە (٣)دا خراوەتەڕوو، گەڕەکی تەعجیل ئەگەر بە یەك گەڕەك هەژمار بکرایا و لێکجودا نەکرایەتەوە، لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە گەورەترین گەڕەکی شاری هەولێر دەبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی بە دوو گەڕەکی جیای نیشتەجێبوون دراونەتە قەڵەم، بۆیە پلەی دووەمی لە دوای گەڕەکی عارەبان لە ڕووی زۆری ژمارەی دانیشتوانەوە بەرکەوتووە. بەپێی ئەو زانیارییانە بێت، کە فەرمانگەی ئامار و سەرژمێری تۆماریان کردووە و لە خشتەی ژمارە (٣) هاتوون، ژمارەی خانووەکانی هەر پێنج گەڕەکەکەی خوارەوەی قەڵا بریتیبووە لە (١٩١٧) خانوو، تێکڕای دانیشتوانیان گەیشتووەتە (٢١١٦٧) کەس.

**خشتەی ژمارە (٣)**
**پۆلێنکردنی گەڕەکەکانی خوار قەڵا بەپێی چەشنی خانووەکان و**
**چڕی دانیشتوان لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا**

| ز | ناوی گەڕەك | ژ. دانیشتوان | کۆشك و خانووی یەك خێزانی | | زیاتر لە خێزان لە خانوویەکدا | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژ. خێزان | ژ. کەس | ژ. خانوو | ژ. خێزان | ژ. کەس |
| ١ | عارەبان | ٥٦٤٤ | ٣٥٣ | ١٩٩٤ | ١٧٨ | ٤٩٨ | ٢١٥٠ |
| ٢ | تەعجیل یەهود | ١٩٩٨ | ٢٥ | ٢٤٩ | ٩٨ | ٣١٩ | ١٧٤٢ |
| ٣ | تەعجیل ئیسلام | ٤٩٦٦ | ٢٧٥ | ١٥٢٦ | ١٣١ | ٥٧٤ | ٢٧١٣ |
| ٤ | خانەقا | ٤٥٢١ | ٢٩٠ | ١٤٦٣ | ٧١ | ٤١٠ | ١٧٩٢ |
| ٥ | مستەوفی | ٤٠٣٨ | ٣٥٩ | ١٩٨١ | ١٣٧ | ٤٢٠ | ١٧٤٢ |
| **کۆی گشتی** | | **٢١١٦٧** | **١٣٠٢** | **٧٢١٣** | **٦١٥** | **٢٢٢١** | **١٠١٣٩** |

**سەرچاوە: (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤)**

لە خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت ئەو خانووانەی یەك خێزانی تێدا دەژین ژمارەیان بە رادەی زیاتر لە دوو بەرانبەر زۆرترە لەو خانووانەی کە زیاتر لە خێزانێك تیایدا دەژین. ئەوەش پێدەچێت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەم بەشەی شار توانای ئاسان فراوانبوون و گەورەبوونی هەیە، چونکە کەوتووەتە پێدەشت و باری تۆپۆگرافیای خاکەکەی یارمەتیدەرە بۆ فراوانبوون بە هەموو ئاقارێکدا. هەروەها پێدەچێت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە عورف و عادەتی کۆمەڵایەتیی باوی ئەو رۆژگارە وای خواستووە خێزانەکان بە شێوەی سەربەخۆ لە خانووەکانیاندا بژین. بۆیە لە کۆی گشتیی (١٩١٧) خانووی بەشی گەڕەکەکانی خوار قەڵا، (١٣٠٢) خانوو لەو خانووانەن کە خێزان بە شێوەیەکی سەربەخۆ تیایدا دەژین و کۆی گشتیی دانیشتوانیان بریتییە لە (٧٢١٣) کەس یان هاوتا بەرانبەر بە (5.5) کەس بۆ هەر

خانوویەك. لە لایەکی دیکە، ژمارەی دانیشتوانی ئەو خانووانەی کە زیاتر لە یەك خێزان تیایدا دەژین، وەك لە خشتەی ژمارە (٣)دا هاتووە، بریتییە لە (١٠١٣٩) کەس لە کۆی گشتیی (٦١٥) خانوو یان بەرانبەر بە (١٦.٤) کەس بۆ هەر خانوویەك. زۆری ژمارەی ئەو خانووانەی زیاتر لە یەك خێزان تیایدا دەژین بۆ کۆمەڵە هۆیەك دەگەڕێتەوە، وای بۆدەچین کە دەستکورتی و بێتوانایی خێزانەکان بۆ دابینکردنی ژیانێکی سەربەخۆ هۆیەکی هەرە گەورەی ئەم بابەتە بووبێت. پاشان باوی دیاردەی جیابوونەوەی کوڕان لە باوانیان دوای پێکهێنانی ژیانی خێزانداری یان ژیان لەگەڵ ماڵەباوانیان لە یەك خانوودا هۆیەکی دیکەی زۆری ئەو خانووانە بێت کە زیاتر لە خێزانێك تیایدا ژیاون لەو ماوە مێژووییەدا. بە شێوەیەکی گشتی، تێکڕا چڕی دانیشتوان بۆ خانووەکانی گەڕەکەکانی خوار قەڵا خۆیداوە لە زیاتر لە (٩) کەس بۆ هەر خانوویەك، کە ئەمەش رێژەیەکی بەرزە، چونکە رووبەری زۆرینەی خانووەکان، وەك رۆژگاری ئەمڕۆمان، بەرفراوان نەبووە.

سەبارەت بە گرنگترین گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵا، خشتەکە لەڕووی نیشتەجێبوونەوە، ئەوە دەداتە دەست کە گەڕەکی عارەبان لە سەرووی هەموو گەڕەکەکانی شاری هەولێرەوەیە لەو سەرژمێرییەدا لەڕووی زۆریی ژمارەی دانیشتوانی. دوای ئەویش گەڕەکی تەعجیل ئیسلام و خانەقا لەم رووەوە لە پلەی دووەم و سێیەمدا دێن. بچووکترین گەڕەك لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە گەڕەکی تەعجیل یەهود بووە بەڕادەی نیوەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی تەعجیل ئیسلام و خانەقا. بە گوێرەی خشتەکەش، گەڕەکی مستەوفی زۆرترین خانووی یەك خێزانی لەخۆ گرتووە. هەروەها خاوەنی زۆرترین ژمارەی خێزانیشە بە جیاوازییەکی کەم لەگەڵ گەڕەکی عارەبان، کە گەڕەکی دواییان لە پلەی دووەم دێت. بەڵام ئەو گەڕەکانەی زۆرترین ژمارەی ئەو خانووانەی تێدایە کە لە خێزان زیاتر تیایدا دەژین، گەڕەکی عارەبان پلە یەکی بەرکەوتووە، دوای ئەویش گەڕەکەکانی مستەوفی و تەعجیل ئیسلام لە پلەی دووەم و سێیەم دێن. گەڕەکی خانەقا کەمترین ژمارەی ئەو خانووانەی تێدا بووە کە زیاتر لە یەك خێزان لە خانوویەکدا ژیانیان گوزەراندبێت.

جێی سەرنجە، بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، لە گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵادا ژمارەیەکی زۆری خەڵك، کە ژمارەیان (٣٣٦٤) کەسە، لە خانووی ئاساییدا نەژیاون، بەڵکو سەرژمێرییەکە لە ژێر خانەی هەبوونی کووخ و کەپر و خێوەتدا تۆماری کردوون، بەسەر یەکەوە بریتیبوونە لە (٤٦٤) خێزان، بەم شێوەیە: گەڕەکی خانەقا (٢١٥) خێزان، گەڕەکی تەعجیل ئیسلام (١٥٢) خێزان، گەڕەکی مستەوفی (٩٧) خێزان، گەڕەکی عارەبان (٢) خێزان. پێویستە ئەوەش بوترێت، کە ژمارەی سەرژمێرییەکە سەبارەت بە گەڕەکی عارەبان لەم رووەوە بە روونی هەڵە و کەموکوڕی تێدا تێبینی دەکرێت، چونکە گوایە تەنها دوو خێزان لە گەڕەکی عارەبان لە خانووی ئاساییدا ژیان ناگوزەرێنن، کەچی لە بەرانبەر ژمارەی ئەندامانی دوو خێزانەکە نووسراوە (١٢٥٢) کەس. (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤). لێکدانەوەی ئەم بابەتەش بۆ ئێمە زەحمەت بوو، یان ئەوەتا هەڵەیەکی زەقە، یان ئەوەتا بەرپرسانی ئامار و سەرژمێری دانیشتوانی گەڕەکی تازە دروستبووی سەعدووناوەیان لەسەر گەڕەکی عارەبان حسێب کردبێت بەبێ ئاماژە بۆکردن بە ژمارەی خێزانەکانی، کە بەرلەو سەرژمێرییە سەعدووناوە لە پەڕگەی شار، بە شێوەیەکی عەشوائی و بێ پلان دروستبووە.

بە گوێرەی زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، دەردەکەوێت کە زۆرترین دامودەزگاکانی حکومی لە بەشی گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵا لە گەڕەکی عارەباندا بووە، بەڕادەی (٧٠) دامەزراوە. گەڕەکەکانی دیکەش بەم شێوەیە بوو: تەعجیل یەهود (٤) دامەزراوە، تەعجیل ئیسلام هیچ دامەزراوەیەکی حکومی لێ نەبووە، خانەقا (٢) دامەزراوە، مستەوفی (١) دامەزراوە. ئەمەش بە واتای ئەوە دێت کە قورسایی دامەزراوە حکومییەکان لەو رۆژگارەی شاری هەولێردا لە گەڕەکی عارەباندا بووە. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە و تێبینی گەورەی لێ دەکرێت ژمارەی قوتابخانەکانە لە شاری هەولێر لەو سەرژمێرییەدا. بە گوێرەی زانیارییەکانی سەرژمێرییەکەی ساڵی (١٩٤٧)، زۆرترین ژمارەی قوتابخانەکان لە گەڕەکی تەعجیل یەهوددا بووە بە (٢) قوتابخانە. پاشان گەڕەکی مستەفی دێت کە خاوەنی

قوتابخانەیەك بووە. هەرچی گەڕەکەکانی عارەبان، تەعجیل ئیسلام و خانەقا بوونە هیچ قوتابخانەیەك تیایاندا بوونی نەبووە (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤).

بە هەمان شێوە، هەرچی دامەزراوە ئەهلییەکانیشە زۆرینەی هەرە زۆریان لە گەڕەکی عارەبان کۆبوونەتەوە، کە خۆیداوە لە (١٢٥) دامەزراوەی ئەهلی. لە دوای ئەویش گەڕەکی خانەقا بە (١٠٣) دامەزراوە و گەڕەکی تەعجیل ئیسلام بە (٣٢) دامەزراوەی ئەهلی لە پلەی دووەم و سێیەمدا دێن. هەرچی سەبارەت بە دەزگا و دامەزراوە ئایینییەکان بێت لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، گەڕەکی خانەقا زۆرترین ژمارەی دامەزراوەی ئایینی لەخۆ گرتووە بە (٥٤) دامەزراوە. دوای ئەویش ڕاستەوخۆ گەڕەکی عارەبان دێت بە (٥٣) دامەزراوە. دوای ئەوانیش گەڕەکی تەعجیل ئیسلام بە (٢) گەڕەك دێت. گەڕەکەکانی دیکەش هەر یەکەیان یەك دامەزراوەی ئایینییان لەخۆ گرتووە (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤).

دوای تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر ئەنجامدانی یەکەم سەرژمێریی فەرمی لە عیراقدا (١٩٤٧)، لە ساڵی (١٩٥٧)دا، گۆڕانێکی بەرچاو بەسەر باری ئاوەدانیی گەڕەکەکانی بەشی خوارەوەی قەڵادا هاتووە، بەوەی گەڕەکی نوێ و ئاوەدان دروستبوون و لە دووەم سەرژمێریی فەرمی عیراق لە ساڵی (١٩٥٧)دا زانیارییان لەبارەوە تۆمار کراوە. کە بریتیبوون لە گەڕەکەکانی سەعدووناوە و سەیداوە. هەروەها هەر دوو بەشەکەی گەڕەکی تەعجیل لێکدراوە و گەڕەکی یەهود دوای ئەوەی جووەکان لە ساڵی (١٩٥٠) بۆ ئیسرائیل کۆچیان کرد (كورية، ١٩٩٨، ص ص١٥٥-ومابعدها)، و شاری هەولێریان جێهێشت گەڕەکەکە لەناواندا نەما، بڕوانە خشتەی ژمارە (٤). ئەوەی پێویست بە وتن دەکات، گەڕەکی سەعدووناوە لە ساڵانی سییەکاندا دروستببوو، بەڵام لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا، وەکو گەڕەکێکی سەربەخۆ بە ڕوونی ئاماژەی بۆ نەکراوە. لە بەرانبەردا لە سەرژمێرییەکەدا ناوی گەڕەکێك زیادکراوە بەناوی (مەعەسکەری سوپا و پۆلیس)، کە ژمارەی دانیشتوانی بریتیبووە لە (١٥٤٩) کەس. (٣) خانووی یەك خێزانی کە (١٤) کەس تیایدا ژیاون و (٢١) خێزانیش لە کووخ و کەپر و خێوەتدا، ژمارەیان بریتیبووە لە (٧٨) کەس، ژیاون (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤). مەعەسکەر لەو ڕۆژگارەدا، بە شێوەیەکی

دوور، دەکەوتە بەشی باکوری قەڵاوە، لەسەر رێی عەنکاوە. هۆیەکی دیکەی گەشەکردنی بەرزی گەڕەکەکانی بەشی خوارەوەی قەڵا، سەرباری ئەو هۆیانەی لە لاپەڕەکانی پێشەوەدا پەنجەی سەرنجمان لەسەر دانا، بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە لەساڵی (١٩٥٢)دا، ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوەی عیراق (مجلس الاعمار العراقی) کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە دوابەدوای رێککەوتنی وەکیەکی قازانج (مناصفة الارباح) نێوان حکومەتی عیراق و کۆمپانیای نەوتی عیراقی، بارودۆخی ئابووریی دانیشتوانی عیراق بە شێوەیەکی گشتی بووژانەوەی بەخۆوە بینی (Longrigg,1953, P.211). ئەوەش کاریگەری هەبووە لەسەر گەورەبوون و گەشەکردنی پانتایی شارەکان بە شاری هەولێریشەوە، بڕوانە خشتەی ژمارە (٤).

**خشتەی ژمارە (٤)**

**پێکهاتەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵا لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا**

| ز | ناوی گەڕەك | ژمارەی دانیشتوانی لە ساڵی ١٩٤٧ | ژمارەی دانیشتوانی لە ساڵی١٩٥٧ | جیاوازیی زۆری و کەمی (+ ، -) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | خانەقا | ٤٥٢١ | ٧٧٧٧ | + ٣٢٥٦ |
| ٢ | سەیداوە | .. | ٢٣٠١ | + ٢٣٠١ |
| ٣ | تەعجیل یەهود | ١٩٩٨ | .. | - ١٩٩٨ |
| ٤ | تەعجیل ئیسلام | ٤٩٦٦ | ٢٨٧٧ | - ٢٠٨٩ |
| ٥ | سەعدووناوە | .. | ٤٣٥٤ | + ٤٣٥٤ |
| ٦ | عارەبان | ٥٦٤٤ | ٦٨٥٠ | + ١٢٠٦ |
| ٧ | مستەوفی | ٤٠٣٨ | ١٠٦٢٦ | + ٦٥٨٨ |
| **کۆی گشتی** | | **٢١١٦٧** | ٣٤٧٨٥ | + ١٣٦١٨ |

**سەرچاوە: (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤؛ المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي الموصل وأربيل، ص٢١٧)**

لە خشتەی ژمارە (٤)ی سەرەوەدا بەرجەستانە دەرکەوتووە لە ماوەی نێوان دوو سەرژمێرییەکە گەشەکردن و پەرەسەندنێکی گەورە و بەرچاو بەسەر هەندێك لە گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵادا هاتووەتە کایە، چ سەبارەت بە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و بەرزبوونەوەی چڕییان بێت، یان سەبارەت بە گەورەبوونی ئاوەدانی بێت لە هەندێك لە گەڕەکەکاندا، وەك: گەڕەکی مستەوفی، گەڕەکی خانەقا، گەڕەکی سەعدووناوە، گەڕەکی سەیداوە. ئەم گەڕەکانە لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانیان، بێگومان چڕیی دانیشتوانیشیان بەرزبۆتەوە و پێویستییان بە گەشە و گەورەبوونێکی نوێی ئاوەدانی و بنیاتنانی خانووبەرە هەبووە. بۆیە ئەو گەڕەکانە سنووره کۆنەکانی خۆیان بەزاندووە و فراوانبوونە.

ئەوەی جێی تێبینی و سەرنجە، گەڕەکەکانی مستەوفی و خانەقایە کە زێدەبوونی ژمارەی دانیشتوانیان ناسروشتییە و پەرەسەندن و گەشە و گەورەبوونێکی زۆریان بەخۆوە بینیوە. بە گوێرەی زانیارییەکانی خشتەی ژمارە (٤)، گەڕەکی مستەوفی زیاتر لە دوو هێندەی خۆی لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە زیادیکردووە لە ماوەی نێوان دوو سەرژمێرییەکەدا. هەرچی گەڕەکی خانەقاشە بە هەمان شێوە گەشەیەکی زەقی هەیە بە ڕادەی نزیکەی دوو هێندەی خۆی لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە لە نێوان دوو سەرژمێرییەکەدا. لە بەرانبەردا گەڕەکی تەعجیل ئیسلام پێچەوانەی سروشتی گەشەکردنی دانیشتوان لە کورتی داوە نزیکەی نیوەی ژمارەی دانیشتوانی پێشووی.

بە شێوەیەکی گشتی، باری ئاوەدانیی گەڕەکەکانی شاری هەولێر، لە سەرژمێریی فەرمی ساڵی (١٩٤٧)دا، بەم شێوەیە بووە وەك لە خشتەی ژمارە (٥)دا خراوەتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٥)**

**پێکهاتەی گەڕەکەکانی شاری هەولێر لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا**

| ز | بەشەکانی شار | کۆی ژمارەی خانوو | کۆی ژمارەی خێزان | کۆی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکان | کۆی گشتیی دانیشتوان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قەڵا | ٥٤٦ | ٨١٧ | ٥٠ | ٤٣٢٠ |
| ٢ | کورتەك | ١٩١٧ | ٤٠١٣ | ٤٤٩ | ٢١١٦٧ |
| کۆی گشتی | | **٢٤٦٣** | **٤٨٣٠** | **٤٩٩** | **٢٥٤٨٧** |

**سەرچاوە: (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص٢٠٤)**

لە خشتەی سەرەوەدا ئەو راستییە زۆر بە روونی دەردەکەوێت کە گەڕەکەکانی قەڵا بوونەتە بەشێکی بچووك لە ئاوەدانییەکانی شاری هەولێر، لە بەرانبەردا گەڕەکەکانی کورتەك لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و پانتایی زەوییە بەکارهاتووەکانی شارەکە، پشکی شێری بۆ خۆی پچڕیوە. ئەوەش لە دیوێکیدا بەڵگەی گۆڕانی شێوەی ژیانی خەڵکانی هەولێر روون دەکاتەوە کە رووەو ژیانی سەردەمیانە هەنگاویان ناوە و باوەشیان بۆ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان و پێشکەوتنە ژیارییەکان کردووەتەوە، لە دیوێکی دیکەشدا نیشانەی دەستپێکێکی بەهێزی رەوتی نیشتەجێبوونی دانیشتوانی ناوچە و گوندەکانی دەوروبەری هەولێرە لەناو شاردا. بە بەڵگەی ئەوەی زێدەبوونی ژمارەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی شاری هەولێر، کە لە سەرژمێریی (١٩٤٧)دا گەیشتووەتە (٢٥٤٨٧) کەس، بە بەراورد بە خەمڵ و داتا و زانیارییەکانی چەند ساڵی پێشووتر، زۆر زیاترە.

**ئەنجام:**

لێکۆڵینەوەکە لە دوای شیکردنەوەی داتا و زانیارییەکانی سەرژمێرییە فەرمییەکانی سالآنی (١٩٤٧-١٩٥٧)، سەبارەت بە گەڕەکەکانی شاری هەولێر و بەراوردکردنیان بە سەرچاوە مێژووییەکان و لێوردبوونەوە لە بەڵگەنامەکانی بەردەست، بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشت:

- شاری هەولێر بە جیاوازیی سەردەمە مێژووییەکانی توانیویەتی پارێزگاری لە ناو و ژیاری تایبەتی خۆی بکات. دانیشتوانی ئەم شارە لە کۆندا تا سەردەمی دوای هاتنی دەسەڵاتداریێتی عوسمانی لە قەڵادا گیرساونەتەوە و بەشێکی کەمیان توانیویانە لە خوارەوەی قەڵادا نیشتەجێ ببن. بۆیە باری ئاوەدانیی لە قەڵادا بە سێ قۆناغی جیا گوزەری کردووە: (قەڵا هەموو شاری پێکهێناوە، قەڵا بەشێکی گەورەی شاری پێکهێناوە، قەڵا بەشێکی بچووکی شاری پێکهێناوە). کە ئەم قۆناغەی دواییان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستپێدەکات.

- سەرژمێرییە فەرمییەکانی سالآنی (١٩٤٧) و (١٩٥٧) زانیارییەکی باش و تا رادەیەك ورد لەخۆ دەگرن بۆ دەرخستنی واقیعی کۆمەڵایەتیی دانیشتوانی شاری هەولێر و رەوتی ژیان لە گەڕەکە جیاوازەکانی شاری هەولێردا. هەروەها دەتوانرێت لە رۆشنایی ئەو زانیارییانەوە، وێنایەکی تەواو و دروست بۆ مێژووی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی هەولێری لەو ماوە مێژووییەدا بکرێت.

- بە گوێرەی زانیارییەکانی سەرژمێرییەکانی (١٩٤٧) و (١٩٥٧)، گەشەکردن بەسەر گەڕەکەکانی شاری هەولێردا هاتووە، سەرباری ئەوەی ژمارەی گەڕەکەکان زیادبوونە، لەناو گەڕەکە کۆنەکانیشدا گەشەکردن بەسەر باری ئاوەدانیدا هاتووە. هەموو ئەمانە لە میانەی لێکۆڵینەوەکەدا بە وردی و بە زمانی ژمارە خراونەتەڕوو.

- هەر بە گوێرەی زانیارییەکانی سەرژمێرییەکان خێزانێکی زۆر لەناو گەڕەکەکانی هەولێر لە خانووی ئاساییدا ژیانیان نەگوزەراندووە، بەڵکو لە کووخ و ژێر کەپر و خێوەتدا ژیاون، ئەوەش بەڵگەی دەستکورتی و نەداریی بەشێك لە دانیشتوانی هەولێر روون دەکاتەوە، کە لەو ماوەیەدا لەنێو گەڕەکەکانی شاردا دەژیان.

هەروەها لە دیوێکی دیکەدا، هەڵوێستی خراپی دەسەڵاتدارانی شارەکە روون دەکاتەوە بەرانبەر بە پێشکەش نەکردنی خزمەتگوزارییەکان بە شێوەیەکی شایستە.

- هەرچەندە گەڕەکەکانی شاری هەولێر پەرەسەندنێکی دیاریان لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا بەخۆوە بینیوە. بەڵام هاوشانی شارەکانی، وەك: مووسڵ و کەرکووك نەبووە. چونکە شارەکە وەك ئەو شارانە هێزی کێشکردنی دانیشتوانی بۆ نیشتەجێبوون تیایدا کەمتر بووە. لەبەر ئەوەی شارێکی پیشەسازی یاخود مەڵبەندێکی بازرگانی نەبووە، تاوەکو خەڵکی لە لیواکانی دیکەی عیراقەوە رووی تێبکەن و تیایدا نیشتەجێببن. ئەوانەی بۆ نیشتەجێبوون روویان لێیکردووە، زۆرتر، خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری خۆی بووە.


**لیستی سەرچاوەکان**

**بەڵگەنامە:**

مراد، خليل علي (الدكتور)، (٢٠١٥)، من وثائق الارشيف العثماني (دفتر تحرير مفصل واجمال ولاية أربيل ٩٤٩هـ/١٥٤٢م)، من منشورات الاكاديمية الكردية، اربيل.

**بڵاوکراوە حکومییەکان:**

**١-بە زمانی عەرەبی:**

- المملكة العراقية، وزارة الشؤون الاجتماعية (مديرية النفوس العامة)، إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني (لواء الموصل- لواء كركوك- لواء السليمانية- لواء أربيل)، بغداد، ١٩٥٤.
- الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية (مديرية النفوس العامة)، المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي الموصل و أربيل ، مطبعة الارشاد، بغداد، دون سنة الطبع.

**٢-بە زمانی تورکیی عوسمانی:**

- موصل ولايتى سالنامەسى، ترتيب ايدن، مكتوبى ولايت صادق افندى، موصل ولايتى مطبعه سى – (١٣١٢هجرى/ ١٨٩٤ميلادى).
- موصل ولايتى سالنامەسى، مكتوبى ولايت سعادتلو حسين توفيق افندى معرفتيله ترتيب اولنمشدر، موصل ولايت مطبعه سى، (١٣٠٨هجرى/ ١٨٩٠ميلادى).

- **موصل ولايتى سالنامه رسميسى، ترتيب ايدن، صفوت، موصل، مطبعه ولايت، (١٣٢٥هجرى/١٩٠٧ميلادى).**
- **موصل ولايتى سالنامه رسميسيدر، موصل ولايتى مطبعه سى – (١٣٣٠هجرى/ ١٩١٢ميلادى).**

**نامە و تێزە زانکۆییەکان:**

**١-بە زمانی کوردی:**

- عبدالرحمن، دڵشاد محمود، (٢٠١٢)، بارودۆخی کۆمەڵایەتیی شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا (١٩٢١-١٩٥٨) لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، تێزی دکتۆرا، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر کراوە، هەولێر.

**٢-بە زمانی عەرەبی:**

- آل مدرس، ساكار بهاءالدين، (٢٠٠٣)، الانماط السكنية في مدينة اربيل (دراسة تحليلية في جغرافية المدن)، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين –اربيل.
- حسين، علي عادل، (٢٠٠٦)، اربل في الفترة (٦٣٠– ٨٧٤هـ/ ١٢٣٣ – ١٤٦٩) دراسة سياسية حضارية، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين-اربيل.
- محمود، احمد عبدالعزيز، (١٩٩٠)، الهذبانيون في اربيل واقليم الجزيرة، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين –اربيل.
- عەلیاوەیی، عبدالله محمد على، (١٩٩٢)، الكرد في عهد المغول، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين –اربيل.

**کتێب:**

**أ-بە زمانی کوردی:**

- بێخاڵی ، مولود، (١٩٩١)، هەولێرم وا دیوە، بەرگی یەکەم ، چاپی یەکەم ، دار الشؤون الثقافية العامة، بەغداد.
- جامباز و بەرزنجی، تاریق و نەژاد، (٢٠٠٦)، ئاماری دانیشتوانی قەڵاتی هەولێر (سەرای-تەکیە-تۆپخانە)، چاپی یەکەم، چاپخانەی بینایی، سلێمانی.

- جاوشلی، هادی رشید، (١٩٨٧)، هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلەك، چاپخانەی الجاحظ، بەغداد.
- حوسێن، موحسین محەمەد، (٢٠١٩)، هەولێر لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر.
- زاخار، ئیدوارد، (١٩٩٥)، کرۆنۆلۆژیای ئەربیلا، وەرگێڕان: عبدالمؤمن، برلین.
- شارەوانی هەولێر، (١٩٨٥)، هەولێر لە یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێردا (١٨٨٥-١٩٨٥)، چاپی یەکەم، چاپخانەی علاء، بەغدا.
- قادر، دکتۆر جەبار، (٢٠١٩)، کەرکوك نەفرەتی نەوت و ستەمی دیمۆگرافیا، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، کوردستان – هەولێر.
- قادر، مەهدی محەمەد، (٢٠٠٨)، هەولێر لەنێوان ساڵانی (١٩١٤-١٩٣٠)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر.
- عەبدولقادر، نەهرۆ محەمەد، (٢٠١٢) هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٦)دا، خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپی یەکەم، هەولێر.

**ب-بە زمانی عەرەبی:**
- أبن خرداذبة، (١٩٧١)، المسالك والممالك، طبعة بريل، بغداد.
- اسماعيل، زبير بلال، (١٩٧١)، أربيل في ادوارها التاريخية (دراسة تاريخية عامة لاربيل وانحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى)، مطبعة النعمان، النجف الاشرف.
- بابان، جمال، (١٩٨٩)، اصول أسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، الطبعة الثانية، بغداد.
- باقر، طه (الدكتور)، (١٩٥٢)، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، الجزء الاول، بغداد.
- باقر و سفر، طه و فؤاد، (١٩٦٦)، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الخامسة، وزارة الثقافة و الارشاد، بغداد.
- البدليسي، الامير شرفخان، (٢٠٠١)، شرفنامة، ترجمة: محمد جميل الروزبياني، الطبعة الثانية، أربيل.
- البغدادي، المنشئ، (١٩٤٨)، رحلة المنشئ البغدادي، ترجمة: عباس العزاوي، شركة التجارة للطباعة المحدودة، بغداد.

- بيات، فاضل مهدي، (٢٠٠٧) الدولة العثمانية في المجال العربي (دراسة تأريخية في الاوضاع الادارية في ضوء الوثائق والمصادر العثمانية حصرا) مطلع العهد العثماني- أواسط القرن التاسع عشر، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت.
- الجنابي، هاشم خضر، (١٩٨٧)، مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر، الطبعة الاولى، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل.
- الحسني، عبدالرزاق، (١٩٢٥)، رحلة في العراق أو خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية، بغداد.
- حسين، سعدي عثمان، (٢٠٠٦)، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر (دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد وموصل)، الطبعة الاولى، مطبعة سيما، السليمانية.
- حسين، محسن محمد (الدكتور)، (١٩٧٦)، اربيل في العهد الاتابكي ٥٢٢-٦٣٠هـ/١١٢٨ - ١٢٣٣م/ اوضاع اربيل السياسية و والاقتصادية و العسكرية و الادارية والثقافية في العهد الاتابكي، مطبعة سعد، بغداد.
- الحيدري، عبدالباقي عبدالجبار أمين، (١٩٨٥)، التجديد الحضري لقلعة أربيل (دراسة اجتماعية- اقتصادية و عمرانية)، من مطبوعات الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب، الموصل.
- صالح، برهان جبار، (٢٠٠٤)، قلعة اربيل بين الماضي والحاضر، الطبعة الاولى، اربيل.
- لسترنج، كي، (١٩٥٤)، بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة: بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة الرابطة، بغداد.
- راولف، ليونهارت، (٢٠٠٨)، رحلة الهولندي الدكتور ليونهارت راولف الى (طرابلس- دمشق- حلب- برقة- ديرالزور- بغداد- خانة- فلوجة- هيت- كركوك- أربيل) في النصف الثاني من القرن السادس عشر الميلادي، الترجمة: د.سليم احمد خالد، الطبعة الاولى، دار العربية للموسوعات، بيروت.
- رسول، اسماعيل شكر (الدكتور)، (٢٠٠٥)، أربيل دراسة تأريخية في دورها الفكري و السياسي (١٩٣٩-١٩٥٨)، الطبعة الثانية، مطبعة بينايى، السليمانية.
- مكاي، دروثي، (١٩٦١)، مدن العراق القديمة، ترجمة: يوسف يعقوب مسكوني، مطبعة شفيق، بغداد.
- كورية، يعقوب يوسف، (١٩٩٨)، يهود العراق (تأريخهم، أحوالهم، هجرتهم)، لبنان.
- وهبي بك، توفيق، (٢٠٠٦). الآثار الكاملة، الجزء الاول، (اعداد: رفيق صالح)، السليمانية.

- يوسف، شريف، (١٩٨٢)، تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور، مطبعة دار الرشيد. بغداد.
- هروتي، سعدي عثمان، (٢٠٠٨)، كوردستان والامبراطورية العثمانية (دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان ١٥١٤-١٨٥١)، الطبعة الاولى، مطبعة خاني، دهوك.
- هروتي، سعدي عثمان (الدكتور)، (٢٠١٢)، دراسات اكاديمية في تاريخ كردستان الحديث، عمان.

**ج-بە زمانی ئینگلیزی:**

*- Ahmed, K.M., (2003) The Northern Transtigris in the first half of second millennium, M.A. thesis, unpublished, Leiden.*
*- Longrigg,S.H.,(1953), Iraq: 1900 To 1950 (A Political, Social, And Economic History), Oxford University Press, Great Britain.*

**وتار و توێژینەوە:**

**أ-بە زمانی کوردی:**

- دەباغ، فەیسەڵ، (١٩٩٩)، چەند زانیارییەکی دەگمەن لەبارەی ویلایەتی موسڵ لە ساڵانی (١٨٨٧-١٨٩٤)دا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٤)، هەولێر.

**ب-بە زمانی عەرەبی:**

- البرادوستي، زيدان رشيدخان اودل (الدكتور)، (٢٠١٣)، قيسرية الجلبية (قيسرية الحاج قادر الجلبي الدباغ)، في: تاريخ اربيل ودورها الحضاري، من بحوث المؤتمر العلمي الثاني التي عقدها جامعة صلاح الدين/ اربيل، أربيل.
- حجارة، اسماعيل، (١٩٧٠)، دمى من تل قالينج اغا، مجلة (سومر)، مج: ٢٦، بغداد.
- الزركاني، خليل حسن (الدكتور)، (٢٠١٣)، قلعة اربيل من القلاع الشامخة في التاريخ، في: تاريخ اربيل ودورها الحضاري، من بحوث المؤتمر العلمي الثاني التي عقدها جامعة صلاح الدين/ اربيل، أربيل.
- قادر، عبدالجبار (الدكتور)، (كانون الاول ١٩٩٠)، أربيل في السالنامات العثمانية، مجلة (كاروان)، السنة التاسعة، عدد (٩١)، اربيل.

- السعدي، عباس فاضل (الدكتور)، (٢٠١٣)، الانتشار المكاني لسكان القلعة وبقية محلات مدينة اربيل، في: تاريخ اربيل ودورها الحضاري، من بحوث المؤتمر العلمي الثاني التي عقدها جامعة صلاح الدين/اربيل، أربيل.
- يوسف، شريف، مدن الطرق القديمة وتخطيطها ومبانيها وما حصل من تطور في بعضها، "آفاق عربية" (مجلة)، العدد (١٦)، بغداد، شباط ١٩٧٦.

**ئینسایکلۆپیدیا:**

**أ-بە زمانی کوردی:**

- حەسەن، مەولود ئیبراهیم، (٢٠٠٩)، " گەڕەکەکانی هەولێر"، لە: ئینسکلۆپیدیای هەولێر (ئەربیل)، بەرگی شەشەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان.
- شەقڵاوەیی، حەبیب، (٢٠٠٩)، "مەسیحییەکانی هەولێر"، لە: ئینسکلۆپیدیای هەولێر (ئەربیل)، بەرگی شەشەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان.
- عەبدوڵڵا، هوشیار، (٢٠٠٩)، "دەرگای ئەحمەدی قەڵای هەولێر"، لە: ئینسکلۆپیدیای هەولێر (ئەربیل)، بەرگی شەشەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان.

**ب-بە زمانی عەرەبی:**

- سترك، م.، (١٩٣٣)، "اربيل"، في: دائرة المعارف الاسلامية، الجزء الاول، القاهرة.

**ج-بە زمانی ئینگلیزی:**

- *Ashtor,Eliyahu, "Irbil", Encyclopaedia Judaica. Ed. Michael Berenbaum and Fred Skolnik.2nd ed. Vol. 10. Detroit: Macmillan Reference USA, 2007.P.24-25.*

## ملخص البحث

## أحياء مدينة أربيل من خلال الاحصائيات الرسمية العراقية (١٩٤٧–١٩٥٨)

يلقي هذا البحث الضوء على التطورات التي شهدتها أحياء مدينة أربيل في العهد الملكي. الذي شهدت كغيرها من المدن نموا بطيئا في القرن الاخير من العهد العثماني، ولكنها تأثرت بطبيعة الحال بالآثار التي خلفتها الحرب العالمية الاولى على العالم والمنطقة.

رصد البحث التطور التأريخي لأحياء المدينة في كلا القطاعين (القلعة ومحيطها)، وحاول تحليل المعلومات والمعطيات الاحصائية الرسمية المتعلقة بالمدينة وأحيائها في مختلف المجالات: عدد السكان وتوزيعهم على الاحياء، عدد المؤسسات الحكومية والاهلية والدينية في تلك الاحياء وطراز البناء. كما عرض البحث مستندا الى المصادر المعتبرة العلاقات بين السكان وانماط حياتهم والقيم والعادات التي كانت تتحكم بحياتهم في هذه المرحلة التاريخية القريبة.

# Abstract

## Erbil City Quarters in formal Iraqi statistics (1947-1958)

This study highlights the developments witnessed by Erbil City Quarters in formal Iraqi statistics; the city, like other cities, had been making a slow progress during the last century of the Ottoman rule. Yet, it was influenced by the consequences of the First World War on the world in general and the region in particular.

Thus, the present study tackles the historical development of the city's neighborhoods in all their tow areas; the citadel, and citadel's immediate surroundings. Hence, it analyzes the city's official statistical data in different walks of life, the population and its distribution in the neighborhoods, the number of state and private institution therein, and the prevalent architectural modes. Depending on reliable sources, the study also explores the relation between the city's inhabitants, their lifestyles, values, and tradition, which shaped their lives during the aforementioned historical stage.

# پیشەی جۆلایی
# لای جووەکانی کوردستان

**سازان سەباح پیربال**
مامۆستا لە بەشی شوێنەوار/ کۆلێژی ئاداب

**پیشەی جۆلایی لە کوردستان:**

بەرهەمی جۆلا لە کوردستان واتا سیپاڵ چنی ( کووتاڵی هێڵ هێڵ) ، مێژوویەکی تۆمارکراوی هەیە، کۆنترین بەڵگە لە بارەی چنینەوە لە نەخشی سەر هەندێ خشتی سەردەمی ( چاخی بەردینی نوێ) (٧٠٠٠-٨٥٠٠) پێش میلاد لە چەرمۆ دۆزراوەتەوە، ئەوە ئەوەمان پێدەڵێ لە هەمان شێوەی تریش هەبوونە بەڵام نەدۆزراونەتەوە. بە گشتی چنین لە کوردستان هەر لە کۆنەوە دەتوانین بڵێین لە پێگەی دووەم بووە دوای کشتوکاڵ کردن.(ئیزەدی، ٢٠٠٧، لا ٥٥٥-٥٥٦) کاری جۆلایی ئەم پیشەیە زیاتر لە شار و شارۆچکەکانی کوردستان کراوە هەڵبەتە ئەمەش شتێکی سروشتییە لەبەر ئەوەی کورد خەڵکێکی شاخاوییە و ئاژەڵدارن لە ناوچەیەکدا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەڵکەوتوون بە بۆنەی ئەم پیشەیەوە بەناوبانگ بوون، زۆرێك لە گەڕیدەکان گەواهی پیشەی جۆلایی دەدەن لە کوردستان (ژیکیل، ١٩٩٩، لا ١٤٢) لە کوردستان هەر لە سەردەمی ئاشوورییەکان گرنگییان بە رستن و چنین داوە گرنگترین بەرهەمهێنانی لۆکە بووە بازرگانییەکی فراوانیان کردووە لەگەڵ ناوچەکانی دراوسێ، وە لە وڵاتی دووروووبار پیاوان و ئافرەتانیش ئەم پیشەیان کردووە (اسطیفانی، ٢٠٠٢، ص٦٩-٦٧.) لە کۆندا لە کوردستان جۆلا توانیویەتی تا ئەندازەیەکی باش جلوبەرگی پیاوانەی کوردەواری و کەلوپەلی پێویستییەکانی ناوخۆ بەرهەم بهێنێت، کە لە لایەن ژنانەوە زۆربەی کارەکان دەکران ، ئەمە جگە لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ و ئیش و کاری رۆژانەی ماڵ و (نانکردن و چێشت لێنان و ) جگە لەوە قوڕکاری و بیناسازی و کشتوکاڵیش ژن لە هاوشانی پیاو بە درێژایی

رۆژگار کاری کردووە، گرنگترین ئەو بابەتانەی کە جۆلا دروستی دەکات، (دووگرد، رانك و چۆغە (شاڵ و شەپك) رەشماڵ، فەرشی دیوار، جاجم، ) رەشماڵ لە کوردەواری (سیاماڵ) ( چادر) دوو جۆر رەشماڵ هەیە هی زستانە قورسە هی هاوینە (سووکە شاشە، پێی دەڵێن چاتۆلە) هەردوو جۆرەکەیان لە مووی بزن دروستدەکرێ لە پاش رستن کردنی بە بەن دروست دەکرێ، چونکە مووی بزن قایمە و سیخە، لە کاتی بارانان ئاو نادا، هەشە لە کەرەستەی ئەستوور و رخت دروستکراوە پێی دەڵێن (دەوار) یان چادر بە زۆری ماڵە هەژارەکان و دۆم و قەرەجەکان بەکاری دەهێنن. (کاکەیی،٢٠٠٣، لا ٢٢٧، ٢١٥. ) دووگرد: بەرهەمێکی چنراوی جۆلایە بۆ نوێژکردن بەکار دێت، زیاتر لە لایەن خەڵکانی برادۆست و باڵەکایەتی دروستدەکرا، بەرماڵ بە زۆری لە کەڵەفی رەنگاو رەنگ کەمتر لە بەن دروستدەکرا، لە رووی نەخشەوە چوار جۆری هەیە، ساکاری و یەك کەشکۆڵ (کەشکۆڵ لە شێوەی تیشکی رۆژە) دوو کەشکۆڵ و سێ کەشکۆڵ. ئەمانە کارێکی قورس و گرانە بۆیە دەسحەقەکەشی گرانە. (غەفور،٢٠١١.لا٨٨).

فەرشی دروستکراوی دیوار زۆربەیان چوارگۆشە بوون، بەڵام پارچەش هەبوون جیاواز بوون لە قەبارە و شێوەدا ، کەلێنێکی گەورەی لە ماڵەکانی کوردیدا پڕ دەکردەوە، زۆر جار هەبوو ئەم پارچانە بەکاردەهات بۆ راخستنی ئەو پارچەی ژێر ژن و مێرد ، دەدرا بە کوڕە گەورە لەکاتی ژنی دەهێنا، وەکو دیارییەکی بەهادار. (شوارتس، ٢٠١٣.لا ٢٤) کۆمەڵێ ناوچە هەبوون لە کوردستان بەناوبانگ بوون بە چنینی جلوبەرگ وەك (شاری ماردین و دەوروبەری و ناوچەکانی سەر بە مووسڵ) بە



**ئافرەتێک لە سەردەمی ئاشووری لە کاتی رستن و تەشی کردن (اسطیفان ،٢٠٠٢ ،ص-٦٧)**

تایبەت ئەو کەرەستانەی کە پەمۆ بوون، تا سەردەمی عوسمانی کوردستان سەرچاوەیەکی سەرەکی بوو بۆ بەرهەمهێنانی بەرهەمی پەمۆ و رەوانەکردنی بۆ مووسل، هەروەها لە گوندی حەززەی تەنیشت هەولێر (النصافی) گوندەکە بە پەمۆ بەناوبانگ بوو، وە (ئامەد)یش لە هەرێمی جەزیرە مەڵبەندی بەرهەمهێنان و ناردنە دەرەوەی جلوبەرگی نەخشێنراو بوو ، وەك مەندیل، مەقارم ( جۆرێکە لە چارۆگ ) سەرەڕای ناردنە دەرەوەی جلوبەرگی دروستکراو لە خوری کەتانی رۆمی (تۆفیق، ٢٠١٤، لا ٢٥٢) د. ژیکیل باسی پیشەی لادێی کردووە بە دوور و درێژی باسی پیشەی جۆڵایی کردووە وەك دروستکردنی ( رانکو چۆغە-_ شاڵ و شەپك ) جلوبەرگ و جۆرەها مافوور و مافووری سەر دیوار و ڕایەخی رەنگاو رەنگ (ژیکیل ،١٩٩٩،لا ١٣٣-١٣٤).

## پیشەی جۆڵایی لای جووەکان:

بە گشتی چنین و کاری جۆڵایی یەکێکە لە پیشە سەرەکییەکانی جووەکانی کوردستان کە پێوەی سەرقاڵ بوون بە تایبەت ئافرەتەکانیان لە نێو ماڵەکانیان، وە زۆر جار بازاڕیان هەبووە و بەرهەمەکانیان فرۆشتووە، خەڵکێکی زۆر متمانەیەکی تەواویان بە بەرهەمەکانیان هەبووە بەهۆی جوانی و باشیی کواڵیتەکانیان (زبیدە، ٢٠٠٧،لا٥٠)، چەند هۆکارێك هەبوو کە وای کردبوو ئەم پیشەیە هەڵبژێرن ، زۆربەی جووەکان لە گوندەکان دەژیان کاریان کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوو بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان پیشەی جۆڵایی باشترین کاریان بوو بۆ ساغکردنەوەی کاڵاکانیان چونکە هەندێ جار بە ئاڵوگۆڕی بە کەلوپەل ساغیان دەکردەوە. زۆر جار هەبوو ئەم پیشەیە لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمایەوە و نازناویان پێ وەردەگرت، جۆڵاکان دڵسۆز بوون بۆ زیندوو راگرتنی نەریت و ستایلیان، بەڵام هەندێکیشیان حەزی داهێنان و شتی نوێیان هەبوو، بە گشتی کوردەکان لە کارامەیی جلوبەرگ پشتیان بە جووەکان دەبەست، چونکە کوردەکان وایان لێکدەداوە لەگەڵ شکۆی ئەوان ناگونجێ. لە ناو شارەکانیش زۆرێك لە دایك و باوکان دەیانویست کارەکانیان فێرە منداڵەکانیان بکەن ئەمەش بە رێگای راهێنان لای وەستایەکی کارامە، ( براور، ٢٠٠٢،لا ٢٥٩-٢٦٤) زۆر جار

هەبوو جووەکان لە شار و گوندەکان لە لایەن توندڕەوە موسڵمانەکانەوە ئازار دەدران یانیش باجێکی زۆریان لێدەسرا لە لایەن ئاغا و دەسەڵاتدارەکانەوە بە مەبەستی پاراستنیان لە جەردەکان، کوردەکان بۆ جلوبەرگ پشتیان بەستبوو بە جووەکان بۆیە زۆر جار پاراستنیان هەر لە لایەن کوردەکانەوە بوو، ئەم پەیوەندییە هەر چییەك بووبێ لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بنیاد دەنرا، زۆر جار هەبووە ئەم پیشەیە پەیوەندیەکی پتەوی دروست کردووە لە نێوان ئاغا و دەسەڵاتدارەکانی گوند و شارەکان و جووەکان، ئەمەش لە بەرژەوەندیی هاوبەش پێکدەهێنرا، زۆر جار هەبووە ئەم پیشەوەرە بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمی خۆی سەردانی ناوچەکانی تریان کردووە چەندین رۆژ و هەفتە دەمانەوە لە لایەن ئاغاکانەوە چاودێری دەکران ، خواردنیشیان بۆ دابین کراوە، جۆلاکەش لەبەرامبەر ئەم میوانداریيە هەندێك بەرهەمی خۆی پێشکەشی ئاغا دەکرد. لە کۆندا مافی بە خاوەن بوونی هاولاتی جوو هەبووە بە میرات جوویان بۆ دەمایەوە ئاغاکان جووەکانیان دەپاراست لە بەرامبەردا دیارییان وەردەگرت، (موردخای ، ٢٠١٥،لا ١٨٥، ١٩٦) زۆر لە گوندەکانی کوردستان رێژەیەك خێزان جووی تیا نیشتەجێ بوو، پاراستنیان لە لایەن گەورەکانیانەوە بوو غەدر لێکردنیان زۆر جار هەبووە ناخۆشی کەوتۆتە نێوان دوو گوند لەسەر کوشتنی جوویێك، بە تایبەت ئەگەر ئەو جووە پیشەی جۆلایی هەبێت چونکە هەموو گوندەکە بۆ جلوبەرگیان بە تایبەت ئاغاکان پشتیان بەم جۆلایە بەستووە، ئاغایەك لەگەڵ هاولاتییەکی جوو دەدوا بە جووێ من بانگی دەکرد ئەمەش واتای ئەوە بوو کە زۆر لە ئاغاوە نزیك بوو. ئاغا مافی خاوەنداریەتی بەسەروە هەبوو ئەمانیش رێزێکی زۆریان لە ئاغاکان دەنا بە ئاغاکەم وەڵامیان دەداوە ئەمەش سەرەڕای پێدانی دیاریی وەکو جلوبەرگیان پێشکەشی ئاغا دەکرد. ئازاردانی جووەکان و کۆچکردنیان بە مانای رووخانی سەرمایە و ئابڕووی ئاغاکە بوو، چونکە سەرمایەیەکی گرنگی ئاغا بوون. زۆر جار هەبووە ئاغایەکی گوندێکی تر وەکو تۆڵەسەندنەوەیەك ئازاری جووی ئاغای تریان دەدا، هەروەها جووە جۆلاکان گوندنشینەکان لە کاتی ئاشتیشدا رۆڵێکی باڵایان هەبووە ، ئەو جووانەی کە جۆلاییيان دەکرد، کە کاریان دروستکردنی شاڵ و شەپك بوو ئەم بەرگە ئەو کاتە بە ناوبانگ بوو، پلەیەکی باڵایان هەبوو لە ناو جلوبەرگی

کوردیدا بەهۆی کارامەیی جووەکانەوە ئاغاکانیش ئەرکی پاراستنیان کەوتبووە ئەستۆوە و سەرجەم پێداویستییەکانیان بۆ بەردەست دەخستن، (علی ، ٢٠١٠،لا ١٢٨) چوار خێزانی پیشەگەری جۆلای جوو لە گوندی (هەرین) دا دەژیان لە ناوچەی زێباریدا بە سەرکردایەتی فارس ئاغا، جۆلا جووەکان سەرجەم پێداویستی جلوبەرگ و پێداویستییەکانی پۆشاکیان بۆ گوندی هەرین و دەوروبەری دابین دەکرد، لە بەرامبەریشدا گوندنشینە کوردەکان پێداویستی جووەکانیان دابین دەکرد، لە گوندەکەیان دروشمی ئاغا ئەوە بوو: بۆ ئەوەی وا لە جووەکان بکەین لە گەڵماندا بمێننەوە و لە ناو ئێمەدا بژین دەبێت چاودێرییان بکەین، کوردەکان بە نۆرە داری سووتان و گەنم و جۆ و سەوزە و میوەیان بۆ جووەکان دەهێنا بۆ ئەوەی بتوانن لە هاوکارییەکانیان بەردەوام بن و ڕێگایان بە جووەکان دەدا ، لە کێڵگەکانیان هەرچییەکیان بویستایە هەڵیان دەبژارد جگە لە ماست و پەنیر و کەرە و ڕۆنیان بۆ دەهێنان، لە ساڵی **١٩٣٢** لەکاتی شۆڕشی بارزانی بەرامبەر حکومەتی عیراقدا، بنەماڵەی موشی بن عیون ( جۆلایەکی بەناوبانگی جوو بوو) بەرەو مێرگەسوور کۆچیان کرد، بارزانییەکان نەیاندەتوانی بۆ ڕواندز و یان ئاکرێ گەشت بکەن لەو کاتە جووەکان دەیانتوانی بۆ مەبەستی ساغکردنەوەی بەرهەماکانیان سەردانی زۆربەی ناوچەکان بکەن، (موردخای ، ٢٠١٥،لا ١٨٥، ١٩٦) بەم شێوەیە جووەکان دەیانتوانی یارمەتی بارزانییەکان بدەن، بە پێشکەشکردنی ئەو بەرهەمە سەرەتاییانەی کە دەستخستنیان ئەستەم بوو، وەکو شەکر و چا و جلوبەرگ کە خۆیان دروستیان دەکرد. خەواجە خێنۆ، پیشەگەرێکی جۆلایی جوو بوو پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی لە کاتی چوونی بۆ ڕوسیا کاك مەسعود تەمەنی پێنج ساڵان بوو کە گەڕانەوە عیراق بۆیە داوای لەو هاوڕێیە جووەی کرد کە ئاگاداری کوڕەکەی بێت، ناوە ناوە جلوبەرگی جوانی بۆ مەسعود دەنارد. (موردخای ، ٢٠١٥،لا ١٨٥، ١٩٦) وە هەروەها لە شوێن و قۆناغی تریش جووەکان دەوری دۆست و کاریگەری بنیاتنانیان هەبووە لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان بەپێی بارودۆخی گونجاو بۆ نموونە: لە دروستبوونی شاری سلێمانی جووەکان بەشدار بوونە و بووە بە مەڵبەندی کولتووری و ڕۆشنبیری، کۆمەڵێك جوو لە ناوچەکانی قەرەداغەوە هاتوونەتە سلێمانی

گەڕەکی خۆیان دروستکردووە و پەرستگایان بنیاد ناوە هەر لەم گەڕەکە ، هەتا لە سەردەمی شێخ مەحموودی بەرزنجی جووەکان سێ چوار سندووق چا و سێ فەردە ئارد و سێ عەلاگەی گەورەی شەکریان بە ئاغا دەدا، لەبەر ئەوەی ئاغا و شێخەکان هەمیشە پڕ میوان بوون ئەم جۆرە بەرهەمانە لە دیوەخان پێشکەش دەکران، جگە لەوە زۆر جار جلوبەرگیشیان بۆ دابین دەکردن بە دیاری پێشکەشیانیان دەکردن، ئەمانیش جووەکانیان دەپاراستن لە بارودۆخی مەترسیدار، بۆیە دەتوانین بڵێین خێزانی جووەکان لە رۆڵی کاری دەستی وەکو چنین و خومچیەتی و دروستکردنی پێڵاو .... پێگەیەکی باشیان هەبوو لە ناوچەکانی سلێمانی و دەوروبەری هەرچەندە تازە سلێمانی دروستکرابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ماوەیەکی کەمدا بووە شارێکی بازرگانیی گرنگ (کوردە، ٢٠١٩،لا ١١٤). بۆیە دەتوانین بڵێین لە ناوچەی سلێمانی ژمارەیەك جوو خەریکی کاری جۆڵایی بوون لە پلەیەکی هونەریی بەرزدا بوون. بەشی هەرە زۆری ئەو بەرهەمانەی لە لایەن جۆڵا جووەکانەوە بەرهەم دەهاتن ئاماژە بە کاری جوانی دوو جۆڵا دەکرێت ، بە ناوەکانی (رەحیمە جوو، شەومیر). (تۆفیق، ٢٠١٥، لا ٨٦) هەر لە ناوچەی قەرەداغ جووەکان مێژوویەکی دێرینیان هەبوو، گەڕەکێکی تایبەتی خۆیان هەبوو بە ناوی گەڕەکی جووەکان، کەسێك هەبوو پیشەی خومچیەتی دەکرد لە لای خەڵکی بەناوبانگ بوو، بە ناوی (میرە جوو) (کوردە، ٢٠١٩،لا ١٧٨) لە شاری کۆیەش جووەکان چەندین کاریان کردووە شارەزاییەکی باشیان هەبووە لەوانە (خومچیەتی و کاری جۆڵایی، رەنگسازی) ئەمانە هەمووی لە سایەی هەلومەرجی لەباری ئەوتۆ هاتۆتە کایەوە کە توانیویانە بە ئازادانە کاروباری خۆیان بکەن، پەرە بە ژیانی خۆیان بدەن لە هەمان کاتدا دەسترەنگینی و کارامەیی جوولەکەکانی کۆیە دەردەخات، (طیب، ٢٠١٢، لا ٢٧٦) لە گوندی رۆستێ جووەکان لەم کارەوە لێهاتوو بوون گەڕەکێکی تایبەت بە خۆیان هەبوو، لە نزیك ماڵی خۆیانەوە گۆڕەپانێك هەبوو ئامێری جۆڵایان لێدادەنا وەکو کارگەیەك بە یەکەوە کاریان دەکرد، پیاو و ژن تێیدا ئیشیان دەکرد، زۆربەی ناوچەکانی تر روویان تێدەکردو دەیانکڕی، ئەم پیشەیە وای کردبوو جووەکانی ناوچەی رۆستێ دەوڵەمەند بن تەنانەت لە ئاغا و میرەکانی رۆستێش دەوڵەمەندتر بن (روستی، ٢٠٠٧، لا ١١٥) هەتا ئەم جۆرە پیشەیە بۆتە

جێی سەرنجی گەڕیدەکان، لە نووسینەکانیان باس کراوە بە نموونە: (برانت) وەکو گەڕیدەیەك لە سەدەی نۆزدەم هاتۆتە ناوچە کوردستانییەکان وە لە یاداشتەکانی باسی پیشەی رستن و جۆلایی کردووە بەم شێوەیە (لە شاری وان زۆربەی دانیشتوان بەم پیشەیە خەریکن و بۆ رەنگ کردنی گلۆڵە بەنەکان دەیاننارد بۆ ناوچەکانی بتلیس)، جگە لەوە باسی نرخی ئەو کووتاڵانەش دەکا، وە باسی کۆمەڵێ ناوچەی تری کوردستان دەکا کە جووەکان بەم کارەوە خەریك بوونە و شارەزایی پیشەیی باشیان هەبووە لەم بوارەدا کە پشت بە دوای پشت بۆیان ماوەتەوە، وە هەروەها لە یاداشتەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کەرەستەی ناوچەی وان بۆ رستن لۆکە بووە. (برانت،١٩٩٩،لا ١٢٣). خێزانە پیشەوەرە جووەکان بە زۆری سەربەخۆیانە کار و پیشەکانی خۆیان بەڕێوە دەبرد، لە گوند و شارۆچکەکاندا هاوڵاتیان لە بەرامبەر کرێی کاری دەستییان، کە نەیاندەتوانی پارەیان پێبدەن ( هێلکە و شیر و هەنگوین و تووتن و گەنم و مێوژ،...) پێدەدان. پشەوەرە جووەکانیش خاکەرایانە بۆ بەرژەوەندی و خۆ گونجاندنی خۆیان بێ دروستکردنی گرژی رازی بوون بە وەرگرتنی خۆراك لە بری پارەی کرێی دەستی کاریان . گەڕیدەیەکی تر بە ناوی (هەی) لە ساڵی ١٩٢١ هاتۆتە ناوچەکانی کوردستان و لە یاداشتەکانی دەنووسێ (زۆربەی پیاوانی پیشەوەری جوو لە بواری جۆلایی و کاری چنین کاریان دەکرد و بژێوی ژیانی رۆژانەی خۆیان و خێزانەکانیان بە دەست دەهێنا لە شاری هەولێر). لە درێژەی یاداشتەکانیدا ئاماژە دەکات بە کۆچی بەرچاوی پیشەوەرە جووەکان لە سەدەی بیستەم لە لادێ و شارۆچکەکانەوە بۆ ناو گەڕەکەکانی شاری هەولێر. ئەمە ئەوەمان بۆ روونەدەکاتەوە کە پیشەی جۆلایی پیشەیەکی باو بوو، رۆڵی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری لە ناو نەخشەی خێڵەکیدا لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بە یەکەوە بەستبۆوە ، رۆڵی جۆلا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لە کۆمەڵگەی کوردستان، کاریگەرییەکانی هەمیشە وای کردووە کە هاوڵاتیان وابەستەی شارەزایی و بوارە پیشەگەرییەکانیان بن ( نموونە زۆرن کە هاوڵاتیانی کوردستان بە قەرز و خاترانە پێداویستیی خۆیان لێ دەکڕی) (hey, ,1921,p76)).

**کەرەستە خاوەکان:**

ئامادەکردنی کەرەستە خاوەکان بە تایبەت بۆ کاری جۆڵایی لە لایەن ئافرەتانەوە دەکرا وەکو بەشێك لە کاری رۆژانەی ماڵەوە بە دەگمەن لە بازاڕی شارەکان دەکڕان.

١. **خوری مەڕ**: باوترین کەرەستەی خاو بوو تایبەت بەکاردەهێنران بۆ چنینی فەرش و رایەخ و جلی جۆراو جۆر، کەرەستە خاوەکان لە مەیدان بە سەر پشتی وڵاخی باربەرەوە دەفرۆشرا یانیش هەندێك جار دەکڕا لە بازاڕەکان، بە تایبەت لە کاتی بڕینەوەی بەهاراندا. جووە پیشەوەرەکان کڕیاری دیار بوون لە بازاڕ (شۆارتس، ٢٠١٢،لا ٩٥).

٢.**مووی مەرەز**: ئەمە مووی بزنە مووی مەرەز جیاوازە لەگەڵ مووی بزنی رەشۆك، چونکە مەرەز نەرمترە و جوانترە لە مووی رەش، کاری ئافرەت لە جۆڵایی زیاتر پاککردنی مووی مەرەزەکەیە ( رۆستی، ٢٠٠٧،لا ١١٥). زۆربەی جار بە رەنگی سروشتیی خۆیانەوە دەچنران. وەکو رەش و سپی و قاوەیی و سووربور.

٣.**ریسی ئاوریشم:** (قاجۆك) لە قۆزاخەی کرم لە لایەن ئافرەتانەوە لە داری بەڕوو دەکرایەوە ئامادەکردنەکەی کارێکی زۆرتری دەویست، چونکە ئامادەکردنی بۆ هەر جۆرە جلێك جیاوازە. (شوارتس،٢٠١٢،لا ٩٥-٩٦)

٤. **ریسی لۆکە:** لە دەرەوە دەهێنران بە ئامادەکراوی لە بازاڕ دەفرۆشران، لەو کۆتاییيانە هەموو قەبارەیەکی جل لە لۆکە دروست دەکران لەبەر پتەوییان.( رۆستی، ٢٠٠٧،لا١١٥)

٥.**دەزووی ئاسنین** (سیرمە) بە ئامادەکراوی دەکڕا بۆ بەکارهێنان، پێکهاتبوو لە لۆکە و لە ناو دەزووی ئاسنین وەردەدرا زۆر دەگمەن بوو، ئەمە زیاتر بەکار دەهێنرا بۆ جوانکردن، بەڵام جۆڵاکان کەمتر بەکاریان دەهینا، چونکە ئەگەری دڕاندنی قوماشی چنراوی هەبوو (شوارتس،٢٠١٢،لا٩٥-٩٦)

## گرنگترین قۆناغەکانی پیشەی جۆڵایی:

**١.شوشتن یان پاککردنەوە:** هەموو ئەو کەرەستانەی کە بۆ کاری جۆڵایی بەکار دەهاتن پێویستییان بە شوشتنەوە هەبوو، سەرەتا پێش تەڕکردنی واتا بە وشکی بە دارێك لێی دەدرا بۆ ئەوەی هەرچی خۆڵ و خاشاك و زیندەوەر هەیە لێی ببێتەوە، دوای ئەوە دەکرێتە ناو حەوزێکی تایبەت بە خۆیان ،( اسطيفاني ،٢٠٠٢ ،ص ٦٩-٦٧) بەڵام جووەکان زۆربەی جار سەرچاوەیەکی ئاو لێیانەوە نزیك بوو دەچوونە لای سەرچاوە ئاوەکە چونکە چەندان جار شوشتنەوەی دەویست بەڵام ئاوریشم و لۆکەش دوای چنینی دەشۆردرانەوە. (شوارتس، ٢٠١٢،لا ٩٦_٩٧) ریسی ئاوریشمیش دوای ئەوەی لە دار بەڕووەکە جیا دەکراوە بە ئاوی گەرم خۆش دەکرا و دوای ئەوە هەمووی بەیەکەوە دەشۆردرا.



**قۆناغی شوشتن و وشککردنەوە لە لێواری رووبارەکان (شوارتس،٢٠١٢، لا١٠١).**

**٢.وشککردنەوە:** قۆناغێکی گرنگە پێش رستنی پێویستە وشك بکرێتەوە، ئەمەش لەسەر تەنافێك یان لەسەر بەردێك دادەنرێت یان لەسەر رایەخێك دەبێت لە شوێنێکی بڵند بێت پاکیش بێت بۆ ئەوەی دووبارە پیس نەبێتەوە هەڵدەخرێت. (الجادر ، ١٩٩١، ص٢) سەبارەت بە ئاوریشم ئەمانیش دوای خۆشکردنی بە ئاوی گەرم شوشتنەوەیان لە بەر هەتاو رادەخرا دەبوایە لە شوێنێکی پاك با هەتاوەکو وشکدەکراوە.

٣. **شیکردنەوە:** ( شەی) ئەمەش بە هۆی شانەیەکی گەورەوە کە دارێکی گەورەیە لە شێوەی دەستە، ژمارەیەك ددانی ئاسنی پێوەیە، ئەمەش لە لایەن چەند


ئامێری شەی بۆ شیکردنەوە
(شوارتس،٢٠١٢،ل١٠١).

ئافرەتێکەوە دەکرا لە ئەنجامدا دوو جۆر مووی لێدەکەویتەوە بنەشە (بنۆك و سەرەشە) بنۆك زیاتر بۆ قات باشترە (رۆستێ، ٢٠٠٧، ل ١١٦).

٤.**رستن**: موو بە ئامرازی لێك جودا لە مادە و شێوە و ئەندازەیی بەرهەمیان دەهێنا یان دەیان ڕست. پێی دەگوترێت (تەشی) ئامێرێکی دەستکردی خۆماڵیی دێرینە، لە دێر زەمانەوە لە کۆمەڵگەی کوردستان بەکار هاتووە چ لە ناو خێزان بۆ رستنی پێداویستی ماڵەوە یان لە بواری پیشەوەری رستندا بە جۆر و قەبارەی جیاواز بەکارهاتووە، هاوکات دەستڕەنگینی و شارەزایی تەشی ڕێسەکانیش فرە چەشن و فرە جۆرن، لە بەڵگە زیندووەکانی سەرچاوەکان دەبینرێ، تەشی و تەشی رستن بەشێکی کولتووری سەردەمی ئاشووریی نوێدا هەبووە (لەسەر تابلۆ دیوارییەکان تەشی تەشی ڕێس ماوەتەوە)، (اصطيفاني،٢٠٠٢ ، ص ٦٥). لەبەر ئەوەی خوری و مووی ئەستوور و باریکی پێ دەڕێسرێت، چەند جۆرێکی هەیە، (ئەستوور، ئەم جۆرەیان بۆ رایەخ و جاجم و شتی دیکەش لەو بابەتانە دەڕێسرێت) ناوەنجی_ خوری بۆ دووگردی پێ دەڕێسرێت، باریك مووی مەرەزی بۆ رانك و چۆغە دەڕێسرێت. تەشی لە دار دروستدەکرێت، لە سێ پارچە پێکهاتوە، قولاب پارچەیەکی کانزایە و لە ناوەڕاستی سەلکی تەشی دەچەقێنرێت، بۆ تێ وەرئاراندنی خوری و موو گیراوە، سەلکە تەشی، پارچە دارێکی خڕە لە داری خۆولاتی


ئافرەتێکی جوو لەکاتی تەشی کردن (شوارتس،٢٠١٢،ل١٠١).

لە لایەن وەستای کوردییەوە دروستدەکرێ. کلکە تەشی دارێکی درێژە سەرەکەی لە کونی تەشی راکراوە، (باوزی، ٢٠٠٨، لا ٨٨) رستن بە تایبەت بە ئامێری تەشی لە لایەن ئافرەتانەوە دەیانرێسی، تۆپەڵێك دەزووی بە دەستیەوە دەگرت، بەپێی ئەستووریی داواکراو حسێبی بڕی بەرهەمی دەکرد، بە دەستەکەی تریشی لە رانی دەخشاند بای دەدا و دەزووەکانی بە هۆی دەست و قولابی لە دارە باریکەکە دەئاڵاند، ئەمەش



**جۆرەکانی تەشی ( محمود، ٢٠٠٨، لا٨٧)**

چەندان سەعات و رۆژی دەخایاند، هەندێ ئافرەت بژێویی رۆژانەیان لەسەر تەشی رستن بوو. (شوارتس،٢٠١٢،لا ٩٦) دەبوایە ئافرەتەکان زۆر لێهاتوو بووانە بە تایبەت لە رستنی مەرەز کارامەیی و شارەزاییەکی زۆری دەویست، چونکە دەبوایە داوەکانی زۆر باریك و لووس بن هیچ گرێی تێدا نەبێت، بەم شێوەیە هەندێك ئافرەتان لەم بوارەدا پسپۆر بوون ئەمە پیشەیان بوو، بەڵام ئەگەر بۆ کارەکانی تر بەکار بهێنرێت وەکو مافوور و بەڕە و لیفکە و .... دەبێت کەمێك درشتتر بڕێسرێت ، ئەگەر بیانەوێ جاجم و بەرماڵی لێ دروستبکرێت، ئەوا دەبێ جۆری رستنەکە توندتر بکرێت، لە رستندا خوری باشتر دەچێتە پاڵ یەکتر و داوی توندتر دەبێت، ئەوەی رستن دەکا دەبێ بیزانی بۆ چی دەیرێسێ ( الجادر، ١٩٩١، ص٢١٠) بەڵام لەم دواییانە مەکینەیەکی کارەبایی تازە بۆ مەرەز رستن دەرچووە مەکینەکە بە ئەسڵ واتەر پەمپی موبەریدەیە بەکارهێنانی لەم ساڵانەدا بۆ پەلەکردن لە رستندا دەگەڕێتەوە. (غەفور،٢٠١١،لا٩٠)

٥.**رەنگکردن**: رەنگکردن پیشەیەکی تایبەتی جووان بوو، بەڵگەش بۆ ئەمە ناوی تسابایە (بوخچی بە زمانی عیبری) کە زۆر لە ناو کوردە جووەکان بەکاردەهێنرا، لە زۆر حاڵەتدا رەنگکردن بەشێك بوو لە پیشەی جۆلایی بەڵام کاتێك ئەزموونی

دەڵەومەندتر و رەنگی تایبەت پەیدا بوو، بوو بە پیشەیەکی تایبەت کە لەماڵەکان یان لە بازاڕی بوخچییاندا دەکرا، (براور ،۲۰۰۲، ۲٥۹-۲٦٤) لە کوردەواری بە (خومچی) بە ناوە (بەشێك لە پیشەگەرەکان بە تایبەت پسپۆر و شارەزا بوون ( شارەزاییەکەیان لە بنەڕەتدا بەسترابۆوە بە ئەزموونی خۆیان و ئەو شارەزاییەی لە باوانیانەوە بۆیان مابۆوە) لە هەڵبژاردنی جۆری رەنگەکان و تێکەڵکردن و گرتنەوەی رەنگەکان و لە خمدانی کەرەستەکانی چنین) بۆ رەنگکردنی، سوودێکی زۆریان لە درەختی جۆراو جۆر وەردەگرت، بە تایبەت لە توێکڵی سەوزە و میوە ، قاوەیی ئاچۆخ لە پیاز وەردەگیرا، قاوەیی تۆخ لە توێکڵی هەنار، رەش لە توێکڵی گوێز، زەردی ئاچۆخ لە سێو. رەنگکردن چەندان قۆناغی هەبوو، یەکەم جار تۆپەڵە دەزوو لە ناو ئاو دەکوڵێنرێت رەنگەکەی پێدادەکرا، تا جێی خۆی دەگرت، هەر رەنگە و دەفری قوڕینی تایبەت بە خۆی هەبوو، کەرەستەکە بۆ ماوەی حەفت خولەکان دەکوڵێنرا، دوای ئەوە دەشۆرایەوە لەبەر هەتاو رادەخرا لە شوێنێکی پاك و دوور لە خۆڵ و تۆز، تاکو وشك دەبۆوە ئینجا حازر دەبوو بۆ چنین، هەندێك جار جگە لە میوە و درەخت، تۆزی رەنگ بەکار دەهات بۆ رەنگکردن کە لە بازاڕەکان دەکڕدرا، (هەورەمانی، ۲۰۱٦، لا(۱۰۸٤-۱۰۸۳) هەندێك جار بنەسلێرك، جۆرە گیایەکە لە کوێستانەکان دەڕوێت لە بەهار پەلکێکی سەوزی یەك سانتیمی پان و پانزە سانتیم درێژی هەیە ئەو بەشەی کە دەکەوێتە ناو خاك بۆ دەرمان بەکار دێت، لەبەر هەتاو وشك دەکرێتەوە، بەڵام دەبێ هەتاوی بەهار بێت چونکە ئەگەر وانەبێ باش وشك نابێ دوایی دەیکوتن وشکی دەکەن و دەیبەن بۆ ئاش دەیهاڕن، ئەوجا لەگەڵ ئاو دەیکەن بە شەربەت ریسی دەخەنە ناوی دوای ئەوە وشکی دەکەنەوە تا رەونەقی پەیدا بکات سیفەتی چوونە پاڵ یەکی بەهێزی دەکات ئینجا دەکرایە کر. (روستی، ۲۰۰۷،لا ۱۱٥)



**کاری رەنگکردن و وشککردنەوەی بەنەکان لە لایەن خومچییەوە**
**(شوارتس،۲۰۱۲، لا۱۰۱).**

ژمارەیەکی زۆری جوو لە ناوچەکانی ئاکرێ لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە ئاکرێ داهاتیان بە پیشەی جۆلایەوە بوو وە سێ خێزانیش بۆیەیان دەکرد، دەروێش ناحوم و میخایلی کە جوو بوو لە ناوچەکانی ئاکرێ سەرجەم خێزانەکەیان کاری جۆلاییان ئەنجامداوە. ژمارەیەکیش بەپێی راپۆرتەکەی هەی لە کتێبەکەی دوو ساڵ لە کوردستان ئاماژە بەوە دەکات لە هەولێریش بۆیەچی بوونە واتا خومچی بوونە، (hey,1921,p76) وە جیمس ریچ کە هاتۆتە کوردستان تێبینی ئەوەی کردووە کە بەشێکی زۆری جووەکان بە کاری خومچیەتی و جۆلاییەوە خەریك بوونە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٢٧ (دەیڤید دبیس هیل) لە راپۆرتێکدا دەڵێت کە تاکە جوولەکەی گوندی (سالاغە) (چالە) بۆیەچی بوونە کە هاوڕێی ئاغای گوندەکەش بووە ئەو پەیوەندییە باشەی ئەو جووە خومچییە لەگەڵ ئاغای گوندەکە هەیبووە رەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە جلوبەرگی کوردی بۆ ئاغا و خەڵکەکە دابین کردووە. (موردەخای، ٢٠١٥، لا ٢٩٨).



**ژووری بۆیەکردنی بەنەکان لە لایەن خومچیەوە (شوارتس،٢٠١٢،لا١٠١).**

دوای رەنگکردنی بەنەکان ئافرەتەکان لە ماڵەوە یان لە شوێنی تایبەتی جۆلاکە دەستیان دەکرد بە هەڵکردن و گلۆڵەکردنی بەنەکان چوار مەشقی دادەنیشت بە یارمەتی هەر دوو رانەکانی هەڵیدەکردەوە، یانیش هەندێ جار چەند دەزگایەکی خڕکردنەوەی بەنەکان هەبوو بە خێرایی دەسووڕانەوە جۆرە دەزگایەکی تر هەبوو کە جۆلا جووەکان بەکاریان دەهێنا بۆ راکێشانی بەنەکان بەکار دەهات (شوارتس،٢٠١٢،لا ١٠١).

**٦.چنین:**



**کاری جۆڵایی لە لایەن جۆڵاوە**
**(شوارتس،٢٠١٢،ل١٠١).**

دوای گلۆڵەکردنی بەنەکان جۆڵا جووەکان دەستیان دەکرد بە چنینی (شاڵ و شەپك و جاجم و بەرماڵ و کەژی و مافووری دیوار....) ئەم بەرهەمانەی بەهۆی دەزگایەکەوە دەکریێ پێی دەگوترێت (پێچال) ئەم دەزگایەش پێکهاتووە لەم پارچانە (دەفە، گورد، شە، لەنگەر، پرد، شانەی لەنگەر، پێستەتە، کۆلەکە هەڵپێچ، واڵە، سنگ، ڕەفتە، مێکوك، لولو، خرەك) ئەمانە هەر یەکەیەکیان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە، (غەفور،٢٠١١،ل ٨٩).

جۆڵا زۆربەی جار لە لایەن پیاوەکانەوە بوو کە شارەزاییەکی تایبەتییان هەبوو لە بارەی جۆری چنین، دەزگای جۆڵایی ژووری تایبەتی و هەڵکەندنی چاڵ لە تەختەکەیا، بۆ ئەوەی ئەو جۆڵایە کە لەوێدایە کار دەکات بە ئاسانی قاچی تیایدا جموجۆل دەکەن و بە هۆیەوە بۆ ئەوەی هەر یەك لەو پارچانە بە ئاسانی بەرز و نزم ببنەوە، ئەم ئامێرە زیاتر لە دار دروستدەکرا، ئەو بەشانەی کە دەزووەکانی پێوە گیر دەکرا لە داری زۆر بەهێز دروستدەکرا وەکو داری بەڕوو و گوێز و توو، کە دەکرا پۆلیش بکرێن، بەشەکانی تریش جار جارە دەگۆڕدران لە لایەن جۆڵاوە لێ دروستدەکرا( هەورامانی،٢٠١٦،ل ١٠٨٣-١٠٨٤)

واتا دەبێت جێگایەکی تایبەت بە خۆی هەبێت بۆ ئەوەی دەزگایەکەی تێدا دامەزرێنێت، و مەرجی خۆی هەیە چونکە جۆڵا ناتوانی دەزگایەکە بۆ هەر شوێنێك

بیەوێ بگوازێتەوە لە کاتی دروستکردنی بەرهەمەکەی لە هەمان کاتیشدا گوێزرانەوەی دام و دەزگای جۆلایی ئەرکێکی گرانە و کارێکی قورسە بە تایبەت پێچال بۆ جموجۆل پێکردن. (هەورەمانی، ٢٠١٦،لا ١٠٨٢)

**جۆلایی لەم پارچانە پێکدێت:**

١. **نەوەردە:** لە نزیك جۆلایە سەری رایەڵی لێ قایم دەکرێ پاشانیش وردە وردە کرەکەی لێ دەئالێنرێت.

٢. **رایەڵ:** بەسەر کارگەی جۆلاییدا دەڕوا لەسەر سەری جۆلا قایم دەکرێ.

٣. **پەرکەر:** دارێکی درێژە و لە هەردوو سەرەوە بە داری قیت لە دەفە دەخرێ لەو لاشەوە بە دارێکی ترەوە دەلکێ بۆ هێنان و بردنی دەفە.



**ئامێری پێچال (هانسن،١٩٨٣،لا ١٤٨-١٥٢)**

٤. **شە (شانە):** شێوەیەکی لاکێشەیی هەیە، کە بیانەوێ بیگۆڕن ئەم بەشەی لێك دەردێنن، داوە شەیەکان قامیشن لە نێوان دوو داری درێژ گیراون، لای بنەوەی شە کە پێیدەگوترێت پۆتاری بن شە بەهۆی دوو داوەوە کە شەپکەی پێقایم کراوە، جۆلا کە پێی خستە سەر شەپکەکان و جوولاندیەوە شەیەکەی لەگەڵ دێ و دەچی.

٥. دەفە: دارێکی خڕە کەمێك درێژە دەکەوێتە دوو گۆی کە توند لە زەوی قایم کراون. (هانسن،١٩٨٣،لا ١٤٨-١٥٢)

## گرنگترین ئەو بەرهەمانەی کە لە لایەن جۆلا جووەکانەوە دروستدەکرا:

١. **فەرشی چنراوی دیوار:** کە کەلێنێکی گەورەی لە ماڵی کوردەکان پڕ دەکردەوە زۆربەیان چوارگۆشەیی بوون وا جوان دروستیان دەکرد بۆ مەبەستی جوانی و گەرمکردنەوەی ژوورەکەش بەکاردەهات، زۆر جار ئەم پارچانە بەکار دەهات بۆ راخستنی ژێر بووك و زاوا، زۆر جار لە لایەن بووکەوە دەدرا بە زاوا بە دیاری هەندێ

جار ناوی زاوای لەسەر دەنووسرا، عادەتەن لەم جۆرە بەرهەمانە جۆلا رادەسپێررا بۆ چنینی بەرهەمێکی تایبەت بەپێی خواستی داواکراو رەنگ و شێوەکەی، زۆر جار هەبوو موشتەری خۆی کەرەستە خاوەکەی دەهێنا هەندێك جاریش جۆلاکە خۆی بەرهەمی دەهێنا یان لە بازاڕی دەیکڕی، بۆیە دەتوانین بڵێین زۆربەی بەرهەمە جوان و ئاڵۆزەکان لە لایەن جۆلا جووەکانەوە بەرهەم دەهاتن.



**مافووری چنراوی دیوار**
**(شوارتس،٢٠١٢،لا ١٠٣_١١٦)**

بەپێی تێپەڕبوونی کات بەرهەمەکان لە هەر ناوچەیەك سیفەت و خەسڵەتی جیاوازی وەرگرت، زۆربەی جار لە سووفی مەڕ دروستدەکران ، زۆر جار جۆلا جووەکان ناوی داودی لەسەر دەنووسرا یان ناوی جۆلاکەی لەسەر دەنووسی. گرنگترین ئەو رەنگانەی کە زاڵ بوون رەنگی سوور و زەرد و سپی و رەش بە ستایلێکی جوان تێکەڵیان دەکرد وە گرنگترین ئەو نەخشانەشی نەخشی ئەندازەیی و نەخشی گیانەوەری بوون (شوارتس،٢٠١٢،لا ١٠٣_١١٦). جووەکان خۆیان بۆ چەندان مەبەست بەکاریان دەهێنا بۆ بۆنە ئایینییەکانیش وە بۆ جوانکردنی سوکاح (ژوورێکە جووەکان دروستیان دەکرد لەناو حەوشەکانی خۆیان یان لە سینەگۆجەکانیان بە چنراوی ڕەنگاوڕەنگ دەیان ڕازاندەوە لە جەژنەکانیان کە خواردنی جۆراوجۆریان دابەش دەکرد ئەمەش بۆ بە بیرهاتنەوەی هەژارەکان بوو) لە جەژنەکانیان هەروەها بۆ چەرچەفی سەر مێز وەهەروەها بۆ پەردەی شاردنەوەی دەفری پیرۆزی بۆنە ئایینییەکان.


بەرمال (توێژەر)

**٢.بەرماڵ** - دووگرد: شتێکی چنراوە بۆ نوێژ لەسەر کردن رادەخرێت لە لایەن جۆلاکانەوە دروستدەکرێت، بەرماڵ بە زۆری لە کەڵەفی رەنگاو رەنگ (سوور و زەرد و رەش و... ) کەمتر لە بەن دەچنرێ (غەفور،٢٠١١،لا ٨٨) لە رووی نەخشەوە چوار جۆری هەیە ساکار و یەك کەشکۆڵ (کەشکۆڵ لە شێوەی تیشکی رۆژە، دوو کەشکۆڵ، سێ کەشکۆڵ، دەسحەقی دروستکردنیان گرانە چونکە دروستکردنیان ئاڵۆزە. جوانترین دووگرد لە لایەن جووەکانەوە دروستدەکران بۆ ئاغاکانیان ئەو کات بەرزترین دەسەڵاتیان هەبووە لە گوندەکان، نموونەیەك لەسەر ئەمە کاتێك جۆلایەك پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ جۆلایەك دەبێت بۆ ئاغاکە داوەتی جۆلاکەی دەکات بۆ ماڵ یەکێکی بەدوا دەنێری داوا لە دەست و پەیوەندی دەکات ئاگاداری بکەن ئەم جۆلایە لە ژێر چاودێری ئاغا دەبێت بۆیە بە هەمووان دەڵێ نابێ کەس دەستی کاتێ بۆیە جۆلاکەش دووگردێکی زۆر جوان و نایابی بۆ ئاغا دووریوە بۆ ئەوەی لە نوێژەکانی جۆلای لە بیر بێت، ئەم دووگردانە پارچەی بەرین بەرین دەچنران دوای ئەوە بەیەکتر دەبەسترانەوە و کۆتایەکەیان بە قوڵینگ دەدروان بۆ جوانکردن و بەهێزکردنی دووگردەکە. (علی،٢٠١٠،لا ١٠٧_١٠٨) ئەو نەخش و


جاجم (ئۆرا شوارتس،٢٠١٢،لا١٠٣ _١١٦).

زەخرەفانەی کە لەسەر دووگردەکان دروستیان دەکرد زیاتر هێڵکاری تاوەر و شرفات و گۆر زیاتر شێوە ئایینییەکان بوون.

٣. **جاجم**: تەنراوێکی تەنك و شاش و زبرە جۆڵا لە دەزووی خوری دەیچنێت. دەشێت بۆ خۆ داپۆشینی کەسێك بەکار بێت لە کاتی خەوتندا. ( مستەفا، ٢٠١٧،لا ٦٨) عادەتەن پارچەکان دوو بەر بوون، پێکەوە وەکو جانتا دەدوورانەوە نەخشی چوارگۆشەیی شەترەنجی بوون، یان خەت خەتی لار یان لێوارەکانی بە گوڵ رازێنرابوونەوە رەنگەکانیشیان زیاتر سووری تاریك و مۆر و لەگەڵ پرتەقاڵی و زەرد. یان هەندێ جار نەخشی شانەیی لەسەر باکگراوندێکی رەنگاو رەنگ کۆ کراونەتەوە، لە کوردستانی عیراق زیاتر پارچە پارچە دروستدەکران پێکەوە دەدوورانەوە بە هەمان داوی خۆیان و هەمان رەنگ. (هانسن،١٩٨٣،لا ١٤٢-١٥٢)



**(کر) تویژەر**

٤. **چنینی مووی مەرەز:** (کر) ئەمە زیاتر بەکار دەهات بۆ قاتی پیاوان، ئەم چنینە زۆر باو بوو لە ناوچەکانی کوردستانی عیراق، چەندان شارۆچکە هەبوون بەناوبانگ بوون لە چنینی مووی مەرەز ئەویش ناوچەکانی بارزان، نیروا و ئاکرێ. قوماشەکان بە خەتی جیاجیا یان یەك رەنگ یان رەنگی جیاجیا دروستدەکران، هەمووی لە مووی بزن دروستدەکرا، هەر دیزاین و ناوێکی هەبوو، گرنگترینیان (باقر باقە) ئەمە زیاتر باکگراوندی سپی و خەتی رەشی هەبوو. سەماوی شینی ئاسمانی، سۆری پشپاش قاوەیی و سوور بوون، کۆما (رەش) خاوەرە (سپی). دوای تەواوکردنی چنینەکە لە نێوان دوو تەختە داراندا دەپێچرا بۆ ماوەی ٢٤ سەعات لە ئاوی گەرم بە جێ دەهێڵدرا، دوای ئەوە مادەیەکیان

لێدەدا بۆ ئەوەی بریقەدار بێت. دوای ئەوە ژنی جۆلاکە دەستی بە دوورمان دەکردو دەیڕازاندەوە، لە بۆنە تایبەتەکان لەبەر دەکرا. (هانسن،١٩٨٣، لا ١٥٤-١٥٥)

بە گشتی زۆربەی چنراوەکان بە تێپەڕبوونی کات هەر ناوچەیەك سیفەت و خەسڵەتی رەنگ و دیزاینی گۆڕانی بەسەرداهات.

**لیستی سەرچاوەکان:**

**کوردی:**


١. ئیزەدی ، مهرادی: چەردە باسێك لە بارەی کوردانەوە، وەرگێڕان ، ئەمین شوان، سلێمانی ، ٢٠٠٧.

٢. کوردە، بەرزان ئەحمەد: کورتە مێژووی جوولەکەکانی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٩.

٣. تۆفیق، زرار سدیق: کۆمەڵگای کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست، هەولێر، ٢٠١٤.

٤. مۆردخای، زاکین ، جوولەکەکانی کوردستان، مێژووی ژیان و پەیوەندییان لەگەڵ ئاغا کوردەکان، و. سیروان حسێن، هەولێر، ٢٠١٥.

٥. تۆفیق، رێبوار حەمە ، جوولەکەکانی سلێمانی، لە سەرەتای دروستبوونی شارەکە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، چاپخانەی پەنجەرە، تاران، ٢٠١٥.

٦. ژیکیل ، لیژەك: کۆمەڵێ لادێی کوردستانی هاوچەرخی عیراق بەرامبەر بە نوێ بوونەوە، و.عەزیز گەردی، ١٩٩٩، هەولێر.

٧. شۆارتس، بێیری، ئۆرا ، جووەکانی کوردستان، و. گۆران سەباح، هەولێر، ٢٠١٣.)

٨. غەفور، عەبدوڵلا، کورد، لێکۆڵینەوەیەك لە کەلتووری مادیی سەردەمدا، هەولێر ،٢٠١١.

٩. طیب، فتح الله ، جوولەکەکانی کۆیە (١٩١٨-١٩٥١) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتییە، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، کۆیە، ٢٠١٢.

١٠.باوزی، محمود: تەشی کۆنترین ئامێری رستن، گۆڤاری مێرگ، ژمارە ٤٢، هەولێر، ٢٠٠٨.

١١.رۆستی، نادر: گوندی کوردی گۆران لە پیشەدا، گوندی رۆست وەك نموونە، سلێمانی، ٢٠٠٧.

١٢.مستەفا، نەوشێروان: بە دەم رێگاوە گوڵچنین، سلێمانی. ٢٠١٧.

١٣.هانسن، هێنی هارۆلد: ژیانی ئافرەتی کورد، لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لە بارەی کۆمەڵی ئیسلامیی عیراقەوە، وەرگێڕانی، عەزیز گەردی، بەغداد، ١٩٨٣.

١٤.کاکەیی، هەردەوێڵ: کەشکۆڵی کوردەواری، سلێمانی ،٢٠٠٣.

١٥.هەورەمانی، محەمەد ئەمین، مێژووی هەورەمان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠١٦.

**سەرچاوەی عەرەبی:**

١. اسطيفاني. صباح ، الصناعة في تاريخ وادي الرافدين ، بغداد ،٢٠٠٢.
٢. براور، اريك: رافائيل پاتای: یهود کردستان، دار ئاراس، اربيل، ٢٠٠٢.

٣. برانت، جيمس: رحلة جيمس برانت ١٨٣٤، ت. حسين الجاف، مطبعة جاحظ،١٩٩٩.
٤. زبيده ، محمد، اليهود و تجارتهم في مصر الاسلامية، قاهرة، ٢٠٠٧.
٥. الجادر . وليد ، الصناعة ، موسوعة الموصل الحضارية ، موصل ، ١٩٩١.
٦. على، صلاح الدين مجيد ، صفحات من تاريخ اليهود في العراق و كردستان، كركوك،٢٠١٠.

**سەرچاوەی بیانی:**

1- hey W-.R; to years in kurdistan, London,1921.

**ئەنجام:**

• پیشەی جۆلایی رۆڵ و کاریگەریی زۆری هەبوو لە ناو جووەکانی کوردستاندا.

• پیشەی جۆلایی سەرچاوەیەکی ئابووری بەهێزیان بوو بە تایبەت لە گوندەکاندا لە دوای کشتوکاڵکردن لە وەرزی زستاندا کاری جۆلایان دەکرد.

• ئەم پیشەیە لە ناو جووەکان بووە هۆی دروستکردنی پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ ئاغا و پیاوە دەسەلاتدارەکان و خەڵکی دەوروبەر.

• پیشەی جۆلایی رۆڵی هەبووە لە پاراستنی جووەکان لە کوشتن و دەرکردنیان، چونکە رووبەڕووی زۆر لە کوشتن و دەرکردن بوونەتەوە لە لایەن توندڕەوەکانەوە لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان.

## ملخص البحث

### مهنة (جۆلا- الحياكة) لدى الطائفة اليهودية في كردستان


تعتبر الحياكة او النسيج من اهم الاعمال والمهن الرئيسية التي زاولها اليهود في كوردستان، وخاصة الساكنين منهم في القرى والارياف ، و استمرت هذه المهنة لديهم لعدة قرون ولعدة اجيال محتفظين بها، وان هذه المهنة كانت ضمن الاعمال الفولكلورية بين الناس، وكان لها دور مهم في قبولهم بين الناس الآخرين وفي توطيد علاقاتهم الاجتماعية.

اضافة الى ذلك ان هذه المهنة كانت لها دور مهم في صناعة المواد المستخدمة مثل الملابس و نسج المصالي والسجاد المحلي و شال و شبك التي كانت معروفة في المدن والارياف، الى جانب ذلك كانت مهنة تلوين الاقمشة (خومجی) مكملة لهذه المهنة، وجودة جمال المنتج كانت مصدرا مهما لايراداتهم وان الكثير منهم كانوا يستخدمونها كسلعة لاغراض تجارية بين المدن وتصديرها للخارج.

وكانت المرأة اكثر خبرة لتحضير المواد الاساسية لهذه المهنة مثل (صوف الخروف، شعر الماعز الاصفر، نسيج الحرير، خيوط القطن، خيوط الميتالی) ثم تبدا مرحلة التنظيف والغسل جيدا وابعاد المعلقات منها، ثم مرحلة التجفيف في مكان نقي وفي هواء طلق ثم تحليل وفك خيوط الغزل بآلة تسمى (شانة) اي المشط ثم تأتي مرحلة الغزل الحقيقي بآلة تسمى (تەشی) ويأتي بعدها مرحلة اختيار الالوان وفي كثير من الاحيان لغرض صناعة شرل و شبك كانت تستخدم نفس الوان الصوف الحقيقي او الطبيعي دون تلوينها.

كانت العوائل اليهودية الذين يمارسون مهنة الغزل (جولا) لهم خبرة كبيرة في مجال هذه المهنة وبجانبهم كانت هناك عوائل يمارسون مهنة التلوين (خومجی) بطريقة مهذبة وكانوا معروفين بحيث ان اغلب الذين يمارسون مهنة الغزل يرسلون نتاجاتهم اليهم لغرض التلوين مقابل مبلغ زهيد، بعد الانتهاء من التلوين يبدأ اصحاب مهنة الغزل بغزل ونسج تلك المواد بآلة تسمى (بيجال).

و تعتبر (چارۆگەی بووزی ، جاجم، فەرشی چنراوی تەنکی دیوار، بەرماڵ، کر، کليم) من اهم منتوجاتهم والتي باقيه الى يومنا هذا وموجودة في الكثير من المتاحف، وكانت لكل منطقة طريقة خاصة يمتازون بها من حيث الطراز او الخصائص والموديلات وكانت جزء من فولكلور منطقتهم، وكانت كل عائلة من العوائل اليهودية تمتاز بنوع معين من الاعمال اليدوية الخاصة بهم.

## Conclusion

### *WAEVING PROFESSION BY JWISH COMMUNITY IN KURDISTAN*

Weaving is considered one of the most important works and major professions practiced by Jews in Kurdistan, especially those who live in villages and rural areas, and this profession continued with them for several centuries and for several generations, keeping it, and that this profession was among the folkloric works among the people, and it had An important role in their acceptance among other people and in strengthening their social relationships.

In addition to that, this profession had an important role in the manufacture of used materials such as clothes, weaving chapels, local carpets, shawls and nets that were known in cities and countryside, in addition to that the profession of textile coloring (Khumji) was complementary to this profession, and the quality The beauty of the product was an important source of their revenue and that many of them were using it as a commodity for commercial purposes between cities and exported abroad.

The woman was more experienced to prepare the basic materials for this profession such as (sheep wool, yellow goat hair, silk fabric, cotton threads, metallic yarn), then the cleaning and washing phase began and the pendants removed from them, then the drying phase in a fresh place and in open air, then Analyzing and decoding yarn with a bale called (shana), meaning the comb, then comes the stage of real spinning with a bale called (tashi), and then comes the stage of choosing colors, and often for the purpose of making shells and nets that used the same colors as real or natural wool without coloring,

The Jewish families who practice the profession of spinning (Jolla) had a lot of experience in the field of this profession, and next to them there were families who practiced the profession of coloring (Khomji) in a polite manner and they were known so that most of those who practice the profession of spinning send their products to them for the purpose of coloring for a small amount, after completion From the coloring, the owners of the profession of spinning seem to spin and weave these materials with a bale called (Pigalle).

(Garogey Bouzy, Jajim, Frashi chnrawi Tinky Dewar, barmal, Kr, and Kilim) are among their most important products, which remain to this day and are present in many museums. From the folklore of their area, each of the Jewish families had a specific type of their own craft.

## تعليمات النشر
## في مجلة الأكاديمية الكوردية

- مجلة الأكاديميّة الكورديّة: مجلّة علمية فصليّة تهتمّ بنشر البحوث العلميّة الـتي تتنـاول قضايا الكورد وكوردستان، شريطة أنْ لا تكون منشورة مـن قبـل أو مقبولـة للنشـر في مجلّة أخرى.
- لغتـا النشـر في المجلّـة همـا الكورديّـة والعربيّـة، ويمكـن نشـر بحـوث تخـصّ الكـورد وكوردستان بلغات أخرى.
- على الباحث أن يكتب على الصفحة الأولى من بحثه عنوان بحثه، اسمه، لقبه العلمـي، عنوان وظيفته، مكان عمله، بريده الإلكتروني ورقم هاتفه.
- يُعتمد المنهج العلميٍ في اختيار عنوان البحث ومتنه وأسلوب تنظيم المصادر والهوامش والاقتباسات، فضلاً عن كتابة البحث بلغة علميّة رصينة، وتعتذر هيئة التحرير عن نشر أيّة دراسة تهمل هذه الجوانب.
- يُلحق بالبحث ملخّص بلغتين أخريين، على أنْ لا يزيد عـن صـفحة واحـدة A4، يوضّـح فيه الباحث أهمّيّة بحثه والنتائج الرئيسة التي توصّل إليها.
- عندما يكون البحـث تحقيقـاً لمخطوطـة مـا، يجـب الالتـزام بالقواعـد والمنـاهج العلميّـة المعمول بها في هـذا المجـال، وتُرفـق بالبحـث عـدّة صـفحات مـن المخطوطـة مـع بيـان المعلومات الأساسيّة عنها والجهة التي تحتفظ بها.
- يجب كتابة البحث بحـروف اليونيكـود، وتنظـيم الهـوامش بأسـلوب هارفـارد، علـى ان يطبع عنوان البحث بحجم (١٥) واسم الباحث او الباحثين مـع العنـاوين الفرعيـة بحجـم (١٤) ويكون المتن بحجم (١٣).
- تُنظّم المصادر والمراجع كالآتي: لقب المؤلّف واسمه، التأريخ، عنوان الكتـاب، الجـزء (إنْ وُجـد)، الطبعـة، دار النشـر، المدينـة،. وتُـنظّم البحـوث في المجلّـات كـالآتي: لقـب المؤلّـف واسمـه، التـأريخ، عنـوان البحـث، اسـم المجلّـة "بـين تنصيصـين"، العـدد، المدينة.
- يُرسل البحث بثلاث نسخ ورقيّة A4، وبقرص مدمج CD، على أنْ لا يزيد عدد صفحات البحث عن (٢٥) صفحة، بضمنها الصور والجداول والمصادر.

- يّعتبر البحث مقبولاً للنشر بعد تقويمه إيجابيّاً من قبل خبراء ومحكّمين متخصّصين، ويزوّد الباحث بقرار من هيئة التحرير بقبوله، ولا يجوز للباحث نشر بحثه لاحقاً في مكان آخر بدون موافقة خطيّة من رئيس التحرير.
- تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في حذف أو إعادة صياغة بعض الألفاظ والتعابير بما يتلاءم مع أسلوب المجلّة في النشر، مع مراعاة عدم المساس بالأفكار الأصليّة للبحث.
- يخضع ترتيب البحوث في المجلّة وفقاً لمنهج المجلّة في التبويب، وليس لأهمّيّة البحث أو لقب الباحث العلمي.
- لا تنشر المجلّة البحوث المستلّة من رسائل الماجستير وأطاريح الدكتوراه.
- تلتزم المجلّة بتطبيق المبادئ المتعلّقة بالانتحال.
- لا تعاد البحوث المرسلة إلى المجلّة إلى أصحابها في حالة عدم الموافقة على نشرها.

